

فیۆدۆر
دۆستۆیڤسکی

وەرگێڕانی:
کەیوان هەورامی

# بێگانە



ڕۆمان

لەگەڵ چوار شرۆڤە

فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی

# بێگانە

وەرگێرانی
کەیوان هەورامی

پێداچوونەوەی
ئاریێز حەسەن

چاپی یەکەم
٢٠١٩

AWER
Nawandi Awer
ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بلاوکردنەوە

# بێگـانـە

- ناونیشان: بێگانە
- ناونیشان: گوندی ستێپانچیکۆڤۆ و خەڵکەکەی
- ناونیشان: هاوەڵی بنەماڵە
- بـابــەت: ئەدەبیاتی ڕووسی – سەدەی ١٩م
- ژانـــــــر: ڕۆمان
- نووسەر: فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی
- وەرگێڕ: کەیوان هەورامی
- هەڵەبڕی: ئاریێز حەسەن
- دیزایینی ناوەوە: محمد حسێن خەتی
- دیزایینی بەرگ: ئاکار جلیل
- شوێنی چاپ: چاپخانەی ئاوێر
- نرخ: (١٠,٠٠٠) دینار
- تیراژ: (١٠٠٠) دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٩٤٧)ی ساڵی ٢٠١٨ی پێ دراوە.

# پێڕست

لەبەردەم کارەساتدا
ترسنۆکگەلێکی جێی شەرمەزاریین
لەبەرانبەر دەسەڵات و زۆردا
چەند کۆیلەیەکی چەپەڵ...
بەرێکی هێندە سستین
کە تا ساتی گەشە و پێگەیشتن
تەنانەت تام و ڕەنگمان
چاوێک تامەزرۆ ناکا
بەرێکی غەریب؛
هەتیوێکی هەڵواسراوی سەر خاک
کە جوانترین کاتی
ساتی کەوتنیەتی...!
بەدەم ڕابواردنەوە
باشترین ئاوات و
هەر ئاوازێکی ئاشقانەمان ژاکاند
جا هەر نەونەمامێکی ئاوزمان وشکاند
لە هەر خۆشی و شادییەک
بە بیانووی بێزارییەوە هەڵهاتین...
هیوای شعر و هێژایی هونەر
مێشکی وردەڵەمانی نەبزواند!

**میخائیل لێرمانتۆڤ**

**چەند برگەیەک لە شیعری «ڕامان» ١٨٣٨**

**(لە کتێبێکی چەرخی زێڕین و زیوینی شیعری ڕووسییەوە)**

«جوانی، جیهان نەجات دەدات.»

**فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی**

## پێشەکی

پەیامهێنی گەورەی ئەدەب، فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی، لە ساڵی ۱۸۵۹دا ڕۆمانێـک بـە ناونیشـانی «گونـدی ستێپانچـیکۆڤۆ و خەڵکەکەی» لە گۆڤاری «یادداشتە نیشتمانییەکان»دا چاپ و بڵاو دەکاتەوە کە دواتر، بە دوو ناونیشانی لاوەکیی دیکەش «بێگانـە» و «هاوەڵبنەماڵە»، دەناسێنرێت و وەردەگێڕرێتە سەر زمانەکانی دی.

خوێنـەری ئازیز، ئـەم کتێبـەی... هەمیشـە نووسـینی پێشـەکی کارێکی سەختە! جا بە تایبەت گەر بزانیت تۆ هیچ قسەیەکی نوێت پێ نییە و ئەوەی کە دەیڵێیت، لە سەرئێشاندنی خوێنەر بەولاوە، هیچی دیکەی لێ ناکەوێتـەوە! وەڵامـی ئـەوەی کـە بۆچـی مـن هـیچ قسـەیەکی نوێم لەسەر ئەم پەرتووکە پـێ نییە کە بۆ گوتن بشێت، ئەوەیـە کـە لـە پاشـبەندی ئـەم کتێبـەدا، چـوار شـرۆڤەی ئێجگـار وردەکارانـە و تۆکمـەت بەرچـاو دەکـەوێت کـە بـە گشـتی کـون و کەلەبەری ڕۆمانەکە و، بە تایبەت هەردووک کەسایەتیی سەرکیی نێو ئـەم ڕۆمانـە «فۆمـا فـۆمیچ و سـەرهەنگ ڕۆسـتانێڤ»، خـودی کەسـایەتیی «فیـۆدۆر دۆشتۆیڤسـکی» و کەسـایەتییە «هـاورزایی-دوورانیـی»ـەکانی نووسـەرمان بـۆ شـەنوکەو دەکـەن. بـێ لەمـەش، وەرگێڕی لێهاتوو و دۆستۆیڤسکیناسی فارس «حەمید ڕەزا ئاتـەش بەرئاب» لەگەڵ «پەریسا شەهریاری»، لەو پێشـەکییە بەپێزەدا کە بـۆ کتێبەکـەیان دانـاوە، هەمدیسـان لـەو بارەیـەوە هـیچ قسـە و زانیارییەکی نوێیان بۆ ئێمە نەهێشتووەتەوە. ئاخر گەلێك ناشیرینە

ئێستە من پێشەکییەکەی ئەوان بخوێنمەوە و جوان جوان بیشێلم و جا بە دارشتنەوەیەکی دیکەوە بیکەمە ماڵی خۆم! دەی، کەواتە کتومت بەشێك لە پێشەکییەکەی حەمید ڕەزا وەردەگێرم و پاشان دەتسپێرمە دەست ڕۆمانێکی ناوازەی دیکەی دۆستۆیڤسکی و کۆمەڵێك کارەکتەری ئێجگار بێگانە و سەرنجڕاکێشی ئەو. وەڵێ بەر لەوە، چەند قسەیەکم لە بارەی وەرگێڕانەکە و ناونیشانی ڕۆمانەکەوە هەیە:

«گوندی ستێپانچیکۆڤۆ و خەڵکەکەی» ناونیشانی سەرەکیی ئەم ڕۆمانەیە، ئەم کتێبە، وەك بەشێك لە بەرهەمەکانی دۆستۆیڤسکی، ناونیشانی لاوەکیشی هەیە، «یادداشتەکانی بێگانەیەك» ناونیشانە لاوەکییەکەیەتی و هەروەها تا ئێستە، بە ناونیشانی «هاوەڵی بنەماڵ–هاوەڵبنەماڵە»یش لە چاپ دراوە. لێرانەدا بە پەیڕەویکردن لە وەرگێڕی فارس، ناونیشانە لاوەکییەکەیمان هەڵبژارد، ئەمەش لەبەر دوو هۆکار: یەکەم ڕەچاوکردنی خۆشگۆکردنی ناونیشان، چونکە «گوندی ستێپانچیکۆڤۆ و خەڵکەکەی» کەمێك دوورودرێژە و خۆش نایێتە سەر زمان، هۆکاری دووەمیش ئەوەیە کە پاڵەوانی سەرەکیی ئەم ڕۆمانە، کە «فۆما فۆمیچ ئۆپیسکین»ە و تا کۆتا تیشکی سەرنجی نووسەری لەسەرە، لە سەرەتای دەرکەوتنیدا، بە خەڵکی ئەو گوندە «بێگانە»یە و بە دیوە دەروونییەکەشدا، کەسایەتییەکە بە خۆی و مرۆڤایەتیش «بێگانە»یە و ئەم ناونیشانەش، زیادتر لەگەڵ ناوەڕۆکی ڕۆمانەکەدا تەبایە، کەواتە، «یادداشتەکانی بێگانەیەك» کورت کراوەتەوە و بۆ ناویشانی

ڕۆمانەکــە، «بێگانــە–ناشــناس» هەڵبــژێردراوە. خــاڵێکی دی کــە دەمەوێ ئامارژەی پێ بکەم، ئەوەیە کە وەك زۆربەی کارەکانی دیکەم، بەر لە وەرگێڕانی هەر ڕۆمانێکی دۆستۆیڤسکی، گەر زانیبێتم چەند کەسێك ئەو ڕۆمانەیان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسی، هەموویانم دەســـت خســـتوون و بڕواپێکـــراو و باشـــترینەکەیانم کردووەتـــە سەرچاوەی وەرگێڕانەکەم، بۆ ئەم کتێبەی بەردەستیشت، سەرچاوەم وەرگێڕانەکەی حەمید ڕەزا ئاتەشبەرئاب بووە، کە لە ڕووسییەوە و بەوپــەڕی وردەکــاری و خەمخۆرییــەوە وەریگێــڕاوە، وەلێ لــە چــەند شوێننێکیشـــدا، ســـوودم لـــە وەرگێڕانەکـــەی «مهـــرداد مهـــرین» وەرگرتووە، چونکە نەمویستووە بەسەر هیچ دەربڕین و وشەیەکی نـامۆدا بـاز بـدەم کـە ماناکـەی نـاڕوون بـووە. لەمـە زیـادتر درێـژی ناکەمــەوە، ئــەوەی کــە لــەژێرەوەدا هــاتووە، لــە پێشــەکیی کتێبــە فارسییەکە و بەشـێك لـە شـرۆڤەیەکی «ستانیسـلاڤ ماکسـکێڤیچ»ی دۆستۆیڤسکیناســەوە وەرگـیراوە، کــە ئەمــەش تـا ڕاددەیــەك وانــەر ئامـادە دەکـات بـۆ خوێندنـەوەی ڕۆمانەکـە و تێـی دەگەیـەنێت کـە سەروکاریی لەگەڵ چ جۆرە کتێبێکدا هەیە.

## بەسەرهاتی نووسین و بڵاوبوونەوەی بێگانە[1]

[1]. پێشەکیی حەمید ڕەزا.

ڕۆمانی بێگانە، یەکەمین جار لە لە ساڵی ١٨٥٩ و لە گۆڤاری *یادداشتە نیشتمانییەکان*دا بڵاو کرایەوە. لە بارەی شێوەگرتنی بیرۆکەی ڕۆمانەکەوە، بەڵگەی لێکدژ هەن. ١٨ی کانوونی دووەمی ١٨٥٨ دۆستۆیڤسکی بۆ براکەی دەنووسێت، دواجار بڕیاری داوە ڕۆمانە گەورەکەی وەلا بنێت و دەست بە کارێکی دی بکات.

هەشت ساڵ لەمەوبەر بوو کە بیرۆکەی ڕۆمانێکی مامناوەندی، هێندەی *هەژاران*[١] بە زینمدا هات. وا دیارە دواجار دەستم بەو بیرۆکەیە ڕاگەیشتووەتەوە و هاتەوە بیرم، جا دووبارە نەخشەتەی ڕۆمانەکەم داڕشتەوە. خۆم بەم کارەوە خەریك دەکەم و دەینووسم. هیوادارم لە ماوەی دوو مانگدا تەواوی بکەم.

ناوەڕۆکی نامەی دۆستۆیڤسکی لە مانگی ٩ی ساڵی ١٨٥٩دا بۆ براکەی، ئەوە پشتڕاست دەکاتەوە کە بیرۆکە سەرەتاییەکانی ڕۆمانی *بێگانە*، چەند ساڵێك لەوەوبەر و لە دەقی ئەو نامەیەدا شێوەیان

٢. «هەژاران» یەکەمین بەرهەمی نووسەر، کە لە لایەن ڕەخنەگرانی ئەو سەردەمەوە پێشوازییەکی گەرمی لێ دەکرێ و پێگەیەکی باشی ئەدەبی بۆ نووسەر دەستەبەر دەکات و دەیباتە نێو کایەی ئەدەبیاتەوە. «و. ك»

گرتووە. دۆستۆیڤسکی لەم نامەیەدا دەنووسێت کە کەسایەتییە سەرەکییەکانی ئەم بەرهەمە، پێنج ساڵ لەوەوبەر شەنوکەو و نەخشەڕێژی کراون. ئەمە بەو واتایەیە کە نووسەر، سەردەمی دەستبەکاربوونی لەسەر کەسایەتییەکانی نێو ڕۆمانی *بێگانەی*، بۆ سەردەمی دەستبەسەربوونەکەی (نزیکەی ١٨٥٤) دەگەڕێنێتەوە.

ئانا گریگۆریۆنا –هاوسەری دۆستۆیڤسکی– دوای مردنی نووسەر، قسەی خۆی لە بارەی سەردەمی شێوەگرتنی ئەم بەرهەمەوە بەیان دەکات. ئانا لە ساڵی ١٨٨٨دا بە *ستانیس لافسکی* دەڵێت، هاوسەرەکەی کە بۆ یەکەمین جار دەستی دایە نووسینی *بێگانە*، لە بنەڕەتدا، نەیویستووە ڕۆمان بنووسێت و زیادتر نیازی ئافراندنی شانۆنامەیەکی هەبووە، *وەلێ وازی لەو کارە هێنا، ئاخر بۆ بردنە سەر سەکۆی نمایشێک، هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر پێویستە و فیۆدۆر میخائیلۆڤیچ دۆستۆیڤسکی دەستی کورت بوو*. لە ڕاستیدا، دۆستۆیڤسکی لە ١٨ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٥٦دا هەواڵی دایە مایکۆف، *کاڵتە کاڵتە! دەستم بە نووسینی کۆمیدیایەك کردووە*، وەلێ دواتر بە چەشنێك شەیدای کەسایەتییەکانی بووە کە وازی لە شێوازە کۆمیدیەکەی هێناوە. ئەو بڕیاری دابوو ڕۆمانێکی کۆمیدی بنووسێت کە لە کۆمەڵە بەسەرهاتێکی جۆراوجۆر پێك هاتبێت. هەڵبەتە زۆر کەس بە *خەونی مامە گیان* لەم گەڵاڵەداڕێژییە جێبەجێنەکراوە تێگەیشتوون. تا ئەو شوێنەی کە پەیوەندیی بە *بێگانە*وە هەیە: لە بنەڕەتەوە گەڵاڵەی ئەم بەرهەمە، وەك ڕۆمانێکی کۆمیدی، جێگەی گومانە. دۆستۆیڤسکی لە کۆتاییەکانی ساڵی

١٨٥٧دا لە بارەی کارکردن لەسەر ڕۆمانی *بێگانە*، هەواڵ بۆ براکەی دەنێرێت و بە *بەرهەمێك کە خۆیشی نازانێت* چییە ناوی دەبات، بە پێچەوانەی خەونی مامە گیانەوە -هەر لەم نامەیەدا- وەك بەشێك لە ڕۆمانەکەی پێشتری لە قەڵەم دەدات.

لەمەڕ ڕۆمانی *بێگانە*وە، دەتوانین -بە پێی ئەو بەڵگانەی کە لە بەردەستدان- وەها داوەری بکەین کە نووسەر لە پاییزی ساڵی ١٨٥٧دا دەستی بە نووسینی کردووە، یانی دوای ئەوەی کە *پلیشییێف* هەواڵی ڕێککەوتنی *کاتکۆف*ی بۆ هاوکاریکردنی دۆستۆیڤسکی لە بڵاوکەرەوەی *پەیکی ڕووسی* بە نووسەر دەگەیەنێت. لە سێی کانوونی دووەمی ساڵی ١٨٥٧دا، دۆستۆیڤسکی بۆ براکەی نووسی کە دەیەوێت دەست بە ڕۆمانەکەی، کە هێندەش دووروودرێژ نییە (نزیکەی شەش لاپەڕەی گەورەی ڕۆژنامە) بۆ *پەیکی ڕووسی* بکات. هەروەها دەنووسێت:

> دەمێکە خەریکم کار لەسەر ئەم بەرهەمە دەکەم، شتێکیشم لێ نووسیوە. کارەکە باش بەرەو پێش دەچێت و ڕۆمانەکە تا پازدەی دیسێمبەر تەواو دەبێت.

وەڵێ دۆستۆیڤسکی –بە پێی خووی هەمیشەیی– لە باسی ڕادەی خێرایی کارەکەوە زیادەڕۆیی کردبوو، هەر لەبەر ئەمەش، کارەکە تا پاییزی ١٨٥٨ی خایاند. لە دیسێمبەری هەمان ساڵدا، دۆستۆیڤسکی ناچار بوو کارەکە ڕابگرێت تا ئەو ڕۆمانە تەواو بکات کە بە پێی گرێبەستێك، بڕیار وابوو بۆ بڵاوکەرەوەی *گوتەی ڕووسی‌ی* بنووسێت. دۆستۆیڤسکی، دوای ئەوەی لە ساڵی ١٨٥٩دا خەونی مامە گیانی تەواو کرد و بۆ *گوتەی ڕووسی‌ی* نارد، دووبارە دەستی بە ڕۆمانی *بێگانە* کردەوە بۆ *پەیکی ڕووسی*. لە ١١ ئاپریلی ١٨٥٩دا سێ لەسەر چواری ڕۆمانەکەی بۆ *کاتۆف* نارد و لە ماوەی مانگی پێنج تا حوورەیران چەند نووسخەیەکی بۆ میخائیلی برای نارد تا بیداتە چاپخانە.

دۆستۆیڤسکی هیوایەکی زۆری لەسەر *بێگانە* هەڵچنیبوو. حسێبی کردبوو، لە باری سەرکەوتنی ئەم بەرهەمەدا –کە بڕوای پێی هەبوو– دەتوانێت پێگەی ئەدەبیی خۆی پتەو بکات (هەقدەسی نووسین زیادتر بکات و کۆبەرهەمەکەی لە چاپ بداتەوە و... ). لە ٩ی مەی ١٨٥٩دا، دۆستۆیڤسکی بۆ براکەی دەنووسێت:

> بێ گومان ئەم ڕۆمانە خەوشی زۆری هەیە و لەوانەیە بەرچاوترینی درێژدادڕییەکەی بێت. وەڵێ هارکات ئەوەشم لا ڕوونە کە دەشێ دەستکەوتی گەورەشی هەبێت. ئەم

پۆمانە لە ڕیزی باشترین بەرهەمەکانی
مندایە. نازانم *کاتکۆف* قەدری دەزانێت
یان نا، لەگەڵ ئەوەشدا، دانی پێدا
دەنێم کە ئەگەر خوێنەران ساردوسڕانە
پێشوازی لە ڕۆمانەکەم بکەن، ئەوسا
ڕەنگە بە تەواوی تووشی خەمۆکی
ببم. هیوای زۆرم بەم بەرهەمەم هەیە و
بۆ پتەوکردنی پێگە ئەدەبییەکەشم هەر
پشتم بەو بەستووە.

دۆستۆیڤسکی، لەگەڵ ناردنی ڕۆمانەکە بۆ کاتکۆف، باس هەلومەرجی (هەقدەسی نووسین بە بڕی ۱۰۰ ڕۆبڵ بۆ هەر لاپەڕەیەك و ۲۰۰ ڕۆبڵیش وەك هاوکاری) خۆی کرد، وەلێ کاتکۆف وەڵامی نامەکەی نەدایەوە. دۆستۆیڤسکی هەڵچوو و لە حوزەیرانی ساڵی ۱۸۵۹دا بە زمانێکی زبر نامەیەکی بۆ نووسی. ۲۸ی ئاب لە تڤێر[1]دا وەڵامی ئەم نامەیەی گەیشتە دەست. لەم نامەیەدا، چاپخانەی پەیکی *ڕووسی* گوێی بە هەلومەرجی ئەو نەدا و چاپکردنی کتێبەکەی ڕەد کردبووەوە. دوای ڕەدکردنەوەی بەرهەمەکە لە لایەن پەیکی *ڕووسی*یەوە، دۆستۆیڤسکی بیری لەوە کردەوە کە ڕۆمانەکەی بداتە بڵاوکەرەوەی *سەردەم*، بە تایبەت لەبەر ئەوەی کە *نیکراسۆف* بەر لەوەش —لە سێپتێمبەری ۱۸۵۸ و ئاپریلی

1. تڤێر: شارێکی ڕووسییە. «و. ف»

١٨٥٩دا- پێشنیاری هاوکاریی بۆ ئەو کردبوو. لە ١٥سێپتێمبەردا برا گەورەی نووسەر، دەستنووسی *بێگانەی* برد بۆ نیکراسۆف و لە ٦ی ئۆکتۆبەردا، لە لایەن بڵاوکەرەوەی *سەردەم*ەوە نامەیەکی پێ گەیشت. ئەوان مافی نووسەریان بە بڕی هەزار ڕۆبڵ بۆ هەموو بەرهەمەکە، بەو مەرجەی کە لە داهاتوودا چاپ بکرێت، پێشنیار کردبوو، جا ئەمەش بە مانای وەڵامی ڕەد بوو.

دۆستۆیڤسکیی ڕەنجاو، مەرجەکانی پێشنیارەکەی نیکراسۆفی بە کاسبکاریی بڵاوکەرەوەی *سەردەم* لێک دایەوە و بەم ئەنجامە گەیشت کە پەیکی *ڕووسی*یش دەیەوێت هەلومەرجی ئەو بقۆزێتەوە.

دۆستۆیڤسکی لە ئۆکتۆبەردا بۆ براکەی دەنووسێت:

> من خۆم بە باشی خەوشەکانی ڕۆمانەکەم دەزانم، وەلێ لام وایە، بەرهەمەکەم لاپەڕەی باشیشی تێدایە.

بە هەرحاڵ، هیوای چاپبوونی کتێبەکەی لە بڵاوکەرەوەی *سەردەم* لەدەست نەدا، چونکە لای وا بوو دەکرێت لەگەڵ نیکراسۆف ڕێک بکەوێت. وەلێ میخائیلی واقعبین، کە هیچ هیوایەکی بە نیکراسۆف نەبوو، لەگەڵ چاپخانەی *یادداشتە نیشتمانییەکان*دا، کە *کرایێفسکی* بەڕێوەبەری بوو، کەوتە گفتوگۆ. لە ٢١ی ئۆکتۆبەردا ئەم گفتوگۆیانە بە سەرکەوتوویی دوایییان هات. *کرایێفسکی بێگانەی*

لەبەرانبەر ۱۲۰ڕۆبڵ بۆ هەر لاپەڕەیەك پەسەند كرد. ڕۆمانەكە لە دوو ژمارەی نۆڤێمبەر و دیسێمبەری *یادداشتە نیشتمانییەكان*دا، ساڵی ۱۸۵۹ چاپ كرا. لە ژمارەی یەكەمیدا ۱۲ وەرز و لە ژمارەی دووەمیدا ٦ وەرز لە ڕۆمانەكە جێگەی كرابووەوە. ئەم دابەشكردنە بەسەر دوو ژمارەدا، بە هۆی پێداگریی دۆستۆیڤسكییەوە بوو. بەڕێوەبەری بڵاوكەرەوە و میخائیل، پێشنیاری دابەشكارییەكی یەكسانی ڕۆمانەكەیان بۆ كرد، لە هەر ژمارەیەكدا نۆ وەرز. پاساویشیان ئەوە بوو كە وا باشە وەرزی میزینچیكۆڤ لە ژمارەی دووەمدا بێت، دەنا خوێنەر گفتوگۆكەی ئەوی لەگەڵ *بێگانە*دا بیر دەچێتەوە و، هەروەها ئەوەی كە ئەو بە تەنیا كرۆكی باسەكە نییە و نابێت ئابنۆسكین بە هەدەر بدرێت. وەلێ ئەوە بۆ دۆستۆیڤسكی زۆر گرنگ بوو كە بە وەرزی *كارەسات* كۆتایی بە بەشی یەكەم بهێنێت. لە نامەی ۲۹ی ئۆكتۆبەری ۱۸۵۹دا، هاتووە كە *نەگەیشتن بە بەشی دوازدەیەم بۆ ئەو وەك ئەوە وایە كە هەموو كاریگەریی بەرهەمەكەی بە فیڕۆ چووبێت.*

میخائیل پەیجۆری هەنگاوەكانی چاپكردن بوو و پێداچەرەوەكانی لە كار ڕاگرتن. وەلێ ئەو گۆڕانكارییەی كە نووسەر دەیوست لە ڕۆمانەكەدا، لەبەر شێوازی چاپەكەی، ئەنجامی بدات (وەك كورتكردنەوەی وەرزی یەكەم و سێیەم كە لە نامەی ۲۹ی ئۆكتۆبەردا بۆ براكەی باس كردبوو)، سەری نەگرت، چونكە ئیدی هەڵەبرییان بۆ ناونیشانی وەرزەكان كردبوو. دواتر كاتێك كە ئەم ڕۆمانە چاپ كرایەوە (۱۸٦۰-۱۸٦٥)، لە جێی پاكنووسكردن و ئەو

کورتکردنەوەیەی کە نووسەر بە نیازی بوو، تەنیا سووکە دەسکارییەکی کرا.

ڕەنگە ئەوە جێی سەرنج بێت کە بەرپرسی سانسۆری *بێگانە*، *ئیڤان گانچارۆف*ی ناودار و خاوەنی بەرهەمی *ئابلۆماف* بوو. لە ١٦ی نۆڤێمبەردا، میخائیل بۆ براکەیی نووسی کە -بە قسەی کرایێفسکی- لە سانسۆرەکەدا، تەنانەت یەك وشە لە ڕۆمانەکە نەسڕراوەتەوە و لە نامەی دواتریدا هەواڵی پێ دا:

> دەڵێن گانچارۆف تەنیا یەك وشەی بەشی یەکەمی سڕیوەتەوە. جا نازانم کە ئاخۆ کام وشەیە بووە.

ڕۆمانەکە بە واژۆی دۆستۆیڤسکی، وەلێ بێ نووسینی یەکەمین پیتەکانی ناو و ناوی باوکی -بەو جۆرەی کە لە ڕووسیادا باوە- چاپ کرا. سڕینەوەی ئەم وشانە، بێ گومان برایانی دۆستۆیڤسکیی هەراسان کرد، چونکە هەر لە هەمان بڵاوکەرەوەی *یادداشتە نیشتمانییەکان*دا، میخائیل دۆستۆیڤسکیش دەینووسی. ٢٣ی نۆڤێمبەر میخائیل بۆ فیۆدۆر دەنووسێت:

> لەوە تێناگەم بۆچی پیتی «ف»یان نەنووسیوە. ئەم «ف»یە لەسەر بەرگی *یادداشتە نیشتمانییەکان*دا هەیە، ئەی بۆچی لەوێ نەسڕراوەتەوە؟ ئەگەر تەواوی مافت و تەنانەت هەموو

ناونیشـانی نەجیبزادەییشـتیان بـۆ گێڕاویتـەوە، کەواتـە بـێ ئـەملا و ئـەولا مـافی چـاپکردنی کتێبەکـەت بـە نـاوی خۆتـەوە هەیـە. *تـۆل*، *پلیشـی پێـف* و *ئاخشـارۆماف* (ئەنـدامانی گرووپـی پیتراشێفسـکیی جـاران) و کەسـانێکی دیکـەش وا ئێسـتە خـەریکن بەرهەمـەکانیان بـە نـاوی باوکیانـەوە چـاپ دەکـەن.

دۆستۆیڤسـکی ئەوسـا *بێگانـە*ی بـە باشـترین بەرهـەمی خـۆی دەزانی. لە نامەی (٩ی مەی ١٨٥٩دا) بۆ براکەی دەنووسێت:

دوو سـاڵ کـاتم بـۆ نووسـینی تـەرخان کـردووە، هەڵبەتـە وێـڕای ئـەو وەستانەی کە لەم نێوەندەدا بە بۆنـەی نووسینی *خـەونی مامـە گیانـەوە* هاتـە پێش. دەستپێك و ناوەڕاستی کتێبەکە کـاری باشـی لەسـەر کـراوە، وەلێ کۆتاییەکـەی پەلـەی لـێ کـراوە. بـە هـەرحاڵ، مـن بـوونی خـۆم لەسـەر داناوە. نامەوێ بڵێم هەموو قسەکانی خـۆم لـەودا کـردوون. وەهـا شـتێك

> قسەی پڕوپووچە! هێشتا قسەی زۆرم هەیە بۆ گوتن. لە بارەی ئەوەی کە لە ڕۆمانەکەدا، ئەگەر وەك *مێلانەی خانەدانیی* تۆرگنێف، هەست یان بە دەربڕینێکی دی تووخمی پەرۆشی کەمە، ئەوا دەبێت بڵێم، لە جێی ئەوە، لەنێویدا، دوو کەسایەتیی نایاب و باش هەن کە ئافراندنیان پێنج ساڵ کاتی خایاندووە، ئەم کەسایەتیانە ناوازە و بێخەوشن. هەڵبەتە ئەمەش بۆچوونی منە. ئەم کەسایەتیانە ڕووسین و تا ئێستە لە ئەدەبیاتی ئێمەدا نموونەیان نەبووە.

ئەم نامەیە بەڵگەیە بۆ ئەوەی کە نەخشەی سەرەتایی ڕۆمانەکە، لەسەر بنەڕەتی لێکدژیی دوو کەسایەتیی جیاواز-فۆما ئۆپیسکین و سەرهەنگ ڕۆستانێف- داڕێژراوە و لە سەرەتاکانی ساڵی ١٨٥٤دا دەست بە هێڵکاریی کراوە.

*بێگانە* لە سەردەمێکی وروژانی کۆمەڵایەتیدا نووسرا. ئەم وروژانە ئەدەبیاتی ڕووسیی زیادتر بە قووڵاییەکانی ژیانی لادێییەوە گرێ دا. وێنای ڕەخنەگرانەی ژیانی لادێیی ڕووسیای بەر لە چاکسازی، بە هەوڵی کۆمەڵە نووسەرێکی وەك پیێمسکی، *ئاسترۆفسکی* و *شیدرین* ساز درا، هەروەها پەیوەندیشی بە

بەربڵاوبوونی شێوازی گۆگۆڵەوە هەیە. هۆکاری ئەوەی کە دۆستۆیڤسکی دەستی بۆ ژیانی لادێیی بردووە، ئەوەیە کە ئەمە، هەم شەپۆلێکی گشتی بوو لە ئەدەبیاتدا و هەم پەیوەندیی بە هەلومەرجی تایبەتیی خۆشیشییەوە هەبوو کە بۆ چەند ساڵێك ئەوی بە قووڵاییەکانی ڕووسیاوە گرێ دابوو.

دۆستۆیڤسکی لەچاو بەرهەمەکەی پێشوویدا، پاڵەوانەکانیی خستبوونە نێو مولْکێکی خانەدانانە و هەلومەرجێکی نائاساییەوە. وەلێ تایبەتمەندییەکانی دیدی دۆستۆیڤسکی بە تەواوی دیارن لە بارەی وێنای ئەو جۆرە ژیان و ژینگە خانەدانی و موڵکدارییەتییەی کە دەیخاتە ڕوو. پاڵەوانانی ئەم ڕۆمانە، لە دەستەی هەمان پاڵەوانە دڵخوازەکانی دۆستۆیڤسکین، کەسایەتیگەلی بێناز و کەمدەست کە لە کۆمەڵگەدا پێگەیەکی دیاریان نییە: *فۆما فۆمیچ و تاتیانا ئەیڤانۆڤنای* بەلاشخۆر، *ئابنۆسکینی* کەمتازۆر بێدەرامەت، *میزینچیکۆڤی* فەوتاو، *کارۆفکینی* هەمیشەمەست و *یێژۆیکین* کە ئیدی لە ترۆپکی هەژاری و سووك و ڕسواییدایە.

بابەتی مرۆڤی سووکایەتیپێکراو بە توانا و لێهاتوویییەکی سەرکوتکراو و بەرزەفڕییە نەخۆشانەکەی، کە لە *ماوزا*[1] و

---

١. دووەمین ڕۆمانی دۆستۆیڤسکی، کە یەکێکە لە دەروونشیکارانەترین کارەکانی نووسەر و باس لە ململانێکی نێوان ئاگایی و نائاگایی دەکات. شایەنی باسە گەورە ڕەخنەگری ئەو سەردەمەی ڕووس «ڤیساریۆن بلینسکی»، دوای خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانە، گورزێکی کوشندە لە پێگەی ئەدەبیی نووسەر دەدات و خوێنەرانی لێ دەتارێنێت، ئەمەش بەو بیانووەی کە ڕۆمانی *ماوزا* تەنیا لاساییەکی ئاشکرای کورتەچیرۆکی *لووتی نیکۆلای گۆگۆڵ*ە. ئەم زانیارییە کەمە، ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە یەکێك لە شرۆڤەکانی پاشبەندی ئەم کتێبەوە و هیوادارم خوێنەر لە

بەرهەمـــەکانی دیکـــەی دەیـــەی ٤٠ی دۆستۆیڤســـکیدا وێنـــەی کێشـراوەتەوە، کرۆکـی ئـەم بەرهەمەیـە و لـە زەمینەیـەکی نـوێ و چاوەڕوانینەکراودا دەردەکەوێت.

مرۆڤـی سـووکایەتیپێکراوی پێشـوو، کـە لـە ڕووی دەروونییـەوە تێکشکاو و بە شێوەیەکی نەخۆشانە گەشەی کردووە، لێرانەدا ئیدی هـەراش دەبێـت و لـە شـێوەی جەللادێکـدا دەر دەکەوێتـەوە. کینـە و ڕقـی لـە کەسـانی دەوروبـەری و ئـارەزووی هەمیشـەیی بـۆ خۆنوانـد، گیانی پڕ دەکات لە ستەم بەرانبەر بەوانی دی.

دۆستۆیڤسکی هاوکات لەگەڵ کارکردن لەسەر بابەتی ڕۆمانەکە، بۆ بنەڕەتی کارەکەی، سوودی لە ناوەڕۆکی بەرهەمگەلی جۆراوجۆر و ژمارەیـەك لـە پێشـهەنگاوەکانی وەرگرتـووە، بـۆ نموونـە، چـەندان کەڕەت ئاماژە بەوە کراوە کە نەخشاندنی کەسایەتییەکان و گەلاڵـەی بنـەڕەتیی هەلومەرجـەکانیان، *کۆمیـدیا*[1]ی *میولـەر* دەخاتـەوە بـیر. خـەڵکی گونـدی ستێپانچیکۆڤۆ بـە ئاشـکرا لـە کەسـایەتییەکانی کۆمیدیای میۆلەر دەچن، فۆما ئۆپیسکین هەمان *تارتۆف*، ڕۆستانێڤ هـەمان *ئارگۆن*، خـانمی جەنـەراڵ هـەمان خـانمی *پێرنێل* و باخچـی یێڤ هەمان *کلیانێت* ـە.

بیری نەکات. واتە کە باس لە کینە و ڕقی شاراوەی دۆستۆیڤسکی بەرانبەر بە بلینسکی دەکرێت، ئەوە لە کاردانەوەی بلینسکی بەرانبەر بە ڕۆمانی هاوزا سەرچاوە دەگرێت. «و. ك»

١. کۆمیدیای پێنج پەردەیی میولەر. تارتۆف ناوی قەشەیەکی ڕیاکاری نێو ئەم ڕۆمانەیە، کە پاشان لە ئەدەبیاتدا، بووە هێمای ڕیاکاری. «و. ف»

لەنێو سووژەی جیاوازی بەرهەمەکانی دۆستۆیڤسکی و هاوسەردەمانیدا، چەند پەیوەندییەك لە ئارادایە. وەك *لۆتمان* دەڵێت، دۆستۆیڤسکی هەر وا هاکەزایی بەتەنیشت ڕۆمانی *ماڵێك لە گونددا*، بەرهەمی *پۆلانسکی* ڕانەبردووە، ئەم بەرهەمە ئەوەڵێن جار لە گۆڤاری *سەردەم* (١٨٥٥) چاپ کرا (دۆستۆیڤسکی هەمیشە بە وردی ئەم گۆڤارەی دەخوێندەوە). هەم ناوی هەدووك بەرهەمەکە (*ماڵێك لە گوندا* و گوندی ستێپانچیکۆڤۆ و خەڵکەکەی) و هەم بەشێك لە ناوەڕۆکەکان، بەرهەمەکەی دۆستۆیڤسکی و پۆلانسکی لێك نزیك دەکەنەوە (وەك ئەوەی چیرۆکەکە لە زمانی گەنجێکەوە دەگێڕرێتەوە کە سەری لەنێو کتێب و زانستدایە، هەروەها ئەوەی کە پاڵەوانەکەی ئێمە دەگەڕێتەوە گوند بۆ لای خاڵۆی و لەوێ چاوی بە گیروگرفتی شاراوەی بنەماڵە دەکەوێت). لەوانەشە بەشێك لە کەسایەتی و هەلومەرجەکانی *بێگانە* لەژێر کاریگەریی *کۆمیدیای سەربار* (١٨٤٨)ی بەرهەمی تۆرگنێفدا بێت، بەرهەمێك کە لە ساڵی ١٨٤٩دا بڵاوکردنەوەی قەدەغە کرا و لە ساڵی ١٨٥٧دا دووبارە بە ناوی ڕۆژی ئەوانی دی، لە ژمارەی دووەمی بڵاوکەرەوەی *سەردەم*دا چاپ کرا. سەربار، خۆی لەژێر کاریگەریی دۆستۆیڤسکیی لاودا نووسرا بوو و بۆیە نەدەکرا سەرنجی ئەو ڕانەکێشێت. هەروەها *ڤیناگۆرادۆف*، لەو بارەیەوە ئاماژەی بە لێکچوونی بابەتی هاوشێوەی وەك سووکایەتی بە مرۆڤ و ئازاری ئەخلاقی کردووە.

لە ساڵی ١٨٤٩دا، گروپی پیتراشێفسکی شانۆنامەی تۆرگنێفی لەگەڵ ئەو بەرهەمانەی دیکەی کە سانسۆر کرابوون، دەخوێنێتەوە.

دۆستۆیڤسـکی پێدەچـێت هـەر لـەو سـەردەمەدا ئـەم بەرهەمـەی خوێندبێتـەوە، وەڵێ تەنانـەت ئەگـەر بـۆ یەکـەمین جـاریش لـە ڕێـی گۆڤاری *سەردەم*ـەوە خوێندبێتیەوە، ڕێی تێدەچێت ئەم کۆمیدیایە کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەری دانابێت. دۆستۆیڤسکی کەرەستە خاوەکـانی خـۆی بـۆ ئافرانـدنی ئـەم دوو کەسـایەتیەی *بێگانـە*، لـە کۆمیـدیاوە بـە قـەرز وەرگرتـوون. *کۆزۆفکین‌ی* –کۆمیـدیای سـەرباری تۆرگنێـف– وەك ئـەوە وایـە لـە ڕۆمانەکـەی دۆستۆیڤسـکیدا خـۆی بنوێنێـەوە و لە شێوەی فۆما ئۆپیسکین و ییژۆیکیندا دەر دەکەوێت. دۆخی فۆما لە کاتی ژیـانی جەنـەراڵی کۆچکردوودا، زۆر لە دۆخـی کــۆزۆفکینی نێــو مــاڵی *کــارین*ــەوە نزیکــە. هەڵســوکەوتە گاڵتەجاڕانــەکانی کــۆزۆفکین پێکچــوونێکی زۆریــان لەگــەڵ هەڵسوکەوتی ییـژۆیکین –هـەمان گـەپجاڕی ئـازاد–ی نێـو ڕۆمـانی دۆستۆیڤسـکیدا هەیـە. بیرمـان نەچـێت کـە پێکهاتـەی دەروونیـی سـەرباری بەلاشـخۆر و گـەپجاڕی ئـازاد، لـە دەیـەی ٤٠دا دڵخـوازی دۆستۆیڤسـکی بـووە، وەك چـۆن *گریگـۆری ییفـیش* لـە بەرهـەمێکی خۆیدا بە ناوی *دۆستۆیڤسکی و دیدرۆ*دا ئاماژەی پێ دەکات. چەند بەشێك لە *بێگانە*، کە تایبەتن بە *تاتیانا ئەیڤانۆڤنا* و ڕفاندنییەوە، لێکچوونێکی لەگـەڵ کۆمـەڵێك وەرزی کتێبـی *یادداشتەکانی پیك و ویك‌ی چارلز دیکنز*دا هەیە، لەو شوێنەدا کە بەسـەرهاتی ڕفانـدنی پیرەکچێك بە ناوی *ڤاردێل* لە لایەن *ئالفەرد جینگل*ـەوە دەگێڕرێتـەوە. وەلـێ لایـەنی دەروونیـی تاتیانـا ئـەیڤانۆڤنا ئـاڵۆزترە. نووسـەر تایبەتمەنـدیی گاڵتەجاڕانـەی بـەو بەخشـیوە، وەڵێ، لـە لایەکـەوە، بـە

دڵنەرم و بێپێچوپەنا و خەیاڵپلاو وەسفی کردووە، کەسێك کە هاوکات ڕیشەکانی ژیانی، لەنێو تراژیدیا و فانتازیادان.

دۆستۆیڤسکی بە وەرگرتنی ئەزموونی بەرگی دووەمی *حەشاماتی مردووی گۆگۆڵ*، هەمدیسان بەردەوام دەبێت لەسەر کەوتنەژێر کاریگەریی ئەو. دیمەنی گفتوگۆی ڕۆستانێڤ لەگەڵ جووتیاران لە وەرزی دووەمدا، گفتوگۆی نێوان *کۆستان ژۆگلا* و جوتیارەکانمان بیر دەهێنێتەوە. بەشێك لە هەڵسوکەوتەکانی فۆما (گوتنەوەی وانەی فەڕەنسی بە خزمەتکاران، گوتوبێژ لەگەڵ جووتیاران لە بارەی فەلەکناسی و وزەی وەبەرهێنان و دابەشکردنی کار)، بیرهێنەرەوەی پووخساری *کاشکاریۆف*ە کە حەزی دەکرد *جووتیارانی لادێکەی، بەدەم ڕاکردن بەدوای گاسنەوە، کتێبی بەیاناتی بروسکەئاسای فرانکلین* یان *گۆرانییە لادێییەکانی ویرژیل* یان *توێژینەوەی کیمایی لەسەر خاك* بخوێننەوە.

لە هەمان کاتدا، بێ گومان قەڵەمی *ڤیلیکاسێلتسێف*، نووسەری وتاری *چەند ئاماژەیەك لە بارەی پەیوەندیی ژیانی باشتر لەگەڵ ئەخلاق و سامان لە ژیانی دێهاتی*دا (بڵاوکراوە لە ژمارەکانی ٢٣ و ٢٤ی ڕۆژنامەی *دێهاتی* ١٨٥٦)، بۆ ئافراندنی ئەم وەرزانە، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر دۆستۆیڤسکی هەبووە. لەوانەیە دۆستۆیڤسکی ئاگاداری گوتاری *چەند ئاماژەیەك لە بارەی گۆڤارەکانەوەی چێرنی شێفسکی* بووبێت کە لە گۆڤاری *سەردەم* (١٨٥٧، ژمارە١)دا بلاو کراوەتەوە. چێرنی شێفسکی لەم بارەیەوە بە شێوەیەکی تەنزئامێز بە گوێیاندا دەداتەوە:

> ئایا دەکرێت ئەم جۆرە ڕستانە بخوێنیتەوە و لە تاو پێکەنین پانتۆڵەکەت تەڕ نەکەیت؟! وەك ئەوەی کە دەڵێن بۆ باشتربوونی ژیانی لادێییەکان پێویستە سوخمە بە کچان ببەستیت، قردێلە لە قژیان بدەیت، فێری سەمای کاردیلی فەرەنسییان بکەیت و پیاوانی لادێیی ڕابێنیت کە دەستی خانمانیان ماچ بکەن.

دۆستۆیڤسکی لە *بێگانە*دا، وەك بەرهەمەکانی دیکەی، سوودی لە شێوازی باوی کلاسیك و گرێچنیی وەرنەگرتووە، بەڵکە بە پێی توانا لێی دوور دەکەوێتەوە. لە بارێکدا کە، لە ڕووی دەروونناسییەوە، ماناشیان دەگۆڕێت و لەگەڵ پێشیناندا دەکەوێتە ململانێ.

*پۆلاسکی لە ماڵێك لە گونددا*، هەر بەو جۆرەی کە هۆگریی تەواوی *خرۆستینی دلۆڤان* بۆ ئاگرافینای سەریار نیشان دەدات، تێکشکاوی و لاوازیی خرۆستینیش شرۆڤە دەکات، یانی خامۆشیی ناخ و ڕووداوی دیکەی ژیان وێنا دەکات کە پێشتر چەندان جار نووسەرانی قوتابخانەی ناتۆرالیزم[١] وێنایان کردووە. وەلێ

---

١. ناتۆرالیزم: سرووشتخوازی، سرووشتوازی، سرووشتەوگەری. ١. کرنەوە، حەز یان بیرێك کە تەنیا لە سەر ویست و غەریزەی سرووشتی دامەزراوە. ٢. ئامۆژەیەکی فەلسەفی کە دیاردەکان بە ژورە سرووشتی نازانێت و بە گوێرەی یاسا و کاردانەوەی سرووشتی لێکیان دەداتەوە. ٣.

دۆستۆیڤسـکی بـە خسـتنەڕووی مەسـەلەی دیالـەکتیك، دەرەقـەتی گێروگرفتی کەسایەتییەکان و کرۆکی هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ هاتووە کە لە سەرەتاوە ڕوون نین و لە قووڵایی بوونیدا شاردراونەتەوە. هەر ئەم پرسەیە کە وا دەکات بشێت *بێگانە* بە *سەربار* بەراورد بکەین. *کوزۆفکینی* تۆرگنێف، لەرزۆك و سووکایەتیپێکراوە، وەلێ *ئۆپیسکین* خۆی هەوڵ دەدات سووکایەتی بە هەموو کەسانی دەوروبەری بکات. کوزۆفکین، بە بۆنەی ورووژانی هەستی لووتبەرزییەوە، پێشنیاری *یێلتسکی* بۆ وەرگرتنی ئەو دە هەزارە ڕەد دەکاتەوە. *فۆما فۆمیچ ئۆپیسکین*یش ئەو پازدە هەزارە ڕەد دەکاتەوە کە *ڕۆستانێڤ* دەیداتێ، بەس هەستی لووتبەرزی تەنیا دەبێتە پاڵنەرێك بۆ سووکایەتیپێکردن و بچووککردنەوەی گەورەکەی.

بەم پێیە، نووسەر ئەگەری پەیوەندیی سێکسیی نێوان فۆما فۆمیچ و خانمی جەنەراڵ ڕەد دەکاتەوە. گەرچی لە سەرەتاوە دەکرێت گومانت بۆ وەها شتێك بچێت، وەلێ فۆما چاوی لەسەر *ناستینکا*یش نییە. دواجار فۆما ئەو پارەیە ڕەد دەکاتەوە کە سەرهەنگ بۆی پێشنیار دەکات. فۆما شوێن ئامانجێکی دیار و ئاگایانە ناکەوێت، بە پێی نەخشەی پێشووی ناجووڵێتەوە، بەڵکە بە پێی بینین و غەریزی هەنگاو دەنێت. ئەو بە گوتەی میزینچیکۆف، *بە جۆرێك لە جۆرەکان شاعیرە*...

---

ڕێبازێك کە لە هوونەر و وێژەدا، بە ڕوانینی زانستی بۆ ڕووداوەکانی ژیان، بەبێ ئاوڕدانەوە بۆ نموونەگەلی ئارمانی و خەیاڵی یان بە پارێز لە وتنەوەی ناحەزی. «و. ك»

دۆستۆیڤسکی بە جەختکردنەوە لەسەر ئەو هەڵسوکەوتانەی فۆما، کە ڕوونکردنەوەیەکی ئەقڵانییان نییە، بابەتی *یادداشتە ژێرزەمینییەکان*، کە بڕیار بوو چەند ساڵێك دواتر بنووسرێت، دەهێنێتە نێو *بێگانە*وە. وەلێ ئەوە *ڕۆزانۆف* بوو کە بۆ یەکەمین جار دەرکی بە لێکچوونی نێوان فۆما فۆمیچ ئۆپیسکین و پیاوی ژێرزەمینیی دووکەرت (پاڵەوانی ڕۆمانی *یادداشتە ژێرزەمینییەکان*) کرد و ئاماژەی پێ دا. دۆستۆیڤسکی هەوڵی سەرهەنگ ڕۆستانێڤ و خوشکەزاکەی بۆ شیکردنەوەی کەسایەتیی ئۆپیسکین، تەنیا لە ڕێی هەلومەرجی ژیانییەوە و ئەوەی کە ئەو خۆی پێشتر سەرکوت کراوە و دراوەتە بەر سووکایەتی، وەك هەوڵێکی چاکەویستانە و بەرز دەخاتە ڕوو کە بە هیچ شێوەیەك یارمەتیدەر نییە بۆ چارەکردنی پرسەکە. بۆچوونە ڕۆشنگەرانەکانی دۆستۆیڤسکی لە بارەی ڕۆڵی شوێنەوە لەسەر شێوەگرتی کەساتیی مرۆڤ، تیۆریی کارکردی ناتۆراڵەکانی دەیەی ٤٠ بیر دەهێنێتەوە. هەر لەبەر ئەمەشە کە سێرگی ئالێکساندرۆڤیچی گێڕەرەوە لە کۆتایی ڕۆمانی *بێگانە*دا، لە بارەی ئەوەی کە نابێت سووکایەتی بە کەوتووەکان بکرێت، بەڵکە بە پێچەوانەوە، پێویستە دەستیشیان بگیرێت و هەڵبستێنرێنەوە، دەدوێت و هاوکات شیعرێکی نیکراسۆف (ئەوسا کە لە تاریکیدا گومڕایت... ) دەڵێت و لەگەڵ خاڵەیدا باسی قوتابخانەی ناتۆراڵ دەکات. لێرانەدا هەست بەو ململانێ شاراوەیەی نێوان ئەو و بۆچوونەکانی بلینسکی دەکرێت، هەمان ئەو بۆچوونانەی کە تا ڕادەیەك لە دەیەی چلی گۆڤاری *سەردەم*دا ڕەنگیان دابووەوە.

ئـەم *تـارتۆڤـ*ـە ڕووسـییەی دۆستۆیڤسـکی، تـەنیا هـەڵگری ئـەم لایەنە زۆر و ئاڵۆزە ئەدەبیانە نییە. هەر بەو جۆرەی کە کرایفسکیش دوای خوێندنـەوەی *بێگانـه*، سـەرنجی خـۆی لەسـەر تایبەتمەندییـە دەروونییەکانی فۆما –کە بە ڕوونـی لـە گۆگۆڵی نیوەی دەیـەی ٤٠ی نزیك دەکرەوە– دەربڕی و بە دۆستۆیڤسکیی گوت کە فۆما، گۆگۆڵی لـە سـەردەمی خـەمۆکیی ژیانیـدا بـیر دەهێنێتـەوە. تینیـانۆفیش لـە گوتاری *لە بارەی تیۆریی پارۆدی*دا (١٩٢١) بـە تێروتەسـەڵی پرسـی گۆگـۆڵی وەك وێنـەی ڕێتێچـووی فۆمـا فـۆمیچ شـەنوکەو کـردووە. تینیـانۆف بـە شـێوەیەکی ڕێتێچـوو نیشـانی داوە کـە لـە *بێگانـه*دا، کتێبـی *بژاردەیـەك لـە نامـە بـۆ دۆسـتان*، بەرهـەمی گۆگـۆڵ و تـا ڕاددەیـەك تەنانـەت خـودی کەسـایەتیی نووسـەرەکەش دەدرێتـە بـەر گاڵتـە. ڕوواڵـەتی گۆگـۆڵ لـە سـاڵانی کۆتـایی ژیانیـدا، کەسـایەتی و خۆپەسـەندی و هەڵسوکەوتی لـە سیمای فۆمـادا ڕەنگـی داوەتـەوە و دووباره مانـا کراوەتـەوە. *مارکۆلیس*، لێکۆڵـەری ئـەمریکی، ئامـاژەی بە یەکێکی دی لەو وردەکارییانـە کـردووە کـە لێکچوونی نێـوان فۆمـا فـۆمیچ و گۆگـۆڵ دەخاتـە ڕوو. لـە وەرزی پێنجـەمی بەشـی دووەمـی *بێگانـه*دا، فۆمایـەك کـە دوای *وەدەرنـان* گەڕاوەتـەوە، داوای شـەرابی *مالاگا* دەکات، باخچییڤ دەڵێت:

مالاگاشـــی دەوێ! داوای شەرابێکیشـــی
کردووە کە هیچ کەس نایخواتەوە! ئـاخر
ئێستە بێ لە مرۆڤێکی چەپەڵی وەك ئەو
کـــــیێ مالاگـــــا دەخواتـــــــەوە؟

ئەم بەشە نزیکە لەگەڵ ئەوەی کە پانایێف لە بارەی گۆگۆڵ و نووسەرانی لاوی پترسبورگی لە ئەپارتمانی کۆماڕۆف، دەیگێڕێتەوە. دوای ئەوەی کە کتێبی یادگارییەکانی پانایێف لە ساڵی ۱۸٦۰دا بڵاو دەبێتەوە، مارگۆلیس وای بۆ دەچێت کە دۆستۆیڤسکی خۆی لەو دیدارانە لەگەڵ گۆگۆڵدا -کە پانایێف وەسفی دەکات- ئامادە بووە. وەڵێ ئەم بۆچوونە بە هیچ بەڵگەیەکی دیکە پشتڕاست ناکرێتەوە. دەشێت دۆستۆیڤسکی، خۆی لەم دیدارانەدا نەبووبێت، بەس بەسەرهاتەکەی لە کەسانێکەوە بیستبێت کە لەوێ بوونە.

پێویستە سەرنج لەوە بدرێت کە سەروەختی کارکردن لەسەر *بێگانە*، کۆمەڵێك یادەوەری لە بارەی نیکۆلای گۆگۆڵ و هەروەها نامەکانی لە بەردەستی دۆستۆیڤسکیدا بوون (*تەقەللایەك لە بیۆگرافیای گۆگۆڵ* لە ساڵی ۱۸٥٤ و *کۆبەرهەم* و *نامەکانی گۆگۆڵ* بە پاکنووسکردنی کۆلشین لە ۱۸٥٦-٥۷دا بڵاو کرابوونەوە). دۆستۆیڤسکی هەر لە هەرەتی لاویدا، دیدێکی نەرێنیانەی لەمەڕ بەرهەمی *بژاردەیەك لە نامە بۆ دۆستانی گۆگۆڵ* هەبوو. لە ساڵی ۱۸٤۷دا -هەر بەو جۆرەی کە دەزانین- ئەو بایەخی کتێبەکەی بە پێی ڕای خوێندنەوەی بازنەی گرووپی پیتراشێفسکی هەڵدەسەنگاند و ئەم پێوەرەش بلینسکی دایناوبوو. هەر لەبەر ئەمەش دۆستۆیڤسکی دوو جار ئەو نامە بەناوبانگەی بلینسکی بۆ گۆگۆڵی لە کۆڕەکاندا، بە ئامادەگیی پیتراشێفسکی و دۆرۆف خوێندەوە. لە دەیەی ٥۰دا، کاتێك دۆستۆیڤسکی بە شێوەیەکی بنەڕەتی بە

بۆچوونەکانی خۆیدا چووبووەوە، دوای ئەوەش، هەر وا بۆچوونە نەرێنییەکی بەرانبەر بەم بەرهەمەی گۆگۆڵ بە پتەوی مایەوە. ئەو ئاماژانە کە لە *نامەکان* و ڕۆمانی *شەیتانەکان*دا بە *گۆڵبژێرێك لە نامە بۆ دۆستان* کراوە، هەمووان گاڵجاڕ و لێدەرانەن. هەر بەو جۆرەی کە بە ڕەشنووسەکانی ڕۆمانی *هەرزەکار*دا دیارە، دۆستۆیڤسکی نموونەی مرۆڤی ڕووسیی سەردەمی خۆی –بە هەمان ئەو ڕۆحە دووپارچەیەی کە تایبەتمەندیی ئەوە و لە ژێرزەمینی شیرکارییە دەروونییەکاندا شاردراوەتەوە– لە گۆگۆڵدا بەدی کردووە. بە بڕوای دۆستۆیڤسکی، لە *بژاردەیەك لە نامە بۆ دۆستان*دا، بەو جۆشوخرۆشە بێهیوایانەیەوە، جاروبار شتێك لە تراژیدیبوونیش دێتە بەرچاو. دۆستۆیڤسکی، گۆگۆڵی بە بۆنەی نەبوونی ڕاستگۆیی لە هەڵسوکەوتیدا سەرکۆنە دەکات، لەبەر ئەوە لۆمەی دەکات کە لە نووسینی وەسیەتنامەکەیدا درۆی کردووە، هەڵیتوپەڵیتی گوتووە و قسەی بێمانای فڕێداوە.

دۆستۆیڤسکی لە *بێگانە*دا، گوتە سیاسی و ئەخلاقییەکانی نووسەری *بژاردەیەك لە نامە بۆ دۆستان*ی داشۆریون. هەروەها لە زۆربەی قسەکانی فۆما فۆمیچدا، بە گاڵتەجاڕییەوە لاسایی شێوازی ئەم کتێبە کراوەتەوە. وەلێ بێ گومان نابێت تەنیا بە لاساییکردنەوەیەکی گاڵتەجاڕانەی گۆگۆڵ لە سیمای فۆما فۆمیچ بگەین. لە بنەڕەتدا، ئەم ڕووخسارە، بریتییە لە کۆمەڵێك تایبەتمەندیی دیاری زۆرێك لە ئینسانە ڕاستەقینەکان. وەلێ مانای لەوە زیاتریش دەگەیەنێت: ئافراندنی ئەم جۆرە سیمایە، کە وەها

دیاردەگەلێکی دەروونی مرۆڤایەتی نۆژەن بکاتەوە، دەستکەوتێکی گەورەیە بۆ نووسەر، چونکە تا بەر لە دۆستۆیڤسکی ئەم جۆرە دیاردانە نەناسراو بوون. دۆستۆیڤسکی بە شێوازێکی نوێ هۆکاری زاڵبوونی فۆما لە ماڵی ڕۆستانێڤدا شەنوکەو دەکات. ئۆپیسکین، ڕۆڵی جۆرە ئایدۆلۆژیا، قووتبێکی دەسەڵاتی ئەخلاقی و ڕۆشنبیری و جەنگاوەرێکی دژی نادادپەروەری، کە *لەسەر بەرگریکردن لە مەق و مەقیقەت بە تەواوی ئازار و ئەشکەنجە دراوە*، دەگێڕێت. وەها ڕۆڵێك، بەو جۆرەی کە دۆستۆیڤسکی وێنای کردووە، لە هەلومەرجی دیاردا، یارمەتیدەرە بۆ هاتنە ئارای دەسەڵاتێکی نکۆڵیلێنەکراو. ئەم تایبەتمەندییەی ژیانی ڕووسیا، یان با باشتر بڵێم، *دیاردەی ئۆپیسکین*، لە ئەدەبیاتی ڕووسیدا —لە ڕۆمانی *ڕۆدین*ی تورگنێفەوە تا *خاڵی ڤانیا*ی چیخۆف— ڕەنگی داوەتەوە.

*بێگانە* لەسەر بنەمای دژبەریی دوو کەسایەتیی، بە بۆچوونی نووسەر، نەریتی ئۆپیسکین و ڕۆستانێڤ بنیاد نراوە. لە ڕاستیدا، هەر کامێکیان بەشێکن لە تەواوکاریی ناوەڕۆکی تەوەرەیی بەرهەمەکەی دۆستۆیڤسکی. ئەو تایبەتمەندییانەی کە لە زۆربەی پاڵەوانانی سەرەتای کاری نووسەردا ڕەنگیان دابووەوە (وەك *گۆلیادکین و پالزۆنکۆڤی ئاودار و نێفیمافی ژەنیاری نێو بەرهەمی نیەتۆچکا*)، لە ڕووخساری فۆمادا بە شێوەیەکی کامڵتر دەرکەوتوونەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، سیمای ئۆپیسکین، بەراورد بە هاوگوتەکانی خۆی لە بەرهەمەکانی داهاتووی دۆستۆیڤسکیدا، لە ئاستێکی بەرزتردایە. فۆما ئۆپیسکین بە هەردایەك، بە پاڵەوانی

*یادداشتە زێرزەمینییەکان* و هەروەها دوای ئەوەش بە کەسایەتییە هاوگوتانەکانی و خودی فیۆدۆر کارامازۆفەوە گرێ دراوە. وەلێ سەرهەنگ ڕۆستانێف یەکەمین سکێچی دۆسۆیڤسکییە بۆ مرۆڤێکی بەرز، کەسێك کە دواتر تایبەتمەندییەکانی تا ڕاددەیەك لە شازادە میشکین و تا جێیەکیش لە باوکی *زۆسیما*دا (کرۆکی گوناهکاریی مرۆڤایەتی لەبەرانبەر هەموو خەڵکی) کامل بوو. ژمارەیەك لە کەسایەتییە لاوەکییەکانی ڕۆمانەکەش لە بەرهەمەکانی دۆستۆیڤسیدا هەراش بوونە، بۆ وێنە، *یێژۆیکین*، *لێبیدۆیف*ی نێو ڕۆمانی *گەمژە* و سەروان *سێنگریف*ی برایانی کارامازۆف بیر دەهێنێتەوە. دەکرێت ڤیدۆپلیاسۆڤ بە باوانی *سێمردیاکۆڤ* بزانین. بەشێك لە تایبەتمەندییەکانی *تاتیانا ئەیڤانۆڤنا*ی نیوەشێتیش بە شێوەیەکی ئاڵۆزتر لە پووخساری *لیبیاتکین*ی ڕۆمانی *شەیتانەکان*دا دوبارە ئافرێنراونەتەوە.

ئەو شێوازە هوونەرییە تازەیەی کە بە زۆری لە کارەکانی دواتری دۆستۆیڤسکیدا بەرچاو دەکەوێت، لە *بێگانە*شدا بە کار براوە: ڕووداوگەلی زۆر کە بەردەوام ڕوو دەدەن، گفتوگۆی تێروتەسەلی پڕ لە جۆشوخرۆش، بەسەرهاتی لێوڕێژ لە دراماتیزم و... هێندە زۆرن کە لەنێو کات و شوێندا گوشراون. ئەم بابەتە مۆڵەتی دایە بەشێك لە ڕەخنەگران کە وای لێك بدەنەوە ئەم ڕۆمانە لە کۆمیدیایەکەوە سەرچاوەی گرتووە. وەلێ هەر ئەم دراماتیزمە، تایبەتمەندیی زۆربەی بەرهەمەکانی دواتری دۆستۆیڤسکیە. ئەو لە *بێگانە*دا، بە شێوەیەکی بەربلاو سوود لە فرەدەنگی و هەراوزەنای چاوەڕواننەکرا و

کاردانەوەی کتوپڕانە (بۆ نموونە لە وەرزەکانی پێنژۆیکین، فۆما فۆمیچ، شوێنهەڵکردن و وەدەرنان) وەردەگرێت. ڕێچارەی دۆستۆیڤسکی، کە *لیانید گرۆسمان* بە کۆڕی کەرنەڤاڵەکان یان بە *کۆتایی لێکۆڵەر* ناوی دەبات، لە زۆربەی بەرهەمەکانی ئەودا، لە خەونی مامە گیان بەدواوە، بە ڕوونی دەبینرێت. میخائیل باختین ئاماژە دەکات کە لە *بێگانە*دا هەستی فانتازیای ژیان، کە تایبەتە بە دۆستۆیڤسکییەوە، دیارە، هەمان ئەو شتەی کە نوێنەری کەرنەڤاڵە لە بەرهەمی ئەودا. ژیان لەم ڕۆمانەدا، بە جۆرێك لە جۆرەکان دونیایەکی ئاوەژووە. کەسایەتیی فۆما فۆمیچ –کە لەگەڵ سەرهەنگ ڕۆستانێڤدا لە دژبەریی کەرنەڤاڵدایە– بە شێوەیەکی تایبەتی بە کەرنەڤاڵ کراوە. دۆستۆیڤسکی لە زمانی فۆما ئۆپیسکینەوە، کۆمەڵە لاساییکرنەوەیەکی گاڵتەجاڕانەی شێوازگەلی جیاوازی ئەدەبی دەخاتە ڕوو و بەم پێیە، لەگەڵ بەسەرهاتە ئەدەبییەکانی سەردەمی خۆیدا (*بژاردەیەك لە نامە بۆ دۆستانی گۆگۆڵ*، وەك دەڵێن *پەندنامەکان* و کتێبگەلی جیاوازی *بۆ خەڵکی* و هاوشێوەی ئەوان) ململانێ دەکات. دۆستۆیڤسکی هاوکات لەگەڵ کارکردن لەسەر ئەم بەرهەمە، سوودی لەو وانە زمانەوانیانە وەرگرت کە لە ساڵانی دەستبەسەری و خزمەتی سەربازیدا ئەزموونی کردبوون و لە بەرهەمێکدا بە ناوی *دەفتەری سیبریا*وە کۆی کردبوونەوە. زۆرێك لە بابەتەکانی ئەم دەفتەرە، لە *بێگانە*دا خراونەتە بەر باس.

*بێگانە* سیخناخە لە ململانێی شاراوە و ئاشکرای ئەدەبی. ئەم بەرهەمە، بابەتی ئەدەبیاتی دەیەی ٥٠ (*تیۆفیاك* بەرهەمی

پیسێمسکی، شعرێکی *کۆزما پرۆتکۆف* بە ناونیشانی *گەمارۆدانی پامبا*، گوتاری *ئافاناسێیف* بە ناونیشانی *مانای نەتەوەیی ئایینیی کەوێلی سلاڤییەکان* و...) دەورووژێنێت و هەروەها لە ئاستێکی بەرزتردا ڕووداوەکانی سالانی ڕابردوو دەداتە بەر تیشکی ڕەخنە، ڕووداوگەلێك کە لەوانەیە ئیدی لە سەروەختی نووسینی ئەم بەرهەمەدا سپێردرابنە دەستی مێژوو، وەلێ هێشتا لای دۆستۆیڤسکی شیاوی لێدوان و گرنگیپێدان بوون (گۆگۆڵ، قوتابخانەی ناتۆرال، *گێڕانەوە ڕووسییەکانیەکانی* ئادۆیفسکی و زابلۆتسکی-دیسیتۆڤسکی، بەرهەمەکانی کارامزین و زۆر کەسانی دیکەش).

دۆستۆیڤسکی زۆر لە خەمی چارەنووسی *بێگانە*دا بوو و بەردەوام لە نامەکانیدا داوا لە برا گەورەکەی، میخائیل دەکات کە لە بارەی ڕۆمانەکەیەوە هەرچی دەڵێن، بێ کەموکوڕی لە یادگەی خۆیدا گلی بداتەوە و دواتر بیگەیێنێتە ئەو، چونکە ئەمە *دەنگی ڕەنخنەی داماتووە*. ئەو سەردەمەی کە میخائیل دۆستۆیڤسکی لەگەڵ نیکراسۆفدا خەریکی گفتوگۆ بوو، فیۆدۆر لەوی ویستبوو:

> سەرنج بخەرە سەر هەموو وردەکاریی یەك بە یەکی وشەکانی ئەو، جا بۆ خاتری خوا، داوات لێ دەکەم سەرلەبەری ئەم وردەکارییانەم بۆ بنووسیت. ئاخر بۆ من زۆر گرنگن.

نیکراسۆف بە شایەتیی کاڤالییێفسکی، ئێجگار خۆپارێزانە لەم ڕۆمانە دوا.

> دۆستۆیڤسکی هەموو قسەکانیی کردن و ئیدی پێویست ناکا یەك وشەی دیکە بنووسێت.

نیکراسۆف بڕیاری خۆی لەسەر دابوو. جا هەر هەمان گۆڤاری *سەردەم* ماوەیەك دواتر نووسیی:

> نیکراسۆف، بە شێوەیەکی خراپ و بێ هیچ سەرنجدانێك، تووشی هەڵەیەکی گەورە بوو. دۆستۆیڤسکیش لە وەڵامی ئەودا، *یادگارییەکانی یانەی مردووان* و *تاوان و سزای* نووسی، تا لەوە زیاتری نیشان بدات.

پێشوازیی نیکراسۆف لە ڕۆمانی *بێگانە* شتێکی نائاسایی نەبوو. ئەم ڕۆمانە بە گشتی بەختێکی وای نەبوو و چاپکردنی ئەو لە *یادداشتە نیشتمانییەکان*دا دەنگدانەوەیەکی وای لێ نەکەوتەوە. ئەوەی کە ماوەتەوە، تەنیا چەند ڕاوبۆچوونێکی نێو نامە تایبەتییەکانە.

*پلیشسێیف* لە نامەیەکدا بۆ *میلیۆکۆڤ*، لە دەی دیسێمبەری ١٨٥٩دا، نووسیی کە ڕمانەکەی دۆستۆیڤسکیی هیچ بە دڵ نەبووە.

> ئەی کوان ئەو نموونە گۆگۆڵیانەی کە میخائیل میخائیلۆڤیچ «دۆستۆیڤسکی» بەڵێنیانی پێ دابووم؟ بۆ لە بەرهەمەکەدا بێ لە سەرهەنگ ڕۆستانێڤ (خاڵە گیان) هیچ ڕووخسارێکی زیندوو بەرچاو ناکەوێت؟ سەرانسەری ئەم دەقە، دەستکرد، درۆیینە و بە شێوەیەکی تۆقێنەر زیادەڕۆیانەیە.

دەکرێت ژمارەیەکی زۆر لەو ڕاوبۆچوونانەش وەربگرین کە میخائیل دۆستۆیڤسکی لە نامەکانیدا بۆ براکەی نووسیون.

> *مایکۆڤ* زۆر ڕۆمانەکەی بە دڵ بووە. (نامەی میخائیل دۆستۆیڤسکی، لە ١١ ئۆکتۆبەری ١٨٥٩دا).

میخائیل دۆستۆیڤسکی لە نامەیەکی دیکەدا بۆچوونی *کانچارۆف*، لە زمانی کەسانی دیکەوە دەردەبڕێت:

> دەڵێن بە خوازە تاریفی ڕمانەکەی داوە،
> جا نازانم چۆن و بە چ جۆرە خوازەیەك
> (نامەی ٢٣ی نۆڤێمبەری ١٨٥٩).

پلیشییێڤ، کە بە تکای دۆستۆیڤسکی، دوای ئەوەی چاپخانەی پەیکی *ڕووسی* ڕۆمانەکەی ڕەد کردەوە، بۆچوونی چاپخانەکەی لە بارەی بەرهەمەکەوە پرسی، جا هەواڵی بۆ نارد:

> ئەوان هەر لە سەرەتاوە کرەیان دەکرد[1]، وەڵێ دەیانگوت پێویستە ڕۆمانەکە بە تەواوی کورت بکرێتەوە.

نامەی میخائیل دۆستۆیڤسکی لە ٢١ی ئۆکتۆبەری ١٨٥٩دا، لە بۆچوونی کرایفسکی لە بارەی ڕۆمانی *بێگانە*وە ئاگادارمان دەکاتەوە:

> ئەو لە بارەی ڕۆمانەکەوە گوتی هەندێك بەشی بێوێنەن، فۆمای زۆر بەدڵ بوو، کەیفی بە کەسایەتییەکانی دیکەش هات. بە تایبەت قسەی لەسەر وێنەی کچی مۆڵکدارەکە کرد. گوتی ئەمە بەرهەمێکی بێوێنەیە. هەروەها، کۆتایی ڕۆمان و هەموو بەشی دووەمی نایابە (کە هەڵبەتە

[1]. کرەکردن: حەز و تاسەی زۆر بۆ شتێك. کرەیان دەکرد: خواخوایان بوو.

> منیش بۆچوونم هەر وایە). وەلێ دەستپێکی ڕۆمانەکە درێژدادڕیی تێدایە، بە شێوەیەکی گشتی، حەیفە تۆ هەندێك جار دەکەویتە ژێر کاریگەریی تەنزەوە و حەز دەکەیت خەڵکی بخەیتە پێکەنین. کرایێفسکی ئەوەشی گوت کە دەسەڵاتی فیۆدۆر میخائیلۆڤیچ لە جۆش و خرۆشدایە و دەکرێت لەم بارەیەوە بڵێین ڕکابەری نییە، وەلێ چ حەیفە کە ئەو لە بەرانبەر ئەم بەهرەیەیدا ئاوها کەمتەرخەمە.

ئەرێنیترین ئەو بۆچوونانەی کە لە بارەی *بێگانە*وە گەیشتوونەتە ئێمە، هی خودی میخائیل دۆستۆیڤسکین.

> هێندە دڵم بە بەرهەکەت خۆشە کە نازانم چۆن بۆتی دەربڕم. کاتێك بەشی دووەمیم خوێندەوە، جۆرە هەستێکی شادمانی بەردەوام چاومی پڕ لە فرمێسك دەکرد. وەلێ ئەوەی کە زیاتر لە هەر شتێك دەینرخێنم، ئەوەیە کە کارەکەت، هەم لە گشت و هەم لە بچووکترین وردەکارییدا، بە تەواوی ڕەسەنە.

دوای ئەوەی کتێبەکە لە ساڵی ١٨٦٠ لە بەرگی دووەمی کۆبەرهەمی دۆستۆیڤسکیدا چاپ کرایەوە، ڕەخنەی تازە لەسەر *بێگانە* بڵاو کرایەوە. هەڵبەتە هەموو ئەو ڕەخنانە لەنێو ئەو گوتارانەدا هاتبوون کە دەپەرژانە سەر بەرهەمەکانی دۆستۆیڤسکی.

بابەتیترین بۆچوون لە لایەن دابرالیۆبۆفەوە و لە گوتاری *خەڵکی ستەمدیدە* (١٨٦١)دایە. ئەو لەو گوتارەدا چەندین جار ئاماژە بە بێگانە دەکات، لە پەیوەندیی نێوان ئەم کتێبە و بەرهەمەکانی دیکەی دۆستۆیڤسکی دەکۆڵێتەوە. بەرهەمگەلێك کە پەرژاونەتە سەر بابەتی کەسایەتیی سووکایەتیپێکراو لە لایەن کۆمەڵگە و ململانێی ئەم کەسایەتییەی کە دژەسووکایەتییە. دابرالیۆبۆف دەنووسێت:

> هەر لە گۆلیادیکنی *هاوزاوە* تا *فۆما فۆمیچی بێگانە*، دۆستۆیڤسکی توانیویەتی زۆرێك لە دیاردە ئەخلاقییەکان و نەخۆشیی سەردەمەکەی بخاتە ڕوو.

تەنیا لە دەیەی ٨٠ و دوای ناوبانگی دۆستۆیڤسکی و تایبەتمەندیی کارەکانی ١٨٦٠-١٨٧٠ ئەو بوو کە ڕەخنەگران پێگەی *بێگانە* و لە سەرووی ئەوەشەوە ئافراندنی کەسایەتیی فۆما ئۆپیسکینیان لە ڕۆمانەکەدا نرخاند. یەکەمین کەسێکیش کە لەم ڕێیەدا هەنگاوی نا، *میخائیلۆفسکی* بوو. ئەو لە گوتاری *بلیمەتی دڵڕەق*دا، کە ڕێك ساڵێك دوای مردنی دۆستۆیڤسکی بڵاو کرایەوە، دانی پێدا نا کە فۆما ئۆپیسکین، لەنێو نموونە دەروونشیکارانەکانی دۆستۆیڤسکیدا، نموونەیەکی کلاسیکییە، ئەو شەڕانی، ستەمکار و

ئەشکەنجەدەرێکە، کە بەدوای هیچ ئامانجێکی کردەییدا هەنگاوی نەناوە و هەوڵ بۆ هیچ ئەنجامێکی دیاریکراو نادات. ئەو چێژ لەم *ڕەوتی ئەشکەنجەدان*ە دەبات، هەر ئەم پرسە *ناپێویستە*یە کە بۆ ئەو پێویست دەنوێنێت. بە کورتی، *شەڕەنگێزیی بێ ئامانج*، کەمتازۆر تەواوی ڕووخساری ئەخلاقیی فۆما دەتەنێتەوە و ئەگەر خۆپەرستیی بێڕادە و هاوکات بێماناشی بۆ زیاد بکەین، دەتوانین بڵێین فۆما ئۆپیسکین تەواو و بێخەوشە.

*بێگانە* بۆ بردنە سەر سەکۆی نمایش، چەندان جار ئافرێندراوەتەوە[1]. *کانستانتین ستانیس لافسکی* لە ساڵی ١٨٩١دا یەکەمین نمایشی ئەوی بەڕێوە برد. *بێگانە* لەوساوە تا ئێستە، چەندان جار لە ڕووسیا و وڵاتانی دیکەدا براوەتە سەر سەکۆ و زیادترین پێشوازییەك کە لێی کرابێت، لە هۆڵی شانۆی هوونەریی مۆسکۆ و ساڵی ١٩١٧دا بوو. لەنێو ئەو باشترین نمایشکارانەی کە لە پێشکەشکردنی نمایشی *بێگانە*دا ڕۆڵیان هەبووە، دەتوانین ئاماژە بە خودی ستانیس لافسکی (ڕۆڵی ڕۆستانێڤ) لە نمایشی ساڵی ١٨٩١دا و *ماسکڤین* (ڕۆڵی ئۆپیسکین) لە نمایشی ١٩١٧دا بکەین. لە ساڵی ١٩٧٠ و دوای چەندین ساڵ بێدەنگی، نمایشێکی تازەی *بێگانە* لە هۆڵی گۆرکی برایە سەر سەکۆ و *ئالێکسێی گریبۆف* لە ڕۆڵی فۆمادا دەرکەوت. لە ساڵی ١٩٨٩دا، *لیف تسۆتسۆل کۆفسکی* نمایشێکی *بێگانە*ی بۆ تەلەفزیۆنی شووڕەوی ئامادە کرد کە *لیف دۆرۆف* تێیدا ڕۆڵی فۆمای دەگێڕا. هەروەها لە ساڵی

---

١. «ئافراندنەوە»م لە بەرانبەر «بازآفرینی»ی فارسیدا بەکار هێناوە، واتای دەستکاریکردن و دووبارە ئافراندنەوەی بەرهەمێك بە مەبەستی بردنە سەر سەکۆی نمایش.

١٩٩٥دا، بە نۆرە لە هۆڵی شانۆی مۆس-ساویت، نمایيشێك بە ناونیشانی *فۆما ئۆپیسکین* دەچێتە سەر سەکۆ کە *سێرگی یۆرسکی* ڕۆڵی سەرەکیی تێدا دەگێڕێت. هەروا لە ساڵی ١٩٩٦دا، لە هۆڵی نمایيشی گەورەی دراماتیکی *تافس تاناگۆف*، نمایيشێك بە ناوی *خەڵکانی بەرزەفڕ*-کە لەم ڕۆمانەی دۆستۆیفسکییەوە ئافرێنراوەتەوە- چووە سەر سەکۆ کە *یۆگێنی لێبیدیف*ی ناودار، تێیدا ڕۆڵی فۆمای گێڕا.

[1]بێگانە، دواهەمین بەرهەمی دۆستۆیفسکییە کە لە کاتی شەنوکەوکردنیدا ناوی گۆگۆڵ دەبەین. بە بوێرییەوە دەتوانین بڵێین لەگەڵ نووسەرانی ئەم بەرهەمەدا، دەسەڵات و شوێنپێی دیاری گۆگۆڵ لە بەرهەمی دۆستۆیفسکیدا دەسڕێتەوە و کۆتایی پێ دێت. وەك چۆن *فۆما فۆمیچ* لە *بێگانە*دا هێمای زەبرە، بە هەمان شێوەش *پلیۆشکین* لە *حەشاماتی مردوو*[2]دا هێمایە بۆ پیسی و چەپەڵی و ستەم. لەگەڵ ئەو جیاوازییەی کە لە بوونی پلیۆشکیندا ڕووخۆشییەکی کاریکاتێریانە دەبینین، ئەمەش لە بارێکدا کە *فۆما فۆمیچ* بوونەوەرێکی دێوئاسا وەلێ ڕاستەقینەیە. گۆگۆڵ بەردەوام دەستەنقەست کۆمیدی و تەنزنووسە، وەلێ دۆستۆیفسکی نمایيشنامەنووسێکی ڕووتاڵ و مۆنە.

---

١. بەشێك لە شرۆڤەکەی ستانیسلاڤ ماکسکێلیچ.

١. حەشاماتی مردوو یان ڕۆحە مردووەکان: یەکێکە لە شاکارە ڕووسییە دووبەرگییەکان کە نووسەر (نیکۆلای گۆگۆڵ)، دەستنووسی بەرگی دووەمی دەسووتێنێت و بە ناتەواوی دەمێنێتەوە. «و. ك»

ناوەڕۆکی کتێبەکە ئازار و مەینەتییەکە، کە ستەمکاری دڵڕەق بەرانبەر بە هەر کەسێکی ڕەوا دەبینێت، هەڵسوکەوتێك کە لە ئازار و مەینەتیی دەروونی خودەوە سەرچاوە دەگرێت. بێ گومان ئەمە، دڵڕەقانەترین کتێبی دۆستۆیڤسکییە لەنێو هەموو دڵڕەقییەکانیدا، خوێندنەوەی ئەم کتێبە ئازاردەر، هەراسان و وەڕەزکەرە. تەماشاکردنی بەردەوامی هەوەسبازییەکانی مرۆڤێکی چەپەڵە لەژێر زەرەبینێکدا، ڕێك وەکو خستنە ژێر زەرەبینی جاڵجاڵۆکەیەك و گەورەکردنی ئەو تا ئەندازەی سەگێکی زل و گەورەترکردنی وێنەکەی بە ڕادەیەك، کە سەرانسەری دیوارێك داپۆشێت. ئەمە کتێبی هێما گەورەکانە، شتێکی هاوشێوەی *میتەرلینگ*[1]، وەك *ئیبسن*[2]، کە هاوکات بە واقیبینییە زیادەڕۆییانەکەی پەستمان دەکات. لایەنە باشەکانی ئەم کتێبە، هەمان لایەنە خراپەکانی ئەون. نیگارکێشێك بێننە بەرچاوتان بە شێوازێکی هێندە ڕاستەقینانە وێنەی ئاگر بکێشێت کە دەست و ڕووخسارمانی پێوە بسووتێنێت. ئێمە بێ گومان لەبەردەم بێگاناندا هەستی ناڕەحەتی و دەسەپاچەیی سەرچاوەگرتوو لە هەڵسوکەوتی ناشیانەی خۆمانمان

---

٢. میتەرلینگ (١٨٦٢–١٩٤٩) شانۆنامەنووسێکی بەلجیکییە. یەکێك لەو نووسەرانەی کە لەژێر کاریگەریی کەسایەتییەکانی سەر بە قوتابخانەی سەمبوولیسزم «هێماخوازی»دا بووە و، لە ساڵی ١٩١١دا خەڵاتی ئەدەبیی نۆبڵی وەرگرتووە. «باڵندەی کەوە» یەکێکە لە شانۆنامە بەناوبانگەکانی کە هاوکات، بە شاکاری ئەو دادەنرێت و دوای بڵاوبوونەوەی، لە ماوەیەکی کەمدا بۆ چەندین زمان وەرگێڕراوە. «و. ك»

١. هێنریك جۆهان ئیبسن (١٨٢٨–١٩٠٦)، شاعیر و شانۆنامەنووسێکی نەرویجییە. ئەو، بە یەکێك لە کۆڵەکەکانی ئەدەبیاتی ئەورووپا دادەنرێت و بە هاوسەنگی شەکسپیر و سۆفکل دێتە ئەژمار کە، کۆمەڵێك بەرهەمی بەناوبانگی وەك «کۆمیدیای عەشق»، «ماڵی بووکەشووشە»، «ئارامگەی شەڕڤان»، «دژمنی خەڵك» و «تارماییەکان»ی لێ بەجێ ماون. «و. ك»

ئەزموون کردووە، یان ڕەنگە زۆر چاومان بە دیمەنی تەریقبوونەوە و بێتاقەتبوونی کەسانێك کەوتبێت کە هۆکارەکەی ئەوە بووە، کەسێك لەبەردەم خەڵکیدا هەڵسوکەوتێکی دزێوی لەبەرانبەر نواندوون. دۆستۆیڤسکی ئەم هەستی تەریقبوونەوە و ئازارچەشتنەی لەنێو کۆڕ و لە بەرچاوی بێگاناندا بە چەشنێك لە ڕۆمانی بێگانەدا شیکار کردووە و هێندەی گەورە و زەق کردووەتە و بە جۆرێك گۆڕیویەتی بۆ ئازار و ئەشکەنجەیەکی کاری، کە هەر بە ڕاستی خوێنەر پێی بێتاقەت دەبێت. ئەو کەسایەتییەی کە چیرۆکی ڕۆمانەکە لەگەڵ ئەودا دەست پێدەکات، کاتێك لە موڵکی خاڵەیدا تووشی هەڵەگەلی یەك لەدوای یەك دەبێت، وەختێك ئامادەبووانی نێو هۆڵەکە لەبەرانبەر ئەو هەڵانەدا کاردانەوە دەنوێنن، خوێنەر هەست بە ئەشکەنجە دەکات. وەلێ ئەمە تەنیا دەستپێکێکە بۆ ئازارەکانی دی. تەواوی ئەم ئازارانە، لە دیدگەی دۆستۆیڤسکییەوە، کۆمەڵێك ئازاری ئەخلاقین. دۆستۆیڤسکی بایەخێکی وا بە ئازاری جەستەیی، یان برینەکانی لەش و نەخۆشییەکان نادات، ئەو تەنیا ئەشکەنجەی ئەخلاقی لە بەرچاو دەگرێت. لە بەرهەمەکانی دۆستۆیڤسکیدا، هەمیشە ئازاری ئینسان، بەرئەنجامی کردەوەکانی خۆیەتی نەك هیچ شتێکی دی.

**هەڵەبجەی شەهید**

**٢٠١٨/١٢/٢٠**

# وەرزی یەکەم

## دەستپێك

خاڵی من «سەرهەنگ ئیگۆر ئیلیچ پۆستانێڤ» دوای خانەنشینبوونی، گواستیەوە بۆ گوندی *ستێپانچیکۆڤۆ* کە بە میرات بۆی مابووەوە، جا بە چەشنێك خووی بە ژیانی ئەوێوە گرت، وەك بڵێیت لە تەواوی ژیانیدا موڵکدارێکی ڕەسەنی ئەوێ بووە و بە هەموو تەمەنی تەنانەت پێشی نەناوەتە ئەودیو زەوی و زارەکەیەوە. لە دونیادا سرووشتگەلێکی نەرم و ملکەچ بوونیان هەیە و سەرهەنگی خانەنشینیش سروشتێکی لەو جۆرەی هەبوو. ڕێی تێناچێ بتوانیت کەسێك وێنا بکەیت کە وەکو ئەو هێمن و سەبارەت بە هەر بابەتێك هاوڕا بێت. لام وایە گەر بە خەیاڵتدا بهاتبا کە داوای لێ بکەیت کەسێك بە کۆڵیەوە بگرێت و هەر بە ڕاستی بۆ مەودای دوو وێرستاییێك[1] بیگرێت، ئەو لەبەرانبەردا هیچ لاریەکی نەدەنوواند و داواکەی بەجێ دەهێنا! بە کورتییەکەی، مرۆڤێکی هێندە فەقیرحاڵ

---

١. وێرستا: یەکەی پێوانە لە ڕووسیای کۆن، کە لە سەردەمی نووسینی ڕۆمانەکەدا، کەمتازۆر هاوتای کیلۆمەترێك بووە. «و. ف»

بوو کە هەر لە یەکەمین داواکردندا، ئامادەبوو بێ درێغیکردن هەموو شتێکی خۆی ببەخشێتەوە و تاکە کراسەکەی بەری بداتە یەکەمین ڕەشوڕووتێك کە لەسەر ڕێگەکەی قووت دەبووەوە. ڕووالەتی لە هی پاڵەوانەکان دەچوو، بالآبەرز و کەڵەگەت، ددانی سپی وەك عاج، سمێڵی درێژ و گەنمڕەنگ، دەنگێکی ساف و پێکەنینێکی زایەڵەدار، ڕاستەقینە و بەنەڕەی هەبوو و، پەلەپەل و پچڕ پچڕ قسەی دەکرد. لەو سەردەمەدا ئیدی تەمەنی چل ساڵ بوو و هەر لە شازدە ساڵییەوە تەمەنی خۆی لە خزمەتی سوپای سوارەی چەکداردا بەڕێ کردبوو. هەر لە تافی هەرزەکاریدا زەماوەندی کردبوو و زیاد لە ڕادە هاوسەرەکەی خۆش دەویست، وەلێ دواتر ژنەکەی کۆچی دوایی کرد و لە دڵی ئەودا، بۆ تاهەتا یادگارییەکی نەسڕاوە و شیرینی جێهێشت.

دواجاریش هەرکە لادێی ستێپانچیکۆڤۆ و شەشسەد ڕەعیەتی سەر بە ئەوی بە میرات پێ بڕا، خێرا وازی لە سووپا هێنا و هەر بەو جۆرەی کە باس کرا، لەگەڵ منداڵەکانی –کوڕەکەی، ئالیۆشای هەشت ساڵە (کە لەدایکبوونی بە بەهای مەرگی دایکی تەواو بوو)، هەروەها کچەکەی، شاسینکای پازدە ساڵان (کە پاش مردنی دایکی لە مۆسکۆ و لە پانسیۆنێکدا[1] دەژیا) – گواستیەوە و لەو گوندەدا نیشتەجێ بوو. وەلێ دوای تێپەڕینی ماوەیەکی کەم، ماڵی خاڵەم بووە کەشتیی نوح!

---

١. پانسیۆن: شوێنی بە کرێ بۆ مانەوە، کە نان و چا و خزمەتگوزاریشی تێدا دابینە. وشەکە فەرەنسییە.

بەسەرهاتەکە بەم جۆرە بوو: ئەو سەردەمەی کە خاڵم میراتەکەی خۆی وەرگرت و خانەنشین بوو، دایکی، کە پاش مردنی مێردی یەکەمی لە شازدە ساڵ لەوەوبەر بێوەژن کەوتبوو، هەمدیس لەگەڵ جەنەراڵێکدا بە ناوی *کراخۆتکین* زەماوەندی کردبووەوە و جا ئێستە، هەمدیس بێوەژن کەوتبوو. وەلێ شازدە ساڵ لەوەوبەر، خاڵە ئالاهەڵگری سووپا بوو و لەم نێوەندەدا خۆیشی نیازی زەماوەنکردنی هەبوو. هەر بەو بۆنەیەشەوە دایکی بۆ ماوەیەکی زۆر ڕەزامەندیی خۆی بۆ زەماندکردنەکەی ئەو دەرنەبڕی و کردیە بەزم و هەرا و ئەو منداڵە بێگوناحەی، لەبەر خۆپەرستی و بێئەمەگی و بێڕێزی سەرزەنشت دەکرد و پاساویشی دەهێنایەوە کە داراییەکەی خاڵە، یانی ئەو موڵکە و دووسەد ڕەعیەت و نازانم چی و چیە، بە دژواری خەرجیی ژیانی ئەو دەردەهێنێت (کە هەڵبەتە دایە مەبەستی لە خەرجی ژیانی خۆی بوو، لەگەڵ قەتارێك لە کارەکەر و سەگگەلێکی بۆڵداگ و چەند سەگێکی پەژمینی پروسیی دیکەی و کۆمەڵە گوربەیەکی چینی و... هەروا بێتەوە تا دەگاتە دوایی...). لە سەروبەندی ئەم سەرکۆنەکردن و مەتەڵپێداهەڵچنین و قیژ و قاوانەدا، کتوپڕ و بە شێوەیەکی تەواو چاوەڕوانینەکراو، ئەسڵەن خۆی بەر لە زەماندکردنی کوڕەکەی، شوێکی تەڕی بۆ کردەوە. کەچی هەر لەو سەردەمەدا پاساوێکی بۆ کارەکەی خۆی داتاشیبوو تا خاڵەی بەستەزمان تاوانبار بکات و بیری بهێنێتەوە کە ئەو، تەنیا لەبەر ئەوە شووی کردووە هەتا لە پیریدا پەناگەیەکی هەبێت، چونکە کوڕە خۆپەرست و نمەکبەحەرامەکەی تەنانەت لەوەش بێبەشی

کــردووە و نیــازی وایــە بــە پیلانێکــی بێشــەرمانەی شــیاوی لێخۆشنەبوون، لە ماڵەکەی خۆی دەریپەڕێنێت.

مــن هــەرگیز نــەمتوانی دەرك بــە هۆکــاری ڕاســتەقینەی زەماوەنــدکردنی پیــاوێکی ئــاقڵی وەك خوالێخۆشــبوو جەنــەراڵ کراخۆتکین لەگەڵ ئەو بێوەژنە چلوسیٚ ساڵەیەدا بکەم. دەکرێت وای بۆ بچیت کابرا گومانی بردووە کە دایەگەورە ژنێکی دەوڵەمەندە. کەسانێکی زۆر لایان وایە کە تەنیا پێویستیی بە پەرستارێك هەبووە، چونکە پێدەچێت لەپێشدا، هەستی بە گورچکبڕیی[1] ئەو نەخۆشیانە کردبێت کە بڕیار بوو لە سالانی پیریدا لەپێی بخەن. هێندەی من بزانم، جەنەراڵ بە درێژایی ژیانی هاوبەشیان، هەرگیز ڕێــزی لــە هاوســەرەکەی نــەدەگرت و لەگــەڵ هەڵکــەوتنی هــەر دەرفەتێکدا، دەیکردە گاڵتەجاڕ و پێی ڕادەبووارد. مرۆڤێکی نامۆ بوو بە خوێندەوارییەکی نیوەونیوەچڵەوە، وەلێ کابرایەکی زۆر وریا بوو، بێ جیاوازی سووکایەتیی بە هەر شت و هەر کەسێك دەکرد، پابەندی هیچ نەریتێك نەبوو و گاڵتەی بە هەمووان دەهات و بە کارەکانیان پێدەکەنی، لە سالانی پیریدا، بە بۆنەی هەندێك نەخۆشییەوە کە ئەوەش بەرئەنجامی ژیانێکی نادرووستی تافی لاویی بوو، زۆر بەدخوو و تووڕە و بێبەزەیی بووبوو. ئەو لە سوپادا ئەفسەرێکی سەرکەوتوو بوو، کەچی سەرباری ئەوەش، بە هۆی ڕووداوێکی نەخوازراوەوە، بە ناچاری دەستی لە خزمەتکردن هەڵگرت و تەنیا لەبەر ئەوەی خۆی لەدەست یاسا و لێپێچینەوە

---

١. گوچکبڕی: کوژەری، کوشندەیی، کارێتی.

نەجات بدات، ناچاربوو چاوپۆشی لە بڕانە[1] بکات. ئەم بابەتەش بە تەواوی ئەوی بەدخوو کردبوو. کەمتازۆر بێ پارە، لەگەڵ سەد ڕەعیەتی مایەپووچدا بۆ خۆی بە بێکاری لە ماڵێ دانیشت و بە درێژایی دوازدە ساڵی داهاتووی ژیانی، هەرگیز نەیزانی کە بە چی دەژیی و کێ خەرجیی ژیانی دابین دەکات، جا سەرباری ئەوەش، پەڵپی[2] ژیانێکی خۆشگوزەرانانەی دەگرت، هەتا بڵێیت کەسێکی دەستبڵاو بوو و تەنانەت گالیسکەی تایبەتیشی گرتبوو. پێیەکانی زۆر زوو لە کار کەوتبوون و لەم دە ساڵانەی دواییدا لەسەر کورسییەك کەوتبوو کە هەرکات پێویستی بکردبا، دوو خزمەتکاری ئەڵقەلەگوێ دەیانگێڕا و هەرگیزیش بێ لە جوێن هیچ شتێکی دیکەیان لێوە نەدەبیست. خەرجیی ڕاگرتنی گالیسکە، خزمەتکاران و کورسیەکەش، تێکڕای لە ئەستۆی ئەو کوڕە سپڵەیە بوو کە دوا قرووشی خۆی بۆ دایکی دەنارد، دووبارە و سێبارە موڵکەکەی دەخستە ڕەهنەوە و دەستی نابووە بینی خۆی، دەچووە ژێر باری قەرزگەلێکەوە کە بەو داهاتە دەرەقەتیان نەدەهات کە لەو سەردەمەدا دەستی دەکەوت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، ناسناوی ڕۆڵەی خۆپەرست و بێحورمەت، وەك سیفەتێکی جیانەبووەوە، بە تەوێڵییەوە چەسپی. هەڵبەتە کەسایەتیی خاڵە بە جۆرێك بوو کە دواجار خۆیشی باوەڕی بەوە هێنا کە خۆپەرستە. بەم پێیە، تەنانەت گەر بۆ سزادانی خۆیشی بێت و تا ئیدی خۆپەرست نەبێت، زیاد و

---

١- بڕانە: ئەو مووچەیەی کە دەوڵەت بە بنەماڵەی کارمەندی مردوو یان پەککەوتە و توانانەماوی دەدات.

٢. پەڵپگرتن: بیانووگرتن، بەهانەگێڕتەی.

زیادتر پارەی پەخشانوتەخشان دەکرد. داپیرەش زۆر بە جەنەراڵەکەیەوە دەنازی و ڕێز و حورمەتی لێ دەنا و لە لایەکی دیکەشەوە ڕۆژ دوای ڕۆژ بەوە دڵخۆشتر دەبوو کە مێردەکەی جەنەراڵێکە و بێ گومان هەر بەو پێیە، خۆیشی هاوسەری جەنەراڵێک.

ئەو، فەرمانڕەوای ئەو ماڵە بوو، ماڵێک کە ئامادەگیی نیوەونیوەچڵی مێردەکەی لەنێو کۆڕی نۆکەران، فاتوفیتکەرانی شار و سەگە ژیکەڵە ماڵییەکاندا ڕێز و حورمەتێکی بۆ پێکەوە دەنا. لەو شارۆچکەیەدا بۆ خۆی بووبووە کەسێکی دیار. پیلانگێڕی، داوەتکران بۆ ئاهەنگی ناولێنان و زەماوەندکردن، یاری برینجی یەك کۆپیکی و ڕێزلێگیران بە بۆنەی ئەوەی کە ژنی جەنەراڵە، بە تەواوی ئەو سووکایەتیپێکرانەی بۆ قەرەبوو دەکردەوە کە لە ماڵێدا دەچووە ژێر باری. ژنە بەدبێژان، بە خۆ و بە ڕاپۆرتەکانیانەوە دەهاتنە لای ئەو، ئەویش هەلەکەی دەقۆستەوە و ئەوپەڕی سوودی لە پێگەکەی خۆی وەردەگرت. بە کورتیەکەی، لە سایەی بوونە ژنی جەنەراڵەوە، تەواوی ئەو شتانەی بەدەست هێنابوون کە پێویستی بوون. جەنەراڵیش لەم بارەیەوە هێندە خۆی هەڵنەدەقوورتاند، لەجێی ئەوە، بە بەرچاوی خەڵکەوە، بە شێوەیەکی بێشەرمانە بە هاوسەرەکەی ڕادەبووارد و بۆ نموونە بە خۆی دەگوت: «تۆ تەماشا من چەندە گەمژە بووم کە ئەم هەویرەترشاوەم هێنا! »، جا هیچ کەسێکیش زاتی نەبوو لەم بارەیەوە ڕایەکی پێچەوانە دەربڕێت. بەرەبەرە ناسیاوان لێی تەکینەوە، جا ئەمەش لە بارێکدا بوو کە

جەنەراڵ نەیدەتوانی بەبێ خەڵکی هەڵبکات و هەمیشە ئارەزووی لە چەنەبازی و مشتومڕ بوو و، بێ ئەوە هەڵی نەدەکرد کە بەردەوام بیسەرێك بەدیارییەوە دانەنیشێت. مرۆڤێکی بیرئازاد و لە جۆری بێدینە دێرینەکان بوو و جا هەر لەبەر ئەوەش، پێی خۆش بوو هەمیشە تاوتوێی پرسگەلی بنەڕەتی بکات.

وەلێ بیسەرانی شارۆچکەی «ن»، کەڵکەڵەی ئەم جۆرە پرسانەیان لە سەردا نەبوو و هەتا دەیانتوانی کەمتر سەردانی ئەوێیان دەکرد.

ماوەیەك بڕیاریان دا لە ماڵەوە یاریی وەرەق بکەن، وەلێ ئەمە هەندێك جار گوشارێکی زۆری دەخستە سەر جەنەراڵ و لە کۆتاییدا دەیکردە دەمەقاڵێ، جا ژنی جەنەراڵ و تەنانەت خزمەتکارانیشی لە ترساندا پێکەوە دوعایان دەکرد و لە بەردەم کۆتەڵی مریەمدا مۆمیان دادەگیرساند، بە لۆبیا و وەرەق پێشبینیی ئەوەیان دەکرد کە ئاخۆ دواتر چی ڕوودەدات، جا نانی کالاچیان[1] بەو ئاواییانەدا دەکردە خێر و بە ترسێکی لەڕادەبەدەرەوە، چاوەڕێی کاتژمێرێکی دوای خوانی فراوێن بوون کە قەراربوو دەستێکی دیکەی ئەو یارییە شوورمەی وەرەق دەست پێ بکاتەوە و جا لەبەرانبەر هەر هەڵەیەکی بچووکدا، خۆیان بۆ بەسەردانەڕاندن و قیروهوڕ و جوێن و تەنانەت لێدانی پیس ئامادە بکەن. جەنەراڵ گەر بابەتێکی بەدڵ نەبا و کەیفی

1. کالاچ: وشەکە لە بنەڕەتدا تاتارییە و بە ڕووسی واتای نانێکی گەنمیی سپی و شیرینی شێوە ئاڵی دەگەیەنێت کە لە هەردوو سەرەوە پێکەوە نووساوە و زۆربەی کاتیش بە مرەبا، هەنگوین یان کەرێوە دەخورێت. «و. ف»

بە شتێك نەهاتبا، ئەوا هیچ شەرمێکی نەبوو و سڵی لەوە نەدەکردەوە کە لەنێو خەڵکیشدا هەر قسەی خۆی بکات. وەك پیرێژن دەستی دەکردە شاتەشات، چون گالیسکەوانان هەمووانی جوێنباران دەکرد، ئەوجا هەندێك کاتیش وەرەقەکانی دەدڕاندن و بەسەر زەویەکەدا پەرتی دەکردن و هاوەڵەکەی لە یاریەکەدا دەردەکرد و تەنانەت خۆیشی لە تاو ڕق و ئازاردا، لە پرمەی گریانی دەدا. جا هەموو مەسەلەکەش هەر ئەوەندە بوو کە بەرانبەرەکەی لەجێی نۆ لو، سەربازی داکردبوو. دواتر بە بۆنەی کزبوونی چاویەوە، پێویستیی بەوە بوو کەسێك کتێبی بۆ بخوێنێتەوە. جا لێرانە دابوو کە سەروسەکوتی کەسێك بە ناوی *فۆما فۆمیچ ئۆپیسکین* ـەوە دەرکەوت.

بێ گومان بە تێروتەسەلی دێمە سەر باسی ئەم کەسە تازەهاتووە. بە دڵنیاییەوە ئەو یەکێکە لە کەسایەتییە گرنگەکانی نێو ئەم چیرۆکەی من. لە بارەی ئەوەی کە ئایا ئەو مافی ئەوەی هەیە تا ئەندازەیەك سەرنجی خوێنەر بەلای خۆیدا ڕابکێشێت یان نا، لە تاقەتی چیرۆکەکەم بەدەرە، پاساویش ئەوەیە کە وام بەلاوە پەسەندترە خودی خوێنەر وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە.

ئەم فۆما فۆمیچە، لە سەرەتاوە بۆ تیکەنانێك بە سەروشکڵی خزمەتکارێکەوە لە ماڵی جەنەراڵ کراخۆتکیندا دەرکەوت، نە زیاتر و نە کەمتر. ئەوەی کە ئەم سەروسەکوتە لە کوێوە خۆی گەیاندووەتە ئەوێ، تا ئێستەش بە خەرمانەیەك لە ناڕوونی دەورە دراوە. وەلێ بە تایبەت بەدواداچوونم بۆ ئەم بابەتە کرد و چەند شتێکم لە بارەی

ڕابردووی ئەم مرۆڤە سەرنجڕاکێشەوە دەست کەوت. دەیانگوت سەروەختێك، لە فەرمانگەیەکدا سەرقاڵی ئیشکردن بووە و لە جێیەکی دیکەش (بە گوتەی خۆی) لەسەر بەرگریکردن لە هەق و هەقیقەت تووشی ئازارێکی سەخت بووە. بیستوومە کە سەردەمانێك لە مۆسکۆ بە کاری ئەدەبییەوە خەریك بووە، جا ئەم بابەتەش هێندە جێی سەرسامی نییە، چونکە هەڵسوکەوتە ناشیرین و نەشیاوەکانی هیچ بەربەستێکی ئەوتۆیان لەبەردەم چالاکیەکانیدا درووست نەدەکرد. وەلێ ئیدی ئەوەیان ڕوونە کە ئەو نەگەیشتووەتە هیچ کوێ و ناچار بووە وەك خوێنەرەوەیەك[1] و مرۆڤێکی بەستەزوان بێتە خزمەت جەنەراڵ. لام وایە کە ئەو، لەبەر خاتری یەك پارووەنانی جەنەراڵ، هیچ سووکایەتیەك نەماوەتەوە کە نەچووبێتە ژێر باری. لە ڕاستیدا، پاشان، دوای مردنی جەنەراڵ، ئەو وەختانەی کە فۆما لە کتوپڕێکدا بۆ خۆی بووە ڕووخسارێکی تەواو دیار و نائاسایی، جار دوای جار لەوەی دڵنیا دەکردینەوە کە ئەو لە ڕێی چوونە ژێر باری ئەم خۆ بەگەپجارکردنەوە، بە شێوەیەکی لەخۆبردووانە، لە ڕێگەی هاوڕێیەتیدا خۆی کردووەتە قوربانی و ئەوجا ئەم جەنەراڵەیش بۆ ئەو بووەتە مایەی خێر و خۆشی و مرۆڤێکی کەموێنە بووە، هەروەها هیچ کەسێك دەرکی بەو نەکردووە و تەنیا لای فۆما باسی لە شاراوەترین نهێنییەکانی ناخی خۆی کردووە، جا دواجار گەر ئەو «فۆما» بە داوای جەنەراڵ، لاسایی هەر جرپوجانەوەرێکی

---

١. لە جێی «خوێنەر»، «خوێنەرەوە»م بە شیاو زانی، چونکە خوێنەر بە ئارەزووی خۆی دەخوێنێتەوە، وەلێ خوێنەرەوە، دەشێت ئیشی خوێندنەوە بێت.

کردووەتەوە و هەموو جۆرە بۆ نماییشێکی بۆ کردووە، ئەوا تەنیا و تەنیا بۆ ئەوە بووە کە هاوڕێ نەخۆش و خەمۆکەکەی سەرگەرم بکات و بیخاتە پێکەنین. وەلێ ئەم دڵنیاییپێدان و ڕوونکردنەوانەی فۆما فۆمیچ ئێجگار گوماناوی دەیاننواند، لەم نێوەندەدا، هەر ئەم فۆما فۆمیچە، تەنانەت لەو سەردەمانەشدا کە ڕۆڵی لیبووکێکی هەبوو، لە خەڵوەتی ژنانەی ماڵی جەنەراڵدا ڕۆڵێکی تەواو جیاوازی دەگێڕا. هەڵبەتە وێناکردنی ئەوەی کە ئەو چۆن دەکرێت وەها کارێکی لێ بوەشێتەوە، بێگومان بۆ ئەو کەسانەی کە بەم جۆرە بابەتانە نائاشنان، کەمێك دژوارە.

ژنی جەنەراڵ ڕێزێکی تەلیسماویی بۆ فۆما فۆمیچ هەبوو: وەلێ هیچ کەسێك سەری لەوە دەرنەدەچوو کە ئەم ڕێزلێگرتنە لەپای چی و بۆ چییە؟ ئەو بەرەبەرە لە بەشی ژنانەی ماڵی جەنەراڵدا بووە خاوەنی دەسەڵاتێکی سەرسووڕهێن کە، تا ڕادەیەك لە دەسەڵاتی ئیڤان یاکۆڤلیڤیچ ـەکان[1] و ئەم جۆرە دانا و پێشبینیکەرانە دەچوو کە بەشێك لە خانمانی خانەدان، بە پەرۆشییەوە بۆ سەردانیکردنیان

١. ئیڤان یاکۆڤلیڤیچ کاریشا (١٧٨٣ – ١٨٦١)، وەك دەڵێن شێتێکی ڕووسی و بە بۆچوونی کەسانێکی زۆری هاوسەردەمی خۆی پێشبینیکەر و غەیبگۆ بووە و تەواوی نەخوێندەواران و تەنانەت زۆربەری خوێندەوارانی سەردەمەکەشی بڕوایان بە غەیبگۆییەکانی هەبووە. ئیڤان وەك نەخۆشێکی دەروونی، زیاتر لە چلوحەت ساڵی تەمەنی خۆی لە نەخۆشخانەی دەروونیدا بەسەر برد. نووسەرانی کلاسیکیی وەك دۆستۆیڤسکی، لیڤ تۆلستۆی، ئاستڕۆڤسکی و لێسکۆڤ لە بەرهەمەکانی خۆیاندا ئەویان بە نەمری گەیاند. ئیڤان یاکۆڤلیڤیچ لە فەرهەنگی ڕووسییەکاندا خوازەیە بۆ مرۆڤی شێت. «و. ف»

دەچوونە نەخۆشخانەکان. فۆما بە دەنگی بەرز کتێبگەلی پەندئامێز و ڕۆحلاوێنی دەخوێندنەوە و بە چاوانی فرمێسکاوییەوە بەسەرهاتی پاکداوێنانی مەسیحیی دەگێڕایەوە، لە خۆی و سەروەرییەکانی دەدوا، دەچووە ڕێوڕەسمی عەشای ڕەبانی و دوعای چێشتەنگایان، جاروباریش پێشبینیی بۆ داهاتوو دەکرد، جا بە تایبەت توانایەکی باشی لە لێکدانەوەی خەوندا هەبوو و بە شێوەیەکی تەواو زیرەکانە کەسانی دەوروبەری خۆی لە خشتە دەبردن.

هەڵبەتە جەنەراڵ سۆسەی ئەوەی دەکرد کە لە ژوورەکانی پشتەوەدا چی ڕوودەدات و هەر لەبەر ئەوەش زیادتر لە جاران ستەمی لە خزمەتکارەکەی دەکرد. وەلێ ئەم ئازار و مەینەتکێشانەی فۆما، ڕێزێکی زیاتری لای ژنی جەنەراڵ و ئەندامانی دیکەی بنەماڵەکە بۆ دەستەبەر دەکرد.

سەرئەنجام هەموو شتێک گۆڕانکاریی بەسەردا هات. جەنەراڵ گیانی سپارد. مەرگەکەشی لە خۆیدا شتێکی سەیر بوو. لەو دواییانەدا، ئەم بەڕێزە بیرئازاد و کۆنەکافرە، بە چەشنێک ترسی لێ نیشتبوو و فرمێسکی دەڕشت و تۆبەی دەکرد و کۆتەڵی پیرۆزی لە بان سەرییەوە ڕادەگرت و قەشەکانی بانگهێشت دەکردن کە هەر مەپرسە. نوێژ و دوعای مردوویان لە ژوور سەری دەخوێند. داماوە دەیقیژاند کە نایەوێ بمرێت و تەنانەت بەدەم گریانەوە داوای لێبووردنی لە فۆما فۆمیچ دەکرد. پاشان ئەم بارودۆخەی دوایی سەنگێکی لە ڕادەبەدەری بەخشییە فۆما فۆمیچ. لەم نێوەندەدا، ڕێک بەر لەوەی ڕۆحی جەنەراڵ لە جەستەی دەرچێت، ڕووداوێک قەوما.

کچە سیسەڵەکەی ژنی جەنەراڵ کە هی یەکەمین هاوسەری بوو، یان با بڵێین پورێی من (*پراسکۆڤیا ئیلینیچنا*) کە بەردەوام لە ماڵی جەنەراڵدا دەژیا و یەکێك بوو لە دڵخوازترین قوربانیەکانی ژێر دەستی ئەو، کە بە درێژایی ئەو دە ساڵە خزمەتێکی بێپشووی ئەو پیاوە کەمئەندامەی کردبوو و تەنیا لەبەر بێئەقڵی و دەمردووییەکەی بوو کە توانیبووی ڕەزامەندیی جەنەراڵ بەدەست بهێنێت، لە بارێکدا کە لەو دواهەمین ساتانەی کە لە ناخەوە فرمێسکی دەڕشت، ئەو لێی نزیك کەوتەوە و گەرەکی بوو بالیفەکەی ژێر سەری ڕێك بکاتەوە، کەچی جەنەراڵی نیوەگیان، لە بارێکدا کە هێندەی نەمابوو لە ڕقاندا دەمی کەف بێنێتەوە، دەستی برد و توانیی قژی کچە بگرێت و باش باش سێ جارێك ڕای بوەشێنێت. جا دوای دە خولەکی دی گیانی سپارد. سەرهەنگیان ئاگادار کردەوە، گەرچی ژنی جەنەراڵ دەیگوت نایەوێت ئەو ببینێت و وای پێ باشترە کە بمرێت نەوەکو لەم ساتانەدا چاوی بەو بکەوێت. ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردنەکەش بە شکۆیەکی تەواوەوە بەڕێوە چوو، هەڵبەتە ئەمەش لەسەر حسێبی هەمان ئەو کوڕە بێئەمەگەی کە چاویان پێیدا هەڵنەدەهات.

لە لادێی دواکەوتووی *کنیازاڤکا*، کە هی چەند موڵکدارێك بوو و جەنەراڵیش لەوێ بۆ خۆی چەند ڕەعیەتێکی هەبوو، ئێستە ئیدی گۆڕێکی بە مەڕمەڕی سپیەوە تێدا بنیاد نرابوو کە چەند پارچەنووسینێکی لە ستاییشی ئەو کۆچکردووەدا، سەبارەت بە ژیری و توانا و ڕۆحی شەریف و مەدالیاکان و جەنەراڵیی ئەوەوە لەسەر هەڵکۆڵرابوو. فۆما فۆمیچ بە شێوەیەکی تەواو جددییانە

بەشداریی لە هەڵکۆڵینی ئەم نووسینانەی سەر گۆڕەکەدا دەکرد. ژنی جەنەراڵ تا ماوەیەکی زۆر هەر وای دەنواند کە لەو کوڕە نارەسەنەی خۆش نابێت. لەنێو کۆڕی چەند کەسێك لە زمانلووس و سەگانی دەوروبەریدا، بەدەم شین و شەپۆڕەوە دەیگوت وای پێ باشە نانە وشەکەکەی خۆی بخوات و هەتا دەکرێت لە فرمێسکی خۆی بخواتەوە، تەنانەت پێی باشترە کە بە گۆچانەکەی دەستییەوە لەبەردەم پەنجەراندا ڕابوەستێت و دەروزە بکات، تەنیا بەو مەرجەی ناچار نەبێت لەو کوڕە سپڵەیە بپارێتەوە تا لەگەڵ خۆیدا بیبات بۆ ستێپانچیکۆڤۆ و هەرگیزاوهەرگیز پێ ناخاتە ماڵی ئەوەوە! جا بە شێوەیەکی گشتی، بەشێك لە هاوسەرانی کەسە پلەدارەکان، وشەی «پێ» بە مانایەکی تەواو کاریگەر دەردەبڕن. جا ژنەی جەنەراڵیش لێهاتوو و هونەرمەندانە دەریدەبڕی... بە کورتیەکەی، ئەم قسانە بە وەها جوانکاری و ڕەوانێژییەکەوە بەیان دەکران کە هەر مەپرسە! پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کە هەر لە سەروبەندی ئەم قیژوهوڕەدا، خەریکی ئامادەکاری بوون بۆ گەشتکردن بەرەو ستێپانچیکۆڤۆ. سەرەنگ هەموو ڕۆژێك هەڵدەستا و لە ستێپانچیکۆڤۆوە چل وێرستای دەبڕی و خۆی دەگەیاندە شار، بەم کارەش ئەسپەکانی بە تەواوی شەکەت کردن، تا دواجار (دوو حەفتە دوای مەرگی جەنەراڵ) مۆڵەتی ئەوەی وەرگرت لەبەردەم دایکی تازیەداریدا دەربکەوێت. جا فۆما فۆمیچ لەم نێوەندەدا ڕۆڵی میانجیکەری[1] دەگێڕا. ئەو بە درێژایی ئەم دوو حەفتەیە، کوڕەی

١. میانجیکەر: ناوبژیوان.

بێبەزەیی و کەللەڕەقی لەبەر هەڵسوکەوتە نامرۆڤانەکانی سەرکۆنە دەکرد و ئەو داماوەی دەخستە گریان. ڕێك لەو ساتەدا بوو کە دەسەلاتی سەرسووڕهێن، هۆڤی[1] و ستەمکارانەی فۆما فۆمیچ بەسەر خاڵەی بێچارەمدا دەستی پێکرد. فۆما، کە باش تێگەیشتبوو تووشی بە تووشی چ جۆرە مرۆڤێکەوە بووە، دەمودەست هەستی کرد کە سەردەمی لیبووکیەکەی تێپەڕیوە و لەم دۆخە شپرزەیەدا تەنانەت دەتوانێت بۆ خۆی ببێتە خانەدانێك! بەم پێیە، تەواوی هەوڵی خۆی خستە گەڕ تا قەرەبووی دواکەوتنی بکاتەوە. دەیگوت:

– گەر دایکتان، چووزانم ئاخر، هەمان ئەو کەسەی کە گوناحی هێنانەدونیای ئێوەی لە گەردنە، گەر بەو دەستەوەی کە لە تاو برسیەتیدا دەلەرزێ، گۆچانەکەی هەڵبگرێ، لە شوێنێکدا خۆی پێ ڕاگیر بکا و دەست لە خەڵکی پان بکاتەوە، ئێوە دەکەونە چ حاڵێکەوە؟ گەر ئەمە هەر بە ڕاستی ڕووبدا، ئایا ئێوە شەرمەزار نابن؟ بەر لە هەموو شتێك لەبەر پێگەی ژنی جەنەراڵی و دوای ئەوەش لەبەر دڵی بێگەردی... چ حاڵێکتان دەبێ گەر ئەو لەناکاو (بە دڵنیاییەوە وا نابێ، وەلێ دەی، خۆ دەکرێ بە هەڵکەوت ئەوە ڕوو بدا) لەبەردەم پەنجەرەکەی ئێوەدا ڕابوەستێ و دەست لە خەڵکی پان بکاتەوە، لە بارێکدا کە ئێوە، منداڵی هەقودادی خۆی، لەسەر دۆشەکە پەڕییەکەی خۆتان پان بوونەتەوە و... بە کورتیەکەی لە کاتێکدا کە ئێوە لە ناز و نیعمەتدان! ئەمە تۆقێنەرە، تۆقێنەر! وەلێ تۆقێنەرتر ئەوەیە کە (سەرهەنگ لێگەڕێن با ڕاستگۆیانە ئەمەتان پێ

---

١. هۆڤیانە: دڕندانە، نامرۆڤانە.

بڵێم)، تۆقێنەرتر ئەوەیە کە ئێوە لەم ساتەدا ڕێك وەکو ستنوونێکی بێهەست لەبەرانبەرمدا ڕاوەستاون، جا دەمتان بەش بووەتەوە و هەیتاهەیتا چاو دەتروسکێنن. تەنانەت پێویستە بڵێم کە ئەمە بێڕەوشتییە، چونکە لە هەلومەرجێکی لەم جۆرەدا دەبوو ئێوە قژی سەرتان بڕووتاندباوە و جۆگەی فرمێسکتان هەڵبەستبا... ئەوە چی دەڵێم، جۆگەی چی! لە هەلومەرجێکی ئاوهادا دەبوو ڕووبار، دەریاچە، دەریا و ئۆقیانووستان بەڕێ خستبا!...

بە کورتییەکەی، فۆما وەها گوڕی خواردبووەوە کە دابووی لە سەری و وڕێنەی دەکرد. بە هەرحاڵ، هەمیشە قسەکانی ئەو بەم جۆرە کۆتاییان دەهات. هەڵبەتە بەرئەنجامی قسەکانیشی ئەوە بوو کە دواجار ژنی جەنەراڵ لەگەڵ خزمەتکار و سەگەکانی، سەرباری فۆما فۆمیچ و هاودەمە تایبەتەکەی (پاکیزە پرەی پێلیتسینا) بە هەنگاوەکانی خۆیان گوندی ستێپانچیکۆڤۆیان پیرۆز کرد. ژنی جەنەراڵ، دەیگوت بە کاتی لای کوڕەکەی دەژی و جارێ گەرەکیەتی هەڵسەنگاندێك بۆ هەڵسوکەوتەکانی بکات. جا وەرە وێنای بکە و بزانە سەرهەنگ (کە جارێ هەڵسوکەوتە بەڕێزانەکانی لەژێر زەڕەبین دابوون) لە چ هەلومەرجێکدایە! سەرەتا، ژنی جەنەراڵ، وەك ئافرەتێك کە تازە بێوەژن کەوتووە، بە ئەرکی خۆی دەزانی کە حەفتەی دوو یان سێ جار ئەژنۆی خەم بگرێتە باوەش و خۆی پان بکاتەوە؛ جا دیار نەبوو کە بۆ دەشیا هەر جارەو ئاژاوەیەك بەرۆکی سەرهەنگ بگرێت. هەندێك جار، بە تایبەت لە ئامادەگیی کەسێك یان میوانێکدا، نەوەکانی (ئالیۆشای بچکۆلە و ساشینکای پازدە

سالآن)ی لەتەك خۆیەوە دادەنیشاندن و تا ماوەیەك وەها بە نیگای ڕەنجاو و مەینەتباری خۆیەوە لێیان ڕادەما کە وەك بڵێیت بەدەست ئەو باوکەوە فەوتابن، هەناسەی قووڵ و قوورسی هەڵدەکێشا و دواجار، لانیکەم بۆ ماوەی یەك کاتژمێری ڕەبەق بە هێمنی و نهێنی هەڵسی دەڕشت[1]. جا ئەشکەنجەدان لەوێوە دەستی پێدەکرد کە گەر سەرهەنگ (بە گوتەی دایکی) هەستی بەو فرمێسکانە نەکردبا. داماوی واش لە ڕاستیدا باش هەستی پێ نەدەکردن و کەمتازۆر هیچ کاتیش نەیتوانی سەر لەم بابەتە دەربکات، جا بۆ نەگبەتی، هەمیشە بەسەر ئەم فرمێکڕشتن و ئاهەڵکێشانانەدا دەهات و بێ ویستی خۆی، ڕێك لەو وەختانەدا دەردەکەوت. لەگەڵ ئەوەشدا، سەرهەنگ (تا ئاستێك کە تەنانەت وێناکردنیشی دژوارە) حورمەتێکی زۆری لێ دەنا. بە کورتیەکەی، هەم ژنی جەنەراڵ و هەم فۆما فۆمیچ بە تەواوی هەستیان بەوە کردبوو کە ئەو مەترسییەی سالآنێك بە بۆنەی جەنەراڵ کراخۆتکینەوە هەڕەشەی لێ دەکردن، لەنێو چووە و سەرهەڵناداتەوە. هەندێك جار ژنی جەنەراڵ لە کتوپڕێکدا، بێ هۆکار خۆی بەسەر قەنەفەدا دەدا و لە هۆش دەچوو. ئامادەبووانی ماڵ هەمووان شپرزە دەبوون و دەبووە هەراوهۆریا. سەرهەنگیش وەك گەڵای خەزان هەڵدەلەرزی و تێك دەشکا. ژنی جەنەراڵ کە دەهاتەوە هۆش خۆی، هاواری دەکرد: «هەی ڕۆڵەی دڵڕەق! تۆ ڕۆحت خاش خاش کردم، ڕۆحی من... »

جا ئەمەی بە فەڕەنسیش دووبارە دەکردەوە:

---

١. هەڵس: فرمێسك، ئەسرین، هەرسی، هەڵسی، ڕووندەك.

- mesentrailles, mesentrailles

ئەوجا سەرهەنگیش بە ترس و لەرزەوە دەیگوت: «دایە گیان، ئاخر من چیم کردووە کە بووەتە مایەی ئازاری ڕۆحتان؟ »

- کێشات! کێشات! جا وا خەریکە پاکانە بۆ خۆی دەکا و ڕەقیش لەگەڵم دەدوێ! کوڕەی دڵڕەق! وا خەریکە بە دەستتەوە دیقی مەرگ دەکەم!...

لەم وەختانەدا بوو کە ئیدی سەرهەنگ بە تەواوی لە پەل و پۆ دەکەوت.

ژنەکەی جەنەراڵ، هەر جارەو بە جۆرێك سەرلەنوێ گیانی بە بەردا دەهاتەوە. سەرهەنگیش نیو کاتژمێرێك دواتر، هەر کەسێك بەلایدا تێپەڕیبا، خێرا دەچووە بەردەمی و لە بارێکدا کە بە پێی خووی سەیری خۆی، قۆپچەی کراسی بەرانبەرەکەی بە گیردەهێنا و بۆ نموونە لەم ڕێیەوە هەوڵی دەدا باشتر بەرانبەرەکەی لە بابەتەکە تێبگەیەنێت و دەیگوت: «دەی ئیدی، براله، خۆ هەرچییەك بێ، ئەو grand dame[1]ێکە بۆ خۆی، ژنی جەنەراڵ بووە، بابە! ژنێکی ئێجگار نیانە، وەڵێ دەی، دەزانی، ئەو خووی بەم نەرم و نیانییەوە گرتووە... خۆ نابێ بەتەما بم لەگەڵ منی هیچلێنەهاتوو بسازێ! ئەوا ئێستەش لێم تووڕیە. هەڵبەتە، خەتای منە. هێشتاکەش نازانم براله، کە کتومت خەتای من چی بووە، وەڵێ دەی، پێی ناوێ و من خەتابارم... »

---

١. ژنە خانەدان. فەرەنسییە. «و. ف»

هەندێك جاریش ئەوە ڕێك دەكەوت كە پاكیزە پرەی پێلیتسینا (ئەو بوونەوەرە بێئاوڕوو و سیسەڵەیەی كە وەختی ڕێكردنی خشەخشێكی دەنایەوە) بەو برۆ قەڵەمی و چاوە بچووك و ئاڵۆشبزوێنانە و لێوی قەیتانی و دەستێكەوە كە دەتگوت لە ئاوی خەیارسوێردا شۆراوە، بە ئەركی خۆی بزانێت مۆچیاریی سەرهەنگ بكات: «هەمووی لەبەر ئەوەیە كە حورمەتی ناگرن، قوربان، چونكە ئێوە خۆویستن ئیدی، خۆویست، ئێوە سووكایەتی بە دایكتان دەكەن، قوربان، بیرتان دەچێتەوە كە ئەوان ژنەجەنەراڵن، وەلێ ئێوە هێشتا تەنیا سەرهەنگێكن، قوربان. »

سەرهەنگیش هەر كات كە بیسەرێكی دەست دەكەوت، دەیگوت: «براله، ئەم پرەی پێلیتسینایە، پاكیزەیەكی تێكەیشتووە، وەك كێوێوێك لەپشت دایكمەوە ڕاوەستاوە! پاكیزەیەكی كەموێنە! وا نەزانی خزمەتكارێكی ئاساییە، براله، فلانی كچی سەرهەنگێكی پلە دووە. ئیدی بۆ خۆت حاڵی بە! »

وەلێ ئەمە هێشتا سەرەتاكەی بوو. هەمان ئەو ژنەی جەنەراڵ، كە ئەو هەموو ئاژاوەیەی دەنایەوە، لەبەرانبەر كۆنەخزمەتكارەكەیدا وەكو مشك دەلەرزی. دەتگوت فۆما فۆمیچ بە تەواوی سحر و جادووی لێ كردووە. ژنی جەنەراڵ لەبەردەم ئەودا، تەنانەت زاتی هەناسەكێشانیشی نەبوو. تەنیا گوێی بۆ شل دەكرد و لە نزیكەوە لێی ورد دەبووەوە. یەكێك لە خزمانی دووری من، یەكێك بوو لە خانەنشینانی دەستەی سوارەی سەربازی و هێشتا لاو دەینواند و هاوكات لە ماڵی خاڵم دەژیا، بە بینینی ئەو بارودۆخە تەواو وەڕەز

بووبوو و جا ڕۆژێکیا بە ڕاشکاوی پێی گوتم کە بە ئەگەرێکی زۆر باوەڕی وایە ژنی جەنەراڵ کەین و بەینێکی لەگەڵ فۆما فۆمیچدا هەیە. هەر لەو ساتەدا من ئەو قسانەم بە بێویژدانییەکی بێڕادە و تەنانەت بە جۆرێك لە ساویلکەیی زانین و بە تووڕەییەوەش نکوڵیم لێ کردن، چونکە لام وابوو کە حەقیقەت شتێکی دیکەیە. هەڵبەتە من ناتوانم بە پێی هیچ ناونیشانێك ئەو شتەی دیکە وەسف بکەم، مەگەر ئەوەی کە بەر لەوە، جەوهەری کەسایەتیی فۆما فۆمیچ (هەر بەو جۆرەی کە خۆم پاشان ناسیم) ڕوون بکەمەوە.

باشە، ئێستە ئێوە چڕوکترین و تەرسەزاڵترین کەسێك کە کۆمەڵگە ڕەدی کردبێتەوە و پەراوێزی خستبێت، لە زەینی خۆتاندا وێنا بکەن، کابرایەك کە هیچ کەسێك ئەوی نەوێت. بوونەوەرێکی بێکەڵك و قێزەون و هاوکات هەتا بڵێیت لووتبەرز وێنا بکەن کە هیچ جوانییەکیشی تێدا نییە کە، هەتا لانیکەم بتوانێت لە ڕێیەوە کەمێك ئەو لووتبەرزییەی خۆی، کە بە شێوەیەکی نەخۆشانە تەشەنای کردووە، دابپۆشێت. پێشەکی وا ڕایدەگەیەنم کە ئەم فۆما فۆمیچە نموونەی ترۆپکی لووتبەرزیە، وەلێ لووتبەرزییەکی تایبەت بە خۆی: لە زەینی خۆتاندا نالەبارترین هەلومەجێك بەرجەستە بکەن کە هەمیشە تێیدا لووتبەرزیی ئینسان، کە بە هۆی نامورادیە تاڵەکانی ڕابردووەوە سووك و پامال کراوە، بۆ ماوەیەکی زۆر بە وێنەی دمەڵێکی قێزەون خۆی مات بدات و بە تێپەڕینی کات و لەگەڵ بینینی هەر جۆرە سەرکەوتنێکدا کە ئەوانی دی بەدەستی دەهێنن،

ئیرەیی و ژەهر بدەڵێنێت. جا لە هەمووشی خراپتر، دڵناسکییەکی بێمانا و بەدگومانییەکی شێتانەش تێکەڵی بابەتەکە ببێت.

ڕەنگە ئەم پرسیارەتان لا درووست ببێت کە ئەسڵەن ئەمە لە کوێوە سەرچاوە دەگرێت و چۆن لە نالەبارترین هەلومەرج و لە دەروونی مرۆڤانێکی هێندە نزمدا، کە بە پێی پێگەی کۆمەڵاتییان، ناچارن لە جێگەکەی خۆیان دابتەپێن و نقەشیان لێوە نەیێت، وەها لووتبەرزی و خۆپەرستییەک لەدایک دەبێت؟ ئاخر چۆن وەڵامی وەها پرسیارێك بدەینەوە؟ کێ چووزانێت، ڕەنگە لەم نێوەندەدا دەستەیەکی ڕیزپەڕ بوونیان هەبێت و پاڵەوانەکەی منیش سەر بەو دەستەیە بێت. هیچ گومانیك لەوەدا نییە کە ئەم بەڕێزە کەسێکی ڕیزپەڕە و دواتر دەپەرژێینە سەر ئەم باسە. وەڵێ لێگەڕێن با پرسیارێکتان لێ بکەم: ئایا لەوە دڵنیان ئەو جۆرە کەسانەی کە بە تەواوی ملیان بۆ ئەم مەسەلەیە داوە و شانازی بەوەوە دەکەن کە گەپجاڕ و خزمەتکار و نانەخۆری ئێوە بن و بچنە ژێر باری هەر سووکییەکەوە، بەڵێ، ئایا لەوە دڵنیان کە ئەم جۆرە کەسانە خۆپەرستیی خۆیان لەدەست داوە؟

ئەی ئەم هەموو ئیرەیی و بەدگۆیی و دەنگۆیە، ئەم هەموو فاتوفیت و قسەهێنان و قسەبردنەی دەوروبەر و تەنانەت بنگوێ و ژێر مێزەکەی ئێوە لە کوێوە دێت؟... کێ چووزانێت، ڕەنگە خۆپەسەندیی هەندێك لەم کەسە وەیلان و لیبووکانە و ئەم شێتە نەگبەتانە، نەك هەر بەم جۆرە سووکایەتییانە لەنێو نەچێت، بەڵکە لەبەرانبەر ئەم سووکایەتیپێکران و گاڵتەجاڕی و لیبووکبازی و

کاسەلێسی و ملکەچی و یاریی خۆ بەبێ کەسایەتینواندنە ناچاری و هەمیشەییانەوە، زیاتر بووروژێت. جا کێ چووزانێت، ڕەنگە ئەم خۆپەسەندییەی کە بەشێوەکی ناجۆر تەشەنا دەکات، تەنیا هەستێکی درۆییەنە بێت و لە سەرەتاوە، دەرکێکی هەڵە بێت سەبارەت بە بەها وجوودیەکانی خود، کە دەشێ پێشتر لە وجوودی دایك و باوکی ئەم ئاوارەیەی داهاتوو و لەبەرچاوی ئەودا پامال کرابێت یان ڕێی تێدەچێت کە یەکەمین جار لە سەردەمی منداڵیدا، بە بۆنەی ستەم و هەژاری و هەزاران چەپەڵکاریی دیکەوە بریندار بووبێت.

وەلێ گوتبووم کە فۆما سەر بەو دەستە کەسانەیە کە لە ڕێسای گشتی بەدەرن و ئەمەش شتێکی ڕاستە. ئەو سەردەمانێك ئەدیب بوو و پاشانیش لەبەر هەندێك هۆکار، بە تەواوی لە زەوقی درا و هەرگیزیش دەستی بە هیچ سەرکەوتنێك ڕانەگەیشت، ئاخر دەزانن، ئەدەبیات ئەو توانایەی هەیە کە جۆرەها کەسی وەك فۆما فۆمیچ لەنێو ببات، هەڵبەتە بە شێوەیەکی تەلیسماوی و نامۆ. من نازانم، وەلێ گومان لەوەدا نییە کە فۆما فۆمیچ بەر لە پەرژانە سەر کاری ئەدەبیات، لە بوارەکانی دیکەشدا هیچ سەرکەوتنێکی بەدەست نەهێنابوو، ڕەنگە لە بوارەکانی دیکەشدا لەجێی پاداشت، تەنیا بە تەپڵەسەریاندا کێشابێت و چەوساندبێتیانەوە، یان تەنانەت لەوەش خراپتر. گەرچی لەم بارەیەوە شتێکی ئەرتۆ نازانم، وەلێ دواتر کە بەدواداچوونێکم بۆ بابەتەکە کرد، تێگەیشتم کە ئەم فۆمایە سەردەمانێك هەر بە ڕاستی لە مۆسکۆدا ڕۆمانۆکەیەکیشی نووسیوە

زۆر لەو ڕۆمانانە چووە کە لە سیەکاندا، کە هەر ساڵەو دەیان نموونەی لەو جۆرە کەڵەکە دەبوون، وەك *ڕزگاریی مۆسکۆ*، *ئاتامان بۆریا*، *کوڕانی عەشق* یان *ڕووسەکانی ساڵانی ١١٠٤* و لەم جۆرە بەرهەمانەی کە لە وەختی خۆی بووبوونە بەزمی گاڵتە و نوکتەبازی بۆ بارۆن برامیۆس[١]. هەڵبەتە ئەم مەسەلەیە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانێك بەر لە ئێستە، وەلێ هەندێك کات ژەهری ماری غرووری ئەدەبی، برینێکی ئێجگار قووڵ و بێچارە جێدەهێڵێت، جا بە تایبەت لە بوونی مرۆڤانی مایەپووچ و دەبەنگدا. فۆما فۆمیچ هەر لە ئەوەڵین هەنگاوی خۆی لە کاری ئەدەبیاتدا، تووشی شکست هات و هەر لەو کاتەوە چووە نێو کۆمەڵەی گەورەی ئەو نامورادانەی کە پاشان لەشکرێك لە شێتەوەڵی و دەروێش و مرۆڤی سەرگەردانی لێوە دەرکەوتن. لام وایە ڕێك لەو سەردەمەوە بوو کە سیفەتی ناقۆڵای خۆهەڵکێشی، حەز بۆ پەرستران، خزمەت و ستاییشکران لە ناخی فۆما فۆمیچدا چەکەرەی کرد. تەنانەت لەو وەختانەش کە لە لیبووکێك بەولاوە هیچ دی نەبوو، کۆمەڵێك پیاهەڵدەری لە دەوری خۆی کۆ کردبووەوە تا بە جۆرێك لە جۆرەکان لەنێو هەمووانذا دیار بێت و غەیبگۆیی بکات، جا جۆرە وێنایەکی دی لەمەڕ خۆیەوە ساز

---

١. ناوی خوازراوی ئۆسیپ ئیڤانۆڤیچ سینکۆڤیسکی (١٨٠٠-١٨٥٨)، نووسەر، ناوازدانەر، دنیاگەڕ، ڕامیار، بازرگان، ڕۆژنامەوان و ڕەخنەگری ڕووسی و لە بنیادنەرانی ڕۆژهەڵاتناسیی ڕووسیا. ئەو بە درێژاییی ساڵانی ١٨٣٤-١٨٤٩ پێداچەرەوەی گۆڤاری «کتێبخانەیەك بۆ خوێندنەوە» بووە. گوتارە ڕەخنەییەکانی ئەو گۆڤارە زیاتر دەپەرژانە سەر بەرهەمگەلی بێبایەخ و گاڵتەیان بە خەوش و کەموڕییەکانیان دەکرد. دۆستۆیڤسکی هەر لە منداڵییەوە بە گۆڤاری سینکۆڤسکی ئاشنا بوو، چونکە گۆڤاری «کتێبخانەیەك بۆ خوێندنەوە»، ئەوسا لە لایەن باوکی سینکۆڤسکییەوە بڵاو دەکرایەوە.

بکات و خۆی بنوێنێت. ئەمە بە تاکە ویستی ئەو دەهاتە ئەژمار! گەر هیچ کەسێکیش تاریفی ئەوی نەدابا، ئەوا خۆی دەستی دەکردە تاریفدانی خۆی. ئەو سەردەمەی کە فۆما لە ماڵی خاڵم، لە ستێپانچیکۆڤۆدا دەسەڵاتێکی تازەی بەدەست هێنابوو و بۆ نموونە بووبووە غەیبگۆیەك، بە گوێی خۆم ئەم قسانەم لەوەوە بیستبوون کە هەندێك جار بە شکۆیەکی سەیرەوە دەیگوت: «زۆر لەلاتان نامێنمەوە، ئاخر خۆ من خەڵکی ئێرە نیم! چاوێك لە بارودۆخەکە دەکەم و کاروبارەکانتان بۆ ڕێك دەخەم و هەندێ شتی پێویستتان فێردەکەم و دوای ئەوە ئیدی ماڵئاوا: دەچم بۆ مۆسکۆ و لەوێ خۆم بە بلاوکردنەوەی گۆڤارێکەوە سەرقاڵ دەکەم! مانگانە سی هەزار گوێگرێك لە کۆڕەکانمدا ئامادەییان دەبێ.[1] پاشان ناوبانگێکی سەرتاسەری پەیدا دەکەم و جا ئەوسا پشتی دوژمنانم دەشکێنم! »

وەڵێ ئەم بلیمەتەی ئێمە، گەرچی هێشتا لە دەستپێکی ڕێگەی ناوبانگەکەی دابوو، کەچی پێشەکی چاوەڕێی وەرگرتنی پاداشتی دەکرد. هەڵبەتە پێشەکی وەرگرتنی پاداشت، شتێکی زۆر خۆشە، جا بە تایبەتی لە هەلومەرجێکی لەم چەشنەدا. دەزانم کە زۆر بە جددی خاڵەی تێکەیاندبوو سەرکەوتنێکی مەزن لە چاوەڕوانیی ئەو ( لە چاوەڕوانیی فۆما فۆمیچ)دایە،[2] باسی پەیامێکی دەکرد کە ئەو

---

١. ئەم قسانەی فۆما ئاماژەن بۆ گوتارێکی گۆگۆل کە لە پێگەی مامۆستای زانکۆی پترسبورگدا داریەتی و لە ساڵی ١٨٣٤دا تووشی ناموڕادی بووە. هەروەها ئاماژەدانی «خلیستاکۆڤ» بە سیوپێنج هەزار پەیك لە شانۆنامەی «لێکۆڵەر»دا نیشان دەدا.

٢. لێکچوونی هەیە لەگەڵ نامەیەکی گۆگۆڵدا بۆ ئاکساکاف (١٣ مارس ١٨٤١):

کاری من کارێکی گەورەیە و بوێریم ئازادی بەدوای خۆیدا دەهێنێ. من ئیدی ئێستە بایەخ بە کارگەلی بچووك نادەم..

بە بۆنەیەوە ئافرێنراوە و لە تارماییەکی باڵدار یان شتێکی لەم جۆرە دەدوا کە شەوانە خۆی بەو نیشان دەدات، جا ئەو بە گەیاندنی پەیامێکی جوامێرانەی لەو جۆرە ڕادەسپێرێت، بۆ نموونە ئەرکی نووسینی کتێبێکی ڕزگارکەر و بەپێز و پڕمانای دەخاتە سەر شان کە زەویلەرزەیەکی بەهێز بەرپا دەکات و سەرانسەری ڕووسیا دەهەژێنێت.[1] جا ئەو ساتەی کە ڕووسیا کەوتە هەژان، ئەو (فۆما فۆمیچ) بێباك لە ناو و ناوبانگی خۆی، ڕوو لە پەرستگەیەك دەکات و لە ئەشکەوتەکانی کییف دا، شەو و ڕۆژ دەداتە دەم یەك و هەر دوعا بۆ سەرکەوتنی نیشتمانەکەی دەکات.[2] هەڵبەتە ئەم قسانە، بە تەواوی خاڵمیان لە خشتە بردبوو.

جا ئێستە بیهێننە بەرچاوی خۆتان کە ئاخۆ دەبێت فۆما فۆمیچێك کە لە سەرانسەری ژیانیدا لەژێر چەپۆکی ستەمدا بووە و پەراوێز خراوە یان تەنانەت وردوخاش کراوە، چ جۆرە بوونەوەرێکی لێ دەردەچێت، فۆمایەك کە هەڵبەتە ژێراوژێر مرۆڤێکی هەوەسباز و

---

یەکەمین جار پ. کۆلیش ئەم نامەیەی لە ساڵی ١٨٥٧دا لەنێو نووسراوە و نامەکانی گۆگۆڵدا بڵاو کردەوە. پێدەچێ دۆستۆیڤسکی ئاگاداری ئەم نامەیە بووبێت. «و. ف»

١. گۆگۆڵ لە وەسیەتنامەی خۆیدا و لە بارەی بەرهەمێکەوە کە باسی لێوە دەکات، یانی «چیرۆکی ماڵئاوایی»یەوە، دەڵێت:

ئەمە باشترین بەرهەمێکە کە تا ئێستە خامە ئافراندبێتی، جا دەمێکە لە دڵمدا چون باشترین گەوهەری خۆم پاراستوومە. «و. ف»

٢. پێکچوونی هەیە لەگەڵ گوتەیەکی گۆگۆڵ لە پێشەکیی «گۆڵبژێرێك لە نامە بۆ هاوڕێیان»:

من لەسەر مەزارگەی پیرۆز دوعا بۆ هەموو هاونیشتمانیانم دەکەم بێ ئەوەی تەنانەت یەکێکیشیان وەلا بنێم.

خۆپەسەندە، فۆمایەك كە خۆی بە نووسەرێكی ڕەنجێنراو دەزانێت و كەچی لە لایەكی دیكەوە بۆ ئەوەی لە برسان نەمرێت، ناچارە لە سەروشكڵی لیبووكێكدا دەربكەوێت، فۆمایەك كە وێڕای ئەوەی لە ڕابردوودا لەژێر باری ستەم و شكستدا بووە، وەڵێ ڕۆحی دیكتاتۆرێكی هۆڤیی هەیە، فۆمایەك كە خۆی هەڵدەكێشێت و لە وەختی سەركەوتندا ڕووقاییم دەبێت، فۆمایەك كە ئیدی ئێستە لە كتوپڕێكدا دەستی بە شانازی و سەركەوتن ڕابگات، بكەوێتە خۆشگوزەرانییەوە و كەسانێكی زۆر بە شانوباڵیدا هەڵبدەن! هەڵبەتە تەواوی ئەمانە لە سایەی پارێزەرە دەبەنگەكەی فۆما (ژنی جەنەراڵ) و پارێزەرە لە خشتەبراوەكەی (سەرهەنگ)ەوەیە كە سەبارەت بە هەر بابەتێك هاوڕایە و ئەوجا فۆماش، دوای ساڵانێكماڵبەكۆڵی، بە هەڵكەوت ڕێی دەكەوێتە ماڵەكەی ئەو. هەڵبەتە پێویستە بە شێوەیەكی تێروتەسەلتر كەسایەتیی خاڵم شی بكەمەوە، چونكە بێ ئەم شیكردنەوەیە، سەركەوتنەكانی فۆما فۆمیچ لە ئاستی تێگەیشتندا نابن. با جارێ ئەوەتان پێ بڵێم كە فۆما كتومت نموونەی ئەم پەندەیە: «كە ڕووت دایە میوان، لێت دەبێتە خاوەنماڵ.» بە هەرحاڵ، دەكرێت بڵێین ئەو ڕابردووی خۆی قەرەبوو كردەوە! ڕۆحی مایەپووچ هەركە لە یەخسیری نەجاتی بوو، ئیدی خۆی دەست بە ستەمكاری دەكات. ستەمیان لە فۆما كردبوو و ئیدی ئەویش دەمودەست، هەستی بەوە كردبوو كە پێویستە ستەم بكات، وردوخاشیان كردبوو و ئەویش كەوتە وردوخاشكردنی ئەوانی دی.

فۆما لەبەر ئەوەی خۆی لیبووکێك بوو، خێرا ئەو فکرەیەی لا درووستبوو کە پێویستە لیبووکێك بخاتە خزمەت خۆیەوە. لە خۆهەڵکێشاندا تەواو بێتامی دەکرد و دەکەوتە چەنەبازی و هەوەسبازییەکانی ئەوسەریان دیار نەبوو.

بۆ خواردنەوە، کاکم داوای شیری باڵندەی دەکرد و بە چەشنێك کەوتبووە ستەمکردن، کە ئەگەر کەسێکی دڵپاك خۆی ئاگاداری فێڵ و تەڵەکەکانی نەبووبا و تەنیا ئاشناییەکی دووراودووری لەگەڵ فۆما هەبا، ئەوا تەواوی ئەم قسانەی بە درۆ و خۆڵکردنە چاو دەزانین و لەبەر ئەم بوختانانەی کە دەدرێنە تەك بارەگای فۆما، خاچێکی دەکێشا و تفێکی ڕۆدەکردە زەوی.

بەڵێ، باسی خاڵم دەکرد. جا هەمدیس دووبارەی دەکەمەوە کە بێ وەسفی ئەم کەسایەتییە نائاساییە، بێ چەندوچۆن فەرمانڕەوایی بێشەرمانەی فۆما فۆمیچ لە ئاست دەرکپێکردندا نییە و تێگەیشتن لە ڕەوتی گۆڕانی لیبووکێك بۆ سەروسیمای مرۆڤێکی گەورە، شتێکی تەواو دژوارە. هەڵبەتە خاڵە کەسێکی دەستکراوە و دڵنەرم بوو. وێڕای هەبوونی ڕوواڵەتێکی کەمێك توورە، سروشتێکی زۆر ناسکی هەبوو، هەتا بڵێیت کەسێکی شەریف و لێهاتوو و بەئەزموون بوو.

بە بووێرییەوە دەڵێم لێهاتوو، چونکە شانی دەدایە بەر ئەرك و بەرپرسیاریەتی و لەو هەلومەرجانەدا سڵی لە هیچ بەربەستێك نەدەکردەوە. ڕۆحی وەك هی منداڵێك پاك بوو. لە ڕاستیشدا بە چل ساڵ تەمەنەوە هێشتا هەر منداڵ بوو، منداڵێکی هەستیار و تەژی لە

گوڕ و تین، جا هەمیشە دڵخۆش بوو و مرۆڤەکانی بە فریشتە دەبینین و لەبەرانبەر کەموکوڕیی ئەوانی دیکەدا، تەنیا خۆی بە تاوانبار دەزانی. سیفەتە باشەکانی ئەوانی دیکەی زیاد لە ڕادە گەورە دەکردن و لە خەیاڵی خۆیدا وەها پێگەیەکی پێ دەبەخشین کە ئەسڵەن بوونیان لە وەها شوێنێکدا دژوار و ڕێتێنەچوو بوو. خاڵە دڵی ئەوەندە باش بوو کە دەچێتە ڕیزی ئەو بێگەردترین و دەروونپاکترین کەسانەی کە تەنانەت شەرمیان پێ دێت لە خەیاڵیشدا ئینسانەکانی دی بە پیس وێنا بکەن و جا خێرا، بەرگی پاکسرووشتی بە بەر باڵای کەسانی نزیکی خۆیاندا دەکەن. ئەو بە سەرکەوتنی ئەوانی دی دڵخۆش دەبوو و بەم جۆرە، ئیدی ئەو هەمیشە لە دونیایەکی خوازراودا دەژیا، گەر هەر جارەو لە کارێکیشدا سەرکەوتن دەستەبەر نەبا، ئەوا بەر لە هەر کەسێك خۆی بە کەمتەرخەم دەزانی. ئەو بە ئەرکی خۆی دەزانی کە لە ڕێگەی ئەوانی دیکەدا قوربانی بدات. ڕەنگە گەر هەر کەسێکی دی لەجێی من با، ئەوی بە ترسنۆك و لاوازویست و بڕوابەخۆنەبوو لە قەڵەم بدابا. هەڵبەتە ئەو لاواز بوو و تەنانەت کەسایەتییەکی هەتا بڵێیت نەرمونیانی هەبوو، وەلێ ئەمە بە هیچ شێوەیەك لەبەر لاوازویستی نەبوو، بەڵکە تەنیا لەوەوە سەرچاوەی دەگرت کە نەکا حورمەتی ئەوانی دی بشکێت، بریندار ببن و ڕەفتاری دڵڕەقانەی لێ بکەوێتەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی کە ئەو ڕێزێکی زۆری بۆ ئەوانی دیکە و بە شێوەیەکی گشتی بۆ مرۆڤایەتی هەبوو. هەڵبەتە ئەو تەنیا لەو ساتانەدا ترسنۆك و لاوازویستی ڕووی تێدەکرد کە بابەتی بەرژەوەندیی تایبەت بە خۆی لەنێواندا بووبا و لەم بارەیەشەوە تا

دواڕادە نەرمیی دەنواند و دەسازا. هەر لەبەر ئەمە، بە درێژایی ژیانی خۆی، هەمیشە بووبووە بابەتی گاڵتەجاڕیی ئەوانی دیکە، بە تایبەت لەلایەن ئەو کەسانەوە کە بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆی لە پێناویاندا بەخت کردبوو. لە لایەکی دیکەشەوە هەرگیز نەدەچووە ئەقڵییەوە کە هیچ نەیارێکی هەبێت، جا گەرچی ئەو نەیارانە خزابوونە بنکەڵیشەیەوە، کەچی ئەو بە هیچ شێوەیەك دەرکی پێ نەدەکرد. بە چەشنێك لە دەمەقرە و هاتوهاواری نێو ماڵ دەتۆقا کە وەك بڵێیت ماڵەکە ئاگری گرتبێت و، جا خێرا لەگەڵ هەمووانـدا دەسازا و ملکەچیان دەبوو. بە جۆرێك لە دڵپاکی، کەمڕوویی و میهرەبانییەکی شەرمنانەوە سەری دەهێنایە ڕاستە و جا بۆ ئەوای کەسانی دەوروبەری، سەرکۆنەی نەکەن لەبەر ئەوەی کە لاوازیی نواندووە، پەلەپەل دەیگوت: «دەی، ئەمە بۆ ئەوەیە... بۆ ئەوەیە... بۆ ئەوەیە کە هەمووان قاییل و کامەران بن! » جا ئەوە گوتنی پێناوێ کە خاڵە ئامادە بوو بێتە ژێر باری هەر ویستێکی جوامێرانەوە. بەدەر لەمانەش، هەر حەرامزادەیەکی لێزان دەیتوانی بە تەواوی خاڵە بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و ناچار بە ئەنجامدانی هەر کارێکی ناشیرینی بکات و جا پاشان زۆر بە سادەییش دەمامکێکی شەریفانە بە بەر کردەوە ناشیرینەکەیدا بکات. خاڵە زۆر بە ئاسانی خۆی ڕادەستی ئەوانی دیکە دەکرد و لەم پەیوەندییەشدا هیچ هەڵەیەکی نەدەکرد. وەختێکیش کە دوای ئازارکێشانێکی زۆر، دواجار لەوە دڵنیا دەبوو کە بەرانبەرەکەی فێڵی لێ کردووە و کەسێکی ناڕەسەنە، ئەوا زیاتر لە هەمووان تەنیا و تەنیا خۆی بە تاوانبار دەزانی. ئێستە بیری لێ بکەنەوە، ژنێکی بیانووگر و

دەبـەنگ کـە قـاتی سـەرەوەی ماڵەکـەی بـە کـرێ داوە، لەگـەڵ ئـەو گەمژەیەی کە پێوەی لکاوە (بتەکەی) کتوپڕ لە ماڵی هێمنی خاڵمدا، جڵەوی کاروبار بگرێتە دەست، ژنێك کە تا ئەو ساتە تەنیا سڵی لە جەنەراڵ دەکردەوە، وەڵێ ئێستە ئیدی ترسی لە هیچ شتێك نییە و تەنانـەت لای وایـە کـە لـە پـای ڕابردوویـدا، پێویسـتە پاداشتیشـی بدەنەوە، هەمان ئەو ژنە گەمژەیەی کە خاڵە بە ئەرکی خۆی دەزانی حورمەتی بگرێت، ئەوەش تەنیا لەبەر ئەوەی کە دایکی بوو. ئەوانە (داپیرە و فۆما) دەستیان پێکرد تا خاڵە بهێننە سەر ئەو بڕوایەی کە تـووڕە و پشـووکورت و نەفامـە، جـا لـە سـەرووی هـەموو ئـەم شتانەشەوە هەتا دڵ حەزکات خۆویستە. خاڵی جێسەرنج ئەوەیە کە پیرێژنە دەبەنگەکە تەنانـەت خۆیشـی بڕوای بە مۆچیاریە قۆڕانـەی خـۆی دەکـرد. لام وایـە کـە فۆمـا فۆمیچیش تـا ڕادەیـەك هـەر وابـوو. دواجار، ئەو دووانە، خاڵەیان هێنایە سەر ئەو بڕوایەی کە فۆما لـە لایـەن خـوداوە نێـردراوە تـا ڕۆحـی ئـەو ڕزگـار بکـات و کـەفوکوڵی هەواوهەوەسی هەوسارپچڕاوی ئەو دابمرکێنێتـەوە، هـەروا بێتـەوە خاڵە کەسێکی لووتبەرزە و خۆی بە سامانەکەیەوە هەڵدەکێشێت و ئامادەیە لەبەر تیکە نانێك فۆما ماميچ تەریق بکاتـەوە. خاڵـەی داماو زۆر زوو بڕوای بەم تایبەتمەندییە ئەخلاقییەی کرد و خێرا دایە پاڵ خـۆی و ئامـادە بـوو قـژی خـۆی بڕوتێنێتـەوە و داوای لێبـووردن بکات...

هەرسـاتێ کـە لەگـەڵ کەسـێك دەکەوتـە قسـە، دەیگـوت: «ڕاستییەکەی ئەوەیە براله، من خۆم خەتابارم. هـەموو خەتایـەك لـە

گەردنی خۆمە! پیاو کە چاکە لەگەڵ کەسێکی دی دەکا، ئەوا پێویستە دووبەرانبەر ڕێز لەو کەسە بگریٚ[1]... یانی... ئەوە چی دەڵێم! چ چاکەیەك!... وا دیسان دەستم کردەوە بە قسەی بێمانا! من هەر لە بنەڕەتەوە هیچ چاکەیەکم لەگەڵ نەکردووە، بەڵکە ئەوە ئەوە کە چاکەی بەسەر منەوە هەیە، نەك من بەسەر ئەوەوە! چونکە لە بنەڕەتدا ئەوە ئەوە کە چاکە دەکا و بە شیاوی ئەوەم دەزانیٚ کە لەلام بژی... ئاخر، من لەبەر تیکەنانێك ئەوم تەریق کردووەتەوە!... نا، تەریقم نەکردووەتەوە، ڕەنگە هەروا قسەیەکم لە دەم دەرچووبیٚ. زۆر جار وا هەڵدەکەویٚ کە بێمەبەست قسەیەکم لە دەم دەردەچیٚ... دەی، دواجار، ئەم مرۆڤەش زووخاوی چەشتووە، ماوەی دە ساڵی ڕەبەق (سەرباری هەر سووکایەتییەك) چاودێریی هاوڕیٚ نەخۆشەکەی کردووە: هەر لەبەر ئەوەش شایەنی پاداشتکردنە! ئاخر، دواجار، خزمەتی بە عیلم و زانیستیش کردووە... کابرا نووسەرە! مرۆڤێکی شەهادەدارە! بە کورتیەکەی ئەو ئینسانێکی مەزنە...

---

١. لە بنەڕەتدا، ئەم وشانەی سەرهەنگ ڕەنگدانەوەی هزری دۆستۆیڤسکین لە نامەیەکیدا بۆ ئالێکساندەر ڤرانگیل، ١٤ ئابی ١٨٥٥:

باش دەزانم کە ئێوە لە هەر کەسێکی دی زیاتر ئەوە دەزانن کە پێویستە چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ کەسێکدا بکەن کە چاکەتان بەسەرییەوە هەیە. دەزانم کە ئێوە دووبەرانبەر و بەڵکە سێبەرانبەریش حوورمەتی دەگرن، پێویستە بە پارێزەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ کەسێکدا بکرێت کە چاکەمان بەسەرییەوە هەیە، چونکە ئەو لەو کاتەدا هەستیارە، جا لای وایە کە پشتگوێخستن و سووکایەتیپێکردن ناچاری دەکەن تا نرخی ئەو چاکەیە بدات کە لەگەڵی کراوە.

(دۆستۆیڤسکی ئەو بەشەی جیا کردووەتەوە کە هێڵی بەژێردا هاتووە. ) «و. ف»

سیمای چارەڕەشانەی فۆمای شەهادەدار کە پێشتر لە سیمای لیبووکی جەنەراڵێکی بەبەهانە و دڵڕەقدا دەرکەوتبوو، دڵی بەخشندەی خاڵەی بریندار دەکرد و داخ و خەفەتی بۆ دەخوارد و خێرا لەبەر ئەو نەهامەتییانەی کە پێشتر بەسەریدا هاتبوون و ئەو سووکایەتی و ستەمەی کە لێیان کردبوو، چاوپۆشیی لە تەواوی کارە سەیروسەمەرە و ڕەفتارە ناڕەسەنانەکانی ئەو دەکرد... خاڵە بەو دڵە ناسك و ئەخلاقە شەریفانەیەوە، خێرا بەو ئەنجامە دەگەیشت کە نابێت بە ڕادەی کەسێکی ئاسایی چاوەڕوانیمان لە کەسێکی زووخاوچەشتوو هەبێت، تەنیا پێویستە چاوپۆشیی لێ بکەین، بەڵکە لەوەش زیاتر، پێویستە بە پشوودرێژییەوە برینەکانی هەتوان بکەین و دووبارە هەڵی بستێنینەوە و لەگەڵ مرۆڤایەتیدا ئاشتی بکەینەوە. ئەمەی کردبووە ئامانجی خۆی و بە چەشنێك هەولی بۆ دەدا و کوێری کردبوو، کە تەنانەت نەیدەتوانی ئەوە ببینێت کە ئەم هەڤاڵە تازەهاتووەی، بێ لە خوێڕییەکی ئارەزووباز و بیانووگر و خۆویست، بێ لە بوونەوەرێکی تەماڵ و سکلەوەڕێن هیچی دیکە نییە. لە ناخەوە باوەڕی بە زانست و بلیمەتیی فانا هەبوو. جا بیرم چوو ئەوەش کە بڵێم خاڵە، بە شێوەیەکی تەواو ساویلکانە حورمەتێکی زۆری بۆ وشەی زانست دادەنا، گەرچی خۆی هەرگیز هیچ شتێك فێر نەبووبوو.

جاریێ ئێوە چیتان دیوە! جاری وا هەبوو خاڵە هێشتا دوو ژووری مابوو بگاتە هۆدەکەی فۆما، بە پادزە ڕێی دەکرد و دەیگوت: «وا سەرقاڵی نووسینە! »

پاشان بە هێواشی و فیزێکەوە دەیگوت: «ئەوەی ڕاستی بێ نازانم خەریکی نووسینی چ شتێکە، وەڵێ براڵە، بێگومان ماجوونێکە[1] بۆ خۆی... هەڵبەتە ماجوون بە مانا باشەکەی. تەنیا بۆ هەندێك کەسیش لە ئاست تێگەیشتندایە، وەڵێ بۆ من و تۆ براڵە، هێندە سەیر و ئاڵۆزە کە هەر باسی مەکە... پێدەچێ نووسینەکانی باسێك بن سەبارەت بە هێزی وەبەرهێنان، خۆی وا دەگوت. هەڵبەتە پەیوەندییێك شتێکی بە سیاسەتیشەوە هەیە. ئەرێ، جا دەبینی کە ڕۆژێك ناوی هەروەکو تۆپ دەنگ دەداتەوە! جا ئەوسا لە سایەی ئەوەوە، من و تۆش ناوبانگ پەیا دەکەین. خۆی بە منی گوت، براڵە... »

بۆ من ئەوە وەك ڕۆژ ڕووناك بوو کە تەنانەت ئەو ڕیشە جوانە قاوەییە درێژەشی هەر لەژێر فەرمانی فۆمادا کورت کردووەتەوە. کاکم وای لێك دەدایەوە کە بەم ڕیشەوە وەك فەرەنسییەکانی لێ هاتووە و هەر لەبەر ئەوەش خۆشەویستییەکی کەمی بۆ نیشتمانەکەی هەیە[2]. فۆما کەم کەم خۆی لە هەڵسووڕاندنی

---

١. ماجوون، چەشنێك خۆراك لە شێوەی تێکەڵاوی شیلەی خورما، شیر، گوێز، پستە، بادام، کونجی و نارگیل و هەنگوین.

٢. دۆستۆیڤسکی لێرانەدا تەشەر لە یەکێك لە فەرمانە ملهووڕانەکانی نیکۆلای یەکەم دەدات. لە دووی ئاپریلی ١٨٣٧دا ئەو فەرمانێکی دەرکردبوو کە بەو پێیە، هێشتنەوەی ڕیش و سمێڵ، لە کارمەندانی فەرمانگە مەدەنییەکان قەدەغە کرابوو.

دۆستۆیڤسکی لە شاری سیمی پالاتینسك (شارێك لە خۆرهەڵاتی کازاغستانی ئێستەدا کە لە ساڵی ٢٠٠٧ بەولاوە ناوی سیمەی لێ نرا) جێبەجێکردنی ئەم یاسایەی بە چاوی خۆی بینی. ڤرانگیل لە کتێبی «یادگارییەکان»ی خۆیدا ئاماژەی بە کاربەدەستێکی دەوڵەتی بە ناوی مالاساپۆژکاف کردووە. ئەو پیاوێکی ڤیزەون بوو و دۆستۆیڤسکی

کاروبارەکانیشدا هەڵدەقوورتاند و ڕاوێژی زیرەکانەی دەدا. ڕاسپاردەکانی تۆقێنەرانە بوون.

ڕەعیەتەکان هەر زوو تێگەیشتن کە چ باسە و گەورەی ڕاستەقینە کەسێکی دیکەیە. هەر لەبەر ئەوەش بە تەواوی گیریان خواردبوو. جارێکیان گفتوگۆی فۆمام لەگەڵ ڕەعیەتێکدا بیست، دانی پێدا دەنێم کە بە دزییەوە گوێم بۆ قسەکانیان گرت. فۆما پێشتریش گوتبووی کە زۆری پێخۆشە قسە لەگەڵ موژیکێکی تێگەیشتووی ڕووسی دا بکات. جا هەر بەو بۆنەیەوە، جارێکیان ڕۆیشت بۆ گەوڕ و لە بارێکدا کە خۆی نەیدەزانی گەنم و جۆ لێك جیا بکاتەوە، لە کاتی قسەکردن لەگەڵ ئەو موژیکەدا، بە نەرمونیانییەوە باسی ئەرکەکانی ڕەعیەتی لە هەمبەر گەورەکەیدا بۆ کرد و کەمتازۆر ئاماژەیەکیشی بە هێزی وەبەرهێنان و دابەشکردنی کار کرد، هەڵبەتە خۆیشی لە یەك ڕستەی قسەکانی خۆی حاڵی نەدەبوو، جا پاشان بۆ گوێگرەکانیی ڕوون کردەوە کە زەوی چۆن چۆنی بە دەوری خۆردا دەخولێتەوە، دواجار، لە بارێکدا کە خۆی لەبەر ڕەوانبێژیی قسەکانی شاگەشکە بووبوو، قسە و باسی دەهێنایە سەر شالیارەکان[1]. من زۆر باش دەرکم بەم بابەتە دەکرد.

---

ناسناوی نووسەرێکی سوورەوەکراوی بەسەردا بڕیبوو. مالاساپۆژکاف، ڕاپۆرتێکی لەسەر فرانگیلی نووسیبوو و دایە وەزارەتی داد بە تۆمەتی ئەوەی کە سمێڵی هێشتووەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، دۆستۆیفسکی بەر لەمە، لە ساڵی ١٨٤٦دا، هەر لەم بارەی ئەم بابەتەوە، کاری لەسەر داڕشتنی نەخشتەی چیرۆکێکی درێژ کردبوو بە ناونیشانی «ڕیشە تاشراوەکان»ـەوە. «و. ف»

١. شالیار: وەزیر. وشەکە هۆرامییە.

پووشکین سەردەمانێك یادداشتێکی نووسیبوو کە منداڵێك سەبارەت بە باوکی گوتوویەتی: «باوکە گیانم هەندە باسە، باوکە گیانم هەندە دڵێلە کە خۆسەویستییەکی زۆڵی لای تزال هەیە... » جا کاتێك لە منداڵەکە دەپرسن کێ ئەم قسانەی بۆ کردووە، دەڵێ باوکە گیانم!...[1] تومەز ئەو باوکە پێویستی بەوە بووە کە منداڵەکەی بخاتە ژێر کاریگەریی خۆیەوە تا هەمیشە گوێلەمستی بێت! جا هەر بە هەمان شێوە هەمیشە ڕەعیەتەکانیش مەراییکارانە گوێیان لە فۆما فۆمیچ دەگرت.

لەنێوان موژیکەکاندا پیاوێکی ڕیشپی، کە نازناوی *ئارخیپ کارۆتکی* بوو، بە مەبەستی مەراییکردنەوە لەوی پرسی: «باوکە گیان، ئایا ئەوسا شازادە مووچەیەکی باشی پێدەدان لە پای کارەکەتاندا؟ »

وەڵێ فۆما فۆمیچ وای بۆ چوو کە ئەم پرسیارە زۆر نافەرمییانەیە. ئەو ئەسڵەن نەیدەتوانی بەرگەی نافەرمیبوون و نزیککەوتنەوەی هیچ کەسێك بگرێت. بە تووڕەییەوە چاوی لە موژیکە چارەڕەشەکە کرد و لە وەڵامدا گوتی: «تۆ چیت داوە لەم بابەتانە، هەی دەستوپێسپی! بۆچی ئەو دەموقەپۆزەتت هێناوەتە بەردەم من؟ تف بکەمە ئەو چڕوچاوەت؟ »

---

١. ئالێکساندەر پووشکین ئەم قسە ئەستەقەی لە بەشی هەژدەیەمی بەرمێکی خۆیدا، بە ناوی «وتووێژی سەرزەوی»ـە گواستووەتەوە. وەڵێ دۆستۆیڤسکی کتومت وەك خۆی نەیگواستووەتەوە.

فۆما فۆمیچ هەمیشە بەم چەشنە قسەی لەگەڵ مۆژیکی تێگەیشتووی ڕووسیدا دەکرد[1]. لەپڕ مۆژیکێکی دی خۆی لە باسەکەدا هەڵقورتاند و گوتی: «ئێوە لە جێی بابمان دان... دەی ئێمە کەسانێکی نەزانین. ڕەنگە ئێوە سەرگورد یان سەرهەنگ و تەنانەت کەسێکی پلەبالاّ بن... وەلێ ئێمە نازانین کە دەبێ چۆن ڕێزتان لێ بگرین. »

فۆما فۆمیچ ئەم جارەیان بە شێوازێکی نەرمتر گوتی: «تۆ سەیری ئەم دەستوپێسپییە! مووچە تا مووچە جیاوازە. تۆی کەللەپووت چیت داوە لەم شتانە! هەندێك کەس تەنانەت لە پێگەی جەنەراڵیشدا برە مووچەیەك وەرناگرن، یانی شایەنی ئەوە نین. ئاخر ئەوانە سوودێکیان نییە بۆ تزار. وەلێ من، ئەو وەختانەی کە لە وەزارەتخانەدا خزمەتم دەکرد، مووچەکەم خۆی لە بیست هەزار ڕۆبڵێك دەدا، جا من ئەوەشم وەرنەدەگرت، چونکە باری ماددیم باش بوو و تەنیا لە پێناو شەرەفمدا کارم دەکرد. داهاتەکەم دەخستە

---

١. شێوازی هەڵسوکەوتی فۆما لەگەڵ مۆژیکەکاندا، بە ڕوونی لاساییکردنەوەیەکی گاڵتەجاڕانەی شێوازی «بژاردەیەك لە نامە»ی بەرهەمی نیکۆلایە. گۆگۆڵ لە نامەیەکدا مولکدارێك ڕادەسپێرێت کە بەم شێوازی قسەکردنە ڕووبەڕووی مۆژیکە تەمەڵەکان ببێتەوە:

هێی تۆ، بەو سەروسەکوتە پیسەتەوە! هێندە بە بنەچەکەتەوە فشیویت کە چاوت بە ڕووی کەسدا هەڵنایێ و هێشتاش هەر ناتەوێ ڕێز لە مرۆڤێکی جوامێر بگری.

دواتر بلینسکی بە شێوەیەکی ڕەنجاوانە ئەم وشانەی لە نامە بەناوبانگەکەیدا بە ڕووی گۆگۆڵدا داوەتەوە. «و. ف»

خزمەت فێرکاریی میری و دروستکردنی یەکەی نیشتەجێبوون بۆ خەڵکانی کازان کە خانووەکانیان سووتابوون. »

موژیکەکە بە سەرسووڕمانەوە پرسیی: «ئاوها! یانی ئەوە ئێوە بوون خانووی کازانیەکانتان نۆژەن کردەوە؟ »

موژیکەکان هەمیشە وەك کەسێکی گەورە چاویان لە فۆما فۆمیچ دەکرد. فۆماش وەك ئەوەی کە نائاسوودە بێت و حەزی نەکردبێت شانازیی وەها گفتوگۆیەکیان پێ ببەخشێت، دەهاتە وەڵام: «دەی هەڵبەتە، منیش پشکێم تێیدا هەبووە. »

گفتوگۆی ئەو لەگەڵ خاڵەدا شێوەیەکی دیکەی هەبوو، پاش خواردنی فراوێنێکی چەور و نەرم، پاڵی بە قەنەفەیەکەوە دەدا و لە بارێکدا کە خزمەتکارێکیش بە چڵە زیزفۆنێکەوە مێشی لێ دەردەکرد[1]، دەیگوت: «خۆتان بیر لەوە بکەنەوە و بزانن کە پێشتر چ جۆرە کەسێك بوون؟ بەر لەوەی من بێمە ئێرە لە چی دەچوون؟ وەڵێ

١. وا دیارە ئەم دیمەنە ڕەنگدانەوەی کاریگەریی سەردەمی منداڵی دۆستۆیڤسکییە لە بارەی میخاییل ئاندرێی یۆڤیچ دۆستۆیڤسکیی باوکییەوە. لە یادگارییەکانی برا بچووکی دۆستۆیڤسکی -ئاندرێی دۆستۆیڤسکی-دا هاتووە کە وەختێك باوکی دوای خواردنی فراوێن بۆی ڕادەکشا، ناو ئاپارتمانەکە قرپوقەپ دەبوو. دەشیا ئاندرێی میخاییلاڤیچی بچووك بە چڵە زیزفۆنێکی پڕگەڵای بچووك کە هەموو ڕۆژێك لە باخدا لێ دەکرایەوە، مێش لە باوکی دەربکات کە بەسەر ئەسکەملەیەکەوە لەتەنیشت قەنەفەوە خەوتبوو.

ئەم یەك دوو کاتژمێرە بۆ من ئەشکەنجەیەکی گەورە بوو، چونکە دەبوو تەنیا و بێ جووڵە، لە بێدەنگییەکی ڕەها و شوێنێکدا دابنیشم و ئەوجا، خوانەخواستە، گەر لە مێشێك بێئاگا بام و بەدەم خەوەوە ئازاری بە باوکم بگەیاندبا...

ئێستاکه من پشکۆی ئاگرێکی ئاسمانیم له بوونی ئێوەدا گەشاندووەتەوە و وا بڵێسە دەسەنێ. دە بڵێن من پشکۆی ئەو ئاگرە ئاسمانییەم لە ناخی ئێوەدا نەگەشاندەوە؟ دەی وەڵام بدەنەوە، من لە ناخی ئێوەدا ئاگرێکم بەرپاکردووە یان نا؟ »

لە ڕاستیدا، فۆما فۆمیچ خۆیشی نەیدەزانی بۆچی وەها پرسیارێك دەخاتە بەر باس. وەلێ ماتی و شەرمی خاڵە، دەستبەجێ ئەوی دەهەری دەکرد. فۆما، کە تا ماوەیەك لەوەوبەر کەسێکی بەستەزوان و پشودرێژ بوو، ئێستە ئیدی بە بچووکترین شتێك کە لەگەڵ مەیلی ئەودا ناکۆك بوو، خێرا وەکو بارووت دەتەقەییەوە. ماتیی خاڵە، بێتاقەتی دەکرد و دەبووە هۆی ئەوەی کە بۆ بیستنی وەڵام، زایاتر پێداگری بکات.

- دە وەڵام بدەنەوە ئیدی: لە ڕۆحی ئێوەدا گڕێك بڵێسەی سەندووە یان نا؟

خاڵە لە خۆیدا ڕۆدەچوو و پێچی دەدایە خۆی و ئەسڵەن نەیدەزانی پێویستە چ وەڵامێك بداتەوە. جا فۆماش بە نیگەرانییەوە لەسەری دەڕۆیشت: «بە ئەرك نەبێ من چاوەڕێی وەڵامم. »

- Maisrepondezdonc[1]

فۆما پاشان لە قتووە چکلێتێکدا کە بە فەرمانی ژنی جەنەراڵ خرابووە سەر مێزەکە و لەبەردەمیدا دانرابوو، چکلێتێکی هەڵدەگرت و بە سیمای کەسێکی پایەبەرزەوە دووبارەی دەکردەوە: «پرسیبووم کە ئایا ئاگرێك لە دەروونی ئێوەدا بڵێسەی سەندووە یان نا؟ »

---

١. دە وەڵام بدەوە! (فەرەنسییە) «و. ف»

دواجار خاڵە بە نیگایەکی بێهیوایانەوە دەهاتە وەڵام: « فۆما، بە خوا نازانم، ڕەنگە شتێکی لەو جۆری بیٚ... لە ڕاستیدا وا باشە پرسیار نەکەن، گەرنا ڕەنگە من بە هەڵە شتێك بڵێم... »

– زۆر باشە! یانی بە ڕای ئێوە من ئەوەندە سووکم کە تەنانەت شایەنی ئەوە نیم وەڵامم بدەنەوە... مەبەستتان ئەوەیە؟ دەی، لێگەڕێن با وا بێ. لێگەڕێن با من سووك بم.

– نا، فۆما، توخوا! ئاخر من کەی مەبەستم بووە شتێکی لەو جۆرە بڵێم؟

– نەخێر، ئێوە کتومت مەبەستتان ئەوە بوو.

– نا، من بە هیچ شێوەیەك مەبەستێکی لەو جۆرەم نەبووە، سوێند دەخۆم!

– زۆر باشە! لێگەڕێن با من درۆزن بم! لێگەڕێن، بە پێی ئەم تۆمەتەی ئێوە، من دەسئەنقەس وا دەکەم و حەزم لە چەلەحانێیە. لێگەڕێن با ئەم سووکایەتیەش بچێتە پاڵ ئەوانی دی، من بەرگەی دەگرم...

لەم ساتەدا ژنی جەنەراڵ بە تۆقیوی هاواری دەکرد:

- Mais, monfils... [1]

جا ئەوسا خاڵە بە هاوارەوە دەیگوت: «فۆما فۆمیچ! ئاخ دایە گیان! بە خوا من بێتاوانم! هەروا لە دەمم دەرچوو!... فۆما، ئێوە بە چی لە من تێگەیشتوون؟ بابە، من کەسێکی نەفامم، خۆم هەست بەوە دەکەم کە نەفامم، خۆم لە ناخەوە ئاگادارم کە قسەکانم

---

١. نا، کوڕەکەم. (فەڕەنسی) «و. ف»

بێمانان... دەزانم، فۆما، هەموو شتێك دەزانم! ئیدی پێویست ناكا ئێوە پێم بڵێن! »

دەستەكانیی والآ دەكردنەوە و لەسەری دەڕۆیشت: «ئەوە چل ساڵ لە تەمەنم تێپەڕیوە و تا ئێستە... تا ئەو ساتەی كە ئێوەم ناسی، بەردەوام وام بیر دەكردەوە كە مرۆڤێكم بۆ خۆم... هەموو شتێك هەر بەو جۆرەیە كە پێویستە ببێ. وەلێ ئەوە ئەمڕۆ لەوە تێگەیشتم كە هەروەكو شەیتان[1] لە گوناهدا نغرۆ بوومە و لە پێشی پێشەوەی خۆپەرستەكانی جیهاندام. من سەرم لەوە سووڕ ماوە كە چۆن زەوی تا ئێستە بەرگەی ئەم هەموو گوناهەی منی گرتووە و ڕۆنەچووە! »

جا ئەوسا فۆما فۆمیچ بە ڕەزامەندییەوە دەیگوت: «بەڵێ، ئێوە خۆپەرستن! »

– بەڵێ، ئێستە ئیدی خۆشم دەزانم كە خۆپەرستم! نا، ئیدی بەسە! گۆڕانكاری لە خۆمدا دەكەم و چاكتر دەبم!

– خوا بكا وا بێ!

فۆما فۆمیچ بە ویقاری پیاوخاسێكەوە هەناسەیەكی قووڵی هەڵدەكێشا، لەسەر قەنەفەكە هەڵدەستا تا بچێت وەنەوزی پاش فراوێنەكەی بكات. ئەو، هەمیشە دوای خواردنی فراوێن وەنەوزێكی دەدا.

---

١. دۆستۆیڤسكی لە جێی وشەی «شەیتان» لە دەقەكەدا «بزن»ی بە كار هێناوە، هۆكارەكەشی ئەوەیە كە یەهوودییەكان شەهوەت بە یەكێك لە تایبەتمەندییەكان بزن دەزان و لە وانەكانی ئنجیلدا بزن هێمای شەیتانە. «و. ف»

مۆڵەت بدەن لە کۆتاییی ئەم وەرزەدا باسی پەیوەندیی نێوان خۆم و خاڵە بکەم و لەوە بدوێم کە چۆن ڕووبەڕووی فۆما فۆمیچ بوومەوە و کتوپڕ بە شێوەیەکی چاوەڕوانینەکراو کەوتمە نێو گرنگترین ڕووداوگەلێکەوە کە تا ئەو ڕۆژە لە گوندی موبارەکی ستێپانچیکۆڤۆدا شتانێکی وا ڕوویان نەدابوو. من گەرەکمە بەم چەشنە پێشەکییەکەم کورت بکەمەوە و ڕاستەوڕاست بچمە سەر کاکڵی باسەکە:

بە منداڵی کە هەتیو کەوتم و ئیدی لەم دونیایەدا هیچ کەسێکم بۆ نەمایەوە، خاڵە جێگەی باوکمی بۆ پڕ کردمەوە و خەرجیی خوێندن و پەروەردەکردنمی گرتە ئەستۆ. بە کورتییەکەی، ئەوەی کە ئەو بۆ منی کرد، هیچ باوکێك بۆ کوڕی خۆیشی نایکات. ئەو کاتە من دە ساڵان بووم. بیرمە کە من و ئەو زۆر زوو بە سرووشتی یەکدی ڕاهاتین و بە تەواوی لێك تێدەگەیشتین. پێکەوە فرفرۆکەبازیمان دەکرد و کڵاوی پیرێژنێکی بەدخوومان دەدزی کە بە هەڵکەوت خزمی هەردووکمان بوو. من خێرا کڵاوەکەم بە کلکی کۆلارەوە دەبەست و دەمدایە دەم با. ساڵانی دوایی لە پترسبورگدا، جاروبار چاوم بە خاڵە دەکەوت. ئەو وەختانە من ئیدی خەریکی تەواوکردنی خوێندنەکەم بووم، کە هەڵبەتە خاڵم هەموو خەرجییەکەی بۆ دابووم. ئەم جارەیان بە هەموو گوڕوتینی لاویەتییەوە وابەستەی ئەو بووم: کەسایەتیی ڕەسەن، نەرمونیان، ڕاستگۆ و لەڕادەبەدەر سادەی ئەو، سەرسامی کردبووم و ئەمە سەرنجی هەر کەسێکی دیکەشی بەرەو خۆی ڕادەکێشا. کە خوێندنی زانکۆم تەواو کرد، تا

ماوەیەك لە پترسبورگ مامەوە، وێڕای ئەوەی کە هیچ ئیشێکم نەدەکرد، کەچی وەك هەر مرۆڤێکی هەڵواسراو بڕوام وا بوو کە لە کاتی خۆیدا کارێکی مەزن ئەنجام دەدەم. حەزم نەدەکرد پترسبورگ جێبهێڵم. لەگەڵ خاڵەدا نامەی زۆرم نەدەگۆڕییەوە و تەنیا لەو کاتانەی کە پارەم پێویست بوو، نامەیەکم بۆ دەنووسی. ئەویش هیچ کات دەستی بە ڕووممەوە نەدەنا. هەر لەو وەختانەدا بوو کە یەکێك لە ڕەعیەتەکانی خاڵە بە بۆنەی کارێکەوە هات بۆ پترسبورگ. لەوم بیست کە لە ستێپانچیکۆڤۆدا وا خەریکە ڕووداوێکی سەیروسەمەرە دەقەومێ.

بڕیارم دا نامەگەلێکی جددیتر بنووسم. خاڵە زۆر سەیر و تەماوی وەڵامی دەداوە و لە نامەکانیدا تەنیا هەوڵی دەدا لە زانست بدوێت و ئەوەی کە چاوەڕێیە پێشکەوتنی زانستیی من ببینێت و شانازی بە سەرکەوتنەکانی داهاتوومەوە بکات. دوای بێدەنگییەکی درێژخایەن، کتوپڕ نامەیەکی سەیرم لەلایەن ئەوەوە پێ گەیشت کە هیچ لێکچوونێکی لەگەڵ نامەکانی پێشووتریدا نەبوو. ئەم نامەیە بە چەشنێك پڕبوو لە ئاماژە و لێکدژی کە سەرەتا نەمتوانی هیچی لێوە هەڵبکرێنم. تەنیا هەر ئەوەندە دیار بوو کە نووسەرەکەی زۆر بە جددی دەدوێت. تاقە شتی ڕوونی نێو ئەو نامەیە، ئەوە بوو کە خاڵە زۆر بە جددی، بنجبڕانە و تا ڕادەیەك تکاکارانە داوای لە من کردبوو کە لەگەڵ کچی یەکێك لە موڵکدارە کەمداهاتەکانی ناوچەی یڕژێڤیکین زەماوەند بکەم کە لەژێر سەرپەرشتیی خۆیدا پەروەردە کرابوو و بە پارەی ئەو خوێندنی لە خوێندنگەیەکی نموونەیی مۆسکۆدا تەواو

کردبـوو و هەنووکـەش مامۆسـتای منداڵـەکانی ئـەو بـوو. خاڵـە نووسیبووی ئەو کچێکی بەدبەختە و من دەتوانم بەختیاری بکەم و ئەم ئیشەی من بە کردەوەیەکی دلێرانە دێتە ئەژمار و جا پاشان ئامـاژەی بـە دڵباشـیی مـن کردبـوو و بەڵێنیشـی دابـوو کـە خـۆی پاشتێلانەی کچەکە بگرێتە ئەستۆ. هەڵبەتە بە جۆرێك لە پارێز و ژێراوژێـری باسـی لـە پاشـتێلانە کردبـوو و لـە کۆتـایی نامەکەشـدا داوای لیّ کردبووم کە ئەم مەسەلەیە وەك نهێنییەکی گەورە لای خۆم بهێڵمـەوە. نامەکـە بـە چەشـنێك ڕایهەژانـدبووم کـە تـا ماوەیـەك هـەر واقووڕ بووم. ئەم پێشنیارە، لانیکەم گەر لـە ڕووە عاشقانەکەشیەوە لێی بڕوانین، کاریگەری لەسەر چ لاوێکی تازەپێگەیشتوو دانانێت؟ جا جگە لەوەش، من بیستبووم کە ئەو مامۆستایە تا ڕادەیەك شۆخ و شەنگیشە. وەلیّ لەو هەلومەرجەدا نەمدەزانی پێویستە چ بڕیارێك بدەم، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بۆ خاڵم نووسی کە دەمودەست دێم بۆ ستێپانچیکۆڤۆ. خاڵە لەگەڵ ئەو نامەیەدا، پارەی گەشتەکەشی بۆ ناردبووم. مـن (وێـڕای ئـەوەی کـە دڕدۆنـگ و تەنانـەت دڵپەرۆشـیش بـووم) کەچـی تـا مـاوەی سیّ حەفتـەی دیکـە گەشـتەکەمم دواخسـت. ڕۆژێکیـان زۆر بـە هەڵکـەوت چـاوم بـە یـەکێك لـە هاوقـەتارەکانی پێشـووی خاڵـە کـەوت کـە لـە ڕێگـەی گەڕانـەوەی لـە قـەفقازەوە سەرێکیشی لە ستێپانچیکۆڤۆ دابوو. پیاوێکی بەتەمەن و دنیادیدە بوو کە هەروا مکووڕانە بە سەڵتی مابووەوە. ئەو بە قینەوە دەستی کردە باسـی فۆمـا فۆمیچ و قسـەی لـە بابـەتێك کـرد کـە تـا ئـەمڕۆش نـەمتوانیوە بە تـەواوی لێـی تێبگـەم. بابەتەکەش ئەوە بوو کـە فۆمـا فۆمیچ و ژنـی جەنـەراڵ پیلانیـان دانـابوو تـا خاڵـە بهێننـە ژێـر بـاری

ئەوەی کە لەگەڵ پاکیزەیەکی بەتەمەن و سەیروسەمەرەدا زەماوەند بکات کە کەمتازۆر کەمئەقڵیش بوو و بەسەرهاتێکی نائاسایی و پاشتێلانەیەکی نیوملیۆنیی هەبوو. ژنی جەنەراڵ توانیبووی ئەو پاکیزەیە بهێنێتە سەر ئەو بڕوایەی کە ئەوان خزمایەتییان لەگەڵ یەکدیدا هەیە و لە ئەنجامدا، ئەو بکاتە بووکی خۆیان. هەڵبەتە خاڵم لەو ساتانەدا هێشتا ڕاڕایە، وەلێ وا دیارە کە مەسەلەی زەماوەندکردنی خاڵە لەگەڵ نیوملیۆن پاشتێلانەدا یەکلایی کراوەتەوە. جا دواجار ئەو دوو مرۆڤە فرەزانە[1] (فۆما فۆمیچ و ژنی جەنەراڵ) بەوپەڕی توانایانەوە کەوتوونەتە گیانی مامۆستای داماو و ستەمدیتوی منداڵەکانی خاڵە و لە ترسی ئەوەی کە نەکا سەرهەنگ هۆگری ببێت یان لەبەر ئەوەی کە ئیدی سەرهەنگ هۆگری بووە، دەیانەوێ لەو ماڵەی دەربپەڕێنن. کە ئەم دواهەمین ڕستەیەم خوێندەوە، وەك ئەوە وابوو پیکێك بە سەرمدا بکێشن. هاوقەتارەکەی خاڵەشم، لە وەڵامی پرسیارەکانی مندا (ئایا خاڵە هەر بە ڕاستی هۆگر بووە یان نا؟) نەیدەتوانی یان نەیدەوست وەڵامێکی ڕێکم بداتەوە، بە گشتی ناڕاستەوخۆ قسەی دەکرد و دیار بوو کە دەسئەنقەست خۆی لە وەها ڕوونکردنەوەیەك دەدزێتەوە. کەوتمە بیرکردنەوە. بەسەرهاتەکە بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر لەگەڵ دەقی نامەکەی خاڵەدا ناتەبا بوو!... ئیدی هیچ دەرفەتێك بۆ خنەخنکردن لە ئارادا نەبوو. بڕیارم دا خێرا بچم بۆ ستێپانچیکۆڤۆ، هیوام وا بوو کە نەك هەر بە تەنیا خاڵە بهێنمەوە هۆش خۆی و

---

١. فرەزان: زۆرزان، فێڵباز، تەڵەکەچی.

هێوری بکەمەوە، بەڵکە بە پێی توانا هەوڵی ڕزگارکردنیشی بدەم، یانی فۆما لەوێ وەدەربنێم و زەماوەندە شوومەکەشی لەگەڵ ئەو پیرەکچەدا هەڵبوەشێنمەوە و دواجار، بەو پێیەی کە گەیشبوومە ئەو ئەنجامەی کە خۆشەویستییەکەی خاڵە تەنیا بیانوێکی درۆیینەی فۆمایە، ئەو شۆخەکچە داماوە بخوازم و بەختەوەر و نازانم چی و چیی بکەم... بە هۆی کەفوکوڵی لاویەتی و بێکاریم، خۆم بە بیرکردنەوە لەم بابەتەوە سەرقاڵ کرد و وەها پاڵنەرێکم لە خۆمدا ساز دا، کە لە دوودڵییەوە گەیشتمە لووتکەی ئەرخەیانی. لە ماوەیەکی کورتدا ئارەزوویێکم بۆ ئەنجامدانی کاری گەورە و ستاییشئامێزانە تێدا وروژا. تەنانەت وام بە بیردا دەهات کە بە خۆکردنە قوربانی لە پێناو ئەو بوونەوەرە بێتاوان و دڵخوازەدا، کارێکی تەواو لەخۆبردووانە و بێوێنە ئەنجام دەدەم. بە کورتی، بیرمە کە بە درێژایی ڕێگە، لە خۆم قاییل و ئاسوودە بووم. مانگی حوزەیران بوو و هەتاو دەدرەوشایەوە. دەوروبەرم بە گۆڕەپانی بێکۆتای جارەگەنم تەنرابوو... جا لەبەر ئەوەی دەمێك بوو خۆمم لە پترسبورگدا بەند کردبوو، لام وابوو کە وا ئێستە، بەو جۆرەی کە پێویستە، چاوەکانم بە ڕووی جیهاندا هەڵهێناون!

# وەرزی دووەم

## جەنابی باخچییڤ

بەرەبـەرە لـە مـەنزڵ نزیـك دەبووینـەوە. كـە گەیشـتینە شارۆچـكەی «ب»، ناچار بووم سەرێك لە دوكانی ئاسنگەری بدەم. مەودای نێوان ئـەوێ و ستێپانچـیكۆڤۆ هـەر دە وێرسـتایەك دەبـوو. ڕێـك لـەنزیك دەروازەی شارۆچـكەكەدا بـوو كـە تایـەی گالیسـكەكەم دەرپـەڕی. كاتێكی وای نەدەویست تا بەشی ئەوە چاكی بكەنەوە كە بڕی دە وێرستا بكات. لەبەر ئەوە، بڕیارم دا تا ئاسنگەران تایەی گالیسكەكە چـاك دەكەنــەوە، نەچــمە هــیچ شــوێنێك و هــەر لــەوێ، لەبــەردەم دوكانەكەدا چاوەڕێ بم. لەگەڵ دابەزینمدا، چاوم بە كابرایەكی قەڵەو كـەوت، كـە ئـەویش وەك مـن، بـۆ چـاككردنەوەی گالیسـكەكەی، بـە ناچـاری لـەوێ لای دابـوو. ئـەو كـە كاتـژمێرێك دەبـوو لـەو گـەرما بەتینــەدا دامــابوو، لــە بــەرخۆوە جــوێنی دەدا و پشــوكورتانە پرتەوبۆڵەی بەسـەر ئەو شاگرد و وەستایانەدا دەكـرد كـە بە دەوری گالیسـكە جوانەكەیـدا كردوكۆشـیان بـوو. كـاكی بـەدخوو، هـەر لـە یەكـەمین نیگـادا بـە كەسـێكی بۆڵەبۆڵكـەر هاتـە بـەر چاوم. تەمـەنی، خـۆی چـلوپێنج سـاڵێك دەدا و ئاوڵـەڕوو و بـاڵای مامناوەنـدی بـوو. لەشی قەڵەو و غەبغەبە و لێوی خڕپن و شۆڕی ئاماژەیان بە ژیـانێكی

خۆشـگوزەرانانە و بێکێشـە دەکـرد. ئەندامـەکانی لەشـی بـارێکی ژنانەی تایبەتییان هەبوو و خێرا سەرنجیان ڕادەکێشایت. جلەکانی بەری پانوپۆڕ، وەلێ هاوکات ڕێکوپێك بـوون، بەس لەگەڵ مۆدێلی ڕۆژدا نەدەگونجان.

گەرچی ئەوە یەکەمین جار بوو لـە ژیانمدا چاوم پێی بکەوێ و پێشتر هەرگیز قسەم لەگەڵدا نەکردبوو، کەچی نازانم بۆ هەر لە خۆوە پێم قەڵس بوو. من هەر لەو ساتەی سەرەتادا کە لە گالیسکەکەوە بازم دایە خوارێ، ئەمەم لە چاوە ئێجگار ڕقاوییەکانیدا خوێندەوە. وێڕای ئەوەش زۆرم حەز دەکرد پێی ئاشنا ببم. لە ڕێی یەکێك لە خزمەتکارە زۆربلێکانییەوە تێگەیشتم کە لە ستێپانچیکۆڤۆ و لەلای خاڵمەوە هاتووە، کەواتە ئەوە دەرفەتێکی زۆر باش بوو تا هەندێك زانیاریی لێ وەربگرم. کڵاوم لەسەر لابرد و بەوپەڕی ڕووخۆشییەوە دەستم کردە باسی ئەوەی کە ماتڵبوون لە ڕێگەدا هەر بە ڕاستی شتێکی ناخۆشە، کەچی کابرای خەپە کتوپڕ بە قەڵسی و بێزارییەوە، لە کەمەرەوە بەرەو سەر، بە ئاراستەی من وەرسووڕا و، جا بە نیگایەکی منەتبارانەوە چاوێکی بە سەراپامدا گێڕا و لەژێر لێوەوە پرتەوبۆڵەیەکی لێوە هات و پشتی تێ کردم. گەرچی ئەم بارەی بۆ تەماشاچییەك زۆر سەرنجڕاکێش بوو، وەلێ بە تەواوی تێی دەگەیاندیت کە بە هیچ شێوەیەك ناکرێ چاوەڕێی گفتوگۆیەکی دڵخوازی لێ بکەیت.

جا پاشان ئەسڵەن وەك ئەوەی کە هەر قسەکەمی لە بارەی ماتڵبوونی نێو ڕێگەوە نەبیستبێت، هاواری بەسەر خزمەتکارێکیدا کرد:

– هۆو گریشکا! ئەوەندە لەژێر لێوەوە بۆم مەبۆڵێنە! پێستت دادەماڵم ها!...

ئەم گریشکا سەرسپییەی کە کۆتێکی درێژی لە بەر بوو و ریشێکی سپی و زۆر درێژی هەبوو، پێدەچوو لە زووەوە خزمەتکاری ئەو بێت. بە رووالەتیدا دیار بوو کە ئیدی ئەویش بێزارە، چونکە بە رووخسارێکی مۆن، لە بەرخۆوە هەر خەریکی جوێندان بوو. جا دەمودەست گەورە و خزمەتکار بووە دەماقاڵێیان. گریشکا، لە بارێکدا کە پشتی تێکردبوو و بە توورەییەوە خەریکی گالیسکەکە بوو، منگاندی:

– پێستی من دادەماڵی؟ قەینا، جارێ بە دڵی خۆت بنەرێنە!

دەتگوت لەگەڵ خۆیدا قسان دەکات، وەلێ دەنگی هێندە بەرز بوو کە هەمووان گوێیان لێی بوو. کابرای خەپە، کە لە توورەییاندا شین و مۆر بووبووەوە، هاواری کرد:

– چی؟ ئەوە تۆ چیت گوت؟ *بە دڵی خۆم بنەرێنم، ها؟*... هەمدیس لە رووم وەستایتەوە، ها؟

– ئەی بۆچی خۆتان قسەی ناخۆش دەفەرموون؟ یانی نابێ قسەش بکەین؟

– چی؟ قسەی ناخۆش دەکەم؟ گوێتان لێیە؟ ئاساییە ئەو بەسەرمدا ببۆڵێنێ، وەلێ نابێ من قسەی ناخۆشی لە روودا بکەم!

– ئەی هاوار، من کەی بەسەرمدا بۆڵاندوون؟

- کەی بۆڵاندووتە؟... یانی نازانی، ها؟ وەڵێ من هۆکارەکەشی دەزانم: لەبەر ئەوە ناوچاوت داوە بە یەکا کە من لەسەر خوانی فراوێن هەستام و هاتمە دەرێ... هۆکارەکەی ئا ئەوەیە.

- ئەی هاوار، ئاخر ئەوە کەی پەیوەندیی بە منەوە هەیە! ئێوە ئارەزووی خۆتانە کە فراوێن دەخۆن یان نا. خۆ بەسەر ئێوەمدا نەبۆڵاندووە. من لەگەڵ ئەم ئاسنگەرانەم بوو.

- یانی لەگەڵ ئاسنگەرەکانت بوو... جا بۆ بەوانی دەڕژێ؟

- خۆ بەوانم نەڕشتووە، من پرتەوبۆڵەی ئەم گالیسکەیە دەکەم.

- جا بۆ نموونە پرتەوبۆڵەی گالیسکەکە دەکەی کە چی ببێ؟

- دەی، لەبەر ئەوەی پەکی کەوت و ماتڵی کردین! تا ئیدی لە کار نەکەوێ و لە نیوەی ڕێگەدا دەسخەڕۆمان نەکا.

- نا گیانە، مەسەلە گالیسکە نییە... نا، تۆ پرتەوبۆڵەی من دەکەی. گەرچی دەزانی خەتاکە لە خۆتەوەیە، کەچی یەخەی ئەوانی دەگری!

- چی بووە، گەورەم! ئێستە ئیدی گرتتان بە ئێمەوە! واز بێنن توخوا!

- بۆ بە درێژیی ڕێگە وەکو بایەقووشێك دانیشتبووی و یەك قسەشت لەگەڵ نەکردم... ها؟ خۆ وەختانی دی باشی دەڕێسی!

- مێش چووبووە گەرووم‌ەوە گەورەم... بۆیە وەکو بایەقووش وسکت بووم. جا بۆ مەگەر بڕیار وایە من چیرۆکتان بۆ بگێڕمەوە؟

گەر حەزتان لە چیرۆك بوو، لەمەودوا ئەو خانمی *مالانیای* چیرۆکبێژە لەگەڵ خۆتان بێنن.

کابرای خەپە دەمی کردەوە تا وەڵامی بداتەوە، وەڵێ هیچ شتێکی بە زەیندا نەهات و بێدەنگ بوو. نۆکەرەکەش کە وا دەردەکەوت زۆر لە قسەکەی خۆی و لەو سەرکەوتنە ڕازییە کە لەنێو ئامادەبوواندا بە نسیبی بووبوو، بە شکۆیەکی دووبەرانبەرەوە دەستی کردە دوان لەگەڵ شاگردەکان و شتی پیشان دەدان.

هەوڵدانەکەم بۆ ئاشنابوون سەری نەگرت، جا بە تایبەت لەبەر ئەوەش کە شەرمۆك بووم. لەم وەختەدا، کتوپڕ لە پەنجەرەی هۆدەی سەرداپۆشراوی گالیسکەیەکەوە سەروسەکوتێکی خەواڵو، چڵکن و بژاو وەدیار کەوت. ئەم گالیسکە بێتایەیە، پێدەچوو ڕۆژانێك بێت بە هیوای چاککردنەوەوە، بێهوودە لە بەردەم ئەو دوکانی ئاسنگەرییەدا ڕاگیرابێت. هەرکە ئەو سەروسیمایە لە پەنجەرەوە وەدیار کەوت، وەستا و شاگردانی ئاسنگەرییەکە، تێکڕا لە تریقەی پێکەنینیان دا. بابەتەکەش ئەوە بوو کە ئەو پیاوە لە گالیسکەدا زیندانی کرابوو و نەیدەتوانی بێتە دەرێ. بەدەم سەرخۆشییەوە خەوێکی باشی بۆ کردبوو و ئێستاکەش، بێهیوایانە دەپاڕایەوە تا لە گالیسکەکە دەری بێنن، جا دواجار تکای لە یەکێك کرد بچێت کەرەستەکانی بۆ بهێنێتەوە. ئەم ڕووداوە بە تەواوی ئامادەبووانی خستبووە پێکەنین.

مرۆڤانێك هەن کە شتگەلی سەیروسەمەرە دەبێتە مایەی شادییان و دەیانخاتە پێکەنین، بۆ نموونە هەڵسوکەوتی مۆژیکێکی سەرخۆش، سەرسمدان و کەوتنی کەسێك لە ناوەڕاستی شەقامدا،

دەمەقرەی ژنان و ئەم جۆرە بابەتانە. جا ڕوون نییە کە بۆچی ئەم جۆرە ڕووداوانە هەیەجانێکی[1] خۆش و هێمن دەهێننە ئاراوە. موڵکدارە خەپەکەی ئێمەش سەر بەم دەستە مرۆڤانە بوو. لە ڕووخساری تووڕە و مۆنی ئەودا، بەرەبەرە بارێکی شاد و میهرەبانانە وەدەرکەوت و دواجار ڕووی گەشایەوە و بە بارێکی دڵسۆزانەوە پرسیی:

– ئەرێ ئەمە *ڤاسیلی یێڤ* نییە؟ چۆن خزاوەتە ئێرە؟

تێکڕا بە دەنگی بەرز گوتیان:

– خودی ڤاسیلی یێڤە، جەنابی *ستێپان ئالێکسییێڤیچ باخچیێڤ*، ڤاسیلی یێڤە.

یەکێك لە شاگردانی ئاسنگەرییەکە، کە نێوانساڵ[2] و باڵابەرز و باریکەلە بوو، بە سەروسیمایەکی جددی و دانایانەوە ئەمەی بۆ زیاد کرد:

– سەرخۆشە، بەڕێز گیان، سەرخۆش! ئێستە وا سێ ڕۆژە لە دەستی گەورەکەی هەڵهاتووە و خزاوەتە ئێرە. بووە بە ڕیشمانەوە، بابە! جا ئێستە داوای ئەسکنەش دەکات[3]. ئاخر کەللەپووت ئەسکەنەت بۆ چییە؟ گەرەکیەتی ئەم دواهەمین کەرەستەیەشی بخاتە ڕەهنەوە!

---

١. هەیەجان: کاردانەوەیەکی هەستی یان ئاکاری لەبەرانبەر دۆخی چاوەڕوانینەکراودا.

٢. نێوانساڵ: بە کەسێك دەگوترێت کە تەمەنی لەنێوان ٤٠ تا ٥٠ ساڵدا بێت.

٣. ئەسکەنە، کەرەستەی دارتاشی.

ڤاسیلی یێڤ سەری لە گالیسکەکە هێنابووە دەرێ و بە دەنگێکی باریك و لەرزۆك پاڕایەوە:

– هۆو، *ئارخیپ* گیان! بابە، پارە وەك چڵکی دەست وایە و دێ و دەڕوا. تۆبی و ئەو خوایە لێرەم نەجات دە.

ئارخیپ بە قینەوە گوتی:

– مەیکە بە هەڵا و لەوێ دانیشە بۆخۆت! بەختت هەبوو! ئەوە سێ ڕۆژە سەرخۆشی، ئەم بەیانییە لەسەر شەقام هەڵمان گرتییەوە و هێنامانی بۆ ئێرە، بڕۆ شوکری خوا بکە کە حەشارمان دای هەی نەگبەت. بە *ماتێڤی ئیلیچ*مان گوتووە: هەمدیس تووشی باگونە[1] بوویتەتەوە.

دیسان دەنگی قاقا بەرز بووەوە.

– ئێستە ئەسکەنەکەی لە کوێیە؟

– لای *زوئی*یە! مێشکی خستووین، بەڕێز! خوێڕیی وا دایمە سەرخۆشە، جەنابی ستێپان ئالێکسییڤیچ باخچییڤ.

کابرای خەپە، لە بارێکدا کە لەبەر پێکەنین کەوتبووە هەناسەبڕکێوە، گوتی:

– هە، هە، هە! هەی کڵاوچی! یانی تۆ ئاوا لە شار ئیش دەکەی... کەرەستە دەخەیە ڕەهنەوە، ها؟

---

١. باگونە، ئاوسان و باکرنی گون، قیرە بوون، تووشبوون بە فتق.

ئەم دەربڕینە تەنزئامێزە لە «دەفتەری سیبریا» و لە پاشینەی ژمارە ١١٨دا هاتووە. دۆستۆیڤسکی، هەروا لە *یادگارییەکانی یانەی مردووان*یشدا بەکاری هێناوە. «و. ف»

ئەو کە تەواو خۆشکەیف و قاییل دەهاتە بەرچاو، بە شێوەیەکی چاوەڕوانینەکراو ئاوڕی لە من دایەوە و درێژەی پێ دا:

– ئەم کابرایە دارتاشێکە لە مۆسکۆدا تاکی نییە! هەی خوێڕی، هەمیشە ئاوا خۆی دەناسێنێ. ئارخیپ، بەری دە: ڕەنگە پێویستیی بە شتێ هەبێ.

بە قسەی کابرای خەپەیان کرد و ئەو مێخەیان بە دەرگەی گالیسکەکەوە لابرد کە بە تایبەت بۆ ئەوە پێوەیان کردبوو تا وەختێك ڤاسیلی یێڤ لە خەو هەڵدەستێت، نەتوانێت بێتە دەرێ و ئەوانیش پێی پێبکەنن. ئەوجا ڤاسیلی یێڤ، چڵکن و پەڕپووت و شڕوشێواو پێی نایەوە سەر زەوی. لە تاو ڕووناکی خۆردا چاوی دەترووسکاند و لەتری دەدا و هەیتا هەیتا دەپژمی، دەستی بە بان چاوییەوە کردە کەپر، پاشان لە چواردەوریی ڕوانی، جا سەرێکی بادا و گوتی:

– تەماشای جەماعەت! تۆ بڕوانە! هەموویان، وا دیارە، هۆشیارن.

بە ئاوازێکی خەمگین و درێژکراوەوە، وەك ئەوەی بیەوێت خۆی سەرکۆنە بکات، لەسەر قسەکەی ڕۆیشت:

– دەی، بەیانیتان باش، برالەکانی خۆم، ڕۆژتان باش.

هەمدیس هەمووان لە تریقەی پێکەنینیان دایەوە.

– ڕۆژی تۆش باش! دەزانی چەند ڕۆژە بێئاگای، هەی پیاوی پاتاڵ!

– هەر خەریکی درۆکردن بە، خۆ درۆ بە پارە نییە!

– بابە، وەك دەڵێن، ئەمڕۆ خۆش ڕایبوێرە، ئەی هوو تا سبەی!

کتوپڕ کابرای خەپە، کە لە تاو پێکەنین پێچی دەدایە خۆی، هەمدیس بە ڕووخۆشییەوە لای لێ کردمەوە و بە دەنگی بەرز گوتی:

– هە هە هە! فێری قسەش بووە! ئاخر ڤاسیلی یێڤ، شەرم لە خۆت ناکەی؟

ڤاسیلی یێڤ، ڕازی لەوەی کە دەرفەتێك هەڵکەوتووە تا باسی نەگبەتییەکانی خۆی بکات، بەدەم دەستڕاوەشاندنەوە، زۆر بە جددی گوتی:

– نەگبەتییە ئیدی، بەڕێز ستێپان ئالێکسی یێڤیچ، نەگبەتی.

– چ نەگبەتییەك، دەبەنگ؟

– لەو جۆرە نەگبەتییانەی کە تا ئەمڕۆش نەتاندیون: بەتەمان وەك ڕەعیەت بمانکەن بە ناوی فۆما فۆمیچەوە.

کابرای خەپە بە تەواوی سووڕ هەڵگەڕا و هاواری کرد:

– کامانەتان؟ کەی؟

هەنگاوێك چوومە پێش: ئیدی باسەکە خەریکبوو بە منیشەوە گرێ دەدرا.

– هەموو خەڵکی *کاپیتۆناڤکا*. گەورەی ئێمە (جەنابی سەرهەنگ) کە خوای لێ ڕازی بێ، بەتەمایە هەموو ئێمەی خەڵکی کاپیتۆناڤکا و داهاتەکەی بە خێر بداتە فۆما فۆمیچ، بەتەمایە حەفتاوشەش ڕەعیەتی بداتێ. بێگومان بە کابراش دەڵێ: *وەرن فۆما گیان، مانێ ئەوە هەمووی بۆ خۆتان! خۆ ئێوە لەم دارەی دونیایەدا هیچ شتێکتان نییە، زەویدار نین و بێ لە دوو دانە ماسیی خاتونەکی نێو*

*دەریاچەی لاداگا خاوەنی هیچ شتێ نین و لە باوانیشتانەوە، تەنیا چەند ڕەعیەتێکی سەرژمێریکراوتان[1] بە میرات بۆ ماوەتەوە. باوانتان...*

ڤاسیلی یێڤ، لەو بەشەی باسەکەدا کە پەیوەندیی بە فۆما فۆمیچەوە هەبوو، بە تەواوی هەڵچدەچوو و بە حەزێکی ڕقاوییانەوە دەری دەبڕی:

– *... باوانتان سەر بە خانەدانە ڕەسەن و ڕەچەڵەکدارە دێرینەکان بوونە، گەرچی بنەچەیان دیار نییە، ڕێك وەکو خۆتان کە ژیانێکی شکۆمەندانەتان هەبووە، وەلێ بە بۆنەی لەخۆبردوویتان، بەوە قاییل بوونە کە ئیشی موبەق بکەن. جا هەرکە کاپیتانۆڤکام کرد بە ناوتانەوە، بۆخۆتان دەبنە موڵکدارێکی خانەدانی ڕەسەن و بنەچەدار و ئیدی ڕەعیەتی خۆتانتان دەبێ. جا لەمەودوا لەتەك کوانووەوە بۆی ڕاکشێن و ژیانێکی خانەدانانە بژین...*

ستیپان ئالێکسی یێڤیچ ئیدی گوێی لەو نەدەگرت. قسەکانی ڤاسیلی یێڤی نیوەمەست کاریگەرییەکی سەیریان خستبووە سەری. کابرای خەپە لە ڕقاندا سوور هەڵگەڕابوو، قوڕقوڕاگەی دەلەرزی و چاوانی بووبوونە گۆمی خوێن و گوتم هاکا بووڕایەوە. بەدەم پیشەپیشەوە گوتی:

– دە سەیر کە توخوا، هەر ئەوەمان کەم بوو! خوێڕییەکی زۆڵ، ئەو فۆمایە سەربارە، بێ و لێمان ببێتە موڵکدار! هەی تف لەم

---

١. ڕەعیەتی سەرژمێریکراو، مەبەست لە ڕەعیەتی ناوتۆمارکراوە و لە لایەن دەوڵەتەوە، باجی ساڵانەیان خرابووە سەر. «و. ف»

ڕۆژگارە! ئێوەش ئیدی چارەڕەش بوون و تەواو و بڕایەوە! هی، دە ئێوەش دەسوبردی لێ بکەن! دەبێ بگەڕێینەوە ماڵێ!

بە دوودڵییەوە چوومە پێش و گوتم:

– مۆڵەت بدەن بزانم، ئێستە باسی فۆما فۆمیچتان دەکرد؟ گەر هەڵە نەبم دەبێ بنەماڵەکەی *ئۆپیسکین* بێ. دەزانن، دەمەوێ... ڕاستییەکەی ئەوەیە کە چەند هۆکارێکی تایبەت وایان کردووە کە لە بارەی ئەم مرۆڤەوە کونجکۆڵ بم و بە جۆرێك لە جۆرەکان زۆرم حەز لێیە بزانم کە قسەکانی ئەم پیاوە تا چ ڕادەیەك ڕاستن. یانی ئەوەی کە گەورەکەی (ئیگۆر ئیلیچ ڕۆستانێڤ) هەر بە ڕاستی نیازی وایە کە یەکێك لە ئاواییەکانی خۆی بداتە فۆما فۆمیچ. بە ڕاستی ئەم بابەتەم زۆر بەلاوە گرنگە و من...

کاکی خەپە قسەکەی پێ بڕیم:

– دەکرێ بزانم بۆچی لە بارەی ئەم مرۆڤەوە، (بە گوتەی خۆتان) کونجکۆڵن؟ بە بۆچوونی من ئەهریمەنێکی زۆڵە نەك مرۆڤ. چیی لە مرۆڤ دەچێ ئەو هیچوپووچە نەگریسە! تەنیا پەڵەیەکە لە عەیبوعار، نەك ئادەمیزاد!

بۆم ڕوون کردەوە کە جارێ هیچ لەسەر ئەو کەسە نازانم، وەلێ ئیگۆر ئیلیچ ڕۆستانێڤ خاڵی منە و بەخۆشم سێرگی *ئالێکساندرۆڤیچ*... م. کابرای خەپە کە لە دڵەوە خۆشحاڵ بوو، کتوپڕ هاواری کرد:

– ئادەی بزانم، ئێوە دەبێ یارۆ کوڕە شەهادەدارەکە بن. باوکە گیان، لەوێ تامەزرۆیانە چاوەڕێتانن! من هەر ئێستە لای ئەوانەوە هاتووم، لە ستێپانچیکۆڤۆوە دێم، لەسەر خوانی فراوێن هەستام و هاتمە دەرێ. کە پودینگیان[1] هێنا من هەستامەوە. نەم دەتوانی بەر بەخۆم بگرم و ببمە هاونشینی فۆما! لەبەر ئەو فۆما نەفرەتییە لەگەڵ هەمووان بووەتە شەڕم... سەیرە! تۆ تەماشای هەڵکەوت! باوکە گیان، داوای لێبووردن دەکەم. من ستێپان ئالێکسییڤیچ باخچییێڤ باخچییێڤم و شێوەی مندالیتانم لە بیرە... ئەی هاوار، کێ بیری بۆ شتی وا دەچوو؟... مۆڵەت بدەن با...

جا کابرای خەپە هاتە پێشێ تا ماچم بکات.

هەر لەوێ، دوای دامرکانەوەی کەفوکوڵی ئەو ساتانەی سەرەتا، خێرا دەستم کردە پرسیارکردن: ئەمە باشترین هەلومەرج بوو. پرسم:

– باشە ئەم فۆمایە کێیە؟ چۆن ئاوا دەسەڵاتی بەسەر ماڵەکەدا گرتووە؟ بۆچی بە قامچی چارەی ناکەن و فڕێی نادەنە دەرێ؟ دەبێ دانی پێدا بنێم...

---

١. پودینگ: جۆرە خۆراکێکە، شێوازی ئامادەکردنی: ٢٥٠گرام شیر لەگەڵ بڕێکی پێویست لە شەکر و قەڵەمێك ڤانیلی کوڵاو، دواتر ٨دانە پسکیتی تێدا دەخووسێنن، جا پسکیتەکان دەخرێنە نێو قاڵبێکەوە کە ئاردی پێدا پژێنراوە. سپێنەی چوار هێلکەی بە باشی تێکدراو دەکرێتە ناوی، جا دواتر زەردێنەکەشیان بە باشی دەشێوێنرێ و لەگەڵ شیری گەرمدا تێکەڵ دەکرێ و بەسەر پسکیتەکاندا دەکرێ، ئەوسا بۆ پێنج خولەك قاڵبەکە دەخرێتە نێو فڕنێکی گەرم و جا دوای کوڵان، بە گەرمی یان ساردی دەخورێت. «و. ك»

– چی؟ ئەو بکەنە دەرێ؟ نەکا تووشی خەیاڵات بووبی؟ خودی ئیگۆر ئیلیچ لە بەردەمیدا لەسەر سنگی پێ ڕێ دەکا! جارێکیان فۆما بڕیار دەدا کە پێنجشەممە، بخرێتە شوێنی چوارشەممە. جا هەر بەو بۆنەیەوە، هەر هەموان ئیدی بە پێنجشەممە دەڵێن چوارشەممە. *من کەیفم بە پێنجشەممە نایێ، لێگەڕێن با ئەویش هەر چوارشەممە بێ!* هەر بەم سادەییە. جا هەر لەبەر ئەوە لە حەفتەیەکدا دوو چوارشەممەمان هەبوو. ئێوە وا دەزانن کە من زیادەڕۆیی دەکەم؟ بە هیچ شێوەیەك زیادەڕۆیی ناکەم! باوکە گیان، لێرانە تەنیا مەگەر بە تەڵەکەی *کاپتن کوکی*[1] بکەینە ئەنجامێك!

– من هەموو ئەمانەم بیستوون، وەلێ پێویستە دانی پێدا بنێم...

– ئەم دانی پێدابنێم و دانی پێدابنێمەتان لە چییە! ئێوەش هەر ئەمە پاتە دەکەنەوە! دەتانەوێ دان بە چیدا بنێن؟ خۆ من هەرچی دەڵێم ئێوە بڕوا ناکەن. نەخێر، وا باشە هەر لە خۆمی بپرسن کە لە چ ماڵخەراتێکەوە[2] هاتووم! دایکی سەرهەنگ ئیگۆر ئیلیچ گەرچی

---

١. دۆستۆیڤسکی لە «دەفتەری سیبریا» و لە پاشینەی ژمارە ٣٠٩دا ئاماژەی بەمە کردووە. James Cook (١٧٢٨-١٧٧٩)، دەریاوانێکی بەریتانییە و سەرپەرشتیی سێ دۆزینەوەی گرنگی کرد کە تێیاندا گەلێك لە دوورگە سەرەکییەکانی ئۆقیانووسی ئارام، وەك ئوسترالیا، زلاندنۆ و هاوایی ناسران و نەخشەیان لێ کێشرا. ئازایی کووك لە ڕابواردن بە شوێنگەلی پڕ لە مەترسیدا، لێهاتوویی لە ڕێبەریکردنی کەسان لە هەلومەرجی سەختدا، هەروەها کارامەیی بەرفراوانی لە هونەری دەریاوانیدا، ڕووپێوی و نەخشەلەسەرکێشان، ئەویان بردە ڕیزی سەرکەوتووترین دۆزەرەوانی سەردەمی خۆی. لە بارەی ئەو و گەشتەکانییەوە کۆمەڵێك کتێب نووسراون و لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەم و سەرەتای نۆزدە لە ڕووسیادا بڵاو دەبوونەوە. «و. ف»

٢. ماڵخەرات، شپرزەیانە: ماڵی بێشیرازە.

ئافرەتێکی سەلارە و ژنی جەنەراڵێکیش بووە، وەڵێ هەر دەڵێی ئەقڵ مەرحەبایی لێ نەکردووە، لە بەردەم ئەو فۆما مەلعونەدا، تەنانەت هەناسەش نادا. ئێمەش هەرچی دەکێشین، هەمووی لە سایەی ئەوەوەیە، ئاخر هەر ئەو بوو کە فۆمای لێ گەورە کردین. فۆما هێندە لە بنگوێی ئەوی خوێند، کە ئیدی هەر دەڵێی لاڵ بووە و ناتوانێ بە وشەیەك بەرگری لە خۆی بکات. گەرچی ئەو خانێکە بۆ خۆی و... بە پەنجا ساڵی شووی بە جەنەراڵ کراخۆتکین کرد! جا هەرچی لە بارەی پراسکۆڤیا ئیلینیچنا، خوشکە چلوسێ ساڵە ترشاوەکەی ئیگۆر ئیلیچەوە بڵێم، هێشتا هەر کەمم گوتووە. ئاخ ئاخ ئاخ، هەر دەڵێی مریشکە و دایمە قدقدیەتی. تەواو لێی پڕم! دۆزەخێکت بۆ ساز دەکا کە لە باسا نییە! تاکە جوانییەك کە لەودا هەبێ ژنبوونیەتی. ئەگەریش من ڕێزی لێ دەنێم، ئەوە تەنیا لەبەر ئەوەیە کە ژنە، گەرنا هیچ خاسیەتێکی دیکەی تێدا نییە! هەی تف لەم ڕۆژگارە! جوانیش نییە پیاو ئەم جۆرە قسانە بکا، چونکە هیچ نەبێ ئەو پووری ئێوەیە. بە بڕوای من کچەکەی سەرهەنگ (ئالێکساندرا ئیگۆراڤنا) کە گەرچی هێشتا شازدە ساڵانە، لە هەر هەموویان ژیرترە. ڕێز لە فۆما نانێ، بینینی هەڵسوکەوتی ئەو بەرانبەر بەم فۆما نەفرەتییە، مایەی دڵخۆشییە. ئەلهەق خانم خاسێکی لەبەردڵانە، جا ئەمەش بە تەواوی مانا! ئاخر تۆ بڵێ ڕێز لە کێ بنێ؟ لەو فۆمایەی کە بۆ جەنەراڵ کراخۆتکینی کۆچکردو تەنیا وەك گەپجارێك وابوو و بۆ سەرگەرمیی ئەو، ڕۆڵی هەموو جۆرە ئاژەڵێکی دەگێڕا؟ وەك دەڵێن، ڤانیا تا دوێنێ بوو زەویی دەکێڵا، کەچی ئێستە لێمان بووە بە فەرماندار! وا ئێستەش خاڵە سەرهەنگی ئێوە، بە

چەشنێك ڕێزی لێ دەنێ کە وەك بڵێی باوکی بێ و تەنانەت وێنەی ئەو نارەسەنەی لە چوارچێوە گرتووە و بە ئاشکرا خۆی دەخاتە بەر پێی... هەی تف لەم ڕۆژگارە!

– بە هەرحاڵ، خۆ هەژاری عەیبە نییە... جا... پێویستە دانی پێدابنێم... باشە ئێستە بڵێن بزانم، ئەم فۆمایە چ جۆرە مرۆڤێکە؟ کابرا قۆزە؟ زیرەکە؟

باخچیێڤ، کە ئیدی بە تەواوی لە پرسیارەکانم قەڵس بوو و لە ڕقاندا لەرەیەکی سەیر تێکەڵ بە دەنگی بووبوو، خەمساردانە تەماشایەکی کردم و گوتی:

– فۆما دەڵێی؟ مانگە! ڕێك دەڵێی مانگە! هاوتای نییە، خۆ دەبیستن؟ کوڕی باش، ئێوەش گەڕان و قۆزتان دۆزییەوە!؟ باوکە گیان، گەر دەتانەوێ ڕاستییەکەی بزانن، ئەو پێکهاتەیەکە لە هەموو ئاژەڵان. خراپ نەبوو لانیکەم تۆزێ زیرەکیش با، ئەی خۆزگە تەڵەکەبازی وا کەمێ زیرەك با، ئەوسا گەر تەنانەت لەبەر ئەم زیرەکییەش با، ڕەنگە منیش (بە نابەدڵییەوە) لەم مەسەلەیەدا نەرمیم بنواندبا، وەلێ ئاخر هیچ هۆش و زیرەکییەکیش لە ئارادا نییە! تەنیا هەر ئەوەندە هەیە کە دەڵێی وەك کیمیاگەرێك هەمووانی دەرمانخوارد کردووە! تف! دەمم کەفی کرد. تەنیا دەبێ پشتگوێی خەی و وسکت بی. باوکە گیان، ئێوە بەو قسانە هەر بێتاقەتیشتان کردم!... هێی، لەگەڵ ئێوەمە! ئەرێ ئەمە چاك بوو یان نا؟

گریشکا بە بێزارییەوە گوتی:

– دەبێ نالّی ڤارۆنکاش بگۆڕدرێ.

– ئێی، ڤارۆنکا! ڤارۆنکا! ڕیشەت دەرهێناین تۆش. ئەی چارەت بکـەم، ڤارۆنکـا!... بـە کورتییەکـەی، بـەڵێ کاکـە، مـن دەتـوانم شتانێکتان بۆ بگێڕمەوە کە لە سەرسامییاندا دەمتان بەش بێتەوە و بۆ تاهەتا هەر وا واقووڕ بمێنن. پێشتر خۆشم ڕێزم لەو کابرایە دەنا. بەس لاتان وایە بە کوێ گەیشت، ها؟ کاکە پەشیمانم، پەشیمان، ڕێك وەکو سەگ، دەی من گەمژە بووم ئیدی! منیشی لە خشتە بردبوو. حەکیمی حەکیمانە! خۆی لە وردەکاریی هەموو باسێك دەدا، لە هـەر بابەتێکدا شتێ هەر دەزانێ! بە ناوی دەرمانەوە تنۆکێکی[1] دایـە مـن، باوکـە گیـان، ئـاخر مـن ناسـاغم، قوڕبەسـەر و قەڵـەوم. ڕەنگـە بـاوەڕ نەکەن، وەڵێ هەر بە ڕاستی نەخۆشم. ئەو تنۆکەی کە پێی دابووم، زۆری نەمابوو بە تەواوی نیوەگیانم بکا. ئێوە تەنیا گوێ بگرن، ئێوە کە دەچنە ئەوێ، سەرەتا دەچێتە دڵتانەوە. کارێکی بەو سەرهەنگە کردووە کە ئەوسەری دیار نییە، ڕۆژێ دادێ کە سەرهەنگ لەدەستی ئـەو فرمێسـکی خـوێنین بڕێـژێ، وەڵێ ئەوسـا ئیـدی دێـری کـردووە و هیچ دادی نادا. لەبەر فۆمای نەفرەتی، دراوسێکان ئیدی ئاموشۆی[2] سـەرهەنگ ناکـەن. ئـاخر هـەر کـەس بچـێتە ئـەوێ، ڕووبـەڕووی سـووکایەتیی یـارۆ دەبێتـەوە. ئـەوە باسـی مـن هـەر مەکـە، تەنانـەت پلەبـەرزانیش ناپـەڕێنێ! دواجـار جـۆرە وتارێـك بـۆ هەرکـەیان دەدۆزێتەوە، ئەو خوێڕیی تەڵەکەچییە بووە بە مامۆستای ئەخلاق.

---

١. تنۆك: قەترە.

٢. ئاموشۆ: هاتوچۆ، سەردان، تێکەڵی.

* بێگانە *

بە ئاشکرا دەڵێ، *من تێگەیشتوو و بەکەماڵم، لە هەمووتان زیاتر ئەقڵم بە شت دەشکێ، تەنیا گوێ لە من بگرن*، دەڵێ، *من خوێندەوارم!* دەی کردمان کە خوێندەواریش بوو! یانی هەر لەبەر ئەوەی کە خوێندەوارە، ئیدی دەبێ نەخوێندەواران لە زەواق بنێ[1]! وەختێکیش کە دەست بە جووڵاندنی ئەو زمانە دەرسخوێندووەی دەکا، ئیدی یەك لەسەر یەك وڕ وڕ وڕ! وڕ وڕ وڕ! یانی با بڵێم، زمانێکی ئەوەندە چەنەبازی هەیە کە ئەگەر تەنانەت بشی بڕی و فڕێی دەیە نێو تەپۆڵکە تەپاڵەیەکەوە[2]، لەوێش هەر دەست لە چەنەبازی هەڵناگرێ و، هەتا قالاوێکی لێ پەیدا نەبێ و بە دەنووك لەتوپەتی نەکا، هەروا درێژە بە چەنەبازییەکەی دەدا. کابرا لووتی وا بەو ئاسمانەوە و بە تەواوی لە خۆی گۆڕاوە! ئێستە ئیدی خۆی لە هەموو ئەو ئیشانەشدا هەڵدەقوورتێنێ کە پەیوەندییان بەوەوە نییە. چیتان لێ بشارمەوە! بەرنامەی داناوە کە خزمەتکار و وەرزێرەکان فێری فەڕەنسی بکا! دەتوانن باوەڕ بکەن و دەشتوانن نەیکەن! دەڵێ *ئەمە بە کەڵکیان دێ*. بە کەڵکی خزمەتکارەکان! هەی تف لەو ئاوەزەت! تەنیا کابرایەکی ڕووهەڵماڵراوی مەلعوونە و لەوە بەولاوە، هیچ دیکە نییە! من لە ئێوە دەپرسم، ئاخر زمانی فەڕەنسی چ کەڵکێکی وەرزێر دەگرێ؟ باشە کەی کەسانی وەك ئێمەش ئیشیان بە زمانی فەڕەنسی دەکەوێ؟ بۆ ئەوەی لە سەمای مازۆکارادا لەگەڵ ژنەبارۆنان خۆمانی پێ هەڵکێشین؟ یان لەگەڵ ژنانی بەمێردا

---

١. لەزەواقنان: حەشرپێکردن، زۆربۆهێنان، کردنەکون.

٢. تەپاڵە، سغێر، پیسایی مانگا و هەر.

نازونووکی پێ بکەین؟ ئەمە تەنیا سووکییە و هیچی دی! بە بڕوای من، هەر کەسێك بتڵە قۆدگایەك بخواتەوە دەتوانێ بە هەموو زمانێك بدوێ. بەڵێ، مانای زمانی فەڕەنسی لای جەماعەتی ئێمە هەر ئەوەیە! ئادەی بزانم، خۆ ڕەنگە ئێستە ئێوە زمانی فەڕەنسی بزانن، ئەرێ؟ ئاخر ئەم وڕ وڕ وڕ! وڕ وڕ وڕە چییە! کاکە گیان، ئاخر دەبێ ئینسان شتەکانی لێك بوەشێوەنەوە. پێشینیان گوتوویانە نان بۆ نانەوا و گۆشت بۆ قەساب!

باخچییێڤ، کە هەر وا بە دڕدۆنگی و قینەوە لێمی دەڕوانی، لەسەری ڕۆیشت:

– ئێوە، باوکە گیان، کەسێکی خوێندەوارن... وا نییە؟ زانکۆتان خوێندووە، ئەرێ؟

– بەڵێ، ئاخر... تا ڕادەیەك...

– لام وایە لە هەر بابەتێکدا شارەزاییەکتان هەیە؟

– بەڵێ قوربان، یانی ئاخر، نا... دەبێ دانی پێدا بنێم، من زیاتر هۆگری خوێندنەوەم. ئەم ماوەیە لە پترسبورگ بووم و ئێستەش پەلەمە خۆم بگەیەنمە خاڵم...

– ئێستە کێ ئێوەی ناچار کردووە بگەڕێنەوە بۆ لای خاڵتان؟ بابە، بە دەردی خۆتانەوە لەوێ سووچێکتان لێ بگرتبا، لانیکەم شوێنێکتان دەبوو بۆ ژیان! نەخێر، باوکە گیان، من بە ئێوە دەڵێم، ئەو دەرسەی کە خوێندووتانە، لێرە سوودێکی وای لێ نابینن و هیچتان دەست ناکەوێ، خاڵەشتان هیچ یارمەتییەکی لەدەست نایێ، تووشتان دەبێ بە تووشی ئەو فۆمایەوە! من لەوێ لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا یەك دونیا کێشم دانا. باوەڕ دەکەن کە من لەوێ لاواز بووم؟

نا، دەبینم باوەڕ ناکەن. جا قەیدی چییە، دەی باوەڕ مەکەن، خوا دەس بە پەڕوباڵتانەوە بگرێ، باوکە گیان!...

بە شپرزەییەکی زیاتر لە جاری پێشووەوە هاتمە وەڵام:

– نا قوربان، داوای لێبووردن دەکەم، خۆ دیارە کە باوەڕ دەکەم، تەنیا مەسەلە ئەوەیە کە جارێ ناتوانم سەری لێ دەرکەم.

– هەر دەڵێن باوەڕ دەکەم، باوەڕ دەکەم، وەلێ دەزانن، ئەوە منم کە باوەڕ بە قسەی ئێوە ناکەم! ئێوەی خوێندەواران باشی لێ دەزانن. تەنیا دەتانەوێ لەسەر پێیەك هەڵفڕنە هەواوە و نماییش بکەن! باوکە گیان، من ئەهلی عیلم و زانست نیم، کەیفیشم پێی نایێ، هەر حەوت گۆشەی دڵم بۆ خۆی زانستە! جارێکیان دیدەنیی ئەم هاوڕێ پترسبورگیانەی ئێوەم کرد... کەسانێکی نارەسەنن! هەموویان فراماسۆنن[1]. کافرن و لە هەموو لایەنێکەوە بێدینی بڵاو دەکەنەوە. ئەوەندە بە ترسەوە دەم بە پێکە قۆدگاوە دەنێن کە وەك بڵێی ئەو قۆدگایە دەیەوێ گازیان لێ بگرێ... هەی تف لە چڕوچاویان! باوکە گیان، ئێوە تەواو بێتاقەتتان کردم، ئیدی نامەوێ هیچتان بۆ بگێڕمەوە! خۆ من بەکرێ نەگیرام تا چیرۆك بگێڕمەوە، ئەوەندەم گوت تا دەمم کەفی کرد. خۆ پیاو نابێ بە گژ هەموو کەسێکدا بچێتەوە، گوناحە... هەر ئەم فۆما خوێندەوارەی ئێوە، لە ماڵەکەی خاڵتان و لەم دواییانەدا ئەو *فیدۆپلیاسۆڤ*ـەی شێت

١. فراماسۆن: ئەندامی ڕێکخراوی فراماسۆنێری کە تۆڕێکی پان و بەرینی نهێنییە لە سەرانسەری دونیادا، کە خۆیان پێیان وایە بڕوایان بە کتێبی ئاسمانی، ملکەچی یاسای وڵات، برایەتیی جیهانی، ئازادیی بیر و بۆچوون هەیە. بەڵام لەبەر ئەوەی ناویان بە شۆفار دەرچوو، لە زۆربەی وڵاتانی دونیادا بە دزێو و چەپەڵ ناو دەبرێن. «و. ك»

کردووە! ڤیدۆپلیاسۆڤ لە دەستی فۆما، بە تەواوی ئەقڵی لەدەست داوە...

گریشکا کە تا ئەو کاتە بە ڕێز و سەرنجەوە گوێی لە قسەکانی ئێمە دەگرت، کتوپڕ خۆی تێکەڵ کرد و گوتی:

– ئەم ڤیدۆپلیاسۆڤە... بە قامچی ئەم ڤیدۆپلیاسۆڤە شین و مۆر دەکەمەوە. گەر بکەوێتە بەر دەستم، زمانی ئەڵمانی لەو کەللەپوتەی دەردەکەم! دەرسێکی دادەدەم کە بیری نەچێتەوە.

گەورەکەی هاواری کرد:

– وس بە! ئاگات لە زمانت بێ، باشە کێ قسەی لەگەڵ تۆ کردووە؟

من کە ئیدی نەمدەزانی چی بڵێم و بە تەواوی کۆنترۆڵی خۆمم لەدەست دابوو، گوتم:

– ڤیدۆپلیاسۆڤ... ناوێکی چەندە سەیرە!

– کوێی سەیرە؟ ئێوەش بوونە ئەو! هاوار لەدەست ئێوەی خوێندەواران، هاوار! خوا بێ بە هانامانەوە!

من کە ئیدی لەمە زیاتر خۆم پێ ڕانەدەگیرا، گوتم:

– ببوورن، ئێوە بۆ لە من توورەن؟ باشە سووچی من چی بووە؟ دەبێ دانی پێدا بنێم، کە ئێستە وا نیو کاتژمێرێکە من گوێ لە قسەکانی ئێوە دەگرم و کەچی هەر تێنشناگەم مەسەلە چییە...

کابرای خەپە وەڵامی دامەوە:

– باوکە گیان، ئێوە بۆ خۆتان قەڵس دەکەن؟ هیچ هۆکارێ لە ئارادا نییە بۆ قەڵسبوون! من خۆشم دەوێن، بۆیە قسەتان بۆ دەکەم. ئێوە وا لێم مەڕوانن، من هەر وا کابرایەکی پرتەوبۆڵەکەرم و هەر ئێستەش بەسەر خزمەتکارەکەممدا قیڕاند. ئەم گریشکای منە ڕەنگە

ناڕەسەن بێتە بەرچاو، وەڵێ من بەوەشەوە هەر زۆڵی وام خۆش دەوێ! ئەم دڵە نەرمەی ئێمەش باش تووشی گێرەوکێشەی کردووین... با ڕێك و بێ پێچوپەنا پێتان بڵێم، سەرلەبەری ئەم بەزمانە سووچی فۆمایە! دواجار هەر دەمکوژێ، سوێند دەخۆم، سەرم دەخوا! هەر ئێستە لە سایەی ئەو بەڕێزەوە وا بۆ دوو کاتژمێر دەچێ کە لەژێر تینی ئەم هەتاوەدا دەبمە کەباب. بەتەما بووم تا ئەو دەبەنگانە گالیسکەکە چاك دەکەنەوە، سەرێك لە قەشەی گەورە بدەم. قەشەی گەورەی ئێرە پیاوێکی باشە. وەڵێ ئەم فۆما جانەوەرە وا بێتاقەتی کردووم کە تەنانەت دەستودڵم نایگرێ بچم و چاوم بە قەشەی گەورەش بکەوێ! نامەوێ چاوم بە هیچ کەس بکەوێ! ئاخر ئێرە تەنانەت میوانخانەیەکی واشی لێ نییە کە تێیدا بە ڕێزەوە پێشوازی لە پیاو بکەن. با ڕێك بیڵێم، هەر هەمووی یەك لە یەك بێشەرەفترن!

باخچینێڤ دیسان هاتەوە سەر باسی فۆما فۆمیچ و دەتگوت، ناتوانێت لە فکری خۆیدا دەری بکات.

– لانیکەم گەر پێگەیەکی بەرزیشی هەبا، ئەوە دەکرا... یانی شیاوی چاوپۆشیلێکردن بوو، وەڵێ تەنانەت پێگەیەکی هاکەزاییشی نییە، من بە تەواوی لەمە بەئاگام. ئەسڵەن هەر دیار نییە کە ئەم کەسە کێیە! خۆی دەڵێ، لە چلەکاندا، لە شوێنێ لەسەر داکۆکیکردن لە هەق، تووشی گێچەڵی گەورە بووە و جا هەر لەبەر ئەوەش، دەبێ ئێمە هەمورمان لەبەری بچەمێینەوە و خۆمان بخەینە بەر پێی! خۆ سڵیش لە هیچ شتێ ناکاتەوە! گەر بچووکترین شتیشی بە دڵ نەبێ،

ئـەوا هەڵدەچـێ و دەقیڕێنـێ: *هـەمووتان خـەریکی سـووکایەتی پێکـردنمن، هـەر لەبـەر ئـەوەی کـە هـەژارم سووکایەتیم پـێ دەکـەن و ڕێزم لێ نانێن!*

ئەسـڵەن بـێ ئامـادەگیی فۆمـا، زاتیشـمان نییـە بـە دەوری مێـزی نانخواردندا دانیشین، جا خۆیشی لە ژوورەکەی نایێتە دەرێ، دەڵـێ، *دڵتـان ئێشـاندووم، مـن کابرایـەکی چارەڕەش و وەیلانم، هـەر نانـە جۆکـەی خـۆم دەخـۆم.* وەختێکـیش بەتـەماین لـە دەوری مێـزی نـانخواردن دابنیشـین، کتـوپڕ سەروسـەکوتی دەردەکەوێتـەوە و هەمدیس دەبێتـەوە بـە مووی لـووت کـە *خـۆ ئاگـادارن کـە بـەبێ مـن دەستتان پێ کرد؟ وا دیارە من هـەر حسێبم بۆ ناکرێ.* بە کورتی، تەواو تەواو پیاو کەلەیی[1] دەکا! باوکە گیان، من زۆر دانم بە خۆمدا گرت و هیچم نەگوت. فۆما لای وا بوو منیش وەکو سەگ کلکی بۆ با دەدەم و لەبەر پارووە نانێك لە بەردەمیدا هەڵدەقونێم، *وەرە کوڕە، ها بیخـە بـەینی ددانەکانتـەوە!* نـا، کـاکی خـۆم، تـۆ تـازە دەسـتت بـە عەرەبانە ڕاگەیشتووە، وەڵێ ئێمـە عەرەبانەسووارین! هەرچۆنێك بێ، مـن و ئیگـۆر پێکـەوە لـە فەوجێکـدا خزمـەتمان دەکـرد. مـن تـازە بووبوومە ئەفسەر کە خۆمم خانەنشین کرد، وەڵێ ئیگۆر ئیلیچ ساڵی پـار بـە پلـەی سـەرهەنگ خانەنشـین بـوو و گەڕایـەوە بـۆ موڵکـە تایبەتییەکـەی خـۆی. پێـی دەڵـێم، *باوکـە گیـان، ئـاخر بـەزەییت بـە خۆتدا بێتەوە، ئەوەندە بۆ فۆمای شل مەکە! دوایی تووشت دەکا ها!* کەچی دەڵێ *نا، ئەو باشترینی مرۆڤەکانە، هاوەڵی منە، فێری خـوو و*

---

١. کەلەیی، دەیری، شێت، هار، تەواو تووڕە.

*ڕەوشتی ئەخلاقیم دەکا*. پەکو! لە بەرخۆوە بیر دەکەمەوە، دەی ڕوونە ئیدی، خۆ ناکرێ ڕووبەڕووی خوو و ڕەوشتی ئەخلاقی ببیەوە! گەر دەستی بە فێرکردنی خوو و ڕەوشتی ئەخلاقی کردووە، ئەوە مانای وایە کە ئیدی کار لە کار ترازاوە. ئەسڵەن ئێوە دەزانن کە هەر ئەمڕۆ چ شەڕێکی نایەوە؟ سبەی ڕۆژی ئەلیاسی پەیامهێنە (باخچییێڤ خاچێکی بە خۆیەوە کێشا)، جەژنی ناولێنانی ئالیۆشای خاڵۆزاشتانە. منی چارەڕەش بەتەما بووم سبەی بۆ فراوێن بچمە لای ئەوان و تەنانەت یاریچەیەکیشم لە پایتەخت کڕیبوو. بووکەڵەیەکی قوڕمیشیی ئەڵمانی، کە دەستی دەزگیرانەکەی ماچ دەکا و کچۆڵەکەش بە دەستەسڕ فرمێسکەکانی دەسڕێ... شتێکی زۆر نایابە! وەلێ ئێستە ئیدی ناستەمە بیکەمە دیاری، مۆرگین فری![1] ئەوەتانێ، لە گالیسکەکەدا کەوتووە و لووتی ئەڵمانیی بووکەکە شکاوە، وا دەیبەمەوە بۆ کابرا. خودی ئیگۆر ئیلیچیش دڵی پێوەبوو ئەو ڕۆژە بکاتە ئاهەنگ و بە خۆیشی ڕایبوویرێ، وەلێ فۆمای جانەوەر لەم کارە چووبوو بە ڕقا و دەیگوت، *بۆ هەمووتان سەرقاڵی ئەون؟ ئێستە ئیدی کەس گوێ بە ئێمە نادا!* ئەو کابرایە زۆر دەڵەکە، بابە! ئیرەیی بە ڕۆژی ناونانی منداڵێکی هەشت ساڵان دەبا! دەڵێ، نەخێر، *ئەمە ڕۆژی منیشە!* بابە، ئاخر ئەمە ڕۆژی ئالیۆشایە، نەک فۆما! دەڵێ نەخێر، *ئەمڕۆ بۆ منیش ڕۆژی ناولێنانە!* من هەموو ئەم شتانە دەبینم و هەر خۆم دەخۆمەوە. دەی گەر ئێوە لە جێی من بان

---

١. مۆرگین فری (سەر لەبەیانی) morgen freh، دەربڕینێکی ئەڵمانییە و لێرانەدا وەکو تەنز یان شێوازێکی گاڵتەجاڕانە بەکار هاتووە. «و. ف»

چیتان دەکرد؟ ئاخر ئەوانە هەموویان لەسەر سنگی پیێ ڕیێ دەکەن و بە گوێی یەکدا دەچپێنن کە *ئاخۆ دەبێ چی بکەین؟ ڕۆژی ئەلیاس بۆ ئەویش بکەینە ئاهەنگ؟ پیرۆزبایی لێ بکەین یان نا؟ گەر پیرۆزبایی لێ نەکەین... ڕەنگە برەنجێ، گەر پیرۆزباییشی لێ بکەین... ئەوە ڕەنگە لای وا بێ پێی ڕادەبووێرین.* تف لە تۆ! ئای لەم بەڵایە! خۆشی خۆشی دانیشتبووین فراوێن بخوین... باوکە گیان، ئەسڵەن تۆ گوێت لێمە؟

– ئەوە چ قسەیەکە، گوێم لێتانە، تەنانەت بە چێژێکی تایبەتیشەوە گویێ دەگرم، چونکە بەم قسانەی ئێوەدا وا تێدەگەم کە ئیدی... جا... دەبیێ دانی پێدابنێم...

– یانی بە چێژلێوەرگرتنەوە گویێ دەگرن، ها؟ دەزانم چێژی لیێ وەردەگرن... هەر دەستەنقەسیش دەتانەوە بە چێژی *تایبەت*، پەستم بکەن، ئەریێ؟

– ئەوە چ قسەیەکە، ئاخر بۆ پەستتان بکەم؟ ئەسڵەن بە پێچەوانەوە. جا ئێوە هێندە... سەرنجڕاکێشانە دەیگێڕنەوە کە بڕیارم وایە هەموو گوتەکانتان یادداشت بکەم.

بە بەدگومانییەوە لێمی ڕوانی و وەك ئەوەی کە ترسابێت، پرسیی:

– یانی چی *یادداشت بکەم*، باوکە گیان؟

– دەی لەوانەشە یادداشت نەکەم... بڕوا بکەن هەر وا گوتم.

– بێگومان ئێستە بە جۆرێك لە جۆرەکان دەتانەوێ دنەم بدەن، ئەریێ؟

بە سەرسوورمانەوە پرسیم:

– یانی چی دنەتان بدەم؟

– هەر ئەوەی کە گوتم. دنەم بدەن و منیش وەك دەبەنگێك هەموو شتێ باس کەم و ئێوەش پاشان هەستن و بابەتێکم لەسەر بنووسن.

دەستبەجێ هەوڵم دا بەڕێز باخچییێڤ بێنمە سەر ئەو بڕوایەی کە من لەو جۆرە کەسانە نیم، لەگەڵ ئەوەشدا، هەروا بە بەدگومانییەوە لێمی دەڕوانی.

– ئەها... یانی لەو جۆرە مرۆڤانە نین! کێ چووزانێ! ڕەنگە لەوەش خراپتر بن. هەر ئەم فۆمایەش هەڕەشەی دەکرد کە باسێك لەسەر من دەنووسێ و دەینێرێ بۆ چاپ.

قسەم پێ بڕی و بۆ ئەوەی تا ڕادەیەك بابەتی باسەکە بگۆڕم، گوتم:

– لێگەڕێن با شتێکتان لێ بپرسم. ئادەی بزانم، ئەوە ئەسڵی هەیە کە خاڵە گیان نیازی زەماوەندکردنی هەیە؟

بەڕێز باخچییێڤ کەمێك تێفکری و هاتە گۆ:

– دەی، قەیدی چییە؟ خۆ ئەمە هیچ نییە. لێگەڕێن کێ شەیدا بووە با زەماوەند بکا، خۆ ئەمە خراپ نییە، کێشە شتێکی دیکەیە... ئم! لەم بارەیەرە ناتوانم وەڵامێکی ڕێك بدەمەوە، باوکە گیان! جارێ ڤاتوفیتکەر و دەستەخوشکەکان وەك مێشی دەوری مرەبا (لەوێ) کۆ بوونەتەوە: ئەسڵەن پیاو ناتوانێ تێبگا کە کێ مێرد بە کێ دەکا. وەڵێ باوکە گیان، با شتێکی هاوڕێیانەتان پێ بڵێم: من چارەی ژن و شتی رام ناوێ! تەنیا بە ناو مرۆڤن، وەڵێ لە ڕاستیدا مایەی شەرم و ڕسوایین: کۆسپی سەر ڕێی گەیشتنە ئاواتن. وەڵێ بە هەرحاڵ، ئەوە گومانی تێدا نییە کە ئەم خاڵۆیەی ئێوە وەك گوربەیەکی سیبریایی

عاشق بووە. سەبارەت بەم مەسەلەیە، باوکە گیان، من جارێ هیچ ناڵێم: بەم زووانە خۆتان دەیبینن، وەڵێ خراپییەکەی ئەوەیە کە تا دێ هەر مەسەلەکە درێژ دەکاتەوە. گەر دەتانەوێ زەماوەند بکەن، دەی زەماوەند بکەن ئیدی، یان ئەوەتا لە حەیبەت ئەم فۆما جانەوەرە ناوێرێ، یان ترسی ئەوەی هەیە کە لای دایکە پیرەکەی باسی بکا. ئاخر ئەو یەك فەرتەنەچییەکە هەر مەپرسە. جا پاشان گەر تێبگات مەسەلە چییە، بە ئاواییدا دەیکاتە هەرا و جووتەوەشاندن. ئەو پیرێژنە خەمی فۆمایەتی. وا دەزانێ گەر خانمێك پێ بنێتە ئەوماڵەوە، ئیدی فۆما فۆمیچ بێزار دەبێ و تەنانەت بۆ دوو کاتژمێریش لەوێ خۆی ناگرێ. خانم بێ گومان بە پشتەمل فڕێی دەداتە دەرێ، یان گەر ئەوەندەش دەبەنگ نەبێ، بە شێوازگەلی دیکە کارێکی پێدەکا کە لە سەرتاسەری ئەو مەملەکەتەدا جێگەی نەبێتەوە! ئێستەش فۆما لەبەر ئەو مەسەلەیە کردوویەتی بە هەلا و لەگەڵ دایە گیان، دووقۆڵی خەریکن شتێك بەسەر خاڵەدا دەسەپێنن کە... ئێوە ئاخر، باوکە گیان، بۆ پەڕیینە نێو قسەکانمەوە؟ دەمویست باسی گرنگترین مەسەلەتان بۆ بکەم، وەڵێ پەڕینە نێو قسەکانمەوە! خۆ هەرچییەك بێ، من لە ئێوە گەورەترم، قسەبڕین بە پیرەمێردێك دوورە لە ئەدەبەوە...

– داوای لێبووردن دەکەم.

– پێویست بە داوای لێبوردن ناکا! دەمەوێ لە بارەی بابەتی ئەمڕۆوە، خۆتان وەك کەسێکی شەهادەدار داوەری بکەن و بزانن کە چۆن دڵی ئێشاندووم. ئێستە گەر کەسێکی بەویژدانن، ئادەی بێن و داوەری بکەن! خەریکبووین لەدەوری مێزی خوانی فراوێن

دادەنیشتین، ڕێك هەموو ئەوەتان بۆ دەگێڕمەوە کە ئەو گوتوویەتی. تازە لەپشت مێزەوە دانیشتبووم کە، سەیر دەکەم جاریّ هیچ نەبووە کاکم بە مۆنییەوە دانیشتووە و تەواو تووڕەیە، وەك ئەوە وا بوو کە شتێك لە ناوەوەڕا بوونی بکرۆژێ. هەی ژیژکی بێددان! گەر لەدەستی بهاتبا لە کەوچکە ئاوێکدا دەیخنکاندم. ئەم مرۆڤە ئەوەندە لەخۆڕازییە کە لە پێستی خۆیدا جێگەی نابێتەوە! جا بەتەما بوو مێشکی منیش بشێلێ و خوو و ڕەوشتی ئەخلاقیم فێر بکا. ئاخر بڵێ بە تۆ چی کە من زۆر قەڵەوم! خوێڕیی وا ئێستە ئیدی گرتوویەتی بە منەوە، بۆ سیسەڵە نیم و قەڵەوم؟ ئادەی ئێوە بڵێن بزانم، باوکە گیان، باشە ئەمە چ جۆرە پرسیارێکە؟ بە بڕوای ئێوە، یانی کردنی وەها پرسیاریّ لەسەر خوانی فراوێن شتێکی ئەوەندە خۆشە؟ منیش زیرەکانە لێی هاتمە وەڵام و گوتم، *ئەوە ویستی خوایە، فۆما فۆمیچ! یەکیّ سیسەڵەیە و، یەکێکیش، قەڵەو، خۆ ئێمە ناتوانین بەر بە ویستی خوا بگرین.* بە بڕوای ئێوە وەڵامێکی زیرەکانە نەبووە؟ دەڵێ، نەخێر، *تۆ پێنجسەد وەرزێرت هەیە، هەموو شتێکت لە بەردەستە، جا هیچ سوودێکیش بە مەملەکەتەکە ناگەیەنی، پێویستە بچی بۆ خزمەتی سەربازی، وەڵێ سووچێکی ماڵەوەت لێ گرتووە و بۆ خۆت ئاکاردیۆن[1] دەژەنی.* جا هەمدیس بە زیرەکییەوە هاتمە وەڵام، *فۆما فۆمیچ، کامە خزمەت؟ گەر یۆنیفۆرم بکەمە بەرم، دەمگوشێ و هەر لەگەڵ ئەوەڵین پژمەدا هەموو قۆپچەکانی دەپەڕنە هەواوە. ئینجا، ڕەنگە ئەمە لە بەردەم پلەبەرزاندا ڕوو بدا و خوانەخواستە بە لۆتی و شتیشمان تێبگەن...*

---

١. ئاکاردیۆن، جۆرێکە لە ئامێری مۆسیقا کە کیسەیەکی فانووسی لە بن باڵیدایە، با بەو کیسەیەدا هاتوچۆ دەکات و دەنگەکە ساز دەبێ. «و. ك»

*ئەی ئەوسا چی؟* باوکە گیان، ئێستە ئێوە بڵێن، من چ قسەیەکی پێکەنیناویم کردووە؟ ئاخر خۆ ئاوا نابێ! لە تاو قسەکەم کەوتە ژانەسك و وا قاقای لێ دەدا کە هەر مەپرسە... یانی ئەسڵەن هیچ رێزێك لە قسەکانیدا نییە، با پێتان بڵێم، سەرباری ئەوەش، بە زمانی فەڕەنسی سووکایەتیی پێ کردم. پێی گوتم، کۆچۆن![1] دەی، منیش مانای ناشیرینی ئەم قسەیە دەزانم. لە بەرخۆوە گوتم، *مەی فیزیکزانی مەلعون، لات وایە بەزاندوومت؟* جا تا ئێرە هەر دانم بە خۆمدا گرتبوو، وەلێ ئیدی سەبرم نەما. لەپشت مێز هەستام و لە بەردەم ئەو مرۆڤە ئاوڕووودارانەی کە لەوێ بوون، تەقاندم و پێم گوت، *خەتای خۆم بوو، فۆما فۆمیچ، من وام زانی کەسێکی بەڕێزی، وەلێ برالە، تۆش هەر بەرازێکی وەك ئێمەی.* جا ئەمەم گوت و خەریکی تێکردنی پوودینگ بوون کە هەستامەوە و ئەوێم جێهێشت. *سندان لە پودینگەکەشتان دا!...*

دوای ئەوەی کە گوێم لە تەواوی بەسەرهاتەکەی باخچییێڤ گرت، گوتم:

– ببوورن، هەڵبەتە من لەگەڵ تەواوی قسەکانتان دام. وەلێ مەسەلەکە ئەوەیە کە من تا ئێستە هیچ شتێکی ئەرێنیم لە بارەیەوە نەبیستووە... بەس، دەزانن؟ ئێستە من بۆخۆم لەم بارەیەوە بۆچوونێکم هەیە.

جا بەڕێز باخچییێڤ بە دڵەڕاوکێیەکی زۆرەوە پرسیی:

– بۆ نموونە چ بۆچوونێکتان هەیە، باوکە گیان؟

---

1. کۆچۆن، خووگ، بەراز. «و. ف»

هەر بە هەمان شپرزەیی جارانەوە گوتم:

- ئەوە دەزانن؟ هەرچەندە پێدەچێ ئێستە کەڵکێکی ئەوتۆشی نەبێت، وەلێ هەرچۆنێك بووە من هەر پێتانی دەڵێم. لام وایە، لەوانەیە هەردووکمان لە بارەی ئەم فۆما فۆمیچەوە بە هەڵەدا چووبین. دەکرێ لەپشت تەواوی ئەم هەڵسوکەوتە سەیروسەمەرانەوە، سرووشتێك خۆی مات دابێت کە بە بۆنەی ڕۆژگارێکی نالەبارەوە، پەرێشان و تێك شکا بێ و ئێستاکەش بیەوێ تۆڵە لە تەواوی مرۆڤایەتی بکاتەوە. بیستوومە لە ڕابردوودا ڕۆڵی لیبووکی گێڕاوە: لەوانەیە ئەمە بووبێتە هۆی سووك و ڕسواکردنی ئەو و بە تەواوی دایشۆردبێ!... لەمە تێدەگەن؟ مرۆڤێکی ئاوڕوودار و بەئاوەز... کەچی ڕۆڵی لیبووکی پێ بگێڕن!... جا هەر لەبەر ئەمەیە کە لە ئاست هەموو مرۆڤەکاندا ڕەشبینە و... بۆشی هەیە گەر لەگەڵ مرۆڤایەتیدا ئاشتی بکەینەوە... یانی لەگەڵ خەڵکی، ئەوسا سەیر بکەین کە سرووشتێکی شازی لێ دەردەچێ و... تەنانەت لەوانەیە، سرووشتێکی تەواو بەرز، جا... جا... دەی خۆ دەزانن، دواجار شتێك لە بوونی ئەم مرۆڤەدا هەیە و بێگومان بێ هۆکار نییە کە هەموو لەبەری دەچەمێنەوە، وا نییە؟

بە کورتییەکەی، خۆیشم هەستم کرد کە بە تەواوی هەموو شتێکم تێك داوە. ڕەنگە بە بۆنەی کاڵفامیمەوە بکرابا چاوپۆشی لەم قسانەم بکرێت. وەلێ بەڕێز باخچییێڤ نیازی چاوپۆشیکردنی نەبوو. زۆر جددی و مکووڕانە لێم ڕاما و، کتوپڕ وەك کەڵەشێری هیندی، سوور هەڵگەڕا و پچڕپچڕ گوتی:

- یانی ئەم فۆما جانەوەرە مرۆڤێکی شازە؟

– گوێ بگرن، من تا ڕایەك هێشتا بڕوام بە هیچ یەك لەو قسانە نییە کە ئێستە کردمن. تەنیا لە چوارچێوەی سۆسەکردندا بوون...

– بە یارمەتیتان، باوکە گیان، لێگەڕێن گەر تەنیا لەبەر کونجۆڵیش بێ بپرسم کە ئێوە فەلسەفەتان خوێندووە، ئەرێ؟

بە سەرسامییەوە پرسیم:

– مەبەستتان چییە؟

– نەخێر، هیچ مەبەستێکم نییە، ئێوە تەنیا، باوکە گیان، ڕاستییەکەی بڵێن، بێ هیچ مەبەستێ، فەلسەفەتان خوێندووە یان نا؟

– دەبێ دانی پێدا بنێم کە نیازی خوێندنیم هەبوو، وەلێ...

بەڕێز باخچییێڤ، کە بە تەواوی هەڵچووبوو، کتوپڕ هاواری کرد:

– دە وا بڵێن! باوکە گیان، بەر لەوەش کە دەم بکەنەوە، خۆم سۆسەی[1] ئەوەم کردبوو کە فەلسەفەتان خوێندووە! من ناخەڵەتێنرێم! ئاستەمە! لە دووریی سێ وێرستاوە دەتوانم بۆنی فەیلەسووف و شت هەڵبکەم! بڕۆن لەگەڵ ئەو فۆما فۆمیچەتاندا پیر و خەڕۆ بن! مرۆڤی شازیان بۆ دۆزیومەتەوە! کەچی منیش، وام زانی نیەتتان باشە، وەلێ ئێوە...

جا بەسەر گالیسکەوانەکەیدا، کە لەو ساتەدا چووبووە سەر جێی دانیشتنی گالیسکەکە، قیڕاند:

– بەڕێ کەوە! دەچینەوە ماڵێ!

---

١. سۆسەکردن، وابۆچوون، قەبلاندن، قەرساندن، خەمڵاندن یا بۆچوونێك لە ڕێی گومان و خەیاڵەوە، بەبێ بەڵگە و هۆ.

بە جۆرێک لە جۆرەکان و زۆر بە دژواری ئەهوەنم کردەوە تا دوجار کەمێك نەرم بوو، بەس لەگەڵ ئەوەشدا ماوەیەکی زۆری دەویست تا تووڕەییەکەی دابمرکێتەوە. لەم کاتەدا، بە یارمەتیی گریگۆری و ئارخیپ (هەمان ئەو وەستایەی کە ئامۆژگاریی ڤاسیلی یێڤی کردبوو) سواری گالیسکە بوو. بەرەو لای گالیسکەکەی چووم و گوتم:

– مۆڵەت بدەن بپرسم، کە ئایا ئیدی سەردانی خاڵە گیان ناکەنەوە؟

– سەردانی ماڵی خاڵە گیان؟ تف لە زاتی ئەو کەسەی کە قسەیەکی لەو جۆرەی کردووە! بۆ وا دەزانن من کەسێکی بەهێزم و خۆم پێ ڕادەگیرێ؟ کێشەکە ئەوەیە کە من تەنیا دەسڕێکی چڵکنم نەك مرۆڤ! حەفتەیەکی بەسەردا ناچێ و من هەمدیس لەو دەوروبەرانە قووت دەبمەوە. باوەڕ بکەن یان نا، من خۆشم نازانم بۆ وام؟ ڕەنگە هەمدیس بڕۆمەوە بۆ ئەوێ و بەگژ فۆمادا بچمەوە. نەگبەتییەکەی من ئەمەیە، باوکە گیان! خوا فۆمای جانەوەری ناردووە بۆ باجدانی گوناحەکانم! من تەبیعەتی ژنانم کەوتووە، دەسەڵاتم بەسەر خۆمدا ناشکێ! حیزەڵەیەکی دەرەجە یەکم، باوکە گیان...

بە هەرحاڵ، دواجار وەکو دوو دۆست لێك جیا بووینەوە و تەنانەت بۆ فراوێن داوەتیشی کردم.

– سەردانمان بکەن، باوکە گیان، بێن با پێکەوە فراوێنێ بخۆین. تازە لە کییفەوە ڤۆدگایان بۆ ناردووم و چێشتلێنەرەکەشمان لەوانەیە کە لە پاریسەوە هاتوونەتەوە. چەشنە ڕاگۆیەکی گۆشتی

باڵندە لێ دەنێ کە پەنجەشتانی پێوە دەخۆن و کڕنۆشێکیش بۆ خودی ناڕەسەنی ئەو دەبەن. خوێندەوارە! زۆر لە مێژە قامچیی بە دەستمەوە نەخواردووە و کەمێ نازپەروەردە بووە... باش بوو بیرتان خستمەوە... بە دڵنیاییەوە بێن! ئەسڵەن حەزم دەکرد ئەمڕۆ داوەتتان کەم، وەڵێ حاڵم ئەوەندە باش نییە و بێتاقەتم. هەر دەڵێی کە ئیدی پێیەکانم هی خۆم نین. ئاخر من قەڵەو و ناساغم. ڕەنگە باوەڕ نەکەن، وەڵێ نەخۆشم... جارێ، خواحافیز، باوکە گیان! ئیدی کاتی ئۆغرکردنە. گالیسکە گچکەکەی ئێوەش چاك کراوەتەوە. بە فۆمای جانەوەریش بڵێن، با چاوم پێی نەکەوێ، گەرنا وا بە گژیدا دەچم کە...

وەڵێ دواهەمین وشەکانی نەدەبیستران و گالیسکەکەی، کە بە چوار ئەسپی بەهێز و هەماهەنگ کەوتە ڕێ، لە تەپوتۆزدا ون بوو. لەم لاوە، گالیسکەکەی منیش ئامادە کرابوو. سوار بووم و ئێمەش دەستبەجێ ئەو شارۆچکەیەمان جێهێشت. لە بەرخۆوە بیرم کردەوە، بێ گومان ئەم بەڕێزەش خەریکە مەسەلەکە گەورە دەکات و لەبەر ئەوەی بە تەواوی لە جەویان داوە، ناتوانێت لەم نێوەندەدا داوەرییەکی بێلایەنانە بکات. بە هەرحاڵ، ئەوەی کە لە بارەی خاڵەوە باسی کرد، شتێکی جێسەرنج بوو. ئێستە ئیدی دوو کەس ئەوەیان پشتڕاست کردبووەوە کە خاڵە دڵی بەو کچەوەیە... ئم! وەڵێ ئەی دواجار من زەماوەند دەکەم یان نا؟ ئەم جارەیان ئیدی بە تەواوی کەوتمە فکر و خەیاڵەوە.

# وەرزی سێیەم

## خاڵە

دانـی پێـدا دەنـێم کـە خۆشـم کـەمێك ترسـابووم. هەرکـە لـە ستێپانچیکۆڤۆ نزیك بوومەوە، کتوپڕ وام بە مێشکدا هات کە تێکڕای خەیاڵـە ڕۆمانسـییەکانم نابـەجێ و تەنانـەت لەوانەشـە تـا ڕادەیـەك دەبەنگانـە بـووبن. کاتـژمێر نزیکـەی پێنجـی پـاش نیـوەڕۆ بـوو. گەیشتبوومە شەقامێك کە بە تەنیشت باخی موڵکدارێکدا تێدەپەڕی. ئـەوە دوای سـاڵانێك دووری بـوو کـە هەمـدیس چـاوم بـەو باخـە دەکەوتەوە، باخێك کە ڕۆژانی شادی منداڵیمی تێدا ڕابردبوون و لـە خەوگەی خوێندنگەی ئەو شوێنانەی کە تێیاندا دەمخوێند، چەندان جـار خـەونم پێـوە دیتبـوو. لـە گالیسـکە بـازم دایـە خـوارێ و ڕاستەوڕاست بـەرەو مـاڵ بوومـەوە. حـەزم دەکـرد بـە دزییـەوە بچم و گوێیەك هەڵبخەم و بەر لە هـەر شتێك، تێر لەگەڵ خاڵـەدا بدوێم. جا هـەر واش بـوو. بـە کووچـەباخی زیزفۆنـە سەدسـاڵەکاندا ڕابـردم و چوومە نێو هەیوانێکـەوە کـە دەرگـە شیشـەییەکانی ڕێك دەچوونەوە سـەر ژوورەکـان. چواردەوری هـەیوان، بـە باخچـەی گـوڵ و گوڵـدانی گیای ئاڵووالا تەنرابوو. لە هەیواندا چاوم بە *گاڤریلای* پیر کـەوت کـە یەکێك بوو لە دێهاتییە ڕەسەنەکانی ئەو ناوچەیە. ئەو، سەردەمانێك

سەرپەرشتیی منی دەکرد و ئێستە ئەو شانازییەی پێ بڕابوو کە ببێتە بەردەستی خاڵە گیان. کابرای پیرەمێرد چاویلکەی کردبووە چاوی و بە سەرنجێکی نائاساییەوە خەریکی خوێندنەوەی تێنووسێکی نێو دەستی بوو. دوو ساڵ لەوەوبەر، کە لەگەڵ خاڵە هاتبووە پترسبورگ، یەکدیمان دیتبوو و هەر لەبەر ئەوەش دەمودەست منی ناسییەوە. هەڵسی شادی بە چاوانیدا سەری کرد، چەمییەوە تا دەستم ماچ بکات و چاویلەکەکەی لە چاو کەوت. ئەم هەموو هەست و سۆزدەبڕینەی پیرەمێردەکە بە تەواوی حەپەساندبوومی. وەلێ لەبەر ئەوەی هێشتا بەشی کۆتای گفتوگۆکەی نێوان خۆم و بەڕێز باخچییێڤ بە تەواوی فکر و خەیاڵی داگیر کردبووم، خێرا سەرنجم چووە سەر ئەو تێنووسە گوماناویەی کە بە دەست گاڤریلاوە بوو. لە پیرەمێردەکەم پرسی:

– ئەوە چی دەخوێنیتەوە، گاڤریلا؟ نەکا بەتەمان تۆش فێری فەرەنسی بکەن؟

بە ئاوازێکی خەفەتبارەوە گوتی:

– ئای باوکە گیان، گەرەکیانە بەم ئاخری پیرییەوە وەکو بولبول بۆیان بورینگێنم.

– خودی فۆما فۆمیچ وانەت پێ دەڵێتەوە؟

– ئەرێ، باوکە گیان، وا دیارە کەس هێندەی ئەوی لێ نازانێ.

– نازانم چی بڵێم، بێ گومان شتۆکەیەکی لە باردایە! باشە، ئەی لە ڕێی گفتوگۆوە فێرت دەکا؟

– نا باوکە گیان، لە ڕێی دەفتەری ڕاهێنانەوە.

– هەر ئەمەی کە بە دەستتەوەیە، ها؟ وشەی فەڕەنسی بە ئەلف و بێی ڕووسی؟ سەیر ئەو زۆڵییە! باش خۆتان داوەتە دەست کەسێکی خەڵەفاو و گەمژە!

من کە لە کتوپڕێکدا هەموو پێشگریمانە بێلایەنانەکانی خۆمم لە بارەی فۆما فۆمیچەوە (کە بەڕێز باخچییێڤ کاتژمێرێك لەوەوبەر بە بۆنەیانەوە سەرکۆنەی کردبووم) لە بیر کردبوو، قیڕاندم:

– گاڤریلا، شەرم لە خۆت ناکەی؟

پیرەمێرد هاتە وەڵام:

– جا کەی بەڕێز فۆما گەمژەیە؟ ئەی بۆ گەورەم و ئەوان لە قسەی دەرناچن؟

من کە بەم قسەیەی ئیدی هیچم بۆ نەمابووەوە، لەژێر لێو گوتم:

– ئمممم! گاڤریلا، لەوانەشە تۆ لەسەر هەق بی، وەڵێ ئێستە بمبە بۆ لای خاڵە گیان!

– ئاخر من ناوێرم خۆمی نیشان دەم، زات ناکەم. تەنانەت ئیدی سڵ لە بینینی دەکەمەوە. بە دەردی خۆمەوە لێرانە دانیشتووم و کاتێکیش کە بەم ناوەدا ڕادەبووری، خێرا فڕکەیەك دەکەمە پشت پەرژینەکە و خۆم دەشارمەوە.

– ئاخر لە چی دەترسێی؟

– ئەمڕۆ وانەکەمم لەبەر نەبوو، فۆما فۆمیچ گوتی، بکەوە *سەر* ئەژنۆ، وەڵێ من نەمتوانی. ئاخر سێرگی ئالێکساندرۆڤیچ، باوکە گیان، ئیدی من پیربوومە و بە کەڵکی ئەم جۆرە یارییانە نایێم! جا گەورەشم توورە بوو کە بۆچی بە قسەی فۆمام نەکردووە و گوتی، *ئای کە پیرێکی دەبەنگی! فۆما خەمی وانەکانی تۆیەتی و دەیەوێ*

گـۆکردنێکی ڕێکـت فێـر بکـا. جـا هـەر لەبـەر ئەوەیـە کـە بـەدەم ڕێکردنـــەوە وشـــەکان دەڵێمـــەوە. فۆمـــا گوتوویـــەتی عەســـر تاقیکردنەوەکەم بۆ دووبارە دەکاتەوە.

وام بە خەیاڵدا هـات کـە شـتێکی تـەماوی لـە قسـەکانیدا بـوونی هەیە. بیرم کردەوە، کە ئەم فێرکردنی زمانی فەڕەنسییە حەکایەتێکی لەپشتەوەیە کە پیرەمێردەکە ناتوانێت باسی بکات.

– گـاڤریلا، ئێسـتە پرسـیارێك: ئـەم فۆمایـە چ جـۆرە مرۆڤێکـە؟ بالأبەرز و چوارشانەیە؟

– فۆما فۆمیچ؟ نە باوکە گیان، نیمچە مرۆڤێکیش نابێ، ناقۆلاّ و گول.

– ئەمم! پەلەت نەبێ، گاڤریلا، لەوانەیـە هـەموو شـتێك بـاش بـێ. بێگومـان بـاش دەبـێ، بـەڵێنت دەدەمـێ! جـا ئێسـتە... خاڵـە گیـان لـە کوێیە؟

– گەورەم لەپشت گەوڕەکەوەیە. وەرزێرەکان هاتوونەتە دیـداری. ڕیشسـپییەکانی کاپیتۆنافکـا هـاتوون تـا دەسـتی مـاچ بکـەن و لێـی بپاڕێنـەوە. ئـاخر بیسـتوویانە کـە بڕیـار وایـە بکـرێن بـە نـاوی فۆمـا فۆمیچەوە. هاتوون بۆ لاڵەوپاڵە[1].

– باشە بۆچی لەپشت گەوڕ؟

– لە ترساندا، باوکە گیان!

خاڵە، هەر بە ڕاستی لەپشت گەوڕەکەوە بوو. لـە کەشـێکی کـراوە و لەبەردەم چەند وەرزێرێکدا، کە لێـی دەپاڕانـەوە، ڕاوەسـتابوو و بـە

١. لالەوپالە، پاڕانەوە بە گریان و شیوەنەوە.

جۆشوخرۆشـێکی زۆرەوە ڕوونکردنـەوەی دەدا. چـوومە پـێش و بانگیم کرد. خاڵە ئاوڕی دایەوە. پڕتاوێکم کرد و یەکدیمان گرتە باوەش.

هەتا بڵێی دڵی بە بینینی من خۆش بوو، لە شادییان جێیی بە خۆی نەدەگرت. هەروا دەستمی دەگوشی و باوەشی پێدا دەکردم... وەك ئەوە وابوو کە کوڕی هەقودادی خۆی لە مەترسییەکی مەرگباردا ڕزگاری بووبێت و گەڕابێتەوە لای. تەنانەت دەتگوت بە گەڕانەوەم، ئەویشم لە مەترسییەکی مەرگبار دەرباز کردووە و ڕێچارەی تەواوی گێرەوکێشەکانی و هەروەها بەختەوەری و شادیی تاهەتایی خۆی و تەواوی ئازیزانیم لەگەڵ خۆمدا هێناوە. ئاخر خۆ خاڵە هەر بەوەندە قاییل نەدەبوو کە بە تەنیا خۆی بەختەوەر بێت. کە کەفوکوڵی ئەو ساتانەی سەرەتا دامرکایەوە، بە تەواوی کەوتە کردوکۆش و شپرزە بوو و ڕاست و چەپی خۆی لێ تێك چووبوو. دابوومیە بەر پرسیار و دەیویست هەرچی زووتر بمباتە لای خێزانەکەی. بەدەم ڕێوە بووین کە خاڵە کتوپڕ ئاوڕی دایەوە. دەیویست بەر لە هەموو شتێك بە وەرزێرەکانی کاپتیۆنافکام بناسێنێت. دوای ئەوە، خۆشم نازانم چۆن بوو کە قسە چووەوە سەر پیاوێکی بەرجەستە بە ناوی جەنابی *کارۆفکین* ـەوە، کە خاڵە سێ ڕۆژ لەوەوبەر لەسەر شەقام چاوی پێی کەوتبوو و، جا بڕیار وابوو ئەمڕۆ بێت و خاڵەش بە پەرۆشییەوە چاوەڕێی دەکرد. جا پاشان وازی لە کارۆفکین هێنا و چووە سەر باسێکی دیکە. من بە خۆشحاڵییەکی زۆرەوە لێیم دەڕوانی و بەدەم وەڵامدانەوەی پرسیارە یەك بەدوای یەکەکانییەوە، پێم گوت کە وام

پێ باشە نەچمە خزمەتی سەربازییەوە و درێژە بە خوێندنەکەم بدەم. کە باس هاتە سەر زانست و زانیاری، خاڵە برۆکانی ویك هێنانەوە و خۆی جددی کرد. ئەو کە دەیزانی ئەم ماوەیە خەریکی خوێندنی بەشی زەویناسیم[1]، بە چەشنێك گەردنی کەش کرد و لە چواردەوری ڕوانی وەك بڵێیت پێشتر خۆی، بە تاق و تەنیا و بێ یارمەتیی ئەوانی دی، دەستی بە سەرلەبەری زانستی زەویناسیدا ڕاگەیشتووە و سەلماندوویەتی. پێشتریش گوتبووم کە خاڵە ئەپەڕی ڕێزی بۆ وشەی زانست دادەنا. دەسئەنقەست دەڵێم «ئەوپەڕی»، چونکە خۆی لە ڕاستیدا سەری لە هیچ بوارێکی زانست دەرنەدەچوو.

جارێکیان کە هێندە وروژابوو چاوی دەبریقایەوە، بە منی گوت:

– ئاە، براله، لەم دونیایەدا کەسانێك بوونیان هەیە کە سەروبنی هەموو شتێك دەزانن. جا پیاو لەنێو ئەوانەدا دانیشتووە و تەنیا گوێ دەگرێ، چونکە دەزانێ کە سەر لەو شتانە دەرناکا، وەلێ لە دڵدا هەستێکی خۆشی هەیە. باشە هۆکاری ئەمە چییە؟ هۆکارەکەی ئەوەیە کە لەوێ خێر هەیە، فکر هەیە و بەختەوەرییەکی گشتی هەیە! لەم مەسەلەیە دڵنیام، بۆ نموونە، من ئێستە بە شەمەندەفەر گەشت دەکەم، وەلێ ڕۆژێ دێ کە ئالیۆشای من بە ئاسماندا دەفڕێ... جا دواجار، هەم بازرگانی و هەم پیشەسازی، چۆن بڵێم،

---

1. لە دەقەفارسییەکەدا، لە جێی زەویناسی، نووسراوە «کانناسی»، واتە کارکردن لەسەر کانەبەرد و کانزا و... جا هێندەی من ئاگادار بم، لێرە، بە دیاریکراوی وەها بەشێکمان نییە و بە گشتی بەو بەشە دەڵێن زەویناسی.

هەردووکیان سەکۆی وەشاندنن... یانی دەمەوێ بڵێم، هەر چییەك بێ، سوود بە پیاو دەگەیەنن... سوودبەخشن ئیدی... مەگەر وا نییە؟

دەی، دووبارە دەگەڕێینەوە سەر دیدارەکەی نێوان خۆم و خاڵەم. خەریکبوو دەستەکانیی لێك دەسووین و پەلەپەل دەیگوت:

– تۆ پەلەت نەبێ، باوانم، پەلەت نەبێ! با کەسێکت پێ بناسێنم! کەسێکی تایبەت! با پێت بڵێم، کەسێکی زانستمەندە، پیاوێکە لە زانست کە ناوی بۆ چەندان سەدە دەمێنێتەوە. هەر بە ڕاستی ئەمە ڕستەیەکی سەرنجڕاکێشە: *ناوی بۆ چەندان سەدە دەمێنێتەوە*، وا نییە؟ ئەمە فۆما پێی گوتم... تۆ پەلەت نەبێ، پێتی دەناسێنم.

– خاڵە گیان باستان لە فۆمایە؟

– نا، نا، باوانەکەم! باسم لە *کارۆفکین* ـە. یانی هەم فۆما و هەم ئەو... وەلێ ئێستە مەبەستم کارۆفکین بوو.

نازانم بۆچی هەرکە باس هاتە سەر فۆما، خاڵە وەك ئەوەی خەجاڵەت بکێشێت، سوور هەڵگەڕا.

– خاڵە گیان، سەروکاریی لەگەڵ چ زانستێکدا هەیە؟

– لەگەڵ زانست، برالە، بە گشتی لەگەڵ زانست! من نازانم کتومت لەگەڵ چ زانستێ، هەر ئەوەندە دەزانم کە کەڵکەڵەی زانستە. جا بە جۆرێ باسی ڕێگەی ئاسن دەکا کە لە ئەقڵا نییە!

خاڵە چاوی ڕاستی تەواو زیت کردبووەوە و بە دەنگێکی چرپەئاسا لەسەری ڕۆیشت:

– دەزانی، بیر و فیکرێکی زۆر نوێخوازانەی هەیە! من وەختێ هەستم بەوە کرد کە لە بەختەوەریی خێزان دەدوا... بەس جەخار کە خۆم زۆر سەر لە شت دەرناکەم (یانی ئێستەش دەرفەتێکی وامان نییە) دەنا مووبەموو بۆم باس دەکردی. سەرباری ئەوەش، خاوەنی بەرزترین خاسیەتی مرۆڤانەیە! داوەتم کردووە تا بێ و لامان میوان بێ. وا ئێستەش هەروا چاوەڕێی ئەوم.

وەرزێرەکان لەم ساتەدا، وەك ئەوەی شتێکی عەنتیکەیان دیتبێت، بە دەمی بەش و چاوانی زەقبووەوە لە من ڕامابوون. قسەم بە خاڵە بڕی و گوتم:

– ببوورن، خاڵە گیان! وا دیارە کاتی ئەم وەرزێرانەم گرتووە. بێگومان کارێکیان هەیە. کێشەیان چییە؟ دەبێ دانی پێدا بنێم کە سۆسەی ئەوە دەکەم و زۆریشم ئارەزووە قسەکانیان ببیستم...

خاڵە کتوپڕ دەستەکانیی پێکدا کێشان و بە شپرزەییەوە گوتی:

– ئاخ، بێ گومان! هەر بیریشم نەمابوو! دەبینی... ئاخر ئێستە من چییان لێ بکەم؟ قسەیان هەڵبەستووە... زۆریشم حەزلێیە بزانم کە ئاخۆ کێ ئەم قسەیەی هەڵبەستووە... ئەوەیان بە دەممەوە هەڵبەستووە کە گوایە من بەتەمام ئەوان بدەمە فۆما فۆمیچ، وەرزێرەکانی کاپیتۆنافکا... خۆ کاپیتۆنافکات لە یادە؟ لەگەڵ کاتیای خوالێخۆشبوو هەموو عەسرانێك بە سواری دەچووینە ئەوێ. لایان وایە دەمەوێ تەواوی کاپیتۆنافکا، لەگەڵ شەستوهەشت ڕەعیەتدا، ببەخشمە فۆما فۆمیچ! وا ئێستاکەش هاتوون و دەڵێن: *ئێمە دەمانەوێ هەر ڕەعیەتی تۆ بین!* هەر ئەوەندە!

بە دڵخۆشییەوە هاوارم کرد:

– خاڵە گیان، یانی ئەوە ڕاست نییە؟ ئێوە کاپیتۆنافکا نادەنە ئەو؟

– نا، من تەمای وەها شتێکم نییە، تەنانەت شتی واشم بە خەیاڵدا نەهاتووە! وەلێ ئەی تۆ ئەمەت لە کێوە بیستووە؟ جارێکیان هەروا شتێکی لەم بابەتەم لە دەم دەرچوو، جا ئێستە بە هەموو لایەکدا بڵاو بووەتەوە. ئەرێ بە ڕاست، ئەمانە بۆ کەیفیان بە فۆما نایێ؟ پەلەت نەبێ، سیریۆژا[1]! خۆم پێتی دەناسێنم.

جا پاشان وەك بڵێیت هەستی بەوە کردبێ کە خۆشم لە فۆما فۆمیچ نایێت، بە شپرزەییەوە چاوێکی لێ کردم و درێژەی پێ دا:

– براله، تۆ نازانی مرۆڤێکی چەندە...

لەناکاو هەموو وەرزێرەکان بە دەنگی بەرز، پێکڕا گوتیان:

– ئێمە بێجگە لە ئێوە هیچ کەسێکی دیمان ناوێ، هیچ کەس! ئێوە باوکی ئێمەن و ئێمەش وەك ڕۆڵەی خۆتان!

گوتم:

– خاڵە گیان، گوێ بگرن، من هێشتا فۆما فۆمیچم نەدیوە، وەلێ... دەزانن... هەندێك شتم بەر گوێ کەوتووە. دانی پێدا دەنێم، ئەمڕۆ چاوم بە بەڕێز باخچییێڤ کەوت. ئێستەش لەم بارەیەوە

---

١. سیریۆژا: باری خۆشەویستانەی ناوی سێرگی. سێرگی کە گێڕەوەیە، خاڵە زۆربەی کات لەنێو نەوانی دیکەدا بە شێوازی فەرمی و بە سێرگی بانگی دەکات و لە خەڵوەتیشدا بە شێوازێکی خۆمانەیی و بە سیریۆژا دەیچڕێت. «و. ف»

بۆچوونێکم هەیە. خاڵە گیان، جارێ مۆڵەتی ئەم ڕەعیەتانە بدەن تا بە تەنیا قسە بکەین. دانی پێدا دەنێم کە بەو مەبەستەوە هاتووم...

خاڵەش وەك ئەوەی کە خواخوای شتێکی وای بووبێت، گوتی:

– بێ گومان، بێ گومان! ڕەعیەتەکان مۆڵەت دەدەین و دواتر قسان دەکەین، ئەسڵەن دەزانن، وەك دوو هاوڕێ، وەك دوو دۆست، گفتوگۆیەکی تێروتەسەل دەکەین!

جا پاشان، لە بارێکدا کە نیوەی قسەکانیی قووت دەدانەوە، بە ڕەعیەتەکانی گوت:

– زۆر باشە، هاوڕێیان، جارێ ئێوە بچن. لەمەودواش تەنیا وەرنە لای خۆم، بۆ هەمیشە و لە هەر وەختێکدا کە پێویست بوو، هەرچۆنێك بووە و لە هەر بارێکدا ڕاستەوڕاست وەرنە لای خۆم.

وەرزێرەکان، هەمدیس بە دەنگی بەرز و پێکڕا گوتیان:

– ئێوە لەجێی باوکمانن! باوکی ئازیزی ئێمەن و ئێمەش ڕۆڵەتان! شەڕی فۆما فۆمیچمان لێ لادەن! هەموو داوایەکی ئێمەی داماو و هەژار هەر ئەوەندەیە!

– ئای کە چەندە دەبەنگن ئەمانە! خۆ گوتم، من ناتاندەمە ئەو!

– ئاخر باوکە گیان، دوایی وانە بە ئێمەش دەڵێتەوە! خۆ دەزانن، هەموو خەڵکی ئێرەی ناچار بە خوێندن کردووە.

من بە هەراسانییەوە گوتم:

– خۆ وانەی فەرەنسی بە ئێوەش ناڵێتەوە؟

یەکێك لە ڕەعیەتەکان، کە پێدەچوو زۆر چەنەباز بێت و قڕژێکی خەنەیی هەبوو و پشتی سەریشی ڕووتابووەوە و وەختێکیش کە قسەی دەکرد، ڕیشە درێژە بزنییەکەی بە چەشنێك تەکانی دەدا کە دەتگوت گیانەوەرێکی سەربەخۆیە و کەوتووەتە جموجووڵ، هاتە وەڵام:

– نا، گەورەم، جارێ خوا ڕەحمی پێ کردووین!

– ئەی چیتان فێر دەکا؟

– قوربان، خۆمانواتەنی، فێرمان دەکا قاسەی زێڕین بکڕین و سکەی مسیی تێکەین!

– یانی چی؟ ئەم سکە مسییە لە کوێوە هات؟

خاڵە کە لە شەرمان سوور هەڵگەڕابوو، کتوپڕ هاواری کرد:

– سیرۆژا! بە هەڵە تێگەیشتووی، بوختانی بۆ دەکەن! ئەم دەبەنگانە لە مەبەستی ئەو حاڵی نەبوونە! باوکە، ئەو هەروا... ئاخر سکەی مسی چییە؟...

خاڵە تەماشایەکی سەرزەنشتباری ڕەعیەتەکەی کرد و درێژەی پێ دا:

– تۆش ئیدی پێویست بەوە ناکا گەرووی خۆت بدڕێنی و هەموو شتێ بگێڕییەوە. دەبەنگ، چاکەی تۆیان ویستووە، جا تۆش بێ ئەوەی حاڵی ببی دەست بە واوەیلا دەکەی!

– ببوورن، خاڵە گیان، وەڵێ ئاخر زمانی فەڕەنسی؟

لێرانەدا خاڵە بە ئاوازێکی مەیلەو پاڕانەوەوە گوتی:

– سیریۆژا، ئەمە تەنیا لەبەر گۆکردنێکی ڕێکوپێکە، تەنیا لەبەر گۆکردنە. فۆما خۆی دەیگوت کە ئەمە تەنیا لەبەر گۆکردنە... بێ لەمەش، لێرە ڕووداوێکی تایبەت لە ئارادایە کە تۆ لێی بێئاگای، جا هەر لەبەر ئەوەش ناتوانی داوەری بکەی. براله، سەرەتا دەبێ لێی حاڵی ببی، جا پاشان خەتاباری کەی... خۆ خەتابارکردنی ئەوانی دی هیچی تێناچێ!

به تووڕەییەوە، ڕوو بە وەرزێرەکان هاوارم کرد:

– باشە بۆ هیچتان نەکردووە؟ دەبوو بێ پێچوپەنا هەموو شتێکتان بە خۆی گوتبا. بتانگوتبا، *فۆما فۆمیچ، ئەمە کارێکی ناڕاستە*. ئاخر خۆ خۆتان زمانتان پێوە بوو!

– باوکە گیان، ئاخر کێ دیویەتی مشك زەنگوڵە لە ملی پشیلە بکا؟ باش گیری داوین! پێمان دەڵێ، *من تۆی وەرزێری دەستوپێسپی، فێری پاکوخاوێنی و ڕێکوپێکی دەکەم. تۆ بۆچی کراسەکەت چڵکنە؟* دەی ئێمە ئیش دەکەین و ئارەقە دەڕژین، هەر لەبەر ئەوەشە کە کراسەکانمان چڵکن دەبن! خۆ ناتوانین هەموو ڕۆژێ بیانگۆڕین. نە چڵکنی کەسی کوشتووە و نە پاکوخاوێنیش کەسی زیندوو کردووەتەوە.

وەرزێرێکی دیکەی ڕەقەڵە و باڵابەرز، کە کراسێکی پڕ لە پینەوپەڕۆی لەبەر بوو و گیوەیەکی حەسیریی[1] کۆنەی لە پێ بوو و پێدەچوو سەر بەو دەستە کەسانە بێت کە هەمیشە ناڕازین و دایمەی

---

١. گیوە، پێڵاوی هاوینەی بنچەرم.

خوا قسەی چزوودار و ژەهراوییان لەسەر زارە، هاتە قسە. ئەو، کە تا ئەو ساتە لەپشت وەرزێرەکانەوە بە بێدەنگی و مۆنییەوە ڕاوەستابوو و بەردەوام تیزخەنێکی[1] دوومانا و تاڵ و فێڵبازانەی لەسەر لێو بوو، گوتی:

- هەر لەم چەند ڕۆژەی ڕابردوودا هاتە سەر خەرمانی خەلە و گوتی، *دەزانن مەودای نێوان ئێمە و مەتاو چەند وێرستایە؟* ئاخر کامیەك لە ئێمە ئەم جۆرە شتانە دەزانێ؟ عیلم و زانست بۆ خانەدانانە، نەك ئێمەومانان. جا پاشان دەڵێ، *نا، تۆکەمژەیەکی دەستوپێ‌سپیی، بەرژەوەندیی خۆت نازانی*، دەڵێ، *وەڵێ من فەلەکناسم و شارەزای هەموو هەسارەکانم!*

خاڵە لە بارێکدا کە خرۆشابوو، بە خۆشحاڵییەوە چاوێکی لە من داگرت و وەك ئەوەی بیەوێ بڵێت، *تۆ سەیرکە و بزانە ئێستە چی ڕوودەدا!* لەناکاو پەڕیە نێو قسەی وەرزێرەکەوە و گوتی:

- ئێ، نەیگوت ئێرە تا خۆرەتاو چەند وێرستایە؟

---

١. تیزخەن: زەردەخەنەی سووکایەتیئامێز و گاڵتەکەرانە بە بەرانبەر. ئەم دەستەواژەیەم بە یارمەتیی هەردوو فەرهەنگی (دانشگا کردستان) و (هەمبانە بۆرینە) لە بەرانبەر وشەی «ریشخند» یان «پوزخند»ی فارسی داتاشیوە کە هێندەی من ئاگاداربم وەها وشەیەکمان نەبووە یان لایەنیکەم من بەرچاوم نەکەوتووە. وشەکە لێکدراوە و لە ڕەگی کاری «خەنین، واتە پێکەنین، خوای، کەنین»ـەوە وەرگیراوە، کە دەبێت بە «خەن» و وشەی «تیز» کە لە فەرهەنگی هەمبانە بۆرینەدا دەرهێنراوە و بە واتای گاڵتەپێکردن و تەوسلێدان دێت. کەواتە «تیزخەن» بە واتای زەردەخەنەیەکی گاڵتەئامێز و سووکایەتیپێکەرانە دێت. هێوادارم پێکابێتم و ئەم وشە لێکدراوە لەجێ بێت.

وەرزێرەکە، کە هەرگیز چاوەڕێی وەها پرسیارێك نەبوو، بە بێزارییەوە وەڵامی دایەوە:

– بەڵێ، ژمارەیەکی زۆر گوت.

– ئێ، کتومت چەندی گوت؟

– گەورەم ئێوە خۆتان باشتر دەزانن، ئێمە لەو بارەیەوە کەسانێکی کۆڵەوارین.

– برالە، خۆ من بۆخۆم دەیزانم، وەلێ دەمەوێ بزانم تۆ بیرت ماوە؟

– دەیگوت چەند سەد یان چەند هەزار وێرستایەك دەبێ. بە کورتییەکەی باسی ژمارەیەکی ئەوەندە زۆر دەکرد کە بە سێ عەرەبانەش کێش نەدەکرا!

– ڕێك وایە، برالە، بیرت نەچێ! نەکا تۆ واتزانیبێ کە یەك وێرستایە و دەتوانی دەستی بگەیەنیتە لا؟

جا پاشان خاڵە، بە دەستەکانی، لە هەوادا کەوتە کێشانی وێنەی گۆیەك.

– نەخێر، برالە، دەزانی، زەوی وەکو گۆ و خەپلەیە، ئەسڵەن تۆ حاڵی دەبی؟

وەرزێرەکە بزەیەکی تاڵی هاتێ و خاڵە لەسەری ڕۆیشت:

– بەڵێ، ڕێك وەکو گۆیەك! جا خۆبەخۆ لە ئاسمانیشدا ڕاوەستاوە و بە دەوری هەتاودا دەخولێتەوە! شتێکی عەنتیکەیە! کاپتن کووکی دەریاوان ئەم ڕاستیەی کەشف کرد...

پاشان ڕووی کردە من و چرپاندی:

– خوا دەزانێ کێ ئەمەی کەشف کردووە... برالە، خۆ من هیچ نازانم... ئادەی، تۆ دەزانی مەودای نێوان ئێمە و هەتاو چەنێکە؟

من کە بە سەرسامییەوە لەم دیمەنەم دەڕوانی، گوتم:

– بەڵێ دەزانم، خاڵە گیان. وەڵێ جارێ من بیر لەوە دەکەمەوە کە گریمان نەخوێندەواری وەك ئافات وا بوو، لە لایەکەوە... ئاخر گوتنەوەی وانەی ئەستێرەناسی بە جووتیاران...

خاڵە، لە بارێکدا کە خرۆشابوو و ئەم دەربڕینەی منی زۆر بەجێ زانیبوو، قسەی پێ بڕیم و گوتی:

– کتومت، کتومت وەك ئافاتە! بۆچوونەکەت ئێجگار بەنرخە! کتومت مایەی ئافاتە! منیش دایمە وا دەڵێم... یانی هیچ کات وام نەگوتووە، وەڵێ هەستم پێ کردووە.

پاشان ڕوو لە وەرزێرەکان، بە دەنگی بەرز گوتی:

– خۆ بیستتان کە نەخوێندەواریش وەك پیسی و چەپەڵی دەبێتە مایەی ئافات! هەر لەبەر ئەوەشە کە فۆما دەیەوێ فێرتان بکا. دەیەوێ فێری شتی باشتان بکا. کەی ئەمە خراپە؟ برالە، ئەم کارە وەکو خزمەت وایە[1]، نرخی هەر پلە و پێگەیەکی هەیە. زانست خاوەنی پێگەیەکی ئاوایە! دەی، دەی بەسە، هاوڕێیان! دەی ئێستە بچن، خواتان لەگەڵ، هەروەها من خۆشحاڵم، خۆشحاڵ... خەمتان نەبێ، من پشتتان تێ ناکەم.

---

١. مەبەست لە خزمەتی سەربازییە.

– باوکە گیان، چاوتان لێمان بێ! ئێوە بن و ئەو خوایە لێگەڕێن با بۆخۆمان بژین!

جا وەرزێرەکان خۆیان خستە بەر پێی.

– باشە، باشە دەی، واز لەم کارە بێنن! کڕنۆش بۆ خوا و تزار ببەن، نەك بۆ من... دەی ئیدی بچن، هەڵسوکەوتتان باش بێ تا بەزەییم پێتاندا بێتەوە... بیبڕنەوە دەی...

لەگەڵ ڕۆیشتنی وەرزێرەکاندا، خاڵە کە لە دڵخۆشییان چاوانی دەبریقانەوە، کتوپڕ ڕووی کردە من و گوتی:

– دەزانی، وەرزێرەکان دڵیان بە قسەی نەرم خۆشە، خراپ نییە دیارییەکیش بدەمە ئەوان. شتۆکەکیان وەك دیاری بدەمێ، ها؟ پێت چۆنە؟ بە بۆنەی هاتنەوەی تۆوە... دیارییان بدەمێ یان نا؟

– خاڵە گیان، دەبینم ئێوە بوونەتە *پافرۆوێل سیلینێکی* خێرۆمەند[1] بۆ خۆتان.

خاڵە بە بارێکی پاساوهێنەرانەوەوە لەسەری ڕۆیشت:

– دەی، خۆ ناکرێ، براڵە، ناکرێ: خۆ ئەمە هیچی تێناچێ. دەمێکە تەمام وایە دیارییەکیان بدەمێ، باشە بە بڕوای تۆ ئەوە کەی

---

١. فرۆوێل سیلینی خێرخواز، ناونیشانی یەکێك لە چیرۆکەکانی کارامازینە. هەڵبەتە خودی نووسەر بە بەرهەمێکی ئەدەبیی دەزانی و لە کاتی ژیانی خۆیدا چاپ نەکرا. پاڵەوانی چیرۆکەکە «فرۆوێل سیلین» کە کابرایەکی ڕەنجبەر و خەڵکی لادێیەکی پارێزگای سیمبیرکە، لە ساڵی قاتیوقڕیدا، نانی خۆی بەسەر جووتیاراندا بەخشییەوە و یارمەتیی هەموو بێکەسانی دا. دۆستۆیڤسکی لە بێگانەدا، چەندین جار بە ناڕاستەوخۆ تانە لە فرۆوێل سیلینی خێرخواز دەدات. «و. ف»

مایەی پێکەنینە کە من زانیارییەکم بەخشییە ئەو وەرزێرانە؟ نەخێر، برالە، من هەروا ئەم کارەم کرد. سیریۆژا، ئەوە لە خۆشیی بینینەوەی تۆدا بوو. تەنیا دەمویست ئەو وەرزێرەش بزانێ کە مەودای ئێرە تا هەتاو چەندە. داماوە دەمی هەروا بەش مابووەوە، من چێژم لێ برد... بە جۆرێ لە جۆرەکان پێی دڵخۆش بووم. وەلێ بڕوانە، هاوڕێکەم، لای میوانەکان باسی ئەوە نەکەی کە من لێرە قسەم لەگەڵ وەرزێرەکان کردووە. من بە تایبەت پشت ئەم گەوڕەم بۆ شوێنی دیداری خۆم و ئەوان دیاری کردبوو تا کەس پێمان نەزانێ. برالە، نەدەکرا ئەم گفتوگۆیە لەوێ ئەنجام بدرێ: کارێکی ئاڵۆزە، خودی وەرزێرەکانیش بێچرپە هاتن. ئاخر، من ئەم کارەم تەنیا لەبەر ئەوان کرد...

بۆ ئەوەی بابەتی باسەکە بگۆڕم و ڕاستەوخۆ بچمە سەر کرۆکی مەسەلەکە، گوتم:

– دەی، خاڵە گیان، وا دواجار گەڕامەوە! پێویستە دانی پێدا بنێم هێندە بە نامەکەی ئێوە سەرسام بووم کە...

خاڵە کە لە ترسان تۆنی دەنگی نزم کردبووەوە، قسەی پێ بڕیم:

– لەم بارەیەوە هیچ مەڵێ، هاوڕێکەم! دواتر، دواتر هەموو شتێ ڕوون دەبێتەوە. ڕەنگە من لە بەردەم تۆدا خەتابار بم، تەنانەت ڕەنگە زۆریش خەتابار بم، وەلێ...

– خاڵە گیان، لە بەردەم مندا خەتابار بیت؟

– با دواتر، دواتر، هاوڕێکەم، دواتر. هەموو شتێك ڕوون دەبێتەوە. هەر بە ڕاست، تۆ پیاوێکی ئێجگار شەرەفمەندت لێ دەرچووە! باوکی باوکەکەم! ئاخ کە چەندە چاوەڕێت بووم! وەك دەڵێن، دەمویست دەردەدڵت لەگەڵ بکەم... تۆ شەهادەداری، منیش تەنیا تۆم هەیە... تۆ و کارۆفکین. پێویستە بڵێم کە لێرە هەمووان لێت قەڵسن. ئاگات لە خۆت بێ، وریا بە هیچ کات تووشی هەڵە نەبی!

نەمدەتوانی لەوە تێبگەم کەسانێك کە ئەسڵەن من ناناسن، ئاخۆ بۆچی لێم قەڵسن. بە سەرسووڕمانەوە لە خاڵەم ڕووانی و گوتم:

– لە من؟ لە من قەڵسن؟

– بەڵێ، براله، لە تۆ. دەی چی بکەین ئاخر! فۆما فۆمیچ کەمێ تووڕەیە... ئەوجا، دایە گیانیش بە پەیڕەویکردن لە ئەو. بە گشتی ئاگادار بە، بە ڕێزەوە هەڵسوکەوت بکە، هیچ لارییەکت نەبێ، جا لە هەمووشی گرنگتر، بە ڕێزەوە هەڵسوکەوت بکە...

– خاڵە گیان، بەرانبەر کەسێکی وەك فۆما فۆمیچ؟

– دەی چی بکەین، هاوڕێکەم! خۆ من بەرگریی لێ ناکەم. بە ڕاستمە! ڕەنگە ئەویش بەری نەبێ لە عەیبوعار، تەنانەت هەر ئێستە، لەم ساتەدا کە من قسانت لەگەڵ دەکەم... ئاخ، براله سیریۆژا، ئەم شتانە چ خەفەتێکم دەدەنێ! ئەی خۆزگە هەموو شتێ بە خێر و خۆشی دەبڕایەوە و ئێمەش تێکڕا قاییل و بەختەوەر

دەبووین!... وەڵێ کێ هەیە بێ کەموکوڕی بێ؟ دەی، خۆ ئێمەش لە زێڕ نیین!

- حەیفت نەکرد، خاڵە گیان! ئاخر بڕوانن کە چی دەکا...

- ئاخ، براله! هەموو ئەمانە لە دەمەقاڵێیەك بەولاوە هیچی دیکە نین! بۆ نموونە، ئێستە بۆت باس دەکەم: فۆما ئێستە لە من قەڵسە، باشە تۆ بڵێی لەبەر چی بێ؟... جا بەدەر لەوەش، ڕەنگە لە بنەڕەتەوە من خۆم خەتابار بم. وا باشە دواتر بۆتی بگێڕمەوە...

من کە پەلەم بوو بیرۆکەکەی خۆم بخەمە بەرباس، قسەم پێ بڕی. ئەوەی ڕاستی بێ ئێمە هەردووکمان پەلەمان بوو.

- دەزانن، خاڵە گیان، من لەم زەمینەیەدا بیرۆکەیەکم هەیە، بەر لە هەموو شتێك فۆما لیبووکێك بووە: ئەم بابەتە بووەتە مایەی نیگەرانیی، ئەوی وێران کردووە و خەونەکانیی داونەتە بەر سووکایەتی، جا هەر لەبەر ئەمەیە کە بووە بە مرۆڤێکی بێبەزەیی و نەخۆش و ڕقلەدڵ و دەیەوێ تۆڵە لە هەموو مرۆڤایەتی بکاتەوە... وەڵێ گەر ئێمە لەگەڵ مرۆڤەکاندا ئاشتی بکەینەوە، گەر بیگەڕێنینەوە سەر باری ئاسایی خۆی...

خاڵە بە جۆشوخۆشەوە گوتی:

- کتومت، کتومت! کتومت وایە! ئەم بیرۆکەیە هەتا بڵێی جوامێرانەیە! تەنانەت مایەی خەجاڵەت و نامەردی بوو گەر ئێمە ئەومان تاوانبار بکردبا! ڕاستە!... ئاخ، هاوڕێکەم، تۆ تێم دەگەی، تۆ بوویە مایەی دڵخۆشیم! بەس خۆزگە لەوێ هەموو شتێ بە خێر و

خۆشی دەبڕایەوە! دەزانی، ئێستە تەنانەت من زاتم نییە لەوێ خۆم دەرخەم. ئێستە کە تۆ هاتووی، بێگومان دەکەونە گیانم!

بەم پێهاتنەی خاڵە دڵگران بووم و ویستم بڵێم:

– خاڵە گیان، مادام وایە...

ئەو یەکسەر دەستمی گرت و هاواری کرد:

– نا، نا، نا! بە هیچ نرخێك! تۆ میوانی منی و من دەمەوێ تۆ بمێنیەوە!

ئەم قسانە بە تەواوی سەراسیمەیان کردم. جا پێداگرانە پرسیم:

– خاڵە گیان، ئێستە پێم بڵێن، بۆ داواتان کردبوو بێمە ئێرە؟ چ چاوەڕوانییەکتان لە من هەیە و بۆ لە بەردەممدا هەست بە خەتاباری دەکەن؟

– مەپرسە، هاوڕێکەم! دواتر، دواتر، دواتر! دواتر هەموو شتێ ڕوون دەبێتەوە! ڕەنگە من لە زۆر ڕووەوە خەتابار بم، وەلێ نیازم وا بوو کارێکی شەرەفمەندانە بکەم، جا... جا...

خاڵە لە بارێکدا کە بە بۆنەی هەیەجانێکی کتوپڕانەوە سوور هەڵگەڕابوو، زۆر توونـد و جددیانـە دەسـتمی گوشـی و لەسـەری ڕۆیشت:

– جا لەگەڵ ئەو زەماوەند دەکەی! تۆ گەر تەنانەت یەك تۆسقاڵە هەستی شەرەفمەندانەت تێدایە، ئەوا زەماوەندی لەگەڵ دەکەی! وەلێ با بەسی بێ، یەك وشەی دی ناڵێم! بەم زووانە خۆت لە هەموو شتێ حاڵی دەبی. هەموو شتێ پەیوەستە بە تۆوە... گرنگ ئەوەیە کە

ئەمڕۆ کەیفیان پێت بێ و بتوانی کاریگەرییەکی ئەرێنییان بخەیە سەر. گرنگ ئەوەیە کە شەرم داتنەگرێ.

– وەڵێ خاڵە گیان، گوێ بگرن، ئێستە کێ لەوێیە؟ دانی پێدا دەنێم کە، من هێندە کەم تێکەڵیی خەڵکم کردووە کە...

خاڵە بەدەم بزەوە قسەمی پێ بڕی:

– کە تۆزێ دەترسی، ها؟ هیچ نییە! هەمووی خۆمانەن، ئازا بە! گرنگ ئەوەیە کە، ئازا بی و نەترسی! من خۆشم بە جۆرێ لە جۆرەکان بە بۆنەی تۆوە دەترسم. پرسیت، کێ لە ماڵەوەیە؟ بەتەمای کێ لەوێ بێ... بەر لە هەمووان دایە گیان، خۆ دایە گیانت لە بیرە؟ بێ زیادەڕۆیی نیانترین و سەلارترین ژنی هەموو دونیایە. دەشێ بڵێین، شێوەی بیرکردنەوەی کەمێ پێشینیانەیە، جا خۆ ئەوە باشتریشە. دەی، دەزانی، جاروبار هەندێ خەیالاتی بە سەردا رادەبوورن و قسەگەلێ دەکا، وا ئێستەش لە من تووڕەیە، دەی، من خۆم خەتابارم... دەزانم کە خەتابارم! دەی، خۆ ئەو دواجار خانمی گەورە و ژنەجەنەراڵی پێ دەڵێن... مێردەکەی پیاوێکی ئێجگار دیار بوو، دوای خۆی سامانێکی وای لێ بەجێ نەما، وەلێ لەشی یەك پارچە زام بوو، بە کورتییەکەی، شیاوی رێزلێنان بوو! کەسی دواتر پاکیزە پرەی پێلیتسینایە. دەی، ئەو... نازانم... لەم دواییانەدا تا رادەیەك... هەڵسوکەوتی بە جۆرێ لە جۆرەکان... بەس خۆ ناکرێ هەمووان خەتابار کەین... دەی، تۆ خۆتی تێمەگەیەنە... هەرگیزیش ئەوەت بە خەیاڵدا نەیێ کە ئەو سەرباری ئێمەیە. برالە، ئەو خۆی کچە سەرهەنگە. هاوەڵی دایە گیانە، من خۆشم دەوێ! برالە، بەدەر لە مانە خوشکم (پراسکۆڤیا ئیلینیچنا)یشی لێیە. دەی، سەبارەت

بەو شتێکی وا نییە کە شیاوی باسکردن بێ: سادە و میهرەبانە، جا کەمێکیش خۆهەڵقوورتێن، لەبەرانبەردا، هەتا بڵێی دڵپاکە! ئەوە گرنگە کە تۆ لە دڵی مرۆڤەکان بڕوانی. دەزانی، گەرچی کچێکی بەتەمەنە، وەلێ هەمان باخچییێڤی شێتوشوور دەوروخولی دەدا، وا دیارە دەیەوێ خوازبێنیی بکا. بەس تەماشا، نەکا کتوپڕ قسەیەکت لە دەم دەرچێ، ئەها، ئەمە نهێنییە! دەی، ئیدی کێی لێیە؟ باسی منداڵەکان ناکەم: خۆت چاوت پێیان دەکەوێ. سبەینێش ئاهەنگی لەدایکبوونی ئالیۆشایە... ئاخ، بە ڕاست! خەریکبوو بیرم بچێ: نزیکەی مانگێك دەبێ کە ئیڤان ئیڤانۆڤیچ میزینچیکۆڤیش لامان میوانە. لام وایە دەبێتە ئامۆزای دایکت، بەڵێ ڕێك ئامۆزای دایکتە! سوتوانی[1] سوارەی چەکدار بووە و تازە خانەنشین کراوە، هێشتا گەنج دیارە. کەسێکی زۆر جوامێرە! وەلێ دەزانی، هەموو سامانەکەی خۆی بە با داوە، سەرم لەوە ئاوساوە کە چۆن مرۆڤ ئاوا لە چاوترووسکانێکا هەموو ژیانی خۆی بەبا دەکا. گەرچی کەمتازۆر شتێکی واشی نەبووە، وەلێ دەی، هەمووی بەبا داوە و بووە بەژێر قەرزوقۆڵەوە... جارێ میوانی ئێمەیە. ئەسڵەن من نەمدەناسی، ڕۆژێکیان هات و خۆی ناساند. مرۆڤێکی ڕۆحسووکە، دڵپاك و کەمدو[2] و شیاوی ڕێزلێنان. کەس نەیدیوە دەنگ و هەرایەکی لێوە بێ. دایمەی خوا بێدەنگە. فۆما بۆ خۆشی بە *غەریبەی بێدەنگ* ناوی دەبا، وەلێ ئەو نایگرێتە دڵ. فۆماش لاریی نییە، تەنیا دەڵێ: ئیڤان کەمێ حۆل دیارە. ئیڤانیش لە هیچ مەسەلەیەکدا لەگەڵی ناکۆك نییە

---

١. سوتوان: ئەفسەری سووپا، کە فەرماندەیی و سەرپەرشتیی لقێك چەکداری لە ئەستۆدایە.

٢. کەمدو: کەمقسە، کەسێك کە قسەی کەم دەکات.

و دایمە *بەڵێ قوربان* لەسەر زمانیەتی. ئممم! ئەرێ، بە جۆرێ لە جۆرەکان ستەملێکراوە... دەی، وێڵی کە! خۆت دەیبینی. لە شاریشەوە میوانمان هەیە، پاول سیمیۆنیچ ئابنۆسکین لەگەڵ دایکی. گەرچی هێشتا لاوە، وەلێ پیاوێکی دانایە، دەکرێ بڵێین، کەسێکی کامڵە، دەزانی، زۆر بەئیرادەیە... نازانم چۆن دەریبڕم، جا هەروا بێتەوە، پابەندی سەرسەختی خووڕەوشت و بەرزەئاکارییە! جا دواجار، دەزانی، ئەمڕۆ تاتیانا ئیڤانۆڤنایەکیشمان لایە کە گوایە یەکێکە لە خزمە دوورەکانمان. هەڵبەتە تۆ نایناسی، وەلێ دەبێ دانی پێدا بنێم کە پاکیزەیەکی هێندە گەنج نییە، بەس... دەچێتە دڵەوە. برالە، ئەوەندە دەوڵەمەندە کە دەتوانێ دوو جار ستیپانچیکۆڤۆ بکڕێت، لەم دواییانەدا ئەم پارەیەی بە میرات بۆ ماوەتەوە، پێشتر کوێرەوەریی زۆری چەشتووە. سیریۆژاکەی خۆم، برالە گیانم، تکا دەکەم زۆر وریا بە، چونکە یارۆ بە جۆرێ لە جۆرەکان نەخۆشە... دەزانی، خووڕەوشتێکی سەیروسەمەرەی هەیە. دەی، تۆ گەنجێکی ژیری، دەرك بەوە دەکەی کە مەینەتیی کێشاوە! دەبێ دووبەرانبەر ئاگاداری ئەو کەسانە بین کە لە ژیانیاندا تووشی مەینەتی بوونە! گەرچی نابێ بیرت بۆ شتی خراپ بچێ. هەڵبەتە کۆمەڵێ خاڵی لاوازی هەیە: هەندێ جار لە شپرزەییان قسەیەکی پێدا دەکا، شتێ دەڵێ کە بۆ گوتن ناشێ. نەکا لات وا بێ کە درۆزنە... برالە، هەموو ئەمانە لە پاکی و سادەییەکی لەڕادەبەدەری ئەوەوە سەرچاوە دەگرن، خۆ حاڵی دەبی؟

وام هاتە بەرچاو کە خاڵە زۆر شپرزە و شەرمەزارە.

گوتم:

– خاڵە گیان، گوێ بگرن، من ئێوەم زۆر خۆش دەوێ... بە داوای لێبووردنەوە، پێویستە بە ڕاشکاوی بپرسم: ئایا ئێوە هەر بە ڕاستی نیازتان وایە زەماوەند لەگەڵ کەسێکدا بکەن؟

خاڵە کە وەکو منداڵ سوور هەڵگەڕابوو، گوتی:

– تۆ ئەمەت لە کێوە بیستووە؟ تەماشا کە هاوڕێ، هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم، بەر لە هەر شتێ با پێت بڵێم کە من نامەوێ زەماوەند بکەم. دایە گیان و تا ڕادەیەك خوشکم و فۆما فۆمیچ، کە ڕێزێکی لەڕادەبەدەری لای دایەگیان هەیە (هەڵبەتە بە بۆنەی ئەو هەموو کارانەوەیە کە بۆ دایە گیانی کردوون)، ئەرێ، هەمووان حەز دەکەن لەگەڵ هەمان ئەو تاتیانا ئیڤانۆڤنایەی کە باسم کرد، زەماوەند بکەم. ئەمە ویستی ئەوانە، لە خەمخۆرییەوەیە و لەبەر بەرژەوەندیی گشتی بنەماڵەکە. هەڵبەتە ئەوان چاکەی منیان دەوێ، باش ئەمە دەزانم، وەلێ بەڵێنم بە خۆم داوە کە بە هیچ شێوەیەك مل بۆ زەماند نەدەم. سەرباری ئەوەش، هێشتا نەمتوانیوە وەڵامیان بدەمەوە، نە گوتوومە ئەرێ و نە گوتوومە نا. براله، دایمە هەر وا بوومە. ئەوانیش وایان زانیوە کە من دڵم پێوەیە و سبەینێ لە ئاهەنگەکەدا ئامادەیی خۆم بۆ ئەم کارە ڕادەگەیەنم... جا هەر لەبەر ئەمەش، ئەوەندە ئیشوکاری سبەینێم بەسەردا کەڵەکە بووە کە نازانم چی بکەم! سەرەڕای ئەوەش، من نازانم کە بۆ فۆما فۆمیچ لێم لووتەلایە، دایە گیانیش هەر وا. براله، دەبێ دانی پێدا بنێم کە تەنیا چاوەڕێی هاتنی تۆ و کارۆفکین بووم... وەك دەڵێن، دەمویست دەردەدڵتان لەگەڵ بکەم...

– خاڵە گیان، کارۆفکین لەم بارەیەوە چ یارمەتییەکی لەدەست دێ؟

– لەدەستی دێ، هاوڕێکەم، بێ گومان یارمەتیم دەدا. براڵە، ئەو کەسێکی ژیرە، بە کورتییەکەی زانیاریی زۆری هەیە! دڵنیام کە من بێخەم دەتوانم پشتی پێ ببەستم وەك ئەوەی کە کێوێکم لە پشتەوە بێ. کەسێکە سەر لە هەموو شتێ دەردەکا! بە جۆرێ لە بەختەوەریی خێزان دەدوێ کە هەر مەپرسە! دانی پێدا دەنێم، کە لە تۆیش ڕادەبینم، لام وایە دەتوانی ئەوان قاییل کەی. خۆت داوەری بکە: ئەسڵەن با وای دانێین من خەتابارم. خۆم لەمە تێدەگەم، وەلێ خۆ بێهەست نیم. دەی خۆ دواجار هەر ڕۆژێ دادێ کە لێم ببوورن! جا ئەوسا پێکەوە ژیانێکی خۆش بەسەر دەبەین!... ئاخ، براڵە، ساشینکای من بە تەواوی گەورە بووە، ئیدی کاتی شوویەتی! ئالیۆشاش بووەتە پیاوێك بۆ خۆی! سبەینێ ئاهەنگی ناولێنانیەتی. مەسەلە ئەوەیە کە من خەمی ساشینکام لێ نیشتووە!...

– بێ بۆ بالاخانە، هاوڕێکەم، بۆ ژووری پێشوازی. پێشتر ئاگادارم کردوونوتەوە هەرکە گەیشتی بەرەو ژووری پێشوازیکردن ڕێنماییت بکەن تا کەس پێنەزانێ. ڕاستە، ڕاستە، جلەکانت بگۆڕە! ئەمە زۆر باشە، شازە، شاز! من تا تۆ دێی، کەمێ ئامادەیان دەکەم. دەی ئیدی، پشت بە خوا! دەزانی، براڵە، پیاو پێویستە سیاسەتی هەبێ. دەی ئیدی، گرنگ نییە! وا ئێستە لەوێ هەمووان چا دەخۆنەوە. فۆما فۆمیچ حەزی وایە هەرکە لە خەو ڕابوو، چا بخواتەوە، دەزانی، جا ئەمە باشتریشە... دەی، وا ڕۆیشتم، تۆ خێرا بە دوای مندا وەرە، مەهێڵە تەنیا بم: بە جۆرێ لە جۆرەکان، براڵە، بە

تەنیا ئاسوودە نیم... بە ڕاست! بوەستە! تکایەکیشم هەیە: بەم جۆرەی کە هەر ئێستە لێرەیا هاوارت کرد، لەبەردەم ئەوانا ئاوا هاوارم بەسەرا مەکە، باشە؟ گەر ویستیشت شتێکم بە گوێدا بدەی، دواتر کە هەر خۆمان بووین بە گوێمیا بدە، کەواتە تا ئەو کاتە دان بە خۆتا بگرە و پەلە مەکە! خۆ دەبینی کە لەوێ هەمووان لەگەڵم ناکۆکن. هەموویان لێم توورەن...

– گوێ بگرن، خاڵە گیان، بە پێی هەموو ئەو شتانەی کە بینیومن و بیستوومن، لام وایە کە ئێوە...

کتوپڕ قسەی پێ بڕیم و گوتی:

– من چی؟ هیچلێنەهاتووم؟ ئەرێ، قسەی دڵت بکە! دەی چی بکەم، برالە! خۆشم ئەوە دەزانم. دەی، دواجار دێی یان نا؟ تکا دەکەم خێرا کە!

کە چوومە سەرێ، لەبەر ئەوەی خاڵە گوتبووی زوو بچم بۆ ئەوێ، خێرا جانتاکەمم کردەوە. بەدەم خۆگۆڕینەوە، بیرم لەوە دەکردەوە کە گەرچی ماوەی کاتژمێرێکی تەواو قسەم لەگەڵ خاڵە کردووە، وەلێ شتێکی وام دەست نەکەوتووە. هەر لەبەر ئەوە، بە تەواوی سەرم سووڕ مابوو. تەنیا کەمتازۆر شتێکم بۆ ڕوون بووبووەوە: ئەوەی کە خاڵە هەروا سوورە لەسەر زەماوەندکردنەکەم، کەواتە ئەو قسەوقسەلۆکە لێکدژانەی کە گوایە، خاڵە خۆیشی هۆکری ئەو کەسە ناوبراوەیە، بێبنەما بوون. بیرم دێت کە زۆر دڵپەرۆش بووم. جا لەگەڵ ئەوەشدا، کەوتمە بیری ئەوەی کە ئەم هاتن و بێدەنگبوونەم لەبەرانبەر خاڵەدا، نزیکەی وەك ئەوە وایە کە

بەڵێنم پێ دابێت و بۆ تاهەتا خۆمم پێوەکردبێت. لە بەرخۆوە بیرم کردەوە:

- خۆ هیچی تێ ناچێ، گوتنی وشەیەك کە بۆ تاهەتا دەست و پێت ببەستێتەوە، خۆ هیچی تێ ناچێ. بەس خۆ من هێشتا بوکێم نەدیوە!

هەروەها بیرم کردەوە:

- باشە بۆ ئەندامانی ئەم خێزانە ڕقیان لە منە؟ بۆچی هەر بەو جۆرەی کە خاڵە دەیڵێ، دەبێت ئەوان هاتنی منیان لە بەردڵ گران بێت؟ جا ئەم ڕۆڵە سەیروسەمەرەیە چییە کە خاڵە، لێرە، لە ماڵەکەی خۆیدا دەیگێڕێ؟ ئەی ئەم هەموو پەنامەکییە[1] لە پای چی؟ هۆکاری ئەم هەموو ترس و لەرزە چییە؟

دانی پێدا دەنێم کە لە ناکاوێکدا هەموو شتێکم تەواو بە بێمانا هاتە بەرچاو و لەگەڵ ئەوەڵین بەرکەوتن لەگەڵ حەقیقەتدا، تێکڕای خەون و خەیاڵە ڕۆمانسی و پاڵەوانانەکانم لە سەر دەرچوون. ئێستە ئیدی دوای گفتوگۆکردن لەگەڵ خاڵەدا، تێگەیشتبووم کە پێشنیارەکەی چەندە نامەنتیقی و گاڵتەجاڕانە بووە و دەرکم بەوە کرد کە کردنی وەها پێشنیارێك لەم هەلومەرجەدا، هەر بە تەنیا لە خاڵەم دەوەشێتەوە. هەروەها من زۆر گەمژە بوومە کە بە پێشنیارەکەی ئەو شاگەشکە بوومە و بە ئاماژەیەکی ئەو، سەرسامانە خۆم گەیاندووەتە ئێرە. مێشکم ئەوەندە قاڵ بوو و بە چەشنێك لە خۆگۆڕیندا پەلەم دەکرد کە ئاگام لە هاتنی ئەو

---

1. پەنامەکی: ژێراوژێری، نائاشکرایی، نهێنیانەیی.

خزمەتکارە نەبوو کە هاتبوو تا یارمەتیم بدات. خزمەتکارەکە لەناکاو بە ئەتەکیەتێکی نائاسایی و زیادەڕۆیانەوە پرسیی:

– بۆینباخی ڕەنگ ئادیلائیدی[1] دەبەستن یان چوارخانەیی؟

سەیرێکیم کرد و لە بەرخۆوە گوتم دەکرێت هەندێک زانیاریی لێ وەربگرم. پیاوێکی لاو و سەروشکڵی زۆر شیاو بوو بۆ خزمەتکاری و، هیچی لە شیکپۆشانی شاری کەم نەبوو.

پێدەچوو چاکەتی قاوەیی لەگەڵ پانتۆڵی سپی و پەستەکی چەرمەی مات[2] و پووتی بۆیاخکراو و ئەو کڵاوە پەمەییە لە خۆڕا هەڵنەبژێردرا بن. ئەمانە ئاماژەیان بە خۆشسەلیقەیی لاوێکی تەرپۆش دەکرد کە خۆبەخۆ سەرنجی ئەوانی دیکەی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا. هەروەها زنجیری کاتژمێرەکەشی، هەروا دەسئەنقەست خرابووە بەرچاوان. ڕەنگی هەڵبزکا بوو و تەنانەت کەمێک مەیلەو سەوزیش بوو. لووتی گەورە، دەنووکە داڵی، نووکن و ئەوەندە سپی بوو کە دەتگوت لە فەخفور درووست کراوە. بزەی سەر لێوانی باریکی، ئاماژەدەری خەمێکی ناسك بوون. نیگای، لەپشت چاوە

---

١. ڕەنگی ئادیلائیدی: بە ڕەنگێکی سووری مەیلەو وەنەوشەیی دەگوترێت یان شینێکی نزیك لە ئەرخەوانی. ئەم ڕەنگە لە ئادیئیلادا (لە ئەڵمانیای کۆندا بە واتەی باری دڵخوان) وەرگیراوە و ناوی پاڵەوانی ئاوازێکی بیتهۆڤنە هەر بەم ناوەوە، کە لەسەر بنەڕەتی شیعرێکی ماتیسن دانراوە. لە دەقی شیعری ماتیسندا باس لە جۆرە ڕەنگێکی ئەرخەوانییە کە بە جۆرێك لە جۆرەکان پەیوەندیی بە کەشی خەمگین و خەمۆکانەی شیعرەکەوە هەیە. لە ناوەڕاستەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا، ناونانی ئەم ڕەنگە بە ڕەنگی ئادیلائیدی باو بوو و تەنانەت لە ساڵەکانی ٤٠–٥٠ جاروبار لە بەرهەمی نووسەراندا ئاماژەی پێ دەکرا، وەلێ دواتر لە بیر کرا. «و. ف»

٢. چەرمەی مات، سپیی مات.

گەورە و بەرجەستە و شوشەئاساکانییەوە، بە تەواوی لە هی کەسانی نەفام دەچوو، لەگەڵ ئەوەشدا، لێوڕێژ بوون لە ڕێز و حورمەت. گوێ نەرم و ناسکەکانی، وەك ڕێزێك پەمۆیان تێخرابوو. قژە کاڵ، درێژ و لوولەکانی چەور کرابوون. دەستە سپی و پاکەکانی دەتگوت بە گوڵاو شتوشۆر دراون. ئەنگوستەکانی، بە نینۆکگەلی بڕبەندلێدراو و درێژی پەمەیی کۆتاییان دەهات. هەموو ئەمانە ئاماژەیان بەوە دەکرد کە ئەو گەنجێکی نازدار و ژیکەڵە و خۆخۆشەویستە. پیتی «سین»ی فیکەئاسا دەردەبڕی و دەسنەنقەستیش پیتی «ر»ی گۆ نەدەکرد.

سەری بەرز و نزم دەکردەوە و هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا و بە شێوەیەکی سەیروسەمەرە خۆی ناسك دەکردەوە. بۆنەکەی خێرا بەر لووت دەکەوت. باڵای کورت و قەڵافەتی سست و لاواز بوو و لە کاتی ڕێکردندا، بە شێوەیەکی زۆر تایبەتی ئەژنۆکانیی دەچەماندنەوە، پێدەچوو لای وا بێت کە ئەم جۆرە ڕێکردنە، نیشانەی ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتە. بە کورتییەکەی سەرتاپا ڕێز و حورمەت و ناسکی بوو و هەستێکی نامۆی لە بارەی ویقاری خۆیەوە هەبوو. نازانم بۆچی هەر لە خۆوە کەیفم بەم دواهەمین تایبەتمەندیەی نەهات.

زۆر بە جددی لە خزمەتکارە لاوەکەم ڕوانی و پرسیم:

– یانی ئاوا، کەواتە ڕەنگی ئەم بۆینباخە ئادیلائیدییە؟

بە هێمنی و ڕێزەوە وەڵامی دامەوە:

– بەڵێ قوربان، ئادیلائیدییە.

– ئاگرافینایی نییە؟

– نەخێر قوربان، وەها ڕەنگێك بوونی نییە.

– بۆ؟

– ئاگرافینا ناوێکی ناشیرنە، قوربان.

– ناشیرینە؟ بۆچی؟

– ئەوە ڕوونە، قوربان، ئادیلائید لانیکەم ناوێکی بیانیی ڕەسەنە، وەلێ ئاگرافینا لەوانەیە ناوی دەڵەقۆڕێکی دێهاتی بێ.

– باشە تۆ ئەقڵت لەدەست داوە؟

– بە هیچ شێوەیەك، قوربان، ئەقڵم بە تەواوی لەجێی خۆیەتی، قوربان! هەڵبەتە ئێوە لەوەدا ئازادان کە چ ناوێکتان پێ خۆشە لێمی بنێن، وەلێ زۆرێك لە جەنەراڵان و تەنانەت بڕێك لە کۆنتە[1] پایتەختنشینەکانیش چێژیان لە هاودەمیی من بردووە، قوربان!

– باشە ناوت چییە؟

– ڤیدۆپلیاسۆڤ.

– ئەها! یانی ڤیدۆپلیاسۆڤ تۆی؟

– بەڵێ، قوربان.

– باشە، برالە، پەلەت نەبێ، بە تۆش ئاشنا دەبین.

جا بەدەم داگەڕان بە پلیکانەکاندا، لە بەرخۆوە بیرم کردەوە:

– ئێرە زیاتر لە شێتخانەی بەدلەم[2] دەچێت تا ماڵ.

---

١. کۆنت: یەکێکە لە سەرناوە ئاغاواتییە ئەورووپییەکانە بۆ پیاوان، بە تایبەت لە فەرەنسادا. هەروەها «کۆنتیس»یش سەرناوی ژنی کۆنتە.

٢. لە بنەڕەتدا ناوی بینایەکە لە لەندەن، کە لەوێ شێتیان ڕادەگرت. «و. ف»

# وەرزی چــوارەم

## چاخواردنەوە

دەرگــەی ژووری چــاخواردنەوە، بــە ڕووی هــەمان ئــەو هەیوانــەدا دەکرایــەوە کــە کاتــژمێرێك لەوەوبــەر گــاڤریلام تێــدا بــینی بــوو. ئاگادارکردنــەوە ژێراوژێرەکــانی خاڵــە، لــە بــارەی چــۆنییەتیی پێشوازیکردن لە من، بە تەواوی ناڕەحەتیان کردبووم. هەندێك جار دەرکەوتنی خۆپەسەندی لە مرۆڤدا، لەگەڵ تەمەنی یەك ناگرێتەوە و نیشاندانیشی تا ڕادەیەك لە ترسەوە سەرچاوە دەگرێت. هەر لەبەر ئەوە، لەگەڵ چوونە ژوورم و بینینــی ئــەو کەســانەی کــە بــە دەوری مێزێکدا دانیشتبوون، پێم گیرایە فەرشەکە و سەرسمێکم دا و جا بۆ پاراستنی هاوسەنگیم، کتوپڕ بازم دایە ناوەڕاستی ژوورەکە، جا ئەمەش بووە هۆی ئەوەی هەستێکی تەواو خراپم تێگەڕێت. وەك ئەوە وابوو کە لە ناکاوێکدا هەموو شانازی و پێگە و شکۆیەکی خۆمم بە با دابێت، لە شەرماندا، ڕەنگم (وەك چەوەندەر) سوور هەڵگەڕا و وشك بووم و بە تاساوی ڕوانیمە ئەو کەسانەی کە لە ژوورەکەدا ئامادە بوون. لەبەر ئەوە ئاماژە بە ڕووداوێکی هێندە

سەرپێی دەکەم کە بە درێژایی ئەو ڕۆژە، کاریگەرییەکی سەیری لەسەر ورە و جۆری بەرکەوتنم لەگەڵ هەندێك لە کەسایەتییەکانی نێو چیرۆکەکەمدا دانا. هەوڵم دا کڕۆنۆش ببەم، بەس نەمتوانی و زیادتر سوور هەڵگەڕام و فڕکەیەکم بەرەو لای خاڵە کرد و تەوقەم لەگەڵ کرد. لە بارێکدا کە هەناسەم سووار بووبوو، گوتم:

– خاڵە گیان، سڵاو.

ڕێك نیازی گوتنی شتێکی دیکەم هەبوو، شتێك کە زۆر شیاوتر بێت، وەلێ بە شێوەیەکی تەواو چاوەڕوانینەکراو، تەنیا گوتم سڵاو. خاڵە کە خەمی منی لێ نیشتبوو، لە وەڵامدا گوتی:

– سڵاو، سڵاو، براڵە گیان، وەلێ خۆ ئێمە سڵاو و چاك و چۆنیمان کردبوو.

جا چپەئاسا گوتی:

– تکایە نارەحەت مەبە! براڵە، ئەم جۆرە ڕووداوانە بەسەر هەموو کەسێکدا دێن، بگرە پیاو ڕەنگە زۆر لەمە خراپتریشی بەسەردا بێ! تەنانەت بۆشی هەیە لە هەلومەرجێکی لەو جۆرەدا بەسەر زەوییەوە گرمۆڵە ببێ!... باشە، ئێستە دایە گیان، مۆڵەت بدەن پێتانی بناسێنم: ئەمەش گەنجەکەی ئێمە، تۆزێ شەرمنە، وەلێ بێ گومان لەبەردڵانە.

جا پاشان ڕوو بە هەمووان ئەمەی بۆ زیاد کرد:

– خوشکەزام، سێرگی ئالێکساندرۆڤیچ.

وەلێ خوێنەری ئازیز، بەر لەوەی بچینە سەر درێژەی باسی چیرۆکەکە، مۆڵەت بدەن تایبەتمەندیی هەریەك لە ئامادەبووانتان، کە ئاوها کتوپڕ خۆم لەنێویاندا دیتەوە، بۆ باس بکەم. وەها ڕوونکردنەوەیەك بۆ دوابەدوای چیرۆکەکەشم شتێکی پێویستە.

بەدەر لە من و خاڵە، کۆڕەکە پێك هاتبوو لە چەند خانمێك و دوو پیاو. فۆما فۆمیچ کە زۆر تامەزرۆی دیداری بووم و گەورە و دەستڕۆیشتووی ئەو ماڵە بوو (تەنانەت لەو ساتەشدا هەستم بەمە دەکرد)، لە کۆڕەکەدا تەشریفی نەبوو. ئەو وێڕای پێواریشی[1]، کەچی کەچی هەر شوێنی خاڵیی دیار بوو و دەتگوت ڕووناکیی ئەو ژوورەشی لەگەڵ خۆیدا بردبوو. هەمووان خەمگین و نیگەران بوون. دەکرا هەر لە یەکەمین نیگادا هەست بەمە بکەیت. سەرەڕای ئەوەی کە خۆشم نارەحەت و دڵخوورت بووم، سەیرم دەکرد کە خاڵەش هێندەی من نیگەران و دڵخوورتە، گەرچی ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دەدا تا بە جۆرێك لە گوێنەدانی درۆیینەوە، دڵەڕاوکێکەی بشارێتەوە. شتێك لە شێوەی قوورساییەکدا گوشاری دەخستە سەر سنگی. یەکێك لەو دوو پیاوەی کە لە ژوورەکەدا ئامادە بوون، لاوێکی کەمتازۆر بیستوپێنج ساڵان بوو. ئەو هەمان ئەو ئابنۆسکینە بوو کە خاڵە یەك دوو کاتژمێرێك لەوەوبەر تاریفی[2] دانایی و بەرزەئاکاریی ئەوی دابوو. ئەوەی ڕاستی بێت بە هیچ شێوەیەك کەیفم بەو بەڕێزە نەهات، چونکە سەرتاپای ئامـاژەی بە

---

١. پێواری، نائامادەیی.

٢. تاریف: پێیاهەڵدان، باسکردنی لایەنی جوان و باشی کەسێك.

کەشخەییەکی بێتامانە دەکرد، قاتەکەی بەری فرە شیك بوو، گەرچی بەکارهاتوو و هەژارانـەش بـوو، جـا بـە ڕووخسـار، لـە چـاو تەمەنیـدا پیرتر دەینواند. بە ڕوواڵەت سمێڵی باریك و بۆری، کە ڕێك لە شاخی سیسـرك دەچـوو، لەگـەڵ ڕیشـە پینەوپەڕۆییـە سـەیرەکەیدا بڕیـار وا بوو نیشانەی ئەوە بن کـە خاوەنەکـەیان کەسێکی جیـاواز و تەنانـەت (بیرئازاد)یشـە. دایمـە چـاوی کـز دەکـردەوە و بزەیـەکی چـزوودار و دەستکردی لەسـەر لێـو بـوو. بەردەوام لەسـەر کورسـییەکەی تیتـاڵی دەکـرد و بـەو چـاویلکانەیەوە لـە منـی دەڕوانـی، وەلێ کـە لام لـێ دەکرەوە، وەك ئـەوەی کـە بترسێت، بە هێمنییـەوە ڕووی ئـەو شیشـە بچووکانەی لـە خـوارێ دەکـرد. ئـەو بـەڕێزەی دیکـەش گـەنج بـوو و تەمــەنی هــەر بیستوهەشــت ســاڵێك دەبــوو. نــاوی میزینـچـیکۆۊ و ئـامۆزای دایکـم بـوو. هـەر بـە ڕاسـتی زیـاد لـە ڕادە بێـدەنگ بـوو. لـە تـەواوی مـاوەی چـاخواردنەوەدا، یـەك قسـەی نـەکرد و وەختێکـیش ئەوانی دی پێدەکەنین، ئەو بزەشی نەدەهاتە سەر لێو. وەلێ من لـەودا هـیچ ئاسـەوارێکم لـەو داماویـە نـەبینی کـە بەرچـاوی خاڵـە کـەوتبوو. چاوە قاوەییە کاڵەکانی نیشاندەری مکووڕی و جۆرێك لـە ڕاشـکاویی کەسایەتیی ئەو بوون. میزینچیکۆۊ ئەسمـەر و قژڕەش و تـەواو قـۆز بوو و جلێکی شیاویشی لە بەر بوو. هەڵبەتـە مـن دوایـی ئـەوەم زانـی کـە جلـەکانی بـە پـارەی خاڵـە دابـین کـراون. لـەنێو خانمەکانـدا، لـە هەموویان زیادتر پاکیزە پرەی پێلیتسینا بەو ڕووخسارە ڕقاوییەوە سەرنجمی بەلای خۆیدا ڕاکێشا. ئەو لەتەك ژنی جەنەراڵ دانیشتبوو، هەڵبەتـە نـەك بـە تـەواوی لەتـەکی، بەڵکـە وەك ڕێزێـك کـەمێك لـە دواتریـەوە، هەیتاهـەیتاش خـۆی دەچـەماندەوە و شـتێکی بـە گـوێی

خودانەکـەی[1] خۆیـدا دەچـپاند. دواتـر دێمـەوە سـەر ئـەو و بـە تێروتەسەلی باسی لێوە دەکەم. دوو یان سێ خانمە بەساڵاچوو لە هاودەمەکانی ژنی جەنەراڵ، بۆ ئەوەی نقەیان لێوە بێت، لەتەنیشت پەنجـەرەوە دانیشـتبوون و واقیـان لـە خـانم گیـانی جەنـەراڵیان وڕ مابوو و بە ڕێزەوە چاوەڕێی هێنانی چا بوون. خانمێکی قەڵەو و تەواو تەپیش سەرنجمی ڕاکێشا. پەنجا ساڵێك دەبوو و جلێکـی زۆر ناجۆر و جلفانـەی[2] لـە بـەر کردبـوو. سـووراو و سپاوێکی باشـی لـە ڕووخساری ناویبوو و لە جێی ددان، پارچە ئێسکی ڕەش و شکاو لـە دەمیـدا وەدیـار کـەوتبوون، وەڵێ ئـەم بابەتـە هـیچ ڕێگرییـەکی لـە نازونوککردن، نوانـدنی ئەنـدام، چاوخومارکردن و تەنانـەت کـەمێك مەکربازیش نەکرد. جۆرەها زنجیری بە خۆیـەوە هەڵواسیبوو و وەك میسـۆ ئابنۆسـکین، دایمـە ڕووی چاویلەکەکانی لـە مـن بـوو. ئـەو، دایـەگیانی ئابنۆسـکین بوو. پـوورێ گیـانم (پرسـاکۆفیا ئـەیلی نیچـنا) خاکەڕایانە خەریکی تێکردنی چا بوو. دیار بوو کە دوای ئەو هـەموو دوورییـە، زۆری حـەز لێیـە باوەشـم پێـدا بکـات و دونیایـەك فرمێسـك بڕژێت، وەڵێ زاتی ئەم کـارەی نـەبوو. پێدەچـوو لـەوێ، هـەموو شتێك بـە جۆرێـك لـە جۆرەکـان لـەژێر کۆنترۆڵـدا بێـت. لەتەنیشـت ئـەو، کچەخاڵم، شاسینکای پازدەساڵان (کچێکی لەبەردڵان و چاو و برۆ ڕەش) دانیشتبوو و بە کونجۆڵییەکی منداڵانەوە، بۆ ساتێك چاوی لە من لا نەدەدا. جا دواجار لەو کۆڕەدا، ڕەنگە بکرێت بڵێین، خانمێکی

---

1. خودان: نانبدە، گەورە، بەخێوکەر.

2. جلفانە، هەرزانە، هەرزەکارانە، دڵتەڕانە.

سەیروسەمەرە زیادتر لە هەرهەمووان سەرنجی کێش کردم. پۆشاکێکی ئالاَوواڵا و ئێجگار کەنجانەی پۆشی بوو، گەرچی بە هیچ شێوەیەك گەنجیش نەبوو و تەمەنی سیوپێنج ساڵێك دەبوو. ڕووخساری لاواز، وشکەوەبوو، هەڵبزڕکاو و هاوکات زیتەڵە بوو. گۆنا ڕەنگپەڕیوەکانی، کەمتازۆر لەگەڵ هەر جووڵە و هەیەجانێکدا سوورایییەکی تۆخیان تێدەگەڕا. زۆر بە جۆشوخرۆش بوو و بەردەوام لەسەر کورسییەکەی جموجووڵی بوو. دەتگوت ناتوانێ بۆ خولەکێك بسرەوێت. بە کونجکۆڵییەکی تەواوەوە لە منی دەڕوانی و زووزوو دەچەمییەوە، چپەچپێکی بە گوێی ساشینکا یان کەسەکەی ئەولاتریدا دەکرد و جا دواتر، بە پێکەنینێکی ساویلکانە و شاد و منداڵانەوە دەترقایەوە. زۆرم بەلاوە سەیر بوو کە هەڵسوکەوتی منداڵانەی سەرنجی هیچ کەسێکی ڕانەدەکێشا و دەتگوت پێشتر، هەمووان لەسەر وەها بابەتێك لەگەڵ یەکدی ڕێك کەوتوون. سۆسەم دەکرد کە دەبێت ئەوە هەمان ئەو تاتیانا ئیڤانۆڤنایە بێت کە وەکو دەزگیران بە مل خاڵمیاندا بڕیوە. تەواوی ئەندامانی ماڵەکە تەنیا لەبەر سامانەکەی ڕوویان دەدایێ. لەگەڵ ئەوەشدا، من خۆشم لە چاوە شین و هێمنەکانی هات. گەرچی دەوری چاوەکانی چرچولۆچیان تێکەوتبوو، وەڵێ نیگای هێندە سادە و شاد و میهرەبان بوو کە بەرکەوتنی، خۆشییەکی تایبەتی پێدەبەخشییت. دواتر بە تێروتەسەلی دێمەوە سەر باسی ئەم تاتیانا ئیڤانۆڤنایەی کە یەکێکە لە کەسایەتییە سەرەکییەکانی ئەم چیرۆکەی من. بەسەرهاتی ئەو شیاوی سەرنجلێدانە. دوای تێپەڕینی پێنج خولەکێك بەسەر ئامادەبوونم لەو میوانییەدا، کوڕیژگەیەکی جوانکیلە لە باخەوە ڕای

کردە نێو ژوورەکە. ئەو، هەمان ئالیۆشای کوڕەخاڵم بوو کە بڕیار وا بوو سبەینێ ئاهەنگی بۆ بگێڕن. گیرفانەکانی ئالیۆشا پڕ بوون لە ئێسك[1] و فڕفڕۆکەیەکیشی بە دەستەوە بوو. بەدوای کچێکی لاو و لەبارەوە خۆی بە ژووریدا کرد کە کەمێك ڕەنگپەڕیو و ماندو دەینواند، وەلێ جوان بوو. نیگایەکی تێکەڵ بە بەدگومانی و کونجکۆڵی و تەنانەت ترسی گرتە ئامادەبووان، بە سەرنجەوە لێم ورد بووەوە و لەپاڵ تاتیانا ئیڤانۆڤنادا دانیشت. بیرمە کە هەر لەخۆوە کەوتمە دڵەتەپێ و وای بۆ چووم کە دەشێ ئەمە هەمان مامۆستاکەی ماڵەوە بێت... خاڵەش لەگەڵ هاتنەژوورەوەی ئەودا، نیگایەکی گرتە من و سوور هەڵگەڕا، جا پاشان خێرا دەستی ئالیۆشای گرت و هێنایە لای من تا ماچی بکەم. هەروەها، ئاگادار بووم کە خانم ئابنۆسکین، سەرەتا لە خاڵە ڕاما و جا پاشان، بە بزەیەکی تەوسئامێزەوە ڕووی چاویلکەی لە خانمی مامۆستا کرد. خاڵە زۆر شپرزە بوو و نەیدەزانی چی بکات. ساشینکای بانگ کرد تا پێمی ئاشنا بکات، وەلێ ئەو تەنیا لە شوێنەکەی هەستا و بێ ئەوەی هیچ بڵێت، کڕنۆشێکی جددیانە و شکۆداری بۆ بردم. من ئەم کارەیم بەلاوە جوان و پەسەند بوو، چونکە زۆر لێی دەها. هەر لەو ساتەدا پورێی میهرەبانم (پراسکۆڤیا ئەیلی نیچنا) ئیدی خۆی پێ

---

١. یارییەکی کۆن و باوی ڕووسیا، کەمەیەکی وەك هەڵماتێن و شێوازەکەی وا بووە کە ئێسکەکانیان لەسەر یەکدی هەڵدەچنین و بە ئێسکێك کە بە دەستەوە بوو، نیشانەیان لەوانی دی دەگرتەوە. بەرانبەری ئەم یارییە لای خۆمان، بە نزیکی قاپبازی (بە کوردی قاپێنە: جۆرە یارییەکی کۆن کە بە هاویشتنی یەك یان چەند قاپێك بەڕێوە دەچێت و بردنەوە یان دۆڕان، لەسەر چۆنییەتیی وەستانی قاپەکە بەندە)یە. «و. ف»

ڕانەگیرا، وازی لە چاتێکردن هێنا و بەرەو ڕووم هات تا ئەملا و ئەولام ماچ بکات، وەلێ هێشتا فریا نەکەوتبووم دوو قسەی لەگەڵ بکەم کە دەمودەست دەنگی شاتەشاتی پاکیزە پرەی پێلیتسینا بەرز بووەوە کە *پراسکۆڤیا ئیلینیچنا! دەڵێی ئێوە دایە گیانتان بیر چووەتەوە (ژنی جەنەراڵ) کە داوای چایان کردبوو، کەچی ئێوە بۆتان تێنەکردووە، دەی خۆ چاوەڕێن.* جا پراسکۆڤیا ئیلینیچنا منی وێڵ کرد و بە خێرایی چوو بەدەم ئیش و کاری خۆیەوە.

ژنی جەنەراڵ، کە بەرجەستەترین کەسایەتیی نێو کۆڕەکە بوو و هەمووان لە بەردەمیدا تەنانەت نەیاندەوێرا بەنیش با بدەن، پیرێژنێکی لاواز و بەدخوو بوو و جلی تازیەی کردبووە بەری. پەستی و بەدخوویی ئەو زیاتر بە بۆنەی پیری و خەساربوونی پاشماوەی ئەقڵیەوە بوو، گەرچی ئەوە پێویست بە باس ناکات کە پێشتریش هەر لە بنەڕەتەوە کەمئەقڵ دەینواند. پێگەی ژنی جەنەراڵ، ئەوی دەبەنگ و لووتبەرزتر کردبوو. کە تووڕە دەبوو، ماڵەکەی دەکردە جەهەنەمێك بۆ خۆی. بە گشتی بە دوو شێواز تووڕەیی خۆی دەردەبڕی، یەکەمین شێوازیان بێدەنگی بوو، یانی پیرێژنە بۆ چەندین ڕۆژ نقەی لە خۆی دەبڕی و کەللەڕەقانە بێدەنگ دەبوو و هەرچیشیان دەخستە بەردەمی، دەیدایە دوا یان هەندێك جار دەشیرژاند، شێوازی دووەمی تەواو پێچەوانە بوو، یانی دەستی دەکردە شاتەشات و پرتەوبۆڵەیەکی بێبڕانەوە. هەمیشە بەم شێوەیە دەستی پێ دەکرد کە داپیرە (داپیرەم بوو) لە بارێکی خەمۆکانەی نائاساییدا ڕۆدەچوو وەك ئەوەی لە بیری ئەوەدا بێت کە هاکا دونیا

گەیشتە کۆتا و هەموو سامانەکەی بە با چوو. جا ئەو بە تەواوی دەچووە نێو دونیای ئەم کوێرەوەری و نەهامەتییانە و لەنێویاندا دەژیا، بە چەشنێك لەو هەستانەی خۆیدا نغرۆ دەبوو کە بە پەنجە هەموو نەهامەتیەکانی داهاتووشی دەژماردن و ئەوجا، بەدەم حسێبکردنییانەوە، شاگەشکە و دەبوو و بە تەواوی حاڵی لێ دەهات. بەردەوامیش بەوە دوایی دەهات کە ئەو زۆر لەمێژە پێشبینیی هەموو شتێکی کردووە و تەنیا لەبەر ئەوە وسکت بووە کە «لەمماڵەدا» بێ لە بێدەنگی هیچی دیکەی بۆ نەماوەتەوە. وێڕای ئەوەش، *ئەگەر پێشتر ڕێزیان لەو بنابا و ئەگەر پێشتر تەنیاوتەنیا گوێیان لە قسەکانی ئەو بگرتبا و... نازانم چی و چی... ئەوا لەو بارەدا... دۆخەکە بە جۆرێکی دی دەبوو...* جا سەرلەبەری ئەم قسانە، خێرا بە «بەڵێ بەڵێ»بۆکردنی هاودەمەکانی خاتو پاکیزە پرەی پێلیتسینا پاڵپشتی دەکران و لە کۆتاییشدا فۆما فۆمیچ بە شێوەیەکی فەرمی بۆی پشتڕاست دەکردەوە. لەو ساتەدا کە بەو ناسێنرام، هەتا بڵێی تووڕە بوو و پێدەچوو تووڕەییەکەشی لە جۆری یەکەم بێت، یانی ترسناکترین جۆری کە قڕوقەپی بوو. هەمووان تۆقیوانە لێیان دەڕوانی. تەنیا تاتیانا ئیڤانۆڤنا، کە لە ئەنجامدانی هەموو کارێکدا سەرپشك بوو، لە باشترین هەلومەرجی دەروونیدا بوو. خاڵە دەستەنقەست و تەنانەت بە شێوەیەکی تەواو جددی منی بردە لای داپیرە، وەلێ ئەو بە مۆنی و تووڕەییەوە پاڵی بە فنجانە چایەکەیەوە نا و لە بەینی ددانەکانییەوە، لە بارێکدا کە ئاوازی قسەکانیی درێژ دەکردەوە، ڕوو لە پرەی پێلیتسینا گوتی:

– ئەمە یارۆ voltiger[1]ـەکەیە؟

ئەم پرسیارە دەبەنگانەیە بە تەواوی تاساندمی. نەمزانی بۆچی بە تەنافباز ناوی هێنام! بە هەرحاڵ، کردنی ئەو جۆرە پرسیارانە هەر بە تەنیا لەو دەوەشایەوە. پرەی پێلیتسینا چەمییەوە و شتێکی بە گوێیدا چپاند، وەلێ پیرێژن بە توورەییەوە دەستێکی ڕاوەشاند. من بە دەمێکی داچەقیوەوە ڕاوەستابووم و سەرسامانە لە خاڵەم دەڕوانی. هەمووان تەماشای یەکدییان دەکرد. ئابنۆسکین تیزخەنێکی هاتێ کە زۆرم لە بەردڵ گران بوو. خاڵەش کە کەمێك شپرزە بووبوو، بە گوێمیدا چپاند:

– براله، هەندێ جار قسەی بێسەروبەرە دەکا، وەلێ مەبەستێکی وای نییە، ئاخر هەروا لە خۆوە قسان دەکا، هیچی لە دڵا نییە. خۆی شەرت دڵە.

کتوپڕ دەنگی زایەڵەداری تاتیانا ئیڤانۆڤنا، کە بە درێژایی ئەو ماوەیە چاوی لە من بڕیبوو و دیار نەبوو کە بۆچی ناتوانێ لەسەر جێیەکەی داسەکێ[2]، بەرز بووەوە:

– بەڵێ، دڵ! دڵ!

---

١. وشەکە فەرەنسییە و بە مانای بەرزبوونەوە، فڕین و لە هەوادامانەوە دێت و پەیوەندیی بە تەنافبازیی سێرکەوە هەیە، وەلێ مانا خوازراوەکەی "کەمئەقڵ"ـە. «و. ف»

٢. داسەکین، سرەوتن، دامرکین، ئۆقرەگرتن، جێبەخۆگرتن، سرەوای، سەکیارەی، مرکیارەی.

وا دیار بوو لەنێو پچەپچەکانی خاڵەوە، وشەی دڵی بەر گوێ کەوتبوو و گەرچی دیار بوو کە زۆر دڵی پێوەیە شتێك بڵێت، کەچی قسەکەی تەواو نەکرد. نازانم شەرم دایگرت یان لەبەر هۆکارێکی دی کتوپڕ بێدەنگ بوو و بە تەواوی سوور هەڵگەڕا. جا پاشان چەمییەوە و شتێکی بە گوێی خانمی مامۆستادا چپاند و دەمودەست دەسرێکی نا بە دەمییەوە و هەروا کە پاڵی بە کورسییەکەوە دابوو، وەکو هێستریاییەکان دایە قاقای پێکەنین. بە واق و وڕییەوە تەماشایەکی ئامادەبووانم کرد، وەلێ سەرسامانە بینیم کە هەمووان سیمایان هێندە جددییە کە هەر دەڵێیت هیچ ڕووداوێکی تایبەتی لە ئارادا نەبووە. بە هەرحاڵ، ئیدی دەمزانی تاتیانا نیڤانۆڤنا چ جۆرە مرۆڤێکە. دواجار چایان بۆ منیش هێنا و هاتمەوە سەر خۆم. نازانم بۆ، وەلێ کتوپڕ وام بە بیردا هات کە پێویستە بە بەڕێزانەترین شێوە سەری قسە لەگەڵ خانمەکاندا بکەمەوە. جا بەم جۆرە دەستم پێکرد:

– خاڵە گیان، ئێوە لەسەر هەق بوون کە دەتانگوت ڕەنگە شەرم دام بگرێ. ڕاستگۆیانە دان بەمەدا دەنێم و هیچ هۆکارێکم بۆ شاردنەوەی نییە.

جا بە بزەیەکی مەراییکارانەوە، ڕوو بە خاتوو ئابنۆسکین لەسەری ڕۆیشتم:

– دانی پێدا دەنێم کە تا ئەمڕۆ، هیچ ئەزموونێکم لەنێو کۆڕی ژناندا نەبووە و ئەمڕۆش دوای ئەو هاتنەژوورەوە نەشیاوە، پێدەچوو سەروسیمام لەناوەڕاستی ژوورەکەدا زۆر پێکەنیناوی بووبێ و بڕێکیش دەستوپێسپی دەرکەوتبم. وا نییە؟

من کە تا دەهات زیاد و زیادتر دەشێوام و لە تاو ئەو مەراییکارییە هاودڵانەیەم سوور هەڵگەڕابووم، نیگایەکی هەڕەشەئامێزم گرتە ئابنۆسکین کە هەروا بەدەم تیزخەنێکەوە لە جێی خۆی دانیشتبوو و سەراپامی هەڵدەسەنگاند. جا لێیم پرسی:

– ئایا چیرۆکی *کێلۆکە*تان[1] خوێندووەتەوە؟

کتوپڕ خاڵە، کە بە تەواوی لە درووستبوونی گفتوگۆ و باشتربوونی باری دەروونیی من خۆشحاڵ بووبوو، بە جۆشوخرۆشێکی تەواوەوە هاواری کرد:

– ڕاستە، ڕاستە! براله، خۆ ئەمە هیچ نییە، هەمووان لەو جۆرە بارودۆخەیان بۆ دێتە پێشێ کە تووشی خەجاڵەتیان بکا. دەی، خەجاڵەتت کێشا و ئیدی ئێستە هەموو شتێ بڕایەوە! براله، من ئەوەڵین جار کە تێکەڵی کۆمەڵگە بووم، بە درۆ دەستم پێ کرد، باوەڕ دەکەی؟ نا، سوێند بە خوا، ئامفیسا پیترۆڤنا، دڵنیات دەکەمەوە کە شیاوی گوێلێگرتنە. هەرکە چوومە قوتابخانەی سوارەی چەکدارەوە

---

١. یەکێکە لە بەرهەمەکانی نووسەری ڕووسی ئالێکسی پیسێمسکی (١٨٢٠-١٨٨١)، کە یەکەمین جار لە ساڵی ١٨٥٠ لە بڵاوکراوەی مۆسکۆنشینانداندا بڵاو کرایەوە.

پاڵەوانی چیرۆکەکە «پاول ڤاسیلییۆچ مێتیف» گەنجە خانەدانێکە بە بڕوانامەی زانکۆوە، وەلێ دەستوپێ‌سپی و نامۆیە بە ژیانی ڕاستەقینە، لە ئەنجامدا، بەردەوام تووشی هەڵەگەلی خەمناک دەبێت، تا دواجار سەر لە مەیخانەکانەوە دەردێنێت و لەنێو دەچێت. وا دیارە مەبەستی سێرگی ئالێکساندرۆڤیچ، لێکچوونی خۆی لەگەڵ بیش مێتیفی لاو بێت کە پاش تەواوکردنی خوێندنی زانکۆ، ڕووی لە گوند کردووەتەوە. «و. ف»

و بەرەو مۆسکۆ بەڕێ کەوتم، بە پێناسنامەیەکەوە[1] چووم بۆ لای خانمێکی پلەبەرز. ئەو خانمە هەتا خوا حەز کا لووتبەرز بوو، بەس وێڕای هەموو ئەو شتانەش کە لە سەری دەگوتران، لە دڵەوە کەسێکی باش بوو. کە چوومە ژوورێ، هاتن بە دەممەوە. هۆڵی چاوەڕوانی پڕ بوو لە پیاوانێك کە زۆربەیان کەسانی دەستڕۆیشتوو بوون. کڕنۆشم بۆ هەمووان برد و دانیشتم. خانم لە دەستپێکی گفتوگۆکەدا پرسیی: *باوکە گیان، ئێوە هیچ زەوی و زارێکتان هەیە؟* لە دارەی دونیادا تەنانەت خاوەنی مریشکێیش نەبووم. ئاخر دەبوو چ وەڵامێکی بدەمەوە؟ لە خەجاڵەتییاندا مردم. هەمووان چاویان تێ بڕیبووم. ئاخر، خۆ من ئەفسەرێکی تازەپێگەیشتوو بووم! بۆ دەبوو نەڵێم کە خاوەنی هیچ نیم، ئاوا ئاوڕووداڕانە بوو، ئاخر گەر وام بکردبا ئەوا ڕاستیەکەم گوتبوو. دواجار خۆم پێ ڕانەگیرا! گوتم، *سەدوحەقدە ڕەعیەتم هەیە*. وەڵێ بۆ لە خۆوە ئەم ژمارەی حەقدەیەم هاتە سەر زار؟ باشە خۆ من تازە هەر درۆکەم کردبوو، کەواتە دەبوو ژمارەیەکی تەواو بڵێم، وا نییە؟ دوای ساتێکی دی، ئاقیبەت لەسەر پێناسنامەکەم ڕوون بووەوە کە قرووشێکم لە گیرفاندا نییە، جا لە سەرووی ئەوەشەوە چ درۆیەکم کردبوو! دەی، خۆ قابیلە دەبوو چی بکەم؟ دوو پێم هەبوو، دووانی دیکەشم قەرز کرد و بۆی دەرچووم و ئیدی لەو ناوەش دەرنەکەوتمەوە. من ئەوسا هیچم نەبوو. هەموو ئەوەش کە ئێستە هەمە، سێسەد ڕەعیەتە کە لە مامە گیان،

---

[1] پێناسنامە، نووسراوێکی ڕەسمی وەك شایەدی لەسەر توانا، لێهاتوویی و ڕاسپێریی کەسێك.

*ئافاناسی ماتڤێییچ* و بەر لەوەش دووسەد ڕەعیەتی کاپیتۆنافکام لە دایەگەورە *ئاکۆلینا پامفیلاڤنا* وە بە میرات بۆ ماوەتەوە، کە ئێستە بە گشتی پێنجسەد و شتێ دەکا. جا ئەمەش کەم نییە! وەلێ لەوسا بەدواوە تۆبەم کرد کە ئیدی درۆ نەکەم و تا ئێستەش هەر تۆبەکەم نەشکاندووە.

ئابنۆسکین بزەیەکی تەوسئامێزی کرد و گوتی:

– من لەجێی ئێوە بام تۆبەم نەدەکرد. هەر خوا دەزانێ کە پیاو چ ڕووداوگەلێکی لە پێشە.

خاڵەش دڵپاکانە پاڵپشتیی قسەکەی کرد:

– وایە، بەڵێ، ڕاست دەکەن، ئێوە لەسەر هەقن!

ئابنۆسکین پاڵی بە کورسییەکەوە دا و قاقا پێکەنی، پاکیزە پەرەی پێلیتسیناش بە شێوەیەکی قێزەون ترشوخوێی بە مەسەلەکەدا کرد و لە تریقەی پێکەنینی دا، تاتیانا ئیڤانۆڤناش، بێ ئەوەی خۆیشی هۆکارەکەی بزانێت، دەستی کردە حیلکەحیلك و تەنانەت چەپڵەشی لێ دا. بە کورتیەکەی، بە ڕوونی ئەوەم بۆ دەرکەوت کە خاڵە لە ماڵەکەی خۆیشیدا هیچ حسێبێکی بۆ ناکرێت. ساشینکا، کە چاوانی لە ڕقاندا بریقەیان دەهات، لە ئابنۆسکین ڕامابوو. خاتونی مامۆستا سوور هەڵگەڕا و سەری دانەواند. خاڵە تاسابوو و سەرسامانە لە هەمووانی دەڕوانی هەر پاتەی دەکردەوە:

– چی بووە؟ چی قەوماوە؟

بــه درێــژایی ئــهم ماوەیــه خزمەکــەی ئێمــه، یــانی میزینچــیکۆڤ، خــۆی لــەم کیژۆڵەیە دوور گرتبــوو و هیچــی نــەدەگوت، تەنانــەت لــەو وەختانــەش کــە هــەمووان دەکەوتنــە پێکــەنین، بزەیەکیشــی نــەدەکرد. جددیانـــه چـــای دەخـــواردەوە و بـــه نیگایـــەکی فەیلەســـووفانەوە هــەمووانی خســتبوونە ژێــر چاودێرییەوە. هــەر کــاتێکیش کــه بێــزار دەبوو، وەك خووی هەمیشەیی خۆی، دەستی دەکردە فیکاندن، بەس لە کاتی خۆیدا وازی لەو کارە دەهێنا. دەرکم بەوە کرد ئابنۆسکین، کە هەیتاهــەیتا تەشــەر لــه خاڵــه دەدات و پــەلار لــه مــن دەگرێــت، وا دیــارە زاتــی ئەوەشــی نییــه کــه تەنانــەت تەماشــایەکی میزینچــیکۆڤ بکــات. هــەروەها لــەوەش تێگەیشــتم کــه ئــەم خزمــه بێدەنگــەی ئێمــه، بەردەوام بە کونجکۆڵییەکی ئاشکراوە لە من دەڕوانیّ، وەك ئەوەی کە بیــەوێت بــه تــەواوی لــەوە تێبگــات کــه مــن چ جــۆرە مــرۆڤێکم. لــەو ساتەدا، مادام ئابنۆسکین دەستی کردە چەنەبازی:

– دڵنیام، monsieur Serge، ئادەی، ناوتان ئەمە بوو، ئەریّ؟ بەڵیّ، زۆر لەوە دڵنیام کە ئێوە لە پترسبورگەکەتاندا ئەوەندە ڕووتان نەداوەتــه خانمــان. لــەم ڕۆژانــەدا بەڕێزانێکی زۆر هــەن کــه بــه کــۆڕی ژنــان بێگانــەن، وەلیّ بــه بــڕوای مــن هــەموویان بیرئــازادن. مــن تــەنیا دەتوانم ئەمە بە بیرئازادییەکی چاوپۆشیلێنەکراو ناو بهێنم و هیچی دی. هــەروەها دانـــی پێـــدا دەنێـــنم کـــه ئـــەم بابەتـــه بووەتـــه مایـــەی سەرسامیم، مایــەی سەرســامیم، دەبیستن لاوەپیــاوە، تــەنیا مایــەی سەرسامی!...

بەوپەڕی گوڕوتینەوە هاتمە وەڵام:

– هەرگیز تێکەڵیی کۆمەڵگەم نەکردووە، وەڵێ ئەم مەسەلەیە... یانی هەڵبەتە من بۆچوونم وایە کە... ئەم مەسەلەیە گرنگییەکی ئەوتۆی نییە... ژیانی من... یانی بە گشتی لە ئەپارتمانەکەمدا ژیاوم... بەس دڵنیاتان دەکەمەوە کە ئەم مەسەلەیە هێندەش گرنگ نییە. لە داهاتوودا پێک ئاشنا دەبین، تا ئێستە هەر لەماڵەوە بوومە...

خاڵە باڵی فش کردەوە و گوتی:

– ئەو بەردەوام سەری لەناو زانستدا بووە.

– ئاخ، خاڵە گیان، خۆ ئێوەش هەر واز لەم زانستەتان ناهێنن!...

دووبارە بە بزە و ڕووقاییمییەکی نائاساییەوە، ڕوو لە خانم ئابنۆسکین بەم جۆرە درێژەم پێ دا:

– بڕوانن، خاڵە گیانی ئازیزم هێندە ڕێز و سەنگ بۆ زانست دادەنێ کە لەم دواییانە و لە ڕێگەدا، بە فەیلەسووفێکی لێوەشاوە و پڕئەزموون ئاشنا بووە کە ناوی کارۆفکینە، جا ئەمڕۆ دوای ساڵانێک دووری، یەکەمین قسەیەك کە بۆ منی کرد، ئەمە بوو کە زۆر بێئارامانە، یان باشتر بیڵێم، بە تامەزرۆییەکی زۆرەوە، چاوەڕوانیی هاتنی ئەم بلیمەتە دەکا... بێ گومان، هەموو ئەمانە تەنیا لە خۆشەویستیی ئەوەوەیە بۆ زانست...

جـا دەمودەسـت لـە تریقـەی پێکـەنینم دا، بـەو هیوایـەی کـە هەمووان بەدوامدا، لەبەر ئەم چوختیەتییەم بکەونە پێکەنین، کەچی لەناکاو ژنی جەنەراڵ ڕوو لە پرەی پێلیتسینا، ساردوسڕانە گوتی:

– ئادەی بزانم، ئەم لاوە مەبەستی کێیە؟ باسی کێ دەکا؟

پرەی بە هەڵچوونەوە شاتاندی:

– ئیگۆر ئیلیچ چەند میوانێکی زانستمەندیان داوەت کردوون، خانم، ئێستە لە شەقامی سەرەکییەوە بەڕێوەن. وا خەریکن خۆیان بۆ پێشوازیلێکردنیان ئامادە دەکەن!

خاڵە بە تەواوی حەپەسا. تەماشایەکی لۆمەکەرانەی منی کرد و گوتی:

– ئاخ، بەڵێ! بیرم نەبوو! چاوەڕێی کارۆفکینم. زانستمەندە، چەندان سەدە ناوی دەمێنێتەوە...

پاشان قسەکەی بڕی و بێدەنگ بوو. ژنی جەنەراڵ دەستێکی ڕاوەشاند و ئیدی ئەم جارە، کارەکەی سەرکەوتوو بوو و بە لێدانەکەی دەستی، فنجانی چایەکە کەوتە سەر زەوی و شکا. دەمودەست هەمووان شڵەژان. خاڵە شەرمنانە بە گوێمیدا چپاند:

– هەمیشە ئاوها تووڕەییەکەی خاڵی دەکاتەوە، شتێ هەڵدەگرێ و بە زەویدا دەکێشێ، وەڵێ تەنیا لەو کاتانە وا دەکا کە تووڕ دەبێ... خۆت لە گێلی دە، برالە، لێی مەڕوانە باوکە، سەرنجت لادە لەسەری... بۆ باسی کارۆفکینت هێنایە ئارا؟...

وەلێ بەر لەوەی خاڵە بڵێت، سەرنجم خستبووە لایەکی دیکە و لەو ساتەدا، نیگام لە نیگای خاتونی مامۆستا ئالاّ و وام هاتە بەرچاو کە لە نیگایدا، جۆرێك لە لۆمە یان تەنانەت بێزاریش شەپۆل دەدات، ڕوون و ئاشکرا گڕی تووڕەیی بە ڕوومەتەکانییەوە بڵێسەی دەدا. نیگاییم خوێندەوە و وای بۆ چووم کە پاکیزە خانم کەیفی بەم هەڵسوکەوتە ناشیرین و ترسنۆکانەیەی من نەهاتووە کە، مەبەستم بووە لە ڕێی بەگاڵتەجاڕنیشاندانی خاڵەوە، لانیکەم بڕێك لە گاڵتەجاڕیی خۆم داپۆشم. ناتوانم بڵێم لەو ساتەدا چەندە تەریق بوومەوە! کاتێك بەزمی شکانی فنجانەکە کۆتایی هات، ئامفیسا پیترۆڤنا دووبارە بەم جۆرە دەستی پێ کردەوە:

– دەمەوێ دیسان باسی پترسبوگ بکەم. بڵێم کە بە وەها چێژێکەوە بیر لە ژیانی نێو ئەو پایتەختە سیحراوییەمان دەکەمەوە... ئەوسا ئێمە تێکەڵییەکی باشمان لەگەڵ بنەماڵەیەکدا هەبوو، بیرت دێ پاول[1]؟ باسی ئەو جەنەراڵ ***پالۆڤیت سین***ـە دەکەم... ئای کە ژنی جەنەراڵ بوونەوەرێکی دڵڕفێن بوو، دڵڕفێن! دەی بێ گومان دەزانن، مەبەستم خانەدانەکەیە، یانی هەمان beaumonde[2]. ئادەی بڵێن بزانم، ڕەنگە ئێوە چاوتان بەوان کەوتبێ... پێویستە دانی پێدا بنێم، تامەزرۆیانە چاوەڕێی هاتنتان بووم. هیوادار بووم بتوانم لە ڕێی ئێوەوە زانیارییەکم لە بارەی هاوڕێیانی پترسبورگمانەوە دەست بکەوێ.

---

١. ناوی کوڕەکەی، یان هەر ناوی بچووکی بەڕێز ئابنۆسکین. «و. ف»

٢. بە فەرەنسی واتای چینی خانەدان دەگەیەنێت. «و. ف»

من کە لەپڕ خۆشکەیفییەکەم بۆ بێزاری و توورەیی گۆڕا بوو، بە بێتاقەتی گوتم:

– بە داخەوەم کە ناتوانم یارمەتیتان بدەم... ببوورن... خۆ من گوتم، بە دەگمەن لەنێو کۆمەڵگەدا دەرکەوتووم. جەنەراڵ پتلۆڤیت سینیش هەر ناناسم، تەنانەت ناویشیم نەبیستووە.

خاڵە گیان، کە خوا نەکا لێی بکەوێتەوە[1]، دیسان گوتی:

– باوکە گیان، ئەمە وانەی زەویناسیی خوێندووە! براله، ئادەی بزانم، زەویناسی یانی ئەوەی کە لێکۆڵینەوە لەسەر بەردی جۆراوجۆر دەکەن؟

– بەڵێ، خاڵە گیان، بەردەکان...

– ئەها... زانستگەلی زۆر هەن کە هەموشیان بەسوودن! وەڵێ، براله، ئەوەی ڕاستی بێ نەمدەزانی زەویناسی چییە! تەنیا هەندێ شتم لای ئەوم و ئەوەوە لێ بیستبوو. کەمتازۆر شارەزای مەسەلەی دیکەم، بەس لە زانستدا کۆڵەوارم، ڕاستگۆیانە دان بەمەدا دەنێم!

ئابنۆسکین ژارخەندێکی کرد و خێرا هەلەکەی قۆستەوە:

– ڕاستگۆیانە دانی پێدا دەنێی؟

ساشینکا نیگایەکی سەرکۆنەئامێزی گرتە باوکی و هاواری کرد:

– باوکە!

خاڵە کە لە هۆکاری نارەزاییەکەی ساشینکا تێنەگەیشتبوو، بە حەپەساوی گوتی:

---

١. لێکەوتنەوە، وەنەکۆتەیۆی، ژێربوون، وازهێنان و پاتەنەکردنەوەی کار و قسەی نادرووست.

- چی بووە، باوانەکەم؟ ئاخ، خوا، ئامفیسا پیترۆڤنا، قسەم بە ئێوە بڕی، بۆ خاتری مەسیح، لێم ببوورن!

ئامفیسا بە بە بزەیەکی تاڵەوە هاتە وەڵام:

- ئۆو، گوێی مەدەنێ! هەڵبەتە من قسەی خۆمم بۆ خوشکەزاکەتان کرد و ئێستە، monsieur serge، ناوتان ئەمە بوو؟ دەمەوێ ئاوها ئەنجامگیری بکەم کە ئێوە دەبێ چاکسازییەکی بنەڕەتی لە خۆتاندا بکەن. بڕوام وایە کە زانست و هونەر... بۆ نموونە پەیکەرتاشی... دەی، بە کورتییەکەی، هەموو ئەم ئامانجە بەرزانە، وەك دەڵێن، لایەنێکی سەرنجڕاکێشیان هەیە، وەلێ ناتوانن جێگەی ژنان بگرنەوە!... خانمان، لاوەپیاو، ئەوە خانمانن کە درووستتان دەکەن و هەر لەبەر ئەوەش، هەڵکردن بەبێ ئەوان دژوارە، دژوار، لاوەپیاو، دژژژواااار!

دووبارە دەنگی زیکنی تاتیانا ئیڤانۆڤنا بەرز بوەوە:

- دژوار، دژوار!

ئەو، کە وەکو منداڵ شڵەژا و سوور هەڵگەڕابوو، درێژەی پێ دا:

- گوێ بگرن، گوێ بگرن، دەمەوێ شتێکتان لێ بپرسم...

لە بارێکدا کە سەرتاپا بووبوومە گوێ، سەیریم کرد و گوتم:

- فەرمایشتتان چییە؟

- دەمویست بپرسم: ئێوە زۆر لێرە دەمێننەوە؟

- سوێند بە خوا، خۆشم نازانم، خۆ کارەکانم...

- کار! دەشێ چ کارێکتان هەبێ؟... لەو کابرایە شێتە!...

تاتیانا ئیڤانۆڤنا لە ڕادەبەدەر سوور هەڵگەڕابوو، ڕووخساری لەپشت باوەشێنەکەوە شاردەوە و بەرەو لای خاتونی مامۆستا چەمییەوە و دەستبەجێ بە گوێیدا چپاند. جا پاشان تریقایەوە و چەپڵەی لێ دا. کە دەستی لە قسەکردن لەگەڵ هاوڕازەکەیدا[1] هەڵگرت، لە ترسی ئەوەی کە نەکا ڕابکەم، دیسان پەلەپەل ڕوو لە من گوتی:

- بوەستن! بوەستن! گوێ بگرن، دەزانن دەمەوێ چیتان پێ بڵێم؟ ئێوە زۆر زۆر لە پیاوێکی گەنج دەچن، پیاوێکی گەنجی سەرنجڕاکێشیش!... ساشینکا، ناستینکا[2]، بیرت دێ؟ ساشینکا، ئەو بە تەواوی لەو گەنجە شێتە ناچێ؟ بیرت دێتەوە؟ بە گالیسکە خەریکی گەڕان بووین کە چاوم پێی کەوت... بەسەر ئەسپەوە بوو و پەستەکێکی سپیشی لە بەر بوو... ڕووقایمی وا بەو عەینەکانەیەوە واقووڕ لێمی دەڕوانی! بیرت دێ، ئەها خۆم لەپشت پەردەی گالیسکەکە نابوو، وەلێ خۆم ڕانەگرت و سەرم لە پەنجەرەکە هێنایە دەرێ و هاوارم کرد: *مەی بێشەرم!* جا پاشان گوڵەکەی دەستمم تێگرت... ناستینکا، خۆ بیرت دێ؟

جا پاشان وەک کچە شێت و شەیدایەک کە گیرۆدەی پەیوەندییەکی ئەویندارانە بێت، بە دەستەکانی ڕووخساریی

---

١. هاوڕاز، هامڕاز، خەمڕەوێن، هاودەم، کەسێک کە بە نهێنییەکانی کەسێکی دی و باس و بەردەڵەکانی ئاشنا و مەحرەمە.

٢. ناوی خانمی مامۆستای ماڵان و بارێکی خۆشەویستانەی ناوی ئاناستاسیایە. دەشێ ئەم ناوە بە مەبەستی جۆراوجۆر و بە شێوازی جیاواز دەر ببڕێت، وەک ناستیا، ناستینکا و ناستاسیا. «و. ل»

شاردەوە، کتوپڕ لە جێگەکەی هەستایەوە و ڕایکردە لای پەنجەرەکە و گوڵێکی نێو گوڵدانەکەی لێ کردەوە و گرتیە بەر پێی من و بە ڕاکردن لە ژوورەکە چووە دەرێ. لە چاوتروسکانێکیشدا پێوار[1] بوو! ئەم جارەیان ئیدی دۆخەکە کەمێك شێوا، گەرچی ژنەی جەنەراڵ هێشتا هەروەکو جاری پێشو، بە خەمساردییەکی تەواوەوە دانیشتبوو. ئامفیسا پیترۆڤناش نەشڵەژابوو، بەس وەك ئەوەی کە پەستی شتێك بووبێت، بە نیگەرانییەوە سەیری کوڕەکەی کرد، خاتونەکان لە شەرمان سوور هەڵگەڕان، پاول ئابنۆسکینیش بە داخێکەوە کە لەو ساتەدا هۆکارەکەی دیار نەبوو، لەسەر کورسیەکەی هەستایەوە و بەرەو لای پەنجەرەکە چوو. خاڵە دەستی کردە ئاماژەکردن و کتوپڕ، ڕووخسارێکی تازە هاتە نێو ژوورەکە و سەرنجی هەمووانی بەرەو لای خۆی ڕاکێشا. خاڵە کە لە ناخی دڵەوە شادیی تێکەڕابوو، هاواری کرد:

– ئەها! ئەوەش یۆگراف لاریۆنیچ! ئای کە چەندە سەرڕاستە! براله، لە شارەوە دێن؟

لە بەرخۆوە بیرم کردەوە:

– ئای لەم شتە عەنتیکانە!

وەلێ لەو ساتانەدا هێشتا نەمدەتوانی بە باشی تەواوی ئەو ڕووداوانە هەزم بکەم و لەوە تێبگەم کە خۆشم بە هاتنە نێو ئەم کۆڕەوە، لە ڕاستیدا دەستەی عەنتیکەکانم کامل کردووە.

---

١. پێوار: نادیار، شوێنبزر.

# وەرزی پێنجەم

## پژێڤیکین

پیاوێك هاتـە ژوور، یـان باشـترە بڵـێم، بـە دژواری خـۆی خزانـدە ژوورەوە (گەرچی لاشیپلانی دەرگەکە وەك پێویست بەرین بوو)، جا لـە بارێکـدا کـە بـە کونجکۆڵییـەکی زیـاد لـە ڕادەوە چـاوێکی بـە ئامادەبووانـدا گێـڕا، لـە بـەردەم دەرگـەدا دەسـتی کـردە کڕنۆشـبردن، داچـــەمین و ڕاســـتبوونەوە و بەدەمەوەپێکـــەنین. تازەهاتووەکـــە، پیرەمێردێکـی کوڵەبنـە و ئاوڵـەڕوو و سەرئەسـڵەح بـوو بـە نیگایـەکی فێڵبازانـە و زیتـەوە. تیزخـەنێکی ورد و تەلیسـماویش بەسـەر لێـوە کەمتازۆر ئەستوورەکانییەوە بوو. کۆتێکی کۆنەی لـە بەر بوو کە بە سەرشـانەکانیدا دیـار بـوو دەسخواسـتە[1]. یـەکێك لـە قۆپچـەکانی کۆتەکـەی بـە داوەکەیـەوە شـۆڕ بووبـووەوە، دوسـێ قۆپچـەیەکی دیکەشی بە تەواوی لێ بووبوونەوە. پووتی شڕ و کڵاوە چڵکنەکەی، لەگـەڵ جلـە سـواڵکەرانەکانیدا لێـك دەهـاتن. دەسـڕێکی چـوارخانەی

---

١. دەسخواست، ئەمانەتی، بە ئەمانەت وەرگیراو.

پیسی بە دەستەوە بوو کە زوو زوو ئارەقەی تەوێڵ و لاجانگیی پێ دەسڕی. کتوپڕ هەستم بەوە کرد کە خاتونی مامۆستا کەمێك سوور هەڵگەڕاوە و نیگایەکی خێرای گرتە من. لە نیگایدا هەستم بە خۆپەرستی و بێشەرمی کرد. پیرەمێردی تازەهاتوو گوتی:

– ئەی نانبدەی من، هەر ئێستە لە شارەوە هاتووم! ڕاستەوڕاست لەوێوە هاتووم، باوکە گیان! هەموو شتێکتان بۆ دەگێڕمەوە، بەس سەرەتا ڕێ بدەن تا ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتی خۆم دەربڕم...

پیرەمێرد بەدەم قسەکردنەوە بەرەو لای ژنی جەنەراڵ چوو، وەلێ کتوپڕ ڕاوەستا و ڕوو بە خاڵە گوتی:

– ئەی نانبدەی من، ئێوە حەزدەکەن گرنگترین تایبەتمەندییەکانی کەسایەتیی من بزانن؟ من مرۆڤێکی سووکم، نارەسەنێکی ڕاستەقینەم! ئاخر بچمە هەر کوێیەك، خێرا خۆم دەخەمە بەر پێی خاوەنماڵ تا هەر لەو ئەوەڵین ساتەدا خۆشەویستی و پشتیوانیی ئەو بۆ خۆم دەستەبەر بکەم. نانبدەی من، جەناب گیان، من مرۆڤێکی سووکم، چەپەڵێکم بۆ خۆم! دایە گیان، مۆڵەت بدەن چمکی کراسە پیرۆزەکەتان ماچ کەم، چونکە ڕەگە لێوم دەستی زێڕین و جەنەراڵیانەی ئێوە پیس بکا.

بەوپەڕی سەراسیمەییەوە بینیم، کە بە نەرمونیانییەکی تەواو نائاسایی تەوقەی لەگەڵ ئەو کرد. پاشان پیرەمێرد ڕووی کردە پاکیزە پرەی پیلت سینا و درێژەی پێ دا:

- هەروەها ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتی خۆم بە ئێوەی گوڵڕووی کۆڕەکەش ڕادەگەیەنم. دەی چی بکەین، خانمخاس، من مرۆڤێکی سووکم! ساڵی ١٨٤١بوو کە بۆیان دەرکەوت من مرۆڤێکی سووکم و لە سوپا دەریان کردم، ڕێك هەمان ئەو ساڵەی کە *ڤالینتین ئیگناتیچ تیخۆنتساف* شەرەفی وەرگرتنی پلەی ئەفسەریی پێ بڕا، جا پاشانیش کردیانە ئەفسەری هەڵسەنگێن، ئەرێ، ئەو بۆ خۆی بووە هەڵسەنگێنێك و منیش بوومە مرۆڤێکی خوێڕی و بێکەڵك. من هەر بە سرووشت ئەو ڕاستگۆییەم تێدایە کە دان بە هەموو شتێکدا بنێم. دەی چی بکەم ئاخر؟ دایمە هەوڵم داوە ئاوڕوودارانە بژیم، بەڵێ هەوڵی خۆمم داوە، وەلێ ئێستە ئیدی پێویستە شێوازێکی دیکە تاقی بکەمەوە.

بەدەم سووڕانەوە بەدەوری مێزەکەدا و ڕۆیشتن بەرەو لای ساشینکا، درێژەی پێ دا:

- ساشینکا، ئەی سێوی نۆبەرەی ئێمە! مۆڵەت بدەن داوێنی کراسەکەتان ماچ بکەم. پاکیزە خانم، بۆنی سێو و تەڕوبڕی و ناسکیی ئێوەم بەر لووت دەکەوێ. جا هەڵبەتە، ڕێزی تایبەتیم هەیە بۆ پاڵەوانی ئاهەنگی ئەمڕۆ، بابە گیان، تیروکەوانێکم بە دیاری هێناوە بۆتان. بە دەستی خۆم ئەم بەیانییە دروستم کرد. کوڕەکانیش یارمەتییان دام. جا کەمێکی دی دەچین بۆ نیشانەشکێنی. ئێوە بابە گیان، کاتێ گەورە بوون، بێ گومان دەبنە ئەفسەر و سەری تورکێك دەپەڕێنن. تاتیانا ئیڤانۆڤنا... ئاخ، ئەوان لێرە نین، نانبدەی ئێمە ئامادە نین! دەنا داوێنی کراسەکەی

ئەوانیشــم مــاچ دەکــرد. پراســکۆڤیا ئیلینیچــنا، ئــەی دایکــە ئازیزەکەمان، وەڵێ مەخابن کە ڕێگە نییە بێم بۆ لاتان، دەنا نەك هەر بە تەنیا دەست، بەڵکە پێشتانم ماچ دەکرد. ئۆو! ئامفیساپیترۆڤنا، ڕێز و حورمەتی بێپایانم هەیە بۆتان. ئەی نانبدەی من، هەر ئەمڕۆ کەوتمە سەرچۆك و بەدەم فرمێسکڕشتنەوە لە بارەگای خوداوەندا دوعام بۆ کوڕەکەتان کرد تا خوداوەند پێگە و توانای پێ ببەخشێ، بەتایبەت توانا! هەروەها، ڕێزی بێکۆتای خاکەڕایانەی خۆم پێشکەش بە ئیڤان ئیڤانۆڤیچ میزینچیکۆۋ دەکەم. دەك خوا بێدڵیتان نەکا! زۆر بێـدەنگن، قوربـان!... بـەخ بـەخ، ســڵاو، ناســتینکا، ژیکەڵــەکانم خۆشەویستییان هەیە بۆتان، هەموو ڕۆژێ یادتان دەکەنەوە. جا ئێستەش ڕێـزی نـەبڕاوەی خـۆم پێشکەشـی خانـەخوێ دەکـەم. لـە شـارەوە هـاتووم، پایەبـەرز، ڕاستەوڕاســت لــە شــارەوە هــاتووم! ئەمانیش، بێ گومان، دەبێ هەمان ئەو خوشکەزایەی ئێوە بن کە لە زانکۆ خەریکی خوێندن بوونە، ئەرێ؟ ڕێز و حوورمەتی خاکەڕایانەم پەسەند بکەن، بەڕێز، تکایە دەستتان ڕاکێشن!

هـەموان کەوتنە پێکـەنین. دیاربوو کە پیرەمێردەکە، هەروا بۆ سـەرگەرمی، ڕۆڵـی گـەپجاڕێکی دەگێـڕا و بەمـەش کۆڕەکـەی گـەرم کردبوو. زۆربەیان دەرکیان بە تەشەر و پلارەکانی نەکردبوو، گەرچی ئەو کەسی نەپەڕاندبوو. تـەنیا خـاتونی مامۆسـتا، کە بە ناسـتینکا بانگ کرابوو و من بە تەواوی سەراسیمە بووبووم، سوور هەڵگەڕا و ناوچـاوی بـە یەکـدا دا. گـەرەکم بـوو دەسـتم بکێشـمە دواوە، وەڵێ

دەتگوت پێشبینیی وەها شتێکی کردووە و، جا بە تەوسخەنێکەوە سەیری کردم و گوتی:

– بابە گیان، من تەنیا دەمویست، بە مۆڵەتی خۆتان، دەستتان بگوشم، خۆ نەمدەویست ماچی کەم. ئێوە واتان زانی، دەمەوێ ماچی کەم؟ نەخێر، بابە گیان، جارێ تەنیا دەمویست دەستتان بگوشم. ئەی نانبدەی من، بێ گومان ئێوە بە گەپجاڕی خانەدانان لە من تێکەیشتوون، ئەرێ؟

– نا... نەخێر، ببوورن، من...

– دەی وایە، کاکە گیان! خۆ ئەگەر من گەپجاڕ بم، ئەوا گەپجاڕێکی دیکەش لێرە هەیە! بە ڕێزەوە هەڵسوکەوتم لەگەڵدا بکەن: هێشتاش بەو ڕادەیە سووك و چرووك نیم کە ئێوە بیری لێ دەکەنەوە. ئەسڵەن گریمان من گەپجاڕ بم، باشە، من کۆیلەم، ژنەکەشم کۆیلەیە، هەر لەبەر ئەوەشە بەردەوام ناچاری ماستاوکردنین! تەواو و بڕایەوە. تەنیا بەم جۆرە شتێکت دەست دەکەوێ، شتێ هەیە... تا لانیکەم بیکەیتە نێو شیری منداڵەکانتەوە. شەکر، ئەرێ، شەکر بیکەیە نێو هەر شتێکەوە تامی خۆشتر دەبێ. بابە گیان، ئەمە نهێنییە کە دەیڵێم، ڕەنگە بە کەڵکی ئێوەش بێ. ئەی نانبدەی من، بەرژەوەندی لە نۆکەریدا بوو، هەر لەبەر ئەوەش بووم بە گەپجاڕ.

ئامفیسا پیترۆڤنا بە دەنگێکی زیکنەوە گوتی:

– هەهەهە! وای لەو پیرەمێردە شەیتانە! دایمە هەمووان دێنێتە پێکەنین!

– دایە گیان، ئەی نانبدەی من، گەمژەکان لەم دونیایەدا بێخەمتر دەژین! گەر هەر بە گەنجی ئەمەم بزانیبا، ئەوا ناوی خۆمم لە پێڕستی گەمژەکاندا تۆمار دەکرد، ڕەنگە تا ئێستە ئیدی ئاقڵ بام. بەس لەبەر ئەوەی حەزم دەکرد زوو ئاقڵ بم، ئەوەتا ئێستە پیرەمێردێکی گەمژەم لێ دەرچووە.

ئابنۆسکین کە دیاربوو ئەوەی پێ ناخۆش بووە پیرەمێردەکە ئاماژەی بە توانا کرد، هەر بەو جۆرەی کە بە ئاسوودەییەوە پاڵی بە قەنەفەکەوە دابوو و بە چەشنێك لەپشت شیشەی چاویلکەکانییەوە لە پیرەمێردەکە نز[1] بووبووەوە کە وەك بڵێیت تەماشای حەشەرەیەك دەکات، کتوپڕ گوتی:

– تکایە... تکایە بڵێن کە... من هەمیشە ناوە گەورەکەی ئێوەم بیر دەچێتەوە... دەبێ بە چی بانگتان بکەم؟.

– ئای کاکە گیان! گریمان ناوی گەورەی من یژێڤیکینە، جیاوازیی چییە؟ ئەوە ئێستە بۆ نۆ ساڵ دەچێ کە هیچ ئیش و پیشەیەکم نییە و بە پێی یاسای سرووشت دەژیم. هەروەها مناڵەکانم، بەڵێ مناڵەکانیشم تەنیا ئەندامی بنەماڵەی *خۆلمسکین*! ڕێك وەکو هەمان ئەو پەندەی کە دەڵێ *دەوڵەمەندەکانی دونیا بەرخێکیان هەیە و هەژارانیش دونیایەك مناڵ*...

---

١. لێنزبوونەوە، لێوردبوونەوە، هەڵسەنگاندن بە نیگا.

– باشە، جارێ... واز لە بەرخەکان و... بە گشتی ئەم بابەتە بێنن. گوێ لە من بگرن، دەمێکە دەمەوێ لێتان بپرسیم کە بۆچی وەختێ دەچنە شوێنێکەوە، لادەکەنەوە و تەماشای دواوەوە دەکەن؟ ئەم کارەتان زۆر پێکەنیناویە.

– بۆ تەماشای دواوەوەم دەکەم؟ بابە گیان، هەمیشە لام وایە یەکێ دەیەوێ لەدواوە، وەکو مێش لە بەینی لەپەکانیدا بمپلیشێنێتەوە. ئاخر من ماخولیاییم، بابە گیان!

هەمدیس هەمووان لە قاقای پێکەنینیان دا. خاتونی ماموستا هەستایە سەر پێ، پێدەچوو تەمای ڕۆیشتنی هەبێت، وەلێ دووبارە لەسەر جێگەکەی دانیشتەوە. لەگەڵ ئەو هەموو جوانییەیدا، ئاسەواری ئازار و مەینەت بە ڕووخسارییەوە دەبینرا و لە تاو ئەم ئازار و مەینەتە سوور هەڵگەڕابوو. خاڵە بە گوێیدا ورتاندم:

– براله، دەزانی ئەم بەڕێزە کێیە؟ باوکیەتی!

من بە چاوانێکی دەرپۆقیوەوە لە خاڵە ڕامام. لەو ساتانەدا بە تەواوی بنەماڵەی یژێڤیکینم لە بیر چووبوو. من کە لە بەرخۆوە وام دەزانی پاڵەوانێکم و بە درێژایی ڕێگە خەیاڵم لای دەزگیرانەکەم بووم و نەخشەگەلی دلێرانەم بۆ دەکێشا، بە تەواوی بنەماڵەی ئەوم لە بیر کردبوو، یان باشتر بیڵێم، هەر لە سەرەتاوە هیچ بایەخێکم بەو مەسەلەیە نەدابوو. چپەئاسا بە خاڵەم گوت:

– باوکی؟ یانی چی؟ لام وابوو ئەو کچە هەتیوە.

– هەهەهە! وای لەو پیرەمێردە شەیتانە! دایمە هەمووان دێنێتە پێکەنین!

– دایە گیان، ئەی نانبدەی من، گەمژەکان لەم دونیایەدا بێخەمتر دەژین! گەر هەر بە گەنجی ئەمەم بزانیبا، ئەوا ناوی خۆمم لە پێرستی گەمژەکاندا تۆمار دەکرد، ڕەنگە تا ئێستە ئیدی ئاقڵ بام. بەس لەبەر ئەوەی حەزم دەکرد زوو ئاقڵ بم، ئەوەتا ئێستە پیرەمێردێکی گەمژەم لێ دەرچووە.

ئابنۆسکین کە دیاربوو ئەوەی پێ ناخۆش بووە پیرەمێردەکە ئامارژەی بە توانا کرد، هەر بەو جۆرەی کە بە ئاسوودەییەوە پاڵی بە قەنەفەکەوە دابوو و بە چەشنێك لەپشت شیشەی چاویلکەکانییەوە لە پیرەمێردەکە نز[1] بووبووەوە کە وەك بڵێیت تەماشای حەشەرەیەك دەکات، کتوپڕ گوتی:

– تکایە... تکایە بڵێن کە... من هەمیشە ناوە گەورەکەی ئێوەم بیر دەچێتەوە... دەبێ بە چی بانگتان بکەم؟.

– ئای کاکە گیان! گریمان ناوی گەورەی من یژێڤیکینە، جیاوازیی چییە؟ ئەوە ئێستە بۆ نۆ ساڵ دەچێ کە هیچ ئیش و پیشەیەکم نییە و بە پێی یاسای سرووشت دەژیم. هەروەها مناڵەکانم، بەڵێ مناڵەکانیشم تەنیا ئەندامی بنەماڵەی *خۆلمسکین*! ڕێك وەکو هەمان ئەو پەندەی کە دەڵێ *دەوڵەمەندەکانی دونیا بەرخێکیان هەیە و هەژارانیش دونیایەك مناڵ*...

---

١. لێنزبوونەوە، لێوردبوونەوە، هەڵسەنگاندن بە نیگا.

– باشە، جارێ... واز لە بەرخەکان و... بە گشتی ئەم بابەتە بێنن. گوێ لە من بگرن، دەمێکە دەمەوێ لێتان بپرسیم کە بۆچی وەختێ دەچنە شوێنێکەوە، لادەکەنەوە و تەماشای دواوەوە دەکەن؟ ئەم کارەتان زۆر پێکەنیناویە.

– بۆ تەماشای دواوەوەم دەکەم؟ بابە گیان، هەمیشە لام وایە یەکێ دەیەوێ لەدواوە، وەکو مێش لە بەینی لەپەکانیدا بمپلیشێنێتەوە. ئاخر من ماخولیاییم، بابە گیان!

هەمدیس هەمووان لە قاقای پێکەنینیان دا. خاتونی ماموٚستا هەستایە سەر پێ، پێدەچوو تەمای ڕۆیشتی هەبێت، وەڵێ دووبارە لەسەر جێگەکەی دانیشتەوە. لەگەڵ ئەو هەموو جوانییەیدا، ئاسەواری ئازار و مەینەت بە ڕووخسارییەوە دەبینرا و لە تاو ئەم ئازار و مەینەتە سوور هەڵگەڕابوو. خاڵە بە گوێیدا ورتاندم:

– براله، دەزانی ئەم بەڕێزە کێیە؟ باوکیەتی!

من بە چاوانێکی دەرپۆقیوەوە لە خاڵە ڕامام. لەو ساتانەدا بە تەواوی بنەماڵەی یژێڤیکینم لە بیر چووبوو. من کە لە بەرخۆوە وام دەزانی پاڵەوانێکم و بە درێژایی ڕێگە خەیاڵم لای دەزگیرانەکەم بووم و نەخشەگەلی دلێرانەم بۆ دەکێشا، بە تەواوی بنەماڵەی ئەوم لە بیر کردبوو، یان باشتر بیڵێم، هەر لە سەرەتاوە هیچ بایەخێکم بەو مەسەلەیە نەدابوو. چپەئاسا بە خاڵەم گوت:

– باوکی؟ یانی چی؟ لام وابوو ئەو کچە هەتیوە.

– بەڵێ، براڵە، ئەو باوکیەتی. دەزانی، پیاوی سەرڕاستتر و شەریفتری وەك خۆی دەست ناکەوێ. تەنانەت دەم لە مەشرووبیش نادا، تەنیا خەریکی گەپجاڕبازییە. هەژارییەکەی لە باسا نییە و تەواو تۆقێنەرە، خاوەنی هەشت دانە منداڵە! بە موچەکەی ناستینکا ژیان بەڕێ دەکا. جا هەر لەبەر ئەم زمانەشی لە خزمەتکردن دووریان خستەوە. حەفتەی جارێکیش دێتە ئێرە. ئەوەندە دەمارزلیشە کە هەرگیز هیچ یارمەتییەك لە هیچ کەسێ وەرناگرێ. چەندان و چەندان جار ویستوومە شتێکی بدەمێ، وەڵێ ئەو ڕازی نەبووە! مرۆڤێکی دڵبریندارە!

خاڵە کاتێك بینیی وا کابرای پیرەمێرد بە شکەوە گوێی بۆ قسەکانمان هەڵخستووە، توند کێشای بە شانیدا و پرسیی:

– ئێ، براڵە یۆگراف لاریۆنیچ، هەواڵی تازەی ئەوێ چییە؟

– دەشێ چ هەواڵێکی تازە هەبێ، ئەی نانبدەی من؟ قوربان، دوێنێ، ڤالینتین ئەیگناتیچ سەبارەت بە مەسەلەی تریشین سکالانامەی پێشکەش کرد. پێدەچێ کێشی ئاردی نێو توورەکەکەیان کەم بووبێتەوە. ئەم تریشینە، هەمان ئەو خانمە خانەدانەیە کە واقووڕ لێت ڕادەمێنێ و هەروەکو سەماوەر دەست بە غەڵبەغەڵب دەکا. بێگومان لە بیرتانە، ئەرێ؟ ئەم ڤالینتین ئەیگناتیچە، لە بارەی تریشینەوە وای نووسیوە:

گەر تریشین، کە هەمیشە بە
چاکە ناوی دەبرێ، نەیتوانیوە
بەرگری لە ناموسی برازاکەی

بکا... (ئاخر ئەم بەڕێزە سالی
ڕابردوو دەستی لە خزمەتکردن
هەلگرت و ڕایکرد) چۆن دەکرێ
چاوەڕێی ئەوەی لێ بکرێ کە
بەرگری لە ماڵ و موڵکی
دەولەت بکا؟

بە دەستی خۆی هەموو ئەمانەی لەسەر کاغەز نووسیوە، بە خودا، درۆ ناکەم، قوربان!

ئامفیسا پیترۆڤنا هاواری کرد:

- ئاه، ئەوە چی دەلێ!

خالە پالپشتیی کرد:

- کتومت، کتومت! ئەی براله یۆگراف، باشە بۆ قسەی نابەجێ دەکەی، ها؟ ئەی هاوار، دواجار ئەم زمانەت سەرت دەخوا! مرۆڤێکی ڕووڕاستی، خوا خۆی دەزانێ کە تۆ مرۆڤێکی ئاوڕوودار و باشی، وەلێ زمانت زبرە! من تێناگەم تۆ بۆ ناتوانی لەگەڵ ئەوانەدا هەلبەکەی! لە کەسانێکی سادە و باش دەچن...

پیرەمێرد بە گوڕوتینێکی تایبەتییەوە هاواری کرد:

- ئەی باوك و نانبدەی من! خۆ منیش هەر لەم مرۆڤە سادانە دەترسم!

کەیفم بە وەڵامەکەی هاتبوو. خێرا بەرەو لای یـژێڤیکین چووم و بە گەرمی دەستیم گوشی. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە دەمویست لەم ڕێیەوە، لە دژی هەڵسوکەوتی هەمووان بەرانبەر بەم پیرەمێردەدا بوەستمەوە. یان ڕەنگە... کێ چووزانێت! ڕەنگە ویستبێتم لای ناستاسیا یۆگرافاونا خۆم شیرین بکەم، وەڵێ ئەم هەنگاوەم ئەنجامێکی ئەوتۆی لێ نەکەوتەوە. من کە وەك هەمیشە سوور هەڵگەڕاو و شپرزە بووم، گوتم:

– دەکرێ لێتان بپرسم کە ئایا تا ئێستە هیچتان لە بارەی یەسوعییەکانەوە بیستووە؟

– نەخێر، بابە گیان، نەمبیستووە، ڕەنگە شتۆکەکیشم بیستبێ... وەڵێ ئاخر بە کەڵکی چی دێ؟ بۆ دەپرسن، قوربان؟

– هەروا... حەزم دەکرد باسێکتان بۆ بکەم... هەرکات دەرفەتێ ڕەخسا، بیرم بێننەوە تا بۆتان باس کەم. ئێستە با تەنیا هەر ئەوەندەتان پێ بڵێم کە دڵنیا بن لێتان تێدەگەم و... ڕێزتان بۆ دادەنێم...

– بیرتان دێنمەوە، بابە گیان، بێ گومان بیرتان دێنمەوە! بە ئاوی زێڕ دەینووسم تا بیرم نەچێتەوە. ئێستە مۆڵەت بدەن با گرێیەك لەمە بدەم تا بیرم نەچێ.

جا هەر بە ڕاستیش دەستی دایە سووچێکی وشکی پەڕۆی تووتنەکەی و گرێی لێدا. پراسکۆڤیا ئەیلی نیچنا گوتی:

– یۆگراف لاریۆنیچ، چای هەڵگرن!

– هەر ئێستە، خانمی زەریف[1]، هەر ئێستە، لەبری خانم، پێویستە بڵێم شازادە، لەبەر خاتری چایەکە! خانم، لە ڕێگەدا چاوم بە ئالێکسی یۆیچ باخچییێڤ کەوت. هێندە دڵخۆش بوو کە سەرم لێی سووڕما! لە بەرخۆوە گوتم تۆ بڵێی نیازی هاوسەرگیرییان نەبێ؟

جا لە بارێکدا کە بە فنجانی چایەوە بەتەنیشت مندا ڕادەبوورد، چاوێکی داگرت و بە دەنگێکی ورتەئاساوە گوتی:

– مەرایی بکە[2]، مەرایی بکە!

ئینجا ڕووی لە ئامادەبووان کرد و درێژەی پێ دا:

– ئەی بۆ نانبدەی گەورە نابینم؟ ئەوە فۆما فۆمیچ لە کوێن؟ ئەی تەشریف ناهێنن بۆ چاخواردنەوە؟

خاڵە وەك ئەوەی کە شتێکی چزووداری تێ ڕۆچووبێت، ڕاچەنی و بە شڵەژانەوە تەماشای ژنەی جەنەراڵی کرد و بە دڵەڕاوکێ و پەرێشانییەکی زۆروە گوتی:

– ئەوەی ڕاستی بێ نازانم. ناردم بەدوایدا، وەڵێ ئەو... نازانم، ئەوەی ڕاستی بێ، ڕەنگە حاڵی باش نەبێ. من ڤیدۆپلیاسۆڤم نارد بەدوایدا و... باشتر نییە خۆشم بچم؟

یژێڤیکین بە درزییەوە گوتی:

– من هەر ئێستە لای ئەو بووم.

---

١. زەریف، جوان و ناسك، دڵڕفێن.

٢. مەرایی بکە، ماستاو بکە، پان بکەوە، زمانلووسی بکە.

خاڵە بە تۆقیوی هاواری کرد:

– یانی ڕێی تێدەچێ؟ ئێ، چۆن بوو؟

– بەر لە هەر شتێ، چووم بۆ لایان و ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتی خۆمم بۆ نواندن. ئەوان گوتیان لە خەڵوەتی خۆیاندا چا دەخۆنەوە و جا پاشان ئەوەشیان بۆ زیاد کرد کە بە لەتە نانێکی ڕەقیش تێر دەبن. هەر ئەوەندە، قوربان!

پێدەچوو ئەو قسانە هەر بە تەواوی خاڵەیان تۆقاندبێت. نیگایەکی خەفەتبار و سەرزەنشتئامێزی گرتە پیرەمێردەکە و گوتی:

– یۆگراف لاریۆنیچ، تۆ دەبوو بۆی ڕوون بکەیەوە، دەبوو بڵێی...

– گوتم، قوربان، گوتم!

– ئی؟

– تا چەند خولەکێ هەر وەڵامیشیان نەدامەوە. سەرقاڵی شیکارکردنی مەسەلەیەکی بیرکاری بوون و خەریکیش بوو دەگەیشتنە ئەنجام، مەسەلەیەکی زۆر ئاڵۆز دیار بوو. لە بەرچاوی خۆم سکێچی پانتۆڵەکانی فیساگۆرسیان دەکێشا. بە چاوی خۆم بینیم. قسەکەمم سێبارە کردەوە، بۆ جاری چوارەم سەریان هەڵبڕی، دەتگوت تازە بە هاتنمیان زانیوە. گوتیان: *نایێم، تازە ئەو کاکی زانستمەندە هاتووە، خۆ ئیدی ئێمە لەتەنیشت ئەو ئەستێرە ئاسمانییەوە جێگەمان نابێتەوە!* جا کتومت گوتی *لەتەنیشت ئەو ئەستێرە ئاسمانییە.*

پیرەمێردەکە لەژێرەوە سەیرێکی کردم و تەوسخەنێکی کرد. خاڵە دەستەکانیی دا بە یەکدا و هاواری کرد:

– دەی، هەر چاوەڕێی ئەوە بووم! هەر دەمزانی! دەبینی سێرگی؟ مەبەستی لە *زانستمەند* تۆ بووی. ئێستە دەبێ چی بکەین؟

شانم هەڵتەکاند و بڕوابەخۆبووانە گوتم:

– خاڵە گیان، دەبێ دانی پێدا بنێم هۆکارەکەی ئەو هێندە گاڵتەجاڕانەیە کە تەنانەت شایەنی بیرلێکردنەوەش نییە. هەر بە ڕاستی سەرم لەوە سووڕماوە کە بۆ ئێوە هێندە خۆتان نیگەران کردووە.

خاڵە بەدەم دەستڕاوەشاندنی توورندەوە، گوتی:

– ئاخ، براله، تۆ هیچ نازانی.

کوتوپڕ پاکیزە پرەی پێلیتسینا خۆی هەڵقورتاند:

– ئیگۆر ئیلیچ، تازە پەشیمانی بێسوودە. هەر لە سەرەتاوە هەڵسوکەوتێکی ڕقاویتان لەگەڵی نواند. قوربان وەك پێشینان دەڵێن، سەری دەبڕن و قژی بۆ شانە دەکەن! گەر گوێتان لە قسەی دایە گیان بگرتبا، ئێستە حاڵتان وا شڕ نەدەبوو.

خاڵە، وەك ئەوەی بیەوێت ڕوونکردنەوەیەکی بۆ بدرێت، بە دەنگێکی تکاکارانەوە پرسیی:

– لەم نێوەندەدا گوناحی من چییە؟ ئاخر لە خوا بترسن!

پاکیزە پرەی پێلیتسینا لووتبەرزانە هاتە وەڵام:

- ئیگۆر ئیلیچ، ئەسڵەن من لە خوا دەترسم، وەڵێ کێشە ئەوەیە کە ئێوە خۆپەرستن و دایکتانتان خۆش ناوێ. ئاخر بۆ هەر لە سەرەتاوە کەوتنە بێرێزیپێکردنی؟ ئەمان دایکی ئێوەن، قوربان! من هەرگیز درۆتان لەگەڵ ناکەم. منیش سەرگوردزادەیەکم بۆ خۆم، کەسێکی هاکەزایی نیم، قوربان!

وای بۆ چووم کە پرەی پێلیتسینا هەر لە بنەڕەتەوە لەبەر ئەوە سەری قسەی کردەوە کە هەمووان و بە تایبەتیش منی تازەهاتوو تێبگەیەنێت کە بۆ نموونە ئەویش سەرگوردزایەکە و کەسێکی هاکەزایی نییە.

دواجار ژنی جەنەراڵیش هاتە گۆ و بە شێوەیەکی هەڕەشەئامێز گوتی:

- ئەمە هەمووی لەبەر ئەوەیە کە سووکایەتی بە دایکی خۆی دەکا.

- دایە گیان، ویژدانتان هەبێ! من کەی سووکایەتیم بە ئێوە کردووە؟

ژنی جەنەراڵ، کە زیاد و زیادتر هەڵچووبوو، لەسەری ڕۆیشت:

- بەڵێ، ئیگۆراشکا، ئەمە هەمووی لەبەر خۆویستی و مڕومۆنیی تۆیە.

خاڵە بێهیوایانە هاواری کرد:

- دایە گیان، دایە گیان! من کەی مرۆڤێکی خویست و مڕومۆنم؟ وا ئێستە پێنج ڕۆژ، پێنج ڕۆژی تەواوە کە لێم لووتەلان و قسەم لەگەڵ ناکەن! ئاخر بۆ؟ لەپای چی؟ لێگەڕێن با ئەوانی دی داوەریم

لە بارەوە بکەن، لێگەڕێن تەنانەت با هەموو دونیا داوەریم لە بارەوە بکەن! ئاخر ڕێ بدەن منیش بەرگری لە خۆم بکەم. دایە گیان، دەمێکە خۆم بێدەنگ کردووە، ئێوە نەتانویست گوێ لە قسەم بگرن. کەواتە ئێستە لێگەڕێن با لانیکەم ئەوانی دی گوێ لە قسەکانم بگرن. ئامفیسا پیترۆڤنا! پاول سیمیۆنیچ، پاول سیمیۆنیچی ئازیز! سێرگی، هاوڕێکەم! تۆ کەسێکی بێلایەنی، وەك دەڵێن، تەنیا تەماشاچییەکی. تۆ دەتوانی داوەرییەکی بێلایەنانە بکەی...

ئامفیسا پیترۆڤنا هاواری کرد:

– لەسەر خۆ بن، کەمێ وریا بن، ئیگۆر ئیلیچ. وا خەریکە دایکتان بە کوشتن دەدەن!

خاڵە وەك مرۆڤێکی لاواز کە ئیدی کاسەی سەبری سەرڕێژ بووبێت، وەلێ هەڵچوونەکەی لە ئاگرێك بچێت کە لە کادان بەربووبێت، بەوپەڕی هیوابڕاوییەوە لەسەری ڕۆیشت:

– ئامفیسا پیترۆڤنا، مەبەستم نییە دایە گیان بکوژم، ئەوە سینگی من، دەی لێدەن! ئامفیسا پیترۆڤنا، پێویستە بڵێم من سووکایەتی بە هیچ کەسێ ناکەم. قسەی من ئەوەیە کە فۆما فۆمیچ لە ڕەسەنترین و ئابڕوومەندترین کەسانی دونیایە، لە سەرووی ئەوەشەوە، هەڵگری هەموو سیفەتێکی بەرزی مرۆڤانەیە، وەلێ... وەلێ لەم بارەیەوە بە تایبەتی سووکایەتیی بە من کردووە.

ئابنۆسکین، وەك ئەوەی بیەوێت زیادتر خاڵە تووڕە بکات، دەنگێکی وەك هی گای دەرکرد:

– ئەمەم!

– پاول سیمیۆنیچ، پاول سیمیۆنیچی ئازیز! نەکا ئێوە هەر بە ڕاستی لاتان وا بێ، چۆن بیڵێم، لاتان وا بێ کە من وەك ئەم ستوونەی ئێرە بێهەستم؟ ئاخر منیش مرۆڤم کاکە، دەبینم، تێدەگەم، دەبێ بڵێم، لە ناخی دڵەوە وا هەست دەکەم کە هەموو ئەم هەڵەتێکەیشتنانە لە خۆشەویستییەکی زیاد لەڕادەی ئەوەوە بۆ من سەرچاوە دەگرن، وەڵێ سوێند بە خوا، لەم بابەتەدا بێویژدانییەکی تایبەت دەنوێنێ. لێگەڕێن با هەموو شتێ بڵێم. ئامفیسا پیترۆفنا، دەمەوێ هەموو باسەکە بە تەواوی وردەکارییەکانیەوە بگێڕمەوە، تا بزانن مەسەلە چییە و ئایا هەر بە ڕاستی ئەوە ویژدانارانەیە کە دایە گیان هەر لەبەر ئەوەی گوێم بە قسەی فۆما فۆمیچ نەداوە، لێم توورەیە؟

جا پاشان خاڵە، بە جۆرێك کە وەك بڵێیت ترسی لە بیسەرانی دیکە هەبێت و متمانە بەوە نەکات هەستی هاوخەمیی بۆ دەربڕن، ڕووی کردە من و لەسەری ڕۆیشت:

– تۆیش گوێ بگرە، سیریۆژا، تۆیش چاك گوێ بۆ قسەکانم بگرە و بڵێ کە من لەسەر هەقم یان نا؟ ئێستە باسی دەکەم کە سەرەتا کێشەکە لە چییەوە سەری هەڵدا: حەفتەیەك لەمەوبەر (بەڵێ، ڕێك حەفتەیەك لەمەوبەر) فەرماندەی پێشووی من، جەنەراڵ *ڕۆساپیتاف*، کاتێك خەریکبوو بە خۆ و بە ژنخوشکەکەیەوە بەم گوندەی ئێمەدا ڕادەبوورد، بۆ ماوەیەك لەم گوندە لای دا. من لە خۆشییان جێم بە خۆم نەدەگرت. هەلەکەم قۆستەوە و خێرا چوومە لای و پاش

ناساندنی خۆم، بۆ فراوێن[1] داوەتم کردن. جەنەراڵ بەڵێنێ دا، بێ گەر بۆی ڕەخسا. ئەم پیاوە، یانی دەبێ بڵێم لەو شەریفترت دەست ناکەوێ، بۆ ڕەوشتبەرزی ناوی ڕۆیشتووە، وێڕای ئەوە، خانەدانیشە! جوامێریی لەگەڵ ژنخوشکەکەیدا گەیاندووەتە لووتکە، ئەو کچە هەتیوەی بە کەسێکی پیاوانە و لاو بە شوو داوە (کە هەر ئێستە لە *مالییناڤا*دا بریکارە، کابرا گەرچی هێشتا گەنجە، کەچی دەکرێ بڵێین هەمووکارەیە!)، بە کورتییەکەی، جەنەراڵی هەموو جەنەراڵەکانە! ئەوەی ڕاستی بێ، لەماڵەوەدا فڕکان فڕکان بوو، چێشتلێنەرەکان گۆشتیان لێدەنا، ژەنیاریشم بانگهێشت کردبوو. دەی، زۆر دڵخۆش بووم و لە شادییان پێم ئەرزی نەدەگرت. فۆما فۆمیچ، ئەم دڵخۆشی و جۆشوخرۆشەی منی لە بەردڵ گران بوو! بیرم دێ کە لەپشت مێز دانیشتبوو، ئەو ژێلە[2] و خامەیەیان خستە بەردەمی کە حەزی لێیەتی. هەروا بە بێدەنگی دانیشتبوو و کتوپڕ، لە جێگەکەی ڕاست بووەوە و گوتی: *سووکایەتی، من سووکایەتم پێ کراوە، کاکە!* پێی دەڵێم: *بۆ سووکایەتیتان پێ کراوە، فۆما فۆمیچ؟* دەڵێ: *ئێوە من پشتگوێ دەخەن، ئێستە ئیدی تێکەڵیی جەنەراڵان دەکەن، ئێوە جەنەراڵەکانتان بەلاوە ئازیزترن تا من!* ئێ، هەڵبەتە من ئێستە بە کورتی باسی دەکەم، وەك دەڵێن تەنیا ڕووداوە سەرەکییەکە دەگێڕمەوە، وەڵێ گەر دەتزانی چ قسەگەلێکی کرد... بە کورتی، گیانمی هێنایە لەرزە! تۆ بایت چیت دەکرد؟ دەی، زۆرم پێ ناخۆش بوو، دەبێ بڵێم، شۆك بووبووم، سرەوتم لێ بڕابوو و هەر ئەملا و ئەولام دەکرد. ڕۆژی میوانی گەیشت. جەنەراڵ پەیامی نارد و داوای لێبووردنی کرد کە ناتوانێ بێ. مانای ئەمە بوو کە نایێ.

---

١. فراوێن، نانی نیوەڕۆ.

١. ژێلە، جۆرێکە لە خوراك، کە لە شەکر، ژێلە و ئاومیوە چێ دەکرێ.

چوومە لای فۆما و گوتم: *دەی، فۆما، خەمتان نەبێ! جەنەراڵ نایێ!* جا وا دەزانن چی ڕووی دا؟ ئەوان بە هیچ شێوەیەك ئامادە نەبوون لێم خۆش بن! دەیانگوت: *منتان زویر کردووە، تەواو و بڕایەوە!* من تکام بڕییە تکاخانە، وەلێ بێسوود بوو. دەیگوت: *نەخێر، ئێوە بچن بۆ لای جەنەراڵەکانتان، ئێوە جەنەراڵەکانتان بەلاوە ئازیزترن تا من، ئێوە کۆتاییتان بەم هاوڕێیەتییە هێنا.* ئێستە هاوڕێکەم! منیش تێدەگەم بۆچی تووڕە بووە. خۆ لە بەرد نیم، قابیلە مەڕ بم، خۆ مرۆڤێکی حۆلیش[1] نیم! ئاخر فۆما بۆیە وا دەکا، چونکە خۆشەویستییەکی زیاد لەڕادەی بۆ من هەیە، هەمووی لەبەر ئەوەیە کە ئەو هۆگری منە. خۆی وا دەڵێ. ئەو ئیرەیی بە پەیوەندیی نێوان من و جەنەراڵ دەبا، ترسی ئەوەی هەیە کە نەکا خۆشەویستیی من لەدەست بدا. وا خەریکە تاقیم دەکاتەوە، دەیەوێ بزانێ ئاخۆ من ئامادەم چ شتگەلێك لە پێناو ئەودا بکەمە قوربانی. دەڵێ: *هەرچۆنێك بێ، ئەوە منم کە بۆ ئێوە حوکمی جەنەراڵێکم هەیە، ئەوە منم کە حوکمی پایەبەرزێکم هەیە! تەنیا وەختێك لەگەڵتان پێك دێمەوە کە ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتی خۆتان بەرانبەر بە من بسەلمێنن.* دەپرسم: *فۆما فۆمیچ، ئاخر من چۆن دەتوانم ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتی خۆمتان بۆ بسەلمێنم؟* دەڵێ: *بە درێژایی ڕۆژ بە پایەبەرز بانگم بکەن، ئیدی ئەوسا ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتی خۆتان بۆ سەلماندووم!* وەك ئەوە وابوو کە لە ناکاو زەوی لەژێر پێمدا ڕۆچووبێ. بێگومان دەتوانی وێنای ئەوە بکەی کە تا چ ڕادەیەك سەراسیمە بوومە! دەڵێ: *ئەمە بۆ ئێوە دەبێتە وانەیەك تا ئیدی لەبەردەم جەنەراڵەکاندا شاگەشکە نەبن و ئەمەش لە بارێکدا، کە کەسانێکی دی هەن کە ڕەنگە کەسایەتییان زۆر لە هی جەنەراڵەکانی*

---

١. حۆل: گەمژە، هێر، وڕ، لاژگ.

ئێوە بەرزتر بێ! دەی، دانی پێدا دەنێم کە ئەمەی گوت ئیدی خۆمم پێ ڕانەگیرا! ڕاستگۆیانە دانی پێدا دەنێم! گوتم: فۆما فۆمیچ، چۆن شتی وا دەبێ؟ ئایا من دەتوانم کارێکی وا بکەم؟ ئایا من ئەو مافەم هەیە کە ئێوە تا پلەی جەنەراڵێك بەرز بکەمەوە؟ خۆتان بیری لێ بکەنەوە بزانن کێ مافی ئەوەی هەیە پلەی جەنەراڵی ببەخشێ؟ ئاخر، من چۆن دەتوانم بە کەسێکی وەك ئێوە بڵێم «پایەبەرز؟ » ئاخر ئەمە، چۆن بیڵێم، دەستدرێژیکردنە سەر پێگەی گەورەکانە! ئاخر جەنەراڵێك مایەی شانازیی وڵاتێکە: لە شەڕەکاندا جەنگاوە و لە ڕێی شەرەف و بەرگریکردن لە نیشتمانەکەیدا گیانی خۆی خستووەتە مەترسییەوە! من چۆن دەتوانم ئێوە بە پایەبەرز بانگ بکەم؟ کەچی هەر سەری نەدەهێنایە ڕاستە و لەسەر قسەی خۆی سوور بوو! گوتم: فۆما، لەبەر ئێوە ئامادەی ئەنجامدانی هەموو کارێکم. فەرمانتان کرد ڕیشم کورت بکەمەوە، چونکە بە بۆچوونی ئێوە لەگەڵ نیشتیمانپەروەریدا نەدەگونجا، منیش وام کرد، ئێستە هەرچی بڵێن من دریغی ناکەم، تەنیا پیاوی چاك بن و واز لە جەنەراڵی بێنن! کەچی دەڵێ: نەخێر، تا ئەو کاتەی بە پایەبەرز بانگم نەکەن، لەگەڵتان پێك نایێمەوە! ئەم کارە بۆ پاکژکردنەوەی ڕۆحی ئێوە پێویستە، دەبێتە هۆی هێوربوونەوەی ڕۆحتان! جا ئێستە وا یەك حەفتەی ڕەبەقە قسەم لەگەڵ ناکا و هەرکاتێکیش کە میوانێ دێتە ئێرە، بە یەکجاری ناوچاوی تاڵ دەکا. لەو کاتەوەی زانیویەتی تۆ خوێندەواری (هەڵبەتە ئەمەشیان خەتای من بوو، دەی ئیدی، خرۆشابووم و کتوپڕ لە دەمم دەرچوو)، گوتوویەتی هەتا تۆ لێرە بی، پێ نانێتە ماڵی منەوە. دەڵێ: یانی من ئیدی بەلای ئێوەوە خوێندەوار نیم. جا هاوار بە ماڵم گەر بزانێ بڕیارە کارۆفکینیش بێ بۆ ئێرە! ئێستە تۆ خۆت پیاوەتییەك بنوێنە و لەم نێوەندەدا

داوەرییەك بکە و پێم بڵێ بزانم هەڵەی من چییە؟ دەکرێ بە پایەبەرز بانگی بکەم؟ هەر بە ڕاست ئەمە حاڵە منی تێکەوتووم؟ باشە بۆ ئەمڕۆ باخچەیێڤی داماوی لەسەر مێز تاراند[1]؟ دەی، کردمان باخچییێڤ هیچ لە فەلەکناسی نازانێ، ئێ خۆ منیش نایزانم، تۆیش نایزانی... دەی ئەمە چیی تێدایە؟

ژنەی جەنەراڵ دووبارە بە منگەوە گوتی:

- تۆ ئێرەیی پێ دەبەی، ئیگۆرۆشکا[2].

خاڵە لە ترۆپکی بێهیواییدا هاواری کرد:

- دایە گیان! ئیدی وا شێت دەبم بە دەستانەوە!... دایە گیان، ئەمە قسەی خۆتان نییە، هی کەسێکی دیکەیە! دواجا من دەبمە دارتەل و پایە یان کۆتەرەدار نەك کوڕی ئێوە!

من بە تەواوی سەرم لەم باسە سووڕ مابوو، قسەکەیم پێ بڕی و هاوارم کرد:

---

١. تاراندن، تارنان، تەرەکردن، دەرکردن، تۆراندن.

١. وەرگێڕی فارس لە پەراوێزدا، نووسیویەتی کە «ئیگۆرۆشکا» شێوەی خۆشەویستینامێزی ناوی «ئیگۆر»ە، ئەمە درووستە، وەلێ لام وایە هاوکات شێوازێکی سووکایەتینامێزیشە، واتە دەکردێت هەمان بچووکردنەوەی ئەو ناوە، هەم وەك خۆشەویستی و هەم وەك سووکایەتیپێکردنیش بگوترێت. وەك چۆن لای خۆمان دەکرێت لە خۆشەویستییەوە ناوی «کەیوان و کێوان» بکەینە «کەوەلە، کەوە، کێوانلە»، هاوکات دەکرێت بۆ بەکەمنیشاندان و سووکایەتیپێکردنیش هەر هەمان ئەو ناوە بچووککراو و سووکەڵانە بەکار بێنین. لام وایە لێرانەدا ژنی جەنەراڵ وەك سووکایەتیپێکردن و بەکەمنیشاندانی کوڕەکەی، بە «ئیگۆرۆشکا» ناوی دەهێنێت، نەك دەبڕینی خۆشەویستی.

– خاڵە گیان، من یستوومە، هەڵبەتە نازانم کە ئایا ڕاستە یان نا، من لە باخچییڤەوە بیستوومە کە فۆما فۆمیچ ئیرەیی بەوە بردووە بۆ ڕۆژی ناولێنانی ئالیۆشا ئاهەنگ دەگێڕن و جا سوورە لەسەر ئەوەی کە بەیانی ڕۆژی ناولێنانی ئەویشە. دەبێ بڵێم کە ئەم تایبەتمەندییەی کەسایەتیی ئەو هێندەی سەراسیمەی کردووم کە...

خاڵە خێرا پەڕییە نێو قسەکانمەوە و گوتی:

– ڕۆژی لە دایکبوونیەتی، برالە، ڕۆژی لەدایکبوون، نەك ناولێنان! تەنیا مەبەستەکەیان بە درووستی نەگەیاندووە، هەڵبەتە ڕاست دەکەن: سبەینێ ڕۆژی لەدایکبوونیەتی. بەڵێ، براڵە، بەر لە هەر شتێ...

ساشینکا هاواری کرد:

– نەخێر، تەنانەت ڕۆژی لەدایکبوونیشی نییە!

خاڵە بە حەپەساوی دەنگی هەڵبڕی:

– ڕۆژی لەدایکبوونی نییە؟

– نەخێر، نییە، باوکە گیان! ئێوە تەنیا خەریکی خۆخەڵەتاندنن تا دڵی فۆما فۆمیچ خۆش بکەن. لەدایکبوونی لە مانگی مارسدا بوو. گەر بیرتان بێ، ڕۆژێك پێشتر، خەریکبووین سەردانی پەرستگەمان دەکرد، ئەو لە گالیسکە خۆشەکەیدا دانیشتبوو و هەمووانی هەراسان کردبوو، هەر هاواری دەکرد کە پاڵپشتی سەر کورسییەکەی، چەقیوەتە سەر کەمەری و ئەوانی دیکەی دابوونە بەر کونجڕك، لە تووڕەییان دوو کونجڕکی گرتە پۆڕێ گیان! کە ڕۆژی لەدایکبوونیشی چووین تا پیرۆزبایی لێ بکەین، خۆی تووڕە کردبوو

کە بۆچی چەپکە گوڵەکەمان کامیلیای[1] تێدا نییە. دەیگوت من حەزم *لە کامیلیایە،* چونکە *ماوسەلیقەی خانەدانانم، وەلێ ئێوە پێتان ئەتك بووە لە گوڵخانەدا بۆمی بێنن.* جا بە درێژایی ڕۆژیش ناوچاوی بەیکدا دابوو و دەم و لەوسی شۆڕ بووبووەوە و قسەشی لەگەڵ نەدەکردین...

لام وایە، تەنانەت گەر بۆمبێکیش بەر ناوەڕاستی ژوورەکە کەوتبووبا، هێندەی ئەم بەگژداچووە ئاشکرایە نەدەبووە هۆی سەرسامی و تۆقینی هەمووان. جا بەگژداچوونەوەی چ کەسێکیش؟ هی کچۆڵەیەك کە تەنانەت زاتی نەبوو لە بەردەم داپیرەیدا بە دەنگی بەرزیش قسان بکات. ژنی جەنەراڵ، کە لە تاو تووڕەیی و سەرسووڕمان زمانی گیرابوو، لە جێگەکەی هەستایەوە، خۆی کیف کردەوە و لە بارێکدا کە نەیدەتوانی بڕوا بە چاوانی خۆی بکات، واقووڕ لە نەوە ڕووقایمەکەی دەڕوانی. خاڵە لە ترسان وشك بووبوو. پرەی پێلیتسینا شاتاندی:

– دە فەرموون، هەرچی بەدەمیا بێ دەیڵێ و کەسیش لێی ناپرسێتەوە! هەر دەسئەنقەت دەیانەوێ داپیرە گیانیان بە کوشت بدەن!

خاڵە، کە هەروا بەملا و بەولادا فڕکەفڕکی بوو و هەنگاوێکی بەرەو لای ژنی جەنەراڵ دەنا و هەنگاوێکیش بەرەو لای ساشینکا پرتاوی دەکرد، قیڕاندی:

–ساشینکا، ساشینکا، بزانە چی دەڵێی! ئەوە چیتە، ساشینکا؟

---

١. کامیلیا، گوڵی درشت و جوان، بە ڕەنگی پەمەیی و سپییەوە کە لە دارچکێکی هەمیشەشین دەڕوێت بە گەڵای سەوزی تۆخ و بریقەدارەوە.

ساشینکا کتوپڕ لەسەر کورسییەکەی هەستایەوە و لە بارێکدا کە پێیەکانی بە زەویدا دەکوتین و چاوەکانی دەبریقانەوە، هاواری کرد:

– باوکە گیان بێدەنگ نابم! ئیدی بێدەنگ نابم! دەمێکە لەم فۆما فۆمیچەی ئێوە، لەم خوێڕی و چەپەڵەی ئێوەی قەبووڵ دەکەین! دواجار ئەم فۆما فۆمیچە سەری هەموومان دەخوا، چونکە هەمووان بەردەوام بە گوێیدا دەچپێنن کە ئاقڵ و دلێر و ئاوڕوومەندە، هەروەها تێکەڵەیەکە لە ئاکاری بەرز، جۆرێکە لە ماجوون. فۆما فۆمیچیش وەکو دەبەنگێك بڕوای بەم قسانە کردووە! ئەو هەموو چێشتە بەتامەی کە ناویانەتە بەردەمی ئەو، گەر بیانناپا بەردەم کەسێکی دی، ئێستە لە خەجاڵەتییان دەبووە ئاو، وەلێ فۆما فۆمیچ هەرچیی دەنێنە بەردەم، دەیخوا و، کەچی هەر داواش دەکا. جا ڕۆژێ بۆخۆتان دەبینن کە هەموومان بە ساقی قووت دەدا. هەموو ئەمانەش خەتای باوکە گیانە! فۆما فۆمیچ سپڵە و خوێڕی و چەپەڵە، بە بەرچاوی هەموانەوە دەیڵێم، لە هیچ کەسیش ناترسێم! دەبەنگێکی ڕاستەقینەیە، شپرێوێکی هەڵەوەڕ و ناڕەسەن، زاڵمێکی بێبەزەیی و دووزمان و درۆزنە... وای کە ئەگەر بە دەستی من دەبوو، هەر ئێستە لەم ماڵەم وەدەر دەنا، وەلێ باوکە گیان هەر بە شان و باڵیدا هەڵدەدا، باوکە گیان شێت و شەیدایەتی!...

کتوپڕ ژنی جەنەراڵ قیژاندی:

– وای خوایە!

جا بوورایەوە و کەوتە سەر زەوی. ئامفیسا پیترۆڤنا بەدەم هاوارکردنەوە دەیگوت:

– *ئاگافیا تیماق یۆنا*، ئازیزەکەم، فریشتەکەم! بێن ئەم شوشە بۆنەم لێ وەرگرن! ئاو بێنن، خێرا ئاو بێنن!

خاڵەش هاواری کرد:

– ئاو، ئاو بێنن! دایە گیان، دایە گیان، هێور بن! دەکەومە سەر ئەژنۆ، دەپاڕێمەوە، توخوا، هێور بن!...

پرەی پێلیتسینا، کە لە تووڕەییان لەشی کەوتبووە لەرزە، بەسەر ساشینکایدا قیژاند و گوتی:

– دەبێ لە ژوورێکی تاریکدا بەندتان بکەن و بێ لە نان و ئاو هیچ شتێکی دیکەتان نەدەنێ... ئێوە هەر بە ڕاستی بکوژن!

ساشینکا، کە ئەویش بە تەواوی دەیری بووبوو، هاواری کرد:

– دە بەندم کەن، خۆ من لە هیچ ناترسم! من بەرگری لە باوکە گیان دەکەم، چونکە ناتوانێ بەرگری لە خۆی بکا. ئەسڵەن ئەم فۆما فۆمیچە، لەبەرانبەر باوکە گیانی منا کێیە؟ خوێڕی و سپڵەی وا نانی باوکە گیان دەخوا و کەچی سووکایەتیشی پێ دەکا! گەر دەسەڵاتم هەبا ئەم فۆما فۆمیچەی ئێوەم لەتوپەت دەکرد! داوای دۆئیلم[1] لێ دەکرد و بە دوو دانە دەمانچە تەختم دەکرد...

خاڵە کە تێدامابوو، قیڕاندی:

– ساشینکا! ساشینکا! گەر یەك وشەی دیکە بڵێی چارەڕەش دەبم، بێ ئەملا و ئەولا لە دارم دەدەن!

ساشینکا بە فرکەیەك خۆی هاویشتە باوەشی باوکی و دەستەکانیی بەدەوری ئەودا ئەڵقاندن و بەدەم فرمێسکڕشتنەوە گوتی:

---

١. دۆئیل: جەنگی تەن بە تەن، بە چەکی سارد یان گەرم بۆ پاککردنەوە و پاراستنی شەرەف.

- باوکە گیان! ئێوە کە ئەوەندە نەرمونیانن، ئێوە کە ئەوەندە باش و جوانسرووشت و هۆشمەندن، بۆ هەر دەسنەنقەست خۆتان دەفەوتێنن؟ بۆ گوێ لە قسەی ئەم مرۆڤە چەپەڵ و سپڵەیە دەگرن؟ بۆ بوونەتە بووکەڵەی دەستی ئەو و خۆتان کردووە بە گاڵتەجاڕی ئەوانی دی؟ باوکە گیان، باوکە شیرینەکەی خۆم!...

جا خووڕ خووڕ کەوتە گریان و سەری نایە نێوان دەستەکانی و بە ڕاکردن لە ژوورەکە چووە دەرێ.

هەڵڵایەکی ترسناك لە ئارادا بوو. ژنەی جەنەراڵ بێهۆش کەوتبوو. خاڵە لەتەنیشتی کەوتبووە سەر ئەژنۆ و دەستیی ماچ دەکرد. پاکیزە پەرەی پێلیتسینا بە دەوریاندا دەخولایەوە و بە بارێکی مڕومۆن و سەرکەوتووانەوە لێمانی دەڕوانی. ئامفیسا پیترۆڤنا ئاوی دەپژاندە ڕووخساری ژنی جەنەراڵ و لاجانگەکانی دەماڵی و لەگەڵ شووشەی بۆنەکەی تێگیرابوو. پراسکۆڤیا ئیلینیچنا هەڵدەلەرزی و فرمێسکی دەڕشت، یەژێڤیکین بەدوای شوێنێکدا دەگەڕا تا خۆی تێدا بشارێتەوە و خاتونی مامۆستاش لە ترسان ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو و بە تەواوی حەپەسا بوو. لەم نێوەندەدا، تەنیا میزینچیکۆڤ کتومت وەك باری ئاسایی جارانی مابووەوە. جا هەستایەوە و بەرەو لای پەنجەرە ڕۆیشت و بێ ئەوەی سەرنجی ئەو دیمەنە بدات، لە دەرێ ڕاما. کتوپڕ ژنەی جەنەراڵ لەسەر قەنەفەکە هەستایەوە، خۆی گیف کردەوە و بە نیگایەکی هەڕەشەئامێزەوە چاوی لە من بڕی. پاشان پێی بە زەویدا کوتی و هاواری کرد:

- ون بە لە بەرچاوم!

پێویستە دانی پێدا بنێم، کە بە هیچ شێوەیەك چاوەڕێی وەها کاردانەوەیەك نەبووم.

- یەڵا، بۆ دەرێ! ون بە و لەم ماڵە بچۆ دەرێ! ئەمە چی دەکا لێرە؟ ئادەی بیکەنە دەرێ! لێرە ون بە!

خاڵە کە لە ترسان لەشی کەوتبووە لەرزین، گوتی:

- دایە گیان، دایە گیان، ئەوە چی دەڵێن؟ خۆ ئەمە سیریۆژای خۆمانە. دایە گیان، ئاخر ئەو میوانی ئێمەیە.

- سیریۆژا کێیە؟ قسەی قۆڕ مەکە! ئیدی نامەوێ هیچ ببیستم، بۆ دەرێ! ئەمە کارۆفکینە. گومانم نییە کە هەمان کارۆفکینە. هەستی شەشەمی من هیچ کات درۆم لەگەڵ ناکا. بۆ ئەوە هاتووەتە ئێرە تا فۆما فۆمیچ دەربەڕێنێ، تەنیا لەبەر ئەوە داوەت کراوە بۆ ئێرە. دڵم شایەتی دەدا کە هۆکارەکەی هەر ئەمەیە... ون بە بۆ دەرێ، نارەسەن!

من کە لە ڕقان کەوتبوومە هەناسەبڕکێوە، گوتم:

- خاڵە گیان، ئێستە مادام وایە... بە داوای لێبووردنەوە من ئیدی بێزارتان ناکەم.

ئەمەم گوت و کڵاوەکەمم هەڵگرت تا بچمە دەرێ. خاڵە بە ڕاکردن دوام کەوت و لە بارێکدا کە هەوڵی دەدا کڵاوەکەمم لێ بستێنێت، هاواری کرد:

- سێرگی، سێرگی، ئەوە تۆ بە تەمای چیی؟... دەی، خۆ ئێستە تەنیا... دایە گیان! دایە گیان، ئەمە سیریۆژاکەی خۆمانە!... هێی، سێرگی، تکا دەکەم! تۆ میوانی منی، تۆ هەر لێرە دەمێنییەوە... من وام دەوێ!

پاشان بە دەنگێکی مەیلەو ورتەورتەوە درێژەی پێ دا:

– ئەو تەنیا ئێستە وایە، تەنیا لەو کاتانەدا وا دەکا کە تووڕ دەبێ... تۆ تەنیا ئێستە، دەبێ بۆ مایەکی کورت بشاردرێیەوە... ئەرێ، جارێ بچۆ بۆ شوێنێ تا دۆخەکە کەمێ هێمن بێتەوە. دایە گیان خۆی لێت دەبووری، بەڵێن دەدەم! ژنێکی نەرمونیانە. ئێستە تەنیا شتێکی لەدەم دەرچوو... خۆ دەبیستی، ئێستە مەسەلەکە تەنیا ئەوەیە کە بە کارۆفکین لە تۆ گەیشتووە، ماوەیەکی بەسەردا بچێ، بەڵێن دەدەم کە لێت ببووری...

خاڵە کتوپڕ بەسەر گاڤریلای داماودا، کە تازە هاتبووە ژووری و لە ترسان هەڵدەرزی، قیراندی:

– باشە تۆ چی دەکەی لێرە؟

گاڤریلا بە تەنیا نەبوو. کوڕێکی لادیی شازدە ساڵانی قۆزیشی لەگەڵ هاتە ژووری. پاشان لەوە تێگەیشتم کە لەبەر جوانییەکەی کراوە بە خزمەتکاری ماڵێ. بە فالالی بانگیان دەکرد. جلێکی تایبەتیی لە بەر کردبوو، کراسێکی ئاوریشمیی سوور بە پشتوێنێکی زێڕچنی و پانتۆڵێکی مەخمەڵیی ڕەشی لە بەر بوو بە پووتێکەوە لە پێستی بزن، کە قەراخەکانی سوورڕەنگ بوون. هەڵبژاردنی ئەم مۆدێلە سەرنجڕاکێشەی جلەکانی، لە لایەن ژنی جەنەراڵەوە بوو. کوڕیژگەکە خووڕخووڕ دەگریا و هەر دڵۆپە هەڵس بوو و بە چاوانی گەورە و کەوەیدا دەهاتنە خوارێ. خاڵە هاواری کرد:

– چی بووە هەمدیسان؟ چی قەوماوە؟ دە قسە بکە کابرا!

گاڤریلا بە سیمایەکی خەمگینەوە هاتە وەڵام:

- فۆما فۆمیچ فەرمانیان کردووە بێینە ئێرە، خۆشیان ئێستە دێن. من تاقیکردنەوەم هەیە، وەڵێ ئەو...

- وەڵێ ئەو چی؟

گاڤریلا بە دەنگێکی خەفەتاوی وەڵامی دایەوە:

- سەمای دەکرد، گەورەم.

خاڵە تۆقیوانە هاواری کرد:

- سەمای دەکرد؟

فالالی بەدەم هەنسکدانەوە گوتی:

- بەعلێ، سە... مام... دەکرد!

- بێ گومان سەمای کامارینی، ئەرێ؟

- سەمای کا... ما... رینی!

- جا فۆما فۆیچ ئەمەی بینی؟

- بەعلێ، بی... نیی!

خاڵە قیڕاندی:

- چارەڕەشتان کردم! سەرتان خواردم!

جا هەردوو لەپی دەستی بە سەرییەوە نا.

ڤیدۆپلیاسۆڤ هاتە نێو ژوورەکە و ڕایگەیاند:

- فۆما فۆمیچ!

لەگەڵ کرانەوەی دەرگەکەدا، فۆما فۆمیچ، بەو کەسایەتییە تایبەتییەی خۆیەوە، لەبەرانبەر ئامادەبووانی سەراسیمەدا وەدەرکەوت.

# وەرزی شەشەم

## چیرۆکی گاچەرمووو وەرزێری کامارینی

خوێنەری ئازیز! بەر لەوەی ئەو شانازییەم پێ ببڕێ کە لە خزمەتتاندا فۆما فۆمیچ بناسێنم، بە پێویستی دەزانم چەند قسەیەك لە بارەی فالالیەوە بکەم و ڕوونکردەوەیەك بدەم. باشە ترسناکیی ئەم بابەتە لە چیدا بوو کە ئەو بە شێوازی کامارینی سەمای کردووە و فۆما فۆمیچ، لە کاتی ئەم سەما دڵخۆشکەرەدا چاوی پێی کەوتبوو؟ فالالی نۆکەرزادەیەك و زڕ کوڕی هاوسەری کۆچکردووی خاڵە بوو و هەر بە منداڵی هەتیو کەوتبوو. خاڵەش زۆری خۆش دەویست. ئەمەش بەس بوو بۆ ئەوەی فۆما فۆمیچ دوای گیرسانەوە لە ستێپانچیکۆڤۆ و ملکەچکردن بە خاڵەم، ڕق لە فالالی هەڵبگرێت کە خۆشەویستی دڵی خاڵە بوو. وێڕای ئەوەش، ژنی جەنەراڵ سۆزێکی تایبەتیی بۆ ئەو هەبوو و سەرباری قینی فۆما فۆمیچ، فالالی هەروا لەم ماڵە خانەدانانەیەدا پێگەی تایبەتیی خۆی بوو، ژنی جەنەراڵ بە تایبەتیی جەختی لەسەر ئەم بابەتە دەکردەوە و فۆماش گەرچی سەری هێنابووە ڕاستە، بەس هێشتا لە ناخی دڵییەوە بەم مەسەلەیە قەڵس بوو. فۆما هەر لە بنەڕەتەوە بە هەموو شتێك قەڵس بوو و لەبەر ئەوەش گەر هەر کاتێك هەلومەرجێکی گونجاوی بۆ بڕەخسابا،

تۆڵەی لە خاڵەی بێتاوانی من دەکردەوە. جوانی و سەرنجڕاکێشیی فالالی لەڕادەبەدەر بوو و ڕووخسارێکی کچانەی هەبوو، کتومت وەك کچێکی زەریفی لادێیی. ژنەی جەنەراڵ چاوی لێی بوو و نازی دەکێشا و وەك کەرەستەیەکی بەنرخ و دەگمەنی یاری، ئاگاداریی دەکرد. ئەو هەر لە بنەڕەتەوە دیار نەبوو کە کێی زیاتر خۆش دەوێت: سەگە چکۆڵە تووك لوولەکەی «ئامی» یان فالالی؟ مۆدێلی جلەکانیشی (هەروەك پێشتر باسم کرد) لە داهێنانەکانی ژنی جەنەراڵ بوو. کچەکان بۆیەیان لە قژی دەدا و *کۆزمای* ئارایشگەریش ڕاسپێردرابوو کە بۆ ڕۆژی ئاهەنگگێڕانەکە قژی لوول بکات. کوڕە بوونەوەرێکی سەیروسەمەرە بوو. هەرگیز نەدەکرا بڵێی کەسێکی گەمژە یان گێژە، وەڵێ هێندە ساویلکە و ڕاستگۆ و خۆشباوەڕ بوو کە هەر بە ڕاستی لە هەندێك کاتدا وەك دەبەنگێك دەهاتە بەرچاو. هەر کات خەونێکی دەدیت، خێرا دەهات و بۆ گەورەکانیی دەگێڕایەوە. لە گفتوگۆی گەورەکانیشدا خۆی هەڵدەقورتاند و باکی بە قسەپێبڕینیان نەبوو. شتگەلێکی دەگێڕایەوە کە خستنە بەرباسیان، لە بەردەم نەجیباندا شیاو نەبوو. هەر کات ژنەی جەنەراڵ دەبوورایەوە یان لەگەڵ خاڵە دەبووە دەمەقرەیان، لە ناخی دڵەوە فرمێسکی دەباراند. گەر کەسێکیش تووشی کێشەیەك بهاتبا، ئەو دڵسۆزیی خۆی بۆ دەنواند. جاروبار دەچووە لای ژنی جەنەراڵ و دەستی ماچ دەکرد و لێی دەپاڕایەوە تووڕە نەبێت، ئەویش بە دڵفراوانییەکی سەیرەوە چاوپۆشیی لە ڕووقاییمیی ئەو دەکرد. هەتا بڵێیت هەستیار، نەرمونیان و وەکو بەرخێك بێوەی و بە وێنەی منداڵێك شاد و بەکەیف بوو. لە وەختی

فراوێن و شێواندا[1] هەمووان، لە هەموو چێشتەکانی سەر مێزیان دەخستە بەردەمی.

فالالی دایمە لەپشت مێزی ژنی جەنەراڵەوە ڕادەوەستا. زۆری حەز لە قەند بوو. کاتێك قەندیان دەدایێ، بەو ددانە پتەو و شیرییە سەدەفییانەیەوە دەیکرماند و بریقەی شادی و چێژێکی وەسفهەڵنەگر لە چاوە شینە شاد و ڕووخسارە گەشەکەیدا خۆی دەنواند.

فۆما فۆمیچ تا ماوەیەکی زۆر چاوی بە ڕووی ئەم فالالیەدا هەڵنەدەهات، بەس وەختێك کە تەماشای کرد ئەم ڕقەی سوودێکی ئەوتۆی پێ ناگەیەنێت، بڕیاری دا ڕۆڵی سەرمەشقی فالالی بگێڕێت. بەم پێیە، دوای ئەوەی بە باشی خاڵەی سەرکۆنە کرد کە گوایە بە هیچ شێوەیەك گوێ بە پەروەدە و فێرکردنی خزمەتکارەکانی نادات، بڕیاری دا خۆی بە تایبەت ئەرکی پەروەدە و فێرکردنی کوڕیژگە داماوەکە لە ئەستۆ بگرێت و فێری هەڵسوکەوت و ڕەوشت و زمانی فەڕەنسیی بکات. ئەو لەگەڵ بەرگریکردن لە بیرۆکە بێماناکەی خۆی (هەر بەو جۆرەی کە نووسەری ئەم دێڕانە شایەتە، ئەم بیرۆکەیە، بیرۆکەیەك نەبوو کە هەر بە تەنیا بە زەینی فۆما فۆمیچدا ڕابوردبێت) دەیگوت:

– سەیرە! سەیرە! فالالی دایمە لە نهۆمی سەرەوە لای خانمەکانە، خۆ ڕەنگە ڕۆژێ خانم، کتوپڕ بیری بچێ کە ئەو زمانی فەڕەنسی نازانێ و بۆ نموونە پێی بڵێ: *donnezmoi mouchoir*[2] جا خۆ

---

١. شێو: نانی ئێوارە.

٢. ئەو دەسڕەملیەم بدەرێ. (دەورەملی، دەسڕەملی: جۆرێکە لە دەسڕ، کە بۆ جوانی لە مل دەکرێت. ) «و. ف، ك»

نابێ ئەو دەست لە خۆی بشواتەوە و پێویستە بتوانێ ئەرکەکەی ڕاپەڕێنێ!

وەلێ پێدەچوو فالالی نەك هەر بە تەنیا نەتوانێت فێری زمانی فەڕەنسی ببێت، بەڵکە بۆ فێربوونی ڕێزمانی ڕووسیش لێی بێهیوا بووبوون، چونکە چێشلێنەر ئاندرۆنی (مامی)یشی کە دونیایەك هەوڵی لەگەڵ دابوو تا فێری ڕێزمانی ڕووسیی بکات، دەمێك بوو کۆڵی لێ دابوو و کتێبێی ئەلف و بێکەی فڕێدابووە تاقەکەوە! فالالی لە بواری تێگەیشتن و فێربوون لە کتێبە فێرکارییەکانییەوە هێندە حۆل بوو کە هیچی نەدەچووە مێشك. بێ لەمەش، مەسەلەکە ئەنجامی دیکەی لێ کەوتەوە، نۆکەرانی دیکە بە فالالییان ڕادەبووارد و پێیان دەگوت: *مێی، فەڕەنسی!* جا بەردەستەکەی خاڵەش، هەمان گاڤریلای پیر زاتی پەیدا کردبوو کە بە ئاشکرا، گوتبووی فێربوونی زمانی فەڕەنسی بێسوودە. فۆما فۆمیچ ئەم قسانەی بیستبوونەوە و بە ڕقدا کەوتبوو و، وای لێ هاتبوو کە خودی گافریلای پیر و ناڕازیشی ناچار کردبوو خۆی فێری فەڕەنسی بکات. بە کورتی، ئەم بیرۆکەی فێربوونی زمانی فەڕەنسییە، کە بەڕێز باخچێیڤی بەو ڕادەیە قەڵس کردبوو، ئەلێرەوە سەرچاوەی گرتبوو. جا بەزمی فێربوونی هونەری هەڵسوکەوت، زۆر لەمە خراپتر بوو: فۆما هەرچیی دەکرد، هەر نەیدەتوانی بەو جۆرەی کە خۆی دەیەوێت، فالالی پەروەردە بکات. جا گەرچی فۆما فۆمیچ ئەوەی لێ قەدەغە کردبوو کە خەونەکانی خۆی بۆ کەسانی دی بگێڕێتەوە (ئاخر بە بۆچوونی ئەو، ئەم کارە بێڕێزی و هەرزەگەرییەکی ڕووت بوو)، کەچی فالالی هەموو بەیانییەك خەونەکەی خۆی بۆ ئەو دەگێڕایەوە. لەگەڵ

ئەوەشدا، فالالی هەر بە فالالی مایەوە. دەی، خۆ دیاریش بوو کە پێویستە خاڵە باجی سەرلەبەری ئەو کارانەی بدات. فۆما بۆ گەورەکردنی بابەتەکە، هەرکات کە هەمووان کۆ دەبوونەوە، بە هەلی دەزانی و هاواری دەکرد:

– ئایا دەزانن ئەمڕۆ چیی کردووە؟ جەنابی سەرهەنگ، ئایا دەزانن ئەم ڕەوشتی نازپەروەرییەی ئێوە چ ئاکامێکی لێ کەوتووەتەوە؟ ئایا دەزانن کە ئەمڕۆ دوای قورزەڵقورتکردنی ئەو پارچە کێکەی کە لەسەر مێزی نانخواردن پێیان دابوو، چیی گوت؟ ئا وەرە ئێرە، وەرە ئێرە ناشیرین، دە وەرە ئێرە هەی دەبەنگ، وەرە بەدتەشکی[1] سوورکاڵ!...

فالالی لەم کاتەدا، کە بە دەست خەریکی سڕینی فرمێسکەکانی بوو، هاتە ژوورێ.

– ئادەی بڵێ بزانم، دوای قورزەڵقورتکردنی ئەو کێکە، چیت گوت؟ لەبەردەم هەمووانیدا دووبارەی بکەوە!

فالالی فرمێسکی دەڕشت و هیچ وەڵامێکی نەدەدایەوە.

– مادام وایە، خۆم دەیڵێم. بەو سکە ئاوساو و بۆگەنەی خۆتتدا دەکێشا و دەتگوت: *وەک چۆن مارتین[2] سابوون قووت دەدا، منیش ئاوها کێکەکەمم حەپەلووش کرد!* تکا دەکەم هەر خۆتان بڵێن سەرهەنگ، لەنێو چینێکی خوێندەوار و بە تایبەت نەجیبزادەدا، گوتنی ئەم جۆرە ڕستانە شتێکی شیاوە؟ تۆ ئەمەت گوت یان نا؟ ئا بڵێ بزانم!

---

١. بەدتەشک، ناحەز، ناشیرین، دزێو، بەدشکڵ، بەدشێوە.

١. مارتین، جۆرە باڵندەیەکی دەریاییە. «و. ف»

فالالی بەدەم گریانەوە گوتی:

– ئەرێ، گو... تم!

– ئادەی، ئێستە پێم بڵێ بزانم، بۆ مەگەر مارتین سابوون دەخوا؟ باشە تۆ لە کوێ بینیوتە مارتین سابوون بخوا؟ ئادەی بڵێ تا منیش ئەم مارتینە عەنتیکەیە بناسم!

فالالی وسکت بووبوو. فۆما دیسان کەللەڕەقانە گوتی:

– لەگـەڵ تۆمـە، باشـە ئـەم مارتینـە کێیـە؟ دەمـەوێ بیبینـم و بیناسـم. ئـەها، چ کارەیـە؟ کارمەنـدی تۆمارگەیـە، ئەستێرەناسـە، وەرزێـرە، شـاعیرە، نـەکا فەرمانـدەی سـووپایە یـان لەوانەشـە بەردەستێك بێ، ها؟ دەی، دواجار خۆ دەبێ کارێکی هەبێ. وەڵام بدەوە!

سەرئەنجام فالالی بەدەم گریانەوە هاتە وەڵام:

– بەر... دە... ستە.

– بەردەستی کێ؟ گەورەکەی کێیە؟

وەلێ فالالی نەیدەزانی گەورەکەی کێیە. بە کورتی، ئەم مەسەلەیە بەوە دوایی دێت کە فۆما لە تاو تووڕەیی ژوورەکە جێدەهێڵێ و هاوار دەکا کە ئەو سووکایەتیی پێ کراوە، ژنی جەنەراڵیش لەخۆ دەچێ و خاڵەش نەفرەت بۆ ڕۆژی لەدایکبوونی خۆی دەنێرێ، داوای لێبووردن لە هەمووان دەکات و بە درێژایی ڕۆژەکە و لە ماڵی خۆیدا، بێچرپە و لەسەر سنگی پێ ڕێ دەکات.

بۆ نەگبەتی، بەیانیی ڕۆژی کارەساتەکەی مارتین و سابوون، فالالی کە بە تەواوی مەسەلەی مارتین و نەهامەتییەکانی ڕۆژی پێشووی لە بیر کردوون، چای دەبات بۆ فۆما فۆمیچ و بۆی

دەگێڕێتەوە کە دوێشەو خەونی بە گایەکی چەرمووەوە دیوە. جا هەر ئەوەمان کەم بوو! ڤینێکی بێرادە فۆما فۆمیچ دەتەنێتەوە و خێرا خاڵە بانگ دەکات و لەبەر خەونی شەرمهێنی فالالی، دەست دەکاتە سەرکۆنەکردنی خاڵە. ئەم جارەیان ئیدی هەلێکی باش دەڕەخسێت: فالالی سزا دەدەن، دەبوو لە سووچێکی ژوورەکەدا لەسەر ئەژنۆ ڕابووەستێت. جا بێ چەندوچۆن بینینی ئەم جۆرە خەونە دزێو و دواکەوتووانەیەی لێ قەدەغە دەکرێت. فۆما دەڵێ:

– دەزانن من لە چی پەستم؟ من لەوە پەست نیم کە ئەو مۆڵەتی بە خۆی داوە بێ و خەونەکەی، خەونی گایەکی سپیم بۆ بگێڕێتەوە، بەڵکە لەوەی... خۆتان پشتڕاستی بکەنەوە سەرهەنگ، بینینی گای سپی، نیشانەی هیچ شتێکی دی نییە بێ لە لاساری، نەزانی و دێهاتیگەریی ئەم فالالیە بێئەدەبەی ئێوە. خەونی هەر کەسێ ڕەنگدانەوەی بیر و فکری خۆیەتی. مەگەر من پێشتر پێم نەگوتن کە فالالی ئەدەب نادرێ و نابێ بهێڵن بێتە نێو کۆڕی نەجیبزادانەوە؟ هەرگیز، هەگیز ناتوانن ئەم بوونەوەرە بێئاوەز و دواکەوتووە بگۆڕن و بیکەنە شتێکی بەرز و شاعیرانە.

پاشان ڕوو لە فالالی درێژەی پێ دا:

– یانی تۆ ناتوانی خەون بە شتێکی جوان، شتێکی خۆش و نایابەوە ببینی، بۆ نموونە دیمەنێ لە ژیانی خانەدانان، بەڕێزانێك کە خەریکی یاریی وەرەقن، یان چەند خاتونێ کە بەنێو باخێکی دلڕفێندا پیاسە دەکەن؟

فالالی بەڵێنی دا بۆ شەوی داهاتوو خەون بە پیاو و خانمانێکەوە ببینێت کە بە باخێکی قەشەنگدا خەریکی پیاسەکردن بن. شەوانە کاتێک دەچووە جێخەوەکەیەوە، فرمێسکی هەڵدەڕشت و لە خودا دەپاڕایەوە کە خەونێکی لەو جۆرە ببینێت و تا ماوەیەکی زۆر لەگەڵ ئەو فکرەدا دەستەویەخە بوو کە چی بکات تا هەمدیسان خەون بەو گاچەرمووە نەفرەتییەوە نەبینێت. وەلێ جەخار کە هەمیشە ئارەزووەکانی مرۆڤ نایێنە دی. کە بەیانیان بەئاگا دەهات، دیسان بیری دەهاتەوە کە بە درێژایی شەو خەونی بەو گایە سپی و دزێوەوە بینیوە و هیچ خانمێکی زەریفی لە وەختی پیاسەکردن بە باخێکی دڵڕفێندا نەهاتووەتە خەون. ئەم جارەیان ئیدی خەونەکەی فالالی ئاکامێکی دیکەی لێ کەوتەوە. فۆما فۆمیچ بە پێداگرییەوە ڕایگەیاند کە بڕوا بەو وەها هەڵکەوتێك ناکات و چەندبارەبوونەوەی ئەو خەونە ڕێتێنەچووە و بێ گومان یەکێك لە کەسانی نێو ماڵەکە، تەنانەت بۆی هەیە خودی سەرهەنگیش بێت کە دەسئەنقەست فالالیی فێر کردبێت تا بەم کارانەی ئازاری فۆما فۆمیچ بدات. هەڵڵا و سەرکۆنەکردن و گریە و شێوەن باڵی بەسەر ماڵەکەدا کێشابوو. بۆ ئێوارەی ئەو ڕۆژە، ژنەی جەنەراڵ نەخۆش کەوت، ئەندامانی ماڵەکە هەمووان ماتەمیان گێڕا. هێشتا قیچە هیوایەك مابوو بۆ ئەوەی لە شەوی داهاتوو، یانی لە شەوی سێیەمدا، خەونەکەی فالالی بە حاڵێك بەلای ژیانی چینی خانەدانانندا بچێت، وەلێ دوای ئەوەی کە بە درێژایی یەك حەوتەی ڕەبەق، فالالی هەر شەوێك تەنیا و تەنیا خەونی بە گایەکی سپییەوە دەبینی، هەمووان پەست بوون و کەوتن

بە ڕقدا! ئەوجا لەوەبەدوا، ئیدی فالالی بە یەکجاری دەبوو دەست لە چوونە نێو کۆڕی نەجیبزادان بشواتەوە.

جا لە هەمووشی سەرنجڕاکێشتر ئەوە بوو کە فالالی، ئەوەی بە مێشکدا نەدەهات کە دەتوانێت بە درۆیەك پینەی بکات: دەیتوانی سووك و ئاسان بڵێت کە خەونی بە گاچەرمووەوە نەدیوە و بۆ نموونە خەونی بە گالیسکەیەکی پڕ لە خانمەوە بینیوە کە فۆما فۆمیچیشیان لەگەڵ بووە. بێ گومان لەو هەلومەرجە نالەبارەدا، درۆکردن، حسێبی گوناحی بۆ نەدەکرا. وەلێ فالالی هێندە ڕاستگۆ بوو کە تەنانەت گەر بە نیازیش با، هەر نەیدەتوانی درۆ بکات. هەر لەبەر ئەمەش، هیچ کەسێك ئەوی هەڵنەدەنا تا درۆیەکی لەو جۆرە بکات. هەمووان دەیانزانی کە ئەو هەر لە سەرەتاوە دەستی خۆی کەشف دەکات و فۆما فۆمیچیش دەمودەست درۆکەی لێ سپی دەکاتەوە. چیمان لەدەست دەهات؟ خاڵە کەوتبوە هەلومەرجێکی بەرگەنەگیراوەوە، فالالیش هیچی لەگەڵ نەدەکرا. کوڕیژگەی داماو، تەنانەت لە ناڕەحەتییاندا ڕۆژ دوای ڕۆژ لاوازتر دەبوو. *مالانیا* کە قەرەواشی[1] گەورەی ماڵەوە بوو، بڕوای وا بوو بەچاویان بردووە، جا هەر لەبەر ئەوەش، جارێکیان ئاوی بە پشکۆدا ڕشت و پاشان بە ڕووخساری ئەویشیدا پژاند[2]. لەم کارە بەسوودەدا، پراسکۆڤیا

١. قەرەواش، کارەکەری ژن، کە لەبەرانبەر دەستهەقێکدا بە کاروباری نێو ماڵی کەسێکدا ڕادەگات.

٢. بە پێی بیروباوەڕێکی خوڕافی، بۆ دوورخستنەوەی نەهامەتی لە کەسی بەچاوبراو، ئاوێك کە دوعای لەگەڵ خوێنراوە، بەسەر پشکۆدا دەپژێنرێت. لەژێر کاریگەریی تینی گەرمادا، ئاو لە شێوەی وردەگەرد دەپژێتە ڕووخساری کەسەی ناوبراو و دەمودەست نەهامەتییەکەی لێ دوور دەکەوێتەوە. «و. ف»

ئیلینیچنای میهرەبانیش بەشدار بوو. وەڵێ ئەم کارەش سوودێکی وای نەگەیاند. فالالی دەیگوت:

– دوای بڕێ نەفرەتیی وا! هەموو شەوێ دێتە خەونم! هەموو شەوێ دوعا دەکەم کە «خوایە خەون بە گاچەرمووەوە نەبینم، خوایە، خەونی گاچەرموو نەبینم! » وەڵێ نەفرەتیی وا بە خۆی و بەو هەیکەلە ناقۆڵا و قۆچانەیەوە خێرا لە بەردەممدا قووت دەبێتەوە و دەست دەکاتە مااااماکردن!

خاڵە گیری خواردبوو، وەڵێ خۆشبەختانە وا دیار بوو کە فۆما فۆمیچ مەسەلەی گاچەرمووی لە بیر کردووە. هەڵبەتە هیچ کەسێك باوەڕی بەوە نەبوو کە دەکرێت فۆما فۆمیچ بابەتێکی ئەوەندە گرنگ لە بیربکات. هەمووان لەوە تۆقی بوون کە نەکا فۆما فۆمیچ جارێ مەسەلەی گاچەرمووی هەڵگرتبێت تا لە هەلومەرجێکی گونجاودا بیخاتەوە بەرباس. پاشان ئەوە ڕوون بووەوە کە فۆما فۆمیچ بەدەست مەسەلەیکی زۆر لە هی گاچەرمووەوە گیرۆدەیە. ئەو سەری بە بابەتگەلێکی دیکەوە قاڵ بوو، لەو کەللە بیرکار و چالاکەیدا نەخشەگەلێکی دیکە لە باری شێوەگرتندا بوون. جا هەر لەبەر ئەوە بوو کە فالالیش ئاهێکی بە بەردا هاتەوە. لەگەڵ فالالیدا، ئەوانی دیکەش ئاهێکیان بە بەردا هاتەوە. کوڕیژگەکە، هاتەوە سەر خۆی و بەرەبەرە ئەم مەسەلەیەی لە بیر کرد، تەنانەت گاچەرمووش تا دەهات، کەمتر و کەمتر دەردەکەوت، گەرچی جاروبار بە شێوەیەکی وەهماوی هەستی بە ئامادەگیی دەکرد. بە کورتییەکەی، هەموو شتێك بە خێر و خۆشی دوایی دەهات، هەڵبەتە بەو مەرجەی گەر لەم دونیایەدا هیچ شتێك بە ناوی سەمای کامارینییەوە بوونی نەبووبا.

پێویستە ئەوە وەبیر بهێنمەوە کە فالالی سەمایەکی زۆر باشی دەکرد، سەما یەکێك بوو لە توانا تایبەتییەکانی ئەو، بەهرەیەکی خۆڕسك و خوداپێداو بوو. بە کارامەیی و جۆشوخرۆشێکی بێکۆتاوە سەمای دەکرد، وەڵێ زیاتر هۆگری سەمای وەرزێری کامارینی بوو. هەڵبەتە لەبەر ئەوە نەبوو کە جووڵە ناڕێك و تەواو بێماناکانی ئەو وەرزێرە بێمێشکە سەرنجی ڕادەکێشا، نا، ئەو تەنیا لەبەر ئەوە حەزی لە سەمای کامارینی بوو کە چێژێکی زۆری لە بیستنی گۆرانیی کامارایینی وەردەگرت و وەختێکیش گوێی لەو گۆرانییە دەگرت، ئیدی نەیدەتوانی جڵەوی خۆی بکات و نەکەوێتە سەما. هەندێك کات، دەمەو ئێواران، دوو سێ نۆکەر و گالیسکەوان و باخەوانی ڤیلۆنژەن و تەنانەت چەند ئافرەتێکی کارەکەریش بە دزیی فۆما فۆمیچەوە، لە حەوشەی پشتەوەی ماڵەکەدا کۆدەبوونەوە و دەستیان دەکردە گۆرانیگوتن و سەماکردن و، جا دواجاریش سەرەی سەمای کامارینی دەهات. گروپەکە پێك هاتبوو لە دوو ژەنیاری بالالایکا، گیتار و ڤیلۆنژەنێك و میترۆشکای گالیسکەوان کە شتێکی لە گەوالڵ[1] لێدان دەزانی. لەم کاتانەدا فالالی دەکەوتە بارێکی سەرسووڕهێنەوە، سەرمەستانە دەکەوتە سەما و هۆشی لای خۆی نەدەما. ئامادەبووانیش بە پێکەنین و هاوارەوە هانیان دەدا. فالالیش قاو و قلی دەکرد و دەنگی قاقای دەهات و چەپڵەی لێ دەدا، بە چەشنێك سەمای دەکرد کە دەتگوت هێزێکی نامۆ و تەلیسمای جادووی لێ کردووە و ئەویش ناتوانێت بەرەنگای ببێتەوە. لە

---

١. گەوالڵ: دەفەی بچووکی زریزەدار.

هەمان کاتدا، هەوڵی دەدا پاژنەکانی بە هەماهەنگی لەگەڵ ئاوازی گۆرانییەکە بە زەویدا بکوتێت کە بەردەوام خێرا و خێراتر دەبوو. ئەم ساتانە، چێژێکی ڕاستەقینەیان بەو دەبەخشی، جا گەر فۆما فۆمیچ دەنگۆی سەمای کاماریی نەبیستباوە، هەموو شتێك بە باشی و خۆشی دەبڕایەوە. جا فۆما فۆمیچ دوای بیستنی ئەم بابەتە، وشك دەبوو و دەمودەست دەینارد بەدوای سەرهەنگدا و بەم جۆرە دەستی بە قسە کرد:

- سەرهەنگ، تەنیا دەمویست شتێ بزانم، ئایا ئەوە ڕاستە کە ئێوە سوێندتان خواردوە ئەم گەمژە چارەڕەشە بە فەوتان بدەن یان نا؟ گەر وایە ئەوە من هیچ ناڵێم، جا گەر واش نییە، ئەوە ئەو کات...

خاڵە تۆقیوانە دەیپرسی:

- بۆ مەگەر چی بووە؟ چی ڕووی داوە؟

- چی ڕووی داوە؟ ئایا ئێوە دەزانن کە فالالی سەمای کامارینیی کردووە؟

- دەی... دەی جا چییە؟

فۆما دەیقیڕاند:

- یانی چی جا چییە؟ ئەمە چ قسەیەکە ئێوە دەیکەن... ئێوە بە گەورەی ئەوان و بە جۆرێ لە جۆرەکان باوکیشیانن! یانی ئێوە هیچ تێگەیشتنێکی دروستتان سەبارەت بە گۆرانیی کامارانی نییە؟ ئایا دەزانن کە ئەم گۆرانییە وێنای وەرزێرێکی سەرخۆش و قێزەون دەکا کە خەریکی ئەنجامدانی پیسترین کردەوەی نائەخلاقییە؟ ئایا دەزانن کە ئەم ڕەعیەتە هەرزەیە تووشی کردەوەیەکی چەندە سووکایەتیئامێز بووە؟ ئەو بەرزترین بەهاکانی ژێر پێ خستوون،

یانی چۆن بیڵێم، بەو پووتە وەرزێرانەیەی خۆیەوە (کە هەر بە تەنیا خوویان بە خشەخشکردن بەسەر ڕووی زەویی مەیخانەوە گرتووە) پامال کردووە! ئێوە نازانن بەو وەڵامەتان سووکایەتیتان بە من کردووە؟ ئادەی بزانم، ئەسڵەن ئێوە لەوە تێدەگەن یان نا؟

– وەڵێ، فۆما... فۆما، ئاخر خۆ ئەمە تەنیا گۆرانییەکە...

– چۆن تەنیا گۆرانییەکە! باشە ئێوە تەریق نابنەوە کە بەم گۆرانییە ئاشنان... ئێوەیەك کە بەشێکن لە کۆمەڵگەیەکی ئاوڕوودار و باوکی منداڵێکی پاك و بێگوناحن، جا لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە، سەرهەنگێکن؟ ئەمە تەنیا گۆرانییەکە! وەڵێ من لەوە دڵنیام کە ئەم گۆرانییە بە بۆنەی ڕووداوێکی ڕاستەقینەوە گوتراوە! ئەمە تەنیا گۆرانییەکە! چ ئینسانێکی نەجیب هەیە دان بەوەدا بنێت کە بەم گۆرانییە ئاشنایە و سەردەمانێك گوێی لێ گرتووە و جا لە شەرمانیش سوور هەڵنەگەڕێ؟ کامە ئینسان، کامە؟

خاڵە بە شەرمەوە و لە سادەیی خۆیدا، دەهاتە وەڵام:

– ئێ، فۆما، مادام تۆ وەها پرسیاری دەکەی، دەی وا دیارە خۆشت ئەم گۆرانییەت بیستووە؟

فۆما، کە بە هیچ شێوەیەك چاوەڕێی وەها وەڵامێکی بکوت نەبوو و لە ڕقان دەکەوتە هەناسە بڕکێوە، بە تەکانێك لەسەر کورسییەکەی هەڵدەستایەوە و هاواری دەکرد:

– چی؟! من بیستوومە؟! من... من... یانی من!... ئێوە سووکایەتیتان پێ کردم!

پێویست بەوە ناکات کە باسی ڕادەی تووڕەبوونی فۆما فایج بکەم. سەرهەنگ لەبەر بێڕێزی و ئەو وەڵامە نەفۆمانەیە، لە بەرچاوی

«پاسەوانی ئەخلاقی مرۆڤایەتی»یەوە، سووك بوو و وەلا نرا. هەر لەو کاتەوە فۆما فۆمیچ سوێندی خوارد کە لە سەعاتی سفر و لە کاتی سەمای کامارینیدا هەڵبکوتێتە سەر فالالی. ئێواران، کە هەمووان وای بۆ دەچوون ئەو سەرقاڵی کاری خۆیەتی، بە دزییەوە دەهاتە نێو باخ و بەدەوری باخچەکاندا دەسووڕایەوە و لەپشت بنجی گوڵە شادانەکاندا خۆی حەشار دەدا. لەوێوە شوێنی سەماکردنەکە دیار بوو. فۆما ڕێك وەك ئەوەی کە ڕاوچییەك بێت و کەمینی لە باڵندەیەك گرتبێت، بەدیار فالالییەوە ئێشکی دەگرت و بە چێژەوە ئەوەی دەهێنایە بەرچاوی خۆی کە ئەگەر لەم کارەدا سەرکەوتوو بێت، ئەوا چ هەڵلایەك بە ئەندامانی ماڵەوە و بە تایبەتیش بە سەرهەنگ دەکات. دواجا کۆششی پشودرێژانەی ئەو بەری دا و ئەم سەماکەری کامارینیەی بەگیر هێنا! ئێستە دەکرێت لەوە تێبگەین کە بۆچی خاڵە، کاتێك بینیی فالالی دەگریێ و ڤیدۆپلیاسۆڤیش هاتنەژوورەوەی فۆما فۆمیچی ڕاگەیاند، دەستی بە ڕووتاندنەوەی قژی کرد. ئالەو هەلومەرجە نالەبارەدا بوو کە فۆما فۆمیچ، بەو کەسایەتییە تایبەتەی خۆیەوە و بە شێوەیەکی تەواو چاوەڕواننەکراو، لەبەر چاوی هەمووماندا وەدەرکەوت.

# وەرزی حەوتەم

## فۆما فۆمیچ

بە کونجکۆڵییەکی زۆرەوە لە بەڕێزیان ورد دەبوومەوە. گاڤریلا ناهەقی نەبوو کە ئەوی بە نیمچە مرۆڤێکی ناشیرین و ناقۆڵا ناودەبرد. فۆمای باڵا کوڵ، قژێکی ماشوبرنجی و لووتێکی دەنووکەداڵیی هەبوو بە ڕووخسارێکی پڕ لە چرچ و لۆچەوە کە بالووکەیەکی گەورەش بەسەر زنجییەوە[1] بوو. تەمەنی پەنجا ساڵێك دەبوو. لە بارێکدا کە چاوی لە زەوی بڕیبوو، لەسەرخۆ و بە هەنگاوی هەماهەنگەوە خۆی بە ژووردا کرد، وەڵێ بڕوابەخۆبوونێکی درۆزنانە بە ڕووخسار و قەدوباڵای دانائاسایانەیەوە دیار بوو. سەرم لەوە سووڕما کە دەبینم جلی ماڵەوەی لە بەرە، هەڵبەتە شێوازی دوورینەکەی بیانی بوو، وەڵێ دەی، بە هەرحاڵ، جلی ماڵەوە بوو، سەرەڕای ئەوەش، نالۆکی[2] لە پێ بوو. بۆینباخی نەبەستبوو و هەر لەبەر ئەوەش، یەخەی کراسەکەی، وەك یەخەی کراسی منداڵان هەڵگەڕابووەوە. ئەمە وای دەکرد سەروسیمای تەواو گاڵتەجاڕانە دەربکەوێت. بەرەو لای ئەسکەملەیەك چوو و ڕایکێشایە لای مێزەکە

١. زنج: چەناگە.

٢. نالۆك: پاپۆش، پێڵاوێکی سووکە و لە ماڵەوە لە پێ دەکرێت.

و بێ ئەوەی هیچ بڵێت، لەسەری دانیشت. کتوپڕ سەرلەبەری ئەو هەراوزەنا و قەرقەشەیە دامرکایەوە کە پێشتر بەرپا کرابوو. وەها بێدەنگییەك بالی بەسەر کەشەکەدا کێشابوو کە دەکرا لە هەوادا دەنگی بالی مێش ببیستیت. ژنەی جەراڵ وەکو بەرخێك هێور بوو. ئێستە ئیدی بە تەواوی هەست بەوە دەکرا کە ئەم ژنە چارەڕەش و گەمژەیە لەبەرانبەر فۆما فۆمیچدا چەندە مەراییکارە. بە چەشنێك چاوی لە فۆما فۆمیچ بڕیبوو کە دەتگوت هەرگیز لە بینینی ئەو گەوهەراتە تێر نابێت. پاکیزە پرەی پێلیتسینا بزەیەکی ساختەی بەسەر لێوەوە بوو و دەستەکانیی لێك دەساوین. پراسکۆڤیا ئیلینیچنای داماویش، بە ئاشکرا لە ترسان هەڵدەلەرزی. خاڵە خێرا کەوتە هەڵکەهەڵك.

– خوشکێ گیان، چای، چای بێنە! خوشکێ گیان بەس با تۆزێ شیرینتر بێ، فۆما فۆمیچ پاش خەوتن حەزی لە چای شیرینە. توخوا وا نییە فۆما، تۆ حەزت لە چای شیرین نییە؟

فۆما فۆمیچ بە سەروسەکوتێکی قەڵسەوە دەستێکی ڕاوەشاند و بە ویقار و دەربڕینێکی بڕگەبڕگە گوتی:

– جارێ خەمی چایم نییە! ئەوە ئێوەن دایمە لە خەمی شیرینبوونی هەر شتێکدان!

ئەم دەستەواژانە و هەروەها هاتنەژوورەوەی تەواو گاڵتەجاڕانە و ویقاری داناناسایانەی فۆمام هەتا بڵێی بەلاوە سەرنجڕاکێش بوو. زۆر پەرۆشی ئەوە بووم کە بزانم ئەم کاکی تازەچاوپێکەوتووە

ڕووقاییمە، تا چەندە پێی لێ ڕادەکێشێ و ڕێز و نەزاکەت پاشێل دەکات. خاڵە بە دەنگی بەرز گوتی:

– فۆما! با پێتان بناسێنم: ئەمە سێرگی ئالێکساندرۆڤیچی خوشکەزامە! هەر ئێستە بڕی داوە.

فۆما فۆمیچ، بێ ئەوەی سەرنجی من بدات، لە سەراپای خاڵە نز بووەوە و دوای بێدەنگییەکی مانادار، گوتی:

سەرهەنگ، سەرم لە ئێوە سووڕماوە! دایمە حەز دەکەن بپەڕنە نێو قسەکانمەوە. باس باسی مەسەلەیەکی تەواو جددییە و، جا ئەوسا ئێوەش هەر لە بنەڕەتەوە دیار نییە قسە... لە بارەی چییەوە دەکەن... فالالیتان دیوە؟

– بەڵێ، فۆما...

– ئەها، کەواتە ئەوتان دیوە! دەی، گەرچی ئەوتان دیووە، بەس من ناچارم جارێکی دی پیشانتانی بدەمەوە. با چێژ لە بینینی دەستپەروەدەی خۆتان ببەن... مەبەستم لایەنە ئەخلاقییەکەیە. وەرە ئێرە، دەبەنگ! وەرە ئێرە، هۆڵەندیی بەدتەشك! دە وەرە، وەرە پێش، وەرە! مەترسە!

فالالی بەدەم هەنسکدانەوە، لە بارێکدا کە دەمی کرابووەوە و هەوڵی دەدا بەر بە گریانەکەی بگرێت، بەرەو فۆما فۆمیچ ڕۆیشت. فۆما تەماشای دەکرد و چێژی لەو کارەی دەبرد. لەو کاتەدا، پاڵی بە ئەسکەملەیەکەوە دا و کەمێك بەرەو لای ئابنوسکین چەمییەوە کە لەتەنیشتی دانیشتبوو و جا گوتی:

– پاول سیمیۆنیچی ئازیز، من دەستەنقەسەت بە هۆڵەندیی بەدتەشك بانگم كرد. دەزانن، هەر بە ڕاستی، لەژێر هیچ هەلومەرجێكدا بە پێویستی نازانم كە بە ناوێكی شیاو بانگی بكەم. ئەوە ڕاستییە، ڕاستی. پیسایی، بە هەرچییەك داپۆشی، هەر پیساییە. بۆ دەبێ بە دەربڕینێكی شیاوتر بدوێم و خۆم و خەڵكی فریو بدەم؟ *ئەم جۆرە داب و نەریتە بێمانایە هەر بە تەنیا لە كەللەی پووچی نەجیبزادەیەكدا جێی دەبێتەوە*[1]. ئادەی بڵێن بزانم، من داوەرییەكە دەخەمە ئەستۆی ئێوە، ئایا ئێوە لەم چڕوچاوە گولەدا، چ جوانییەك بەدی دەكەن؟ مەبەستم شتێكی بەنرخ و زەریف و بەرزە، نەك ڕووخسارێكی سوور و سپی.

فۆما فۆمیچ زۆر لەسەرخۆ، بڕگەبڕگە، خوێنساردانە و بە ویقارەوە قسەی دەكرد. ئابنۆسكین بە بێباكییەكی ڕووقاییمانەوە هاتە وەڵام:

– چ جوانییەكی تێدا بەدی دەكەین؟ بە بۆچوونی من، پارچە گۆشتێكی سووركراوە و بەلەزەتی گا، هەر ئەوەندە...

فۆما بێ بەكارهێنانی جێناوی كەسیی سەربەخۆی من، بە ویقارەوە درێژەی پێ دا:

---

١. ئەم ڕستەیە ڕاستەوخۆ ئاماژە بە بەرهەمێكی گۆگۆڵ «بژاردەیەك لە نامە بۆ دۆستان» دەدات. لە سێیەمین نامە، كە لە بنەڕەتدا پەیوەستە بە ڕۆمانی «حەشاماتی مردوو»ەوە، هاتووە:

بیرێكی هێندە گەمژانە، تەنیا دەشێ لە كەللەی پووتی نەجیبزادەیەكدا شێوە بگرێت! «و. ف »

– ئەمڕۆ چوومە بەر ئاوێنە و تەماشام کرد، وام هاتە بەرچاو کە هەر بە ڕاستی سەروسیمام جوان نییە، وەلێ نائاگایانە بەو ئەنجامە گەیشتم کە... من بە شانوباڵی خۆمدا هەڵنادەم، دەنا بێگومان لەم چاوە خۆڵەمێشییانەدا شتێك هەر هەیە کە بەندە لە کەسێکی وەك فالالی جیا دەکاتەوە. لەم چاوانەدا هزر هەیە، ژیان هەیە، ژیری هەیە! بە گشتی مەبەستم ئەو چینەیە کە خۆم سەر بەوم. ئێستە ئێوە بۆچوونی خۆتان بڵێن: ئایا ڕێی تێدەچێ کە ئەم پارچە گۆشتە برژاوە تۆسقاڵێك ڕۆحی تێدابێ؟ نەخێر، پاول سیمیۆنیچ، ئەم جۆرە مرۆڤانە، کە هەر بە تەواوی بێفکر و ئامانجن و هەر دەزانن گۆشتی گا بخۆن، بڕوانە ڕەنگوڕوویان کە چۆن دایمە بە شێوەیەکی هێندە ناحەز و گرژ و دەبەنگانە سوور و تەڕوتازەیە! حەز دەکەن ئاستی تێگەیشتنی بزانن؟ هێی، تۆ، وەرە پێش تا چێژ لە ئاستی تێگەیشتنت وەرگرین! بۆ ئاوا دەمت دادڕیوە؟ نەکا بەتەما بی نەهەنگێك بە ساقی حەپەلووش کەی؟ ئادەی بزانم، یانی گوایە تۆ قۆزی، ها؟ وەڵام بدەوە: تۆ قۆزی؟

فالالی بەدەم هەنسکدانەوە هاتە وەڵام:

– بەع... لێ، قۆ... زم!

ئابنوسکین لەبەر پێکەنین پسابوو. من ئیدی لە تاو ڕق هەڵدەلەرزیم. فۆما بە بارێکی سەرکەوتووانەوە ڕووی کردە ئابنۆسکین و گوتی:

– خۆ بیستتان؟ پەلەتان نەبێ، ئێستە شتی خۆشتریش دەبیستن! من هاتووم تاقیی بکەمەوە. خۆ دەبینن پاول سیمیۆنیچ، کەسانێ

هەن کە دەیانەوێ ئەم گەمژە چارەڕەشە بە لاڕێدا بەرن و بیفەوتێنن. بۆی هەیە لەم لێپرسینەوەیەدا توونـد بـووبم و هەڵە بکەم، وەلێ من تەنیا لە مرۆڤدۆستییەوە ئەم قسانە دەکەم. ئەو، ئەمڕۆ خەریکی نەگریسترن سەمای جیهان بوو، کەچی لێرەش هیچ کەس خەمی ئەم مەسەلەیەی نەبوو. ئێستە خۆتان باش گوێ بگرن. وەڵام بدەوە: تۆ ئێستە خەریکی چـی بـووی؟ وەڵام بـدەوە، خێـرا وەڵام بـدەوە... دەبیستی؟

فالالی کە لە پرمەی گریانی دابوو، گوتی:

– سە... مام دەکرد...

– چۆن سەمات دەکرد، ها؟ چ سەمایەکت دەکرد؟ یەڵا بڵێ!

– کامارینی...

– کامارینی! باشە ئێستە ئەم کامارینیە کێیە؟ ئەسڵەن ئەم کامارینیە چییە؟ بۆ وا دەزانی من سەرم لە وەڵامەکەت دەردەچێ؟ ڕوونی بکەوە با ئێمەش حاڵی بین: ئەم کامارینیەی تۆ کێیە؟

– وەر... زێر...

– وەرزێـر! تـەنیا وەرزێرێکـە؟ پـێم سـەیرە! کەواتـە بـێ گومـان وەرزێرێکی بێوێنەیە! دەبێ وەرزێرێکـی نـاودار بووبێ کە گۆرانییان بەسەردا گوتووە و سەمای تایبەتییان بۆ داهێناوە؟ خێرا کە، وەڵام بدەوە!

فۆما چێژی لە ئازاردانی ئەوانی دی وەردەگرت. وەك چۆن گوربەیەك یاری بە مشك دەكات، بە هەمان شێوە گەمەی بە قووربانییەكەی خۆی دەكرد، وەلێ فالالی هەروا مات و مەلوول دەگریا و لە مانای پرسیارەكەی ئەو تێنەدەگەیشت. فۆماش هەروا پێداگریی دەكرد:

– وەڵام بدەوە! لەگەڵ تۆمە، ئەم وەرزێرە كێیە؟ بڵێ بزانم!... ئاخر كابرا سێرفە[1]، هی دەوڵەتە، ئازادە، بەرئەركە یان ئابووری؟

– ئا... بوو.. ری...

– ئەها، یانی ئابوورییە! خۆ دەبیستن، پاول سیمیۆنیچ؟ حەقیقەتێكی تازەی مێژوویی: وەرزێری كامارایینی ئابوورییە. ئممم!... باشە ئەم وەرزێرە ئابوورییە چیی كردووە؟ چ كارێكی جوامێرانەی ئەنجام داوە كە ئاوا پێیدا هەڵدەدەن و... سەما و هەڵپەڕكێی بۆ دەكەن؟

پرسیارەكە ئاڵۆز بوو و جا لەبەر ئەوەش كە پەیوەندیی بە فالالییەوە هەبوو، مەترسیدار بوو. ئابنۆسكین بە شێوەیەكی تایبەت لە دایكیی ڕوانی كە خەریك بوو بەسەر قەنەفەكەوە پێچی دەدایە خۆی و جا ویستی شتێك بڵێت:

---

١. سێرف، بەو ڕەعیەت و وەرزێرانە دەگوترا كە بە بەشێك لە دارایی گەورەكەیان دادەنران، ڕەعیەتانی دەوڵەتی یان حكوومی، سەر بە دەوڵەت یان كۆشكی سەڵتەنەتی بوون، ڕەعیەتە ئابوورییەكان بەشێك بوون لە ماڵوموڵكی پەرستگە، ڕەعیەتی بەرئەرك یان بەرئەركی كاتی، بەو دەستە جووتیارانە دەگوترا كە هێشتا لەبەرانبەر ئەو زەویوزارەی بەردەستیان، لەگەڵ خاوەنزەویدا حسێبیان پاك نەكردبووەوە. «و. ف»

- ئێستە... ئێوە... گەرچی...

چارە نەبوو. لەوێ هەوەسبازییەکانی فۆما حسێبی یاسایان بۆ دەکرا. من بە گوێی خاڵەمدا، کە ئیدی تاسابوو و نەیدەزانی چی بکات، چپاند:

- ببوورن خاڵە گیان، گەر ئێستە بەر بەم کابرا گەمژەیە نەگرن، ئەو... خۆتان دەزانن کە ئامانجی چییە؟ دواجار فالالی درۆیەکی لە دەم دەردەچێ، جا دڵنیام...

خاڵە چووە نێو ئاژاوەکەوە:

- فۆما، لەگەڵ ئەوەشدا، باشتر وایە تۆ... فۆمای ئازیز، خوشکەزاکەمت پێ دەناسێنم، ئەم گەنجەی کە دەیبینی... بەشی زەویناسیی خوێندووە...

- سەرهەنگ تکا دەکەم ئا بەم بەشی زەویناسییەتان قسەم پێ مەبڕن. ئەوەندەی من ئاگادار بم، ئێوە سەر لە هیچی دەرناکەن و ڕەنگە «ئەوانی دیکەش» شتێکی وای لێ نەزانن. خۆ منداڵ نیم. ئەو دەبێ لە وەڵاممدا بڵێ کە وەرزێری کامارینی لە جێی ئەرککێشان بۆ خێزانەکەی، خواردوویەتییەوە و لە مەیخانەدا کەڵپۆسەکەی گۆڕیوەتەوە بە مەشرووب و سەرخۆشانە خۆی بە شەقامدا کردووە. بە پێی باسەکان، تەواوی ناوەڕۆکی ئەم گۆرانییە هەر ئەمەیە و بازاری مەیخۆری گەرم دەکا. خەمتان نەبێ، ئەو ئیدی دەزانێ لە وەڵامدا چی بڵێ. یەڵا وەڵام بدەوە: ئەم وەرزێرە چیی کرد؟ هەر ئێستە گوتم، ڕاستەوخۆ وەڵامەکەم لە دەم نای. ڕێک دەمەوێ لە

زمانی خۆتەوە ببیستم کە ئەو چیی کردووە و بۆ ئەوەندە ناسراوە و ناوبانگێکی هێندە نەمری هەیە کە تەنانەت شاعیران هۆنراوەی بەسەردا دەڵێن؟ ها؟

فالالیی داماو، ماتەم دایگرتبوو و سەیری ئەملا و ئەولای دەکرد و جا لەبەر ئەوەی نەیدەزانی چی بکات، وەك کەوەماسی کە تازە لە ئاویان بریبێت، دەمی دەکردەوە و دای دەخست. دواجار لەوپەڕی بێهواییدا و بە دەنگێکی منگنەوە گوتی:

– شەرم دەکەم بی... لێم!

فۆما سەرکەوتووانە گوتی:

– ئەها! شەرم دەکا بیڵێ! سەرهەنگ، خۆ منیش چاوەڕێی وەها وەڵامێ بووم! شەرم لە گوتنی دەکا، وەڵێ شەرم لە ئەنجامدانی ناکا! ئەوەش تۆوی ئەم خووڕەوشتەی کە ئێوە چاندووتانە و وا ئێستەش چەکەرەی کردووە، فەرموون... ئاوی بدەن. نەخێر، قسەکردن بێسوودە! فالالی، هەر ئێستە بەرەو مووبەق بەڕێ دەکەوی و خۆت پێوار دەکەی. جارێ لەبەر ڕێزی ئامادەبووان هەقم نییە بەسەرتەوە، وەڵێ هەر ئەمڕۆ... بە توونددی سزا دەدرێی. گەر واش نەبوو و دیسان لەبەر تۆ قسەی منیان شکاند، ئەوسا تۆ لێرە بمێنەوە و بە سەمای کامارینی گەورەکانت سەرگەرم بکە و منیش، هەر ئەمڕۆ ئەم ماڵە جێ دەهێڵم! تەواو و بڕایەوە! ئەمە قسەی کۆتایی منە. دە ئێستە بڕۆ!

ئابۆسکین لەژێر لێو گوتی:

- لام وایە ئێوەش زۆر سەختگیرن...

خاڵە بۆ پاڵپشتیکردنی قسەکەی هاواری کرد:

- ڕاستە، ڕاستە!

وەلێ کتوپڕ قسەکەی بڕی و بێدەنگ بوو. فۆما مۆڕەیەکی کرد و بە لاچاو لێی ڕوانی و جا لەسەری ڕۆیشت:

- پاول سیمیۆنیچ، لەم دۆخەدا، من سەرم لە ئەدیب و شاعیر و زانستمەند و بیرمەندانی ئەمڕۆ سووڕماوە و نازانم خەریکی چین؟ بۆ هیچ هەڵوێستێکیان لەسەر ئەو هۆنراوە و گۆرانیانە نییە کە خەڵکی ڕووسیا دەیانڵێن و بەدەم گوێلێگرتنیانەوە هەڵدەپەڕن؟ کەواتە ئەم هەموو پووشکین و لێرمانتۆف و بارۆزدنایانە تا ئێستە خەریکی چی بوون؟ هەر بە ڕاستی حەپەساوم! خەڵکی خەریکی سەمای کامارینین، سەمایەك کە ئامانجەکەی پیرۆزکردنی مەیخواردنەوەیە، جا شاعیرانیش دێن و باسی عەشق و عاشقیم بۆ دەکەن![1] باشە بۆ

---

١. ئیڤان پیترۆڤیچ بارۆزدنا (١٨٠٣-١٨٨٨): شاعیرێکی ئاستناوەندی ڕووسە. پەلاماری فۆما بۆ سەر شیعری ڕووسی، پێشزەمینەیەکی پڕمەرای دیاری هەیە. لە ساڵی ١٨٥٢ لە پترسبورگدا، بەرهەمۆکی *گوڵی عەشق* بڵاو بووەوە(بەرهەمۆك: کۆلیکسیۆن، ژمارەیەك شتی سەر بە یەك، کە بۆ لێکۆڵینەوە، سەرگەرمی یان ڕابواندن کۆ کراونەتەوە). ئەم بەرهەمۆکە ئەلبوومێکی عەوامپەسەند بوو. پێك هاتبوو لە باشترین گوتارگەلێکی تایبەت بە شیعری ڕووس و پۆرتێرگەل ژۆکۆڤسکی، بینی دیکتاف و دە تابلۆی ڕەسمی گ. پیداناف. لەم بەرهەمۆکەدا، شیعری ژۆکۆڤسکی و پووشکین و شاعیرانێکی ئاستنزمتری وەك کۆرینیف، ڤلادیمیراف و ئەم ئیڤان بارۆزدنایە بڵاو کرابووەوە. بە لای نۆپیسکینیشەوە، کە یەکێك بووە لە خوێنەرانی گوڵی عەشق، پووشکین و لێرمانتۆف لەگەڵ شاعیرانێکی وەك بارۆنازدنا، کە بەرهەمەکانیان زیاتر بۆ سەرگەرمی و تایبەت بە عەوامانی ئەو سەردەمە بوون، لە یەك ئاستی هونەریدا بوون. «و. ف»

واز لە گوڵی عیشق ناهێنن و شیعری ئەخلاقیانە بۆ خەڵکی نانووسن؟[1] ئەمە گرفتێکی کۆمەڵایەتییە! کێشە ئەوە نییە ئەوان وێنای وەرزێری بکەن، وەلێ لانیکەم با وەرزێرێکی ئاوڕوومەند هەڵبژێرن، یان باشتر بیڵێم، با وەسفی جوتیارێکی زەحمەتکێش بکەن، نەك وەرزێرێکی سەرخۆش. دە با وێنای لادێییەکی ژیر بکەن بەو هەموو سادەییەی خۆیەوە، جا با ئەو لادێییە کابرایەکی پوزەوانەلەپێش بێ، خۆ من کێشەم نییە، وەلێ بەو مەرجەی خاوەنی هێژاییەکی ئەخلاقیی ئەوتۆ بێ کە بکرێ بوێرانە بڵێی، تەنانەت کەسایەتییەکی بەرجەستەی وەك ئەسکەندەری مەکەدۆنیش ببەزێنێ. *من سەرزەویی ڕووسیا دەناسم و سەرزەویی ڕووسیاش من دەناسێت*[2]: هەر لەبەر ئەوەشە وەها قسەیەك دەکەم. دە با باسی

---

١. لە پەلاماردانە یەك لەدوای یەکەکانی فۆمادا بۆ سەر گۆرانیی کامارانی وەك گۆرانییەکی سووك و نائەخلاقی، بە ڕوونی دیارە کە لاساییکردنەوەیەکی گاڵتەجاڕانەی ڕەخنەگرێکی مۆسیقییە بە ناوی راسیسلاف (ناوی خوازراوی ف. تۆلستۆی)یە. ئەو لە یەکێك لە گوتارەکانی خۆیدا، کە لە گۆڤاری هەنگی باکوردا بڵاو بووەتەوە، وا دەڵێ:

ئاخۆ ئاین و ئۆپێنی وەرزێکی پەڕپووتی دەبەنگ ج چێژێك بە مرۆڤ دەبەخشێت؟ بێگومان مەیخانەیەك بە هەموو بەسەرهات و بەزمەکانییەوە دەشێت جێگەی سەرنج بێت، وەلێ ئایا ئەوە ڕاستە کە بخرێتە نێو بەرهەمێکی جوانی هوونەرییەوە؟...

هەر شتێك کە بۆ باسکردن گونجاوە، هەمیشە ناکرێت بۆ خستنە سەر بەرهەمێکی نمایيشیش، کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ چاکسازی و پاکژکردنەوەی ئەخلاق و بەرزکردنەوەی ڕۆحدا هەیە، گونجاو بێت. «و. ف»

٢. دەکرێت لە بنەڕەتدا نیکۆلای پالیۆڤی (١٧٩٦-١٨٤٦) —نووسەر، ڕەخنەگر و وەرگێڕ— بە خاوەنی ئەم گوتەیە بزانین. ئەو لە پێشەکیی ڕۆمانەکەیدا، وەك سوێندێك بەسەر مەزارگەی پیرۆز (١٨٣٢)ـەوە، دەنووسێت:

بێ گومان هەر کەسێك هەموو ئەوەی خوێندبێتەوە کە تا ئەمڕۆ نووسیوومە، دانی پێدا دەنێت کە تاقەتی نیشتمانپەروەریی زیادەڕۆیانەم نییە، وێڕای ئەوەش، من سەرزەویی

وەرزێرێکی مووچەرمووی خێزاندار بکا کە لە کووخێکی هەژارانەدا دەژی و سەرەڕای برسییەتیش، کەچی هەر ڕازییە و ناکڕووزێتەوە و سوپاسی خوا دەکا و چاویشی لە زێڕ و زیوی دەوڵەمەندان نییە[1]. لێگەڕێ دواجار کابرای دەوڵەمەند خۆی دڵی نەرم ببێ و یارمەتیی بدا، تەنانەت لێگەڕێ بەم ڕووداوە، هێژایی کابرای وەرزێر لەگەڵ هێژایی گەورەکەیدا، کە ڕەنگە کەسێکی پایەبەرزیش بێ، با یەك بگرن. جا دواجار کابرای لادێیی و ئەو کەسە پلەبەرزە، کە لە ڕووی پێگەی کۆمەڵایەتییەوە مەودایەکی زۆریان لەنێواندایە، لە هێژاییدا بگەنە یەکیەتییەك... ئەمە بیرۆکەیەکی ئێجگار بەرزە! کەچی ئێمە لەبەرانبەر ئەوەدا چی دەبینین؟ لە لایەکەوە شیعرگەلێکی عاشقانە و لە لایەکی دیکەشەوە وەرزێرێکی سەرخۆش کە بە حاڵێکی شڕەوە بە شەقامدا دەسووڕێتەوە! باشە ئەمە کوێی شاعیرانەیە؟ پیاو دڵ بە چی خۆش کا؟ ئەی کوا هزر؟ کوا ناسکی؟ ئەی ئەخلاق چیی لێ هات؟ هەر بە ڕاستی حەپەساوم!

کتوپڕ یڕژێڤیکین بە خرۆشانەوە گوتی:

---

ڕووسیا دەناسم و خۆشم دەوێت، تەنانەت لەوەش زیاتر، مۆڵەت بدەن ئەوەشی بخەمە سەر کە سەرزەویی ڕووسیاش من دەناسێت و خۆشی دەوێم.

ئەم دەربڕینی «سەرزەویی ڕووسیا من دەناسێت و من سەرزەویی ڕووسیا دەناسم...» زۆر باو بووە. بلینسکی لەو ناکۆکی و ململانێیانەی کە لەنێو بڵاوکراوەکاندا لەگەڵ پالیۆڤی هەیبووە، چەندان و چەندان جار ئەمەی گوتووەتەوە. «و. ف»

١. بە بۆچوونی ڤلادیمێر تۆنیمانۆف (١٩٣٧-٢٠٠٦) -دۆستۆیڤسکیناس، پرۆفیسۆری زمانەوانی و لە بەرجەستەترین ئەندامانی یانەی پووشکین- دەکرێت ئەمە دەربڕینێکی تەنزئامێز بێت لە بارەی شرۆڤەیەکی ڕەخنەییانەی پالیۆڤی بۆ *حەشاماتی مردووی* نیکۆلای گۆگۆڵ، کە چیرنی شێفسکی لە کتێبی نامەکانی سەردەمی گۆگۆڵدا ئاماژەی پێ کردووە. دۆستۆیڤسکی باش بەم کتێبە ئاشنا بوو. «و. ف»

- فۆما فۆمیچ، دەبێ لەبەر خاتری ئەو دەربڕینانە سەد ڕۆبڵتان بدەمێ!

جا پاشان لەسەرخۆ بە گوێمیدا چپاند:

- دڵنیا بە یەك قرووشیشی نادەمێ. مەرایی بکە، تۆش تۆزێ مەرایی بکە!

ئابنۆسکین لەژێر لێوەوە گوتی:

- بەڵێ، ئاخر... ئێوە زۆر باشتان شی کردەوە.

خاڵە کە بە سەرنجێکی زۆرەوە گوێی بۆ قسەکانی فۆما شل کردبوو، دڵخۆشانە سەیرێکی منی کرد و گوتی:

- ڕاستە، تەواو ڕاستە!

پاشان، لە بارێکدا کە دەستەکانیی هەڵدەگلۆفین، ورتاندی:

- خوایە گیان، وای لەو باسە!

جا بە چەشنێك خرۆشابوو کە ئەمەشی بۆ زیاد کرد:

- فۆما فۆمیچ، خوشکەزاکەمت پێ دەناسێنم. ئەویش پێشتر سەروکاریی لەگەڵ ئەدەبیاتدا هەبووە.

فۆما فۆمیچ هەروا وەك جارانی پێشوو، هیچ گرنگییەکی بە قسەکانی نەدەدا. زۆر جددییانە بە گوێی خاڵەمدا چپاند:

- بۆ خاتری خوا، لێتان دەپاڕێمەوە ئەوەندەم مەناسێنن!

کتوپڕ فۆما فۆمیچ ڕووی کردە میزینچیکۆڤ، لە بارێکدا کە واق و وڕ لێی دەڕوانی، پرسیاری لێ کرد:

- ئیڤان ئیڤانۆڤیچ، گوفتوگۆکانی ئێمەتان بیستن و ئێستەش بۆچوونتان چییە؟

میزینچیکۆڤ بە سەروسیمایەکەوە کە وەك بڵێیت هەر ئێستە لە خەویان هەستاندبێت، سەرسامانە پرسیی:

– من؟ ئێوە لەگەڵ منتان بوو؟

– بەڵێ، ئێوە، قوربان. لە ئێوە دەپرسم، چونکە من ڕێز بۆ بۆچوونی ژێرە ڕاستەقینەکان دادەنێم، نەك بۆ ئەو خۆبەژێرزانە جێگومانانەی کە تەنیا لەبەر ئەوە ژێر دەردەکەون کە دایمە لەلایەن ئەوانی دیکەوە وەك ژێر و زانستمەند دەناسێنرێن. هەندێ جاریش تەنیا بۆ ئاژاوەنانەوە داوەتیان دەکەن یان بۆ شتانێکی لەو بابەتە.

مەبەستی من بوو. فۆما فۆمیچ، بێ گومان، کە تا ئەو کاتە بە هیچ شێوەیەك لای لە من نەدەکردەوە، تەنیا لەبەر ئەوە ئەم باسە ئەدەبییانەی کردبوونەوە تا هەر لە ئەوەڵین هەنگاودا، ئەم ژێر و زانستمەندە پترسبورگیە لەنێو ببات و بپلیشێنێتەوە. ئیدی هیچ گومانێکم لەوەدا نەبوو. میزینچیکۆڤ بە بێتاقەتی و بێزارییەوە هاتە وەڵام:

– گەر بۆچوونی منتان دەوێ، دەبێ بڵێم... بۆچوونەکەی ئێوەم بە دڵە و هاوڕاتانم.

فۆما گوتی:

– ئێوەش بێتامتان کردووە ئەوەندەی هاوڕام بن!

جا دوای ئێستێکی کورت، دووبارە ڕووی لە ئابنۆسکین کردەوە و لەسەری ڕۆیشت:

- پاول سیمیۆنیچ، ڕاستگۆیانە پێتان دەڵێم، گەر من ڕێز بۆ کارامزینی نەمر دادەنێم، نە لەبەر خاتری مێژووە و نە لەبەر *مارفا پاسادنیتسا* و ڕووسیای کۆن و نوێیە، بەڵکە بەو بۆنەیەوەیە کە ئەو *فرۆول نووسیوە*[1]، هەر بە ڕاستی حەماسەیەکی بێوێنەیە! ئەم

---

١. بەرهەمێکی وەك *مێژووی حکومەتی ڕووسیا* لە یازدە بەرگدا (١٨١٦-١٨٢٤)، کە بەرگی دوازدەیەمی، بە ناتەواوی مابووەوە و لە ساڵی ١٨٢٩دا، دوای مردنی کارامزین، بڵاو کرایەوە. داستانی درێژی *مارفا پاسادنیتسا*، گرتنی نۆوگاراد (١٨٠٣) و یادداشت لەسەر ڕووسیای نۆی و کۆن و پەیوەندیی سیاسی و نیشتمانی (١٨١١، کە بەشێکی لە ١٨٣٧ و ١٨٤٢ و هەمووی لە ١٨٧٠دا بڵاو کرایەوە)، هەمووی نووسینی کارامزینن. لە ساڵی ١٧٩١دا، داستانی فرۆول سیلینی خێرخوازی بۆ یەکەمین جار لە گۆڤاری مۆسکۆدا بڵاو کردەوە کە ئەم داستانە لە ساڵی ١٨٤٨دا، لە پێنجەمین چاپی نووسینەکانی کارامزیندا چاپ کرایەوە. ئەم داستانە باس لە لادێییەکی مەینەتیی سەر بە پارێزگەی سیمبیرسك دەکات کە لە قاتوقڕیدا، نانی خۆی لەنێو جووتیاراندا بەش دەکات و یارمەتیی داماوان دەدات و دوو پاکیزەی بە ناوی گەورەکەیەوە کڕین و بە تکا و لالە مۆڵەتی ئازادییانی وەرگرت... جا پاشان بە پاشتێلانەیەکی شیاوەوە بە مێردی دان و... فرۆول سیلینش وەك پاڵەوانە ئەرێنییەکانی دیکەی کارامزین، کەسایەتییەکی هەستیار و بەسۆزی هەیە. فرۆول لەگەڵ هەمان ئەو جووتیارانەدا کە دوای یارمەتییەکانی ئەو فرمێسکیان بە چاواندا دەهاتە خوارێ... ئەویش لە پرمەی گریانی دەدا و چاوی لە ئاسمان دەبڕی...

لێرەدا تاریفدانی فرۆول لە لایەن فۆماوە، مانایەکی خوازراوی هەیە. دۆستۆیڤسکی دیدێکی ڕەخنەگرانەی لە بارەی دیمەنسازیی خەڵکانی نێو بەرهەمەکانی کارامزینەوە هەیە و کارامزین بە یەکێك لە پێشەنگانی سلاڤییە خەڵکدۆستە هەستیار و خەیاڵپلاوەکان دادەنێت کە لە ساڵانی (١٨٥٠-١٨٦٠)دا دەرکەوتن. ئەو لە وتاری *کتێبخوێنی و ئاوەزی ئەدەبی*دا (١٨٦١)، ئاماژە بەوە دەکات کە نابێت بە پێی داستانەکانی کارامزین و جووتیارە سەرامیکییەکانی داوەری لە بارەی بارودۆخی خەڵکییەوە بکرێت. دۆستۆیڤسکی لێرانەدا بە شێوەیەکی تانەئامێز ئاماژە بە فرۆول سیلی دەکات وەك وێنایەکی بەلاڕێدابراو لە بارەی جووتیارانی ڕووسییەوە. «و. ف»

بەرهەمە لە هەناوی خەڵکەوە هەڵقوڵاوە و بۆ تاهەتا بە زیندوویی دەمێنێتەوە! حەماسەیەکی ئێجگار ناوازەیە!

خاڵە شاگەشکە بووبوو و بۆ پاڵپشتیی قسەکەی گوتی:

– ڕاستە، تەواو ڕاستە! ئای لەو سەردەمە شکۆمەندە! فرۆول سیلین مرۆڤێکی چاکەکار بوو! بیرم دێ کە ئەم بەرهەمەم دەخوێندەوە، فرۆول دوو پاکیزەی کڕین و ئازادی کردن، پاشان چاوی بڕییە ئاسمان و کەوتە گریان. ئای لەو کەسایەتییە بێهاوتایە!

ئای خاڵەی ماو! بە هیچ شێوەیەك نەیدەتوانی خۆی بگرێت و تێکەڵی ئەو باسانە نەبێت. فۆما بزەیەکی ڕقاویی هاتێ، بەس هیچی نەگوت. ئامفیسا پیترۆڤنا بە پارێزەوە هاتە نێو باسەکە:

– هەڵبەتە لەم ڕۆژانەشدا شتانی سەرنجڕاکێش دەنووسرێن، وەك *نهێنییەکانی برۆکسل*[1]

فۆما لە بارێکدا وەك ئەوەی بەداخ بێت، گوتی:

---

١. ئەم ڕۆمانە، یەکێکە لەو بەرهەمانەی کە لاساییکردنەوە یان بە جۆرێك لە جۆرەکان وەرگێڕانی ڕۆمانی *نهێنییەکانی پاریس*ـە، کە بەرهەمی یۆژن سۆ (نووسەری سەدەی نۆزدەی فەڕەنسا)یە و بێ ناوی نووسەر، لە ساڵی ١٨٤٧ لە پترسبورگدا چاپ کرا. هەڵسەنگێنەری *کتێبخانەیەك بۆ خوێندنەوە* ئاماژەی بەوە کرد کە ئەم ڕۆمانە، یەکێکە لە خراپترین ئەو ڕۆمانانەی کە بە لاساییکردنەوەی نهێنییەکانی پاریس نووسراوە، ڕۆژنامەیەکی ئەدەبیش لە ساڵی (١٨٤٧)دا کە بەردەوام ئاماژەی بە ڕۆمانگەلێکی بێژماری ڕوونووسکراو لە ڕۆمانەکەی یۆژن سۆ دەکرد، نووسیبووی:

بێگومان هەموویان لە ئاستێکی زۆر نزمی ڕۆمانە ئەسڵییەکەدان... هەروەها بە شێوەیەکی بنجبڕانەش، «نهێنییەکانی برۆکسل» خراپترینیانە. «و. ف»

– مـن وای بـۆ ناچـم، قوربـان. لـەم دواییانـەدا خـەریکی خوێندنـەوەی هۆنراوەیـەك بـووم... دەی، باشـە، ئـەی دوای ئـەوە! ئەوەی ڕاستی بێ لەنێو ئەم تازانەدا زیاتر کەیفم بەو یارۆیە دێ کە بە ناوی خوازراوی ڕونۆسەوە دەنووسێت... زمانێکی پاراوی هەیە.

لە ناکاو ئامفیسا پیترۆڤنا هاواری کرد:

– ڕونـۆس! ئـەوەی کـە نامـە دەنێـرێ بـۆ گۆڤـار؟[1] وای کـە چـەندە سەرنجڕاکێشە! چ یارییەك بە وشە دەکا!

– کتومت یاری بە وشە دەکا. دەکرێ بڵێین یاری بە قەڵەمەکەی دەکا. هەتا بڵێی زمانی سادەیە!

ئابنۆسکین بێباکانە گوتی:

– وایە، بەس ئەو کابرایە زۆر کۆنەپەرستە.

– بەڵێ، کۆنەپەرستە... لاریم نییە، وەلێ کۆنەپەرستێکی دڵگیر و خۆشەویسـتە! هەڵبەتـە هیچـیەك لـە بۆچـوونەکانی ئـەو لەبەرانبـەر ڕەخنەی بنەڕەتیدا خۆیان ڕاناگرن، وەلێ سـادەییەکەی مرۆڤ حـەیران دەکـا! ڕاسـتە خـەریکی وڕێنەکردنـە، وەلێ وڕێنەچـییەکی دڵگـیر و خوشەویستە! بۆ نموونە بیرتانە لـە گۆڤـارە ئەدەبییەکەیـدا ڕایگەیانـد کە خاوەنی ماڵ و موڵکی تایبەتییە؟

خاڵە خۆی بەنێو گفتوگۆکەدا کرد و گوتی:

---

[1] . لێرانەدا ئاماژەیەکی تانەئامێزە لە نامەکانی بەشداربوونێکی دەرەشاریی گۆڤاری سەردەم لە بارەی ڕۆژنامەوانیی ڕووسییەوە. «و. ف»

– ماڵ و موڵك؟ هەر زۆریش باشە! ئەی لە چ شارێکە؟

فۆما ئێستێکی کرد، واقووڕ لە خاڵە ڕاما و پاشان بە هەمان شێواز لەسەری ڕۆیشت:

– ئاخر، بۆ خاتری خوا پێم بڵێن: بە من و خوێنەران چی کە ئەو ماڵ و مووڵکی هەیە؟ ماڵ و مووڵکی هەیە... دەی خێری لێ ببینێ! وەڵێ ئای کە ئەو بابەتە بە چ تام و چێژێکەوە باس کراوە! کابرا خودای لادقردییە، جەفەنگی لێ دەپڕژێ، هەر قسەی نەستەقەو لێی دەبارێ! لە بنەڕەتدا ئەو خودی تاموچێژە! بەڵێ، دەبێ ئاوا بنووسی! من گەر ئامادە بام بۆ گۆڤارەکان بنووسم، لام وایە هەر ئاوها دەمنووسی...

یژێڤیکین بە ڕێزەوە گوتی:

– ڕەنگە باشتریش، قوربان.

خاڵەش وەك پاڵپشتیکردن گوتی:

– تەنانەت ئەم شێوازەی شتێکی مۆسیقیشی تێدایە!

دواجار فۆما فۆمیچ، لەوە زیاتر نەیتوانی دان بە خۆیدا بگرێت و گوتی:

– سەرهەنگ، دەکرێ تکاتان لێ بکەم... هەڵبەتە بە ڕێزەوە... کە خۆتان هەڵنەقوورتێنن و دەرفەت بدەن باسەکەمان بە ئاسوودەیی تەواو کەین؟ ئێوە ناتوانن قسە لەسەر ئەم باسە بکەن و بۆچوونی خۆتانی لەسەر بڵێن، نا، ناتوانن! کەواتە گفتوگۆ نەدەبیە

دڵخوازەکـەمان لـێ مەشـێوێنن. خـەریکی کاروبـاری ماڵـەوە بـن و چایەکەتان بخۆنـەوە، وەڵێ... واز لـە ئـەدەبیات بێنن. خـەمتان نـەبێ، ئەدەبیات بەمە هیچ لەدەست نادا!

ئەمە ئیدی لووتکەی بێشەرمی بوو! گیرم خواردبوو و نەمدەزانی چی بکەم. خاڵە هیوابڕاو و شەرمەزار گوتی:

– ئاخر، فۆما، خۆ ئێوە خۆتان دەتانگوت چێژبەخشە.

– بـەڵێ، قوربـان. بـەس مـن شـارەزایانە لـەو مەسـەلەیە دوام و لـە کاتی خۆشیدا ئەو قسەیەم کرد، بەس ئەی ئێوە...

یژێڤیکین، لە بارێکدا کە ماستاوچییانە دەوروخولی فۆما فۆمیچی دەدا، پەڕییە نێو قسەکانی و گوتی:

– بەڵێ، ئەو قسەکانە تێفکرینیان لەپشتەوە بوو، قوربان! ئەقڵی ئێمە ئەوەندە کەمە کە پێویست بەوە دەکات بڕێك قەرز بکەین، بە دژواری بـڕی دوو بابـەتی زانیسـتی دەکـا، وەڵێ دەی، گریمـان بـڕی سێیەم دانەشی کرد... بەس، دەی ئیدی، ئێمە ئاواین!

خاڵە گوتی:

– ئێ، وا دیارە دیسان قسەی لەقولۆقم کردەوە!

جا هـەمان بزە نەرمونیانانـە هەمیشـەییەکەی نیشـتە سـەر لێوی. فۆما گوتی:

– کەواتە خۆشتان دانی پێدا دەنێن.

- هیچ نییە، فۆما، ناڕەحەت مەبە. دەزانم کە تۆ وەك هاوڕێیەك ڕێ لە قسەکردنم دەگری. وەك هاوڕێیەك، وەك برایەك. من خۆم مۆڵەتی ئەوەم پێ داوی، تەنانەت خۆم داوام لێ کردی ئەم کارە بکەی! ئەمە پێویستە، دەبێ وا بێ! ئاخر لە بەرژەوەندیی خۆمدایە! مەمنوونتم و هەر بە ڕاستیش پێی گەورە دەبم!

ئیدی کاسەی سەبرم خەریکبوو بەسەریدا دەڕژا. تا ئەو کاتە وام دەزانی ئەوەی کە لە بارەی فۆما فۆمیچەوە دەیڵێن، تا ڕادەیەك زیادەڕۆییە، وەڵێ لەو ساتانەدا کە هەموو شتێکم بە چاوی خۆم دەبینی، هەتا بڵێی سەرسام بووم. نەمدەتوانی بڕوا بەوە بکەم کە دەیبینم، لە لایەکەوە ئەو هەموو ڕووقاییمی و زۆرداریییە بێشەرمانەیە حەپاساندبوومی و لە لایەکی دیکەشەوە، ئەو هەموو ماستاوچییەتی و دڵپاکییە ساویلکانەیەم بۆ لێك نەدەدرایەوە. تەنانەت خاڵەش لەو هەموو بێشەرمییەی فۆما ناڕەحەت بوو. دەکرا لە ڕووخساریدا ئەوە بخوێنیتەوە... لە ناخی دڵەوە حەزم دەکرد لەگەڵ فۆمادا بکەومە قسە و بە گژیدا بچمەوە و چاوترسێنی بکەم... جا چی دەبێ با ببێ! بەدەم ئەم بیرکردنەوەوە وورووژابووم. لە دەرفەتێك دەگەڕام و چاوەڕێ بووم، وەڵێ هیچ هەلێك نەڕەخسا: فۆما، لێبڕوانە بڕیاری دابوو هیچ گرنگییەك بە من نەدات. خاڵە کە بە هەموو توانای خۆیەوە هەوڵی دەدا کەمێك لەو گرژییە کەم بکاتەوە کە کەوتبووە نێو گفتوگۆکەوە، درێژەی پێ دا:

- ڕاست دەکەی، تۆ ڕاست دەکەی، فۆما. تۆ دایمە ڕاستگۆیانە حەقیقەتەکە دەڵێی و گوێ بەوە نادەی کە ڕەنگە کەسێ ئەمەی لە

بـەردڵ گـران بـێ، مـن سوپاسـگوزارتم، فۆمـا. پیـاو دەبـێ زانیـاریی لەسـەر بابـەتێ هـەبێ جا قسـەی لەسـەر بکـا. هـەر بـە ڕاسـتی داوای لێبـووردن دەکـەم! ئـەوە یەکـەمین جـار نییـە کـە دەکەومـە وەهـا هەلومەرجێکـەوە. سـێرگی، تـۆ تەماشـا، مـن جارێکیـان خـەریکی تاقیکردنەوە بووم... ئەوە ئێوە پێدەکەنن! وەڵێ باوەڕ کەن! سوێند بە خوا، من خـەریکی تاقیکردنـەوە بـووم. ڕێکخـراوێ لـە بەڕێوەچوونی تاقیکردنەوەیەکـدا بانگهێشـتی کردبـووم. هـەروا وەك ڕێزلێگرتنێـك منیـان لـەنێو مامۆسـتاکاندا دانیشـاند. ئـاخر ئـەوێ کورسـییەکی زیادەی لێ بوو. دەبێ دانی پێدا بنێم کە ترسابووم، زۆر تۆقێنەربوو: من هەر لە بنەڕەتەوە شارازاییم لە هیچ بوارێکدا نییە! جا دەبوو چی بکـەم؟ لـە بـەرخۆوە بیرم دەکـردەوە، کـە هاکـا هەڵیانسـتاندمە سـەر تەختـە! وەڵێ دەی، ئـەوە ڕووی نـەدا، هـەموو شـتێ بـە خێـر گـەڕا، تەنانەت خۆشم پرسیارم دەکرد. بۆ نموونە دەمپرسی نووح کێ بوو؟ بە گشتی زۆر بە باشی وەڵامیان دەدایەوە، جا دوای ئـەوە فراوێنمان خوارد و بە خۆشیی گەشە و پێشکەوتنەوە شامپانیامان خواردەوە. ڕێکخراوێکی زۆر بێوێنە بوو!

فۆما فۆمیچ و ئابنۆسکین لە تاو پێکەنین پێچیان دەدایە خۆیـان. خاڵەش دڵخۆش لەوەی کە هەمدیس شادی باڵی بەسـەر کەشـەکەدا کێشاوەتەوە، لە ناخی دڵەوە پێدەکەنی و دەیگوت:

– من دواتر خۆشم پێکەنینم بە ئیشـەکەی خـۆم دەهـات. نـەخێر، فۆما، جارێ چیت دیوە! ئێستە با بۆتی بگێڕمـەوە کە جارێکیـان چ پـەنتێکم دا تـا هـەمووتان لـە پێکەنینانـدا بپـڕووکێن... سـێریۆژا، تەماشا کەن، ئێمە لە *کراسناگۆرسك* بووین...

فۆما قسەی پێ بڕی و گوتی:

- سەرهەنگ مۆڵەت دەدەن لێتان بپرسم کە ئایا ئەم بەسەرهاتەی ئێوە زۆر دەخایەنێ یان نا؟

- ئاه، فۆما! ئەمە سەرنجڕاکێشترین بەسەرهاتە کە تا ئێستە بیستبێتتان، ڕەنگە لە تاو پێکەنین بپڕووکێن. تۆ تەنیا گوێ بگرە، سەرنجڕاکێشە، سوێند بە خوا، زۆر سەرنجڕاکێشە. ئێستە دەیگێڕمەوە کە چ پەنتێکم دا.

ئابنۆسکین، بەدەم باوێشکدانەوە گوتی:

- من بەو پەڕی تامەزرۆییەوە گوێ لەم جۆرە بەسەرهاتانەتان دەگرم.

ئاقیبەت فۆما گوتی:

- چارەمان نییە، دەبێ گوێ بگرین.

- فۆما، هەر بە ڕاستی شیاوی بیستنە، سوێند دەخۆم. ئامفیسا پیترۆڤنا، دەمەوێ ئەوە بگێڕمەوە کە چۆن جارێکیان تێکەوتم. سێرگی، تۆش گوێ بگرە، ئەم بەسەرهاتە کەمێکیش پەندئامێزە.

خاڵە لە شادیان چاوی دەبریقایەوە، قسەکانیی قووت دەدانەوە و وەك ئەو کاتانەی کە دەیویست بۆ کەیف و خۆشی شتێك بگێڕێتەوە، لەنێو قسەکانیدا ڕستەگەلی ناپەیوەستی بێژماری بەکار دەهێنا.

- ئێوارەی ئەو ڕۆژەی کە گەیشتینە شار، چووم بۆ سەیری شانۆ. ڕۆڵی وەینەکی[1] سەرەکیی ژن، کارۆپۆتکینا دەیگێڕا، ئەو

---

١. وەینەك، نوێنبار، کارەکتەر، شانۆکار، کایەگێڕ.

دواتر لەگەڵ فەرماندەی سوارەی سووپا، *زۆیرکاف*دا ڕای کرد و نمایشەکە بە نیوەونیوەچڵی مایەوە: هەر لەبەر ئەوە پەردەیان دادایەوە... جا ئەم زۆیرکافە بێچاووڕوێکی بێهاوتا بوو، لەوێ تا بینەقاقا دەیخواردەوە و هاوکات سەحنەڕازێنیش بوو. وا نەبێ بڵێی هەمیشە سەرخۆش بوو، نا، زۆربەی کات بۆیە دەیخواردەوە تا وەختێکی خۆش لەگەڵ هاوڕێکانیدا بەسەر بەرێ. وەڵێ دەی، کە لە کەللەی دەدا، هەموو شتێکی بیر دەچووەوە، وەك ئەوەی کە لە کوێ دەژی، لە چ مەملەکەتێکە و ئەسڵەن خۆی ناوی چییە! بەس بە سرووشت زۆر کوڕەچاکە بوو... دەی، من لە هۆڵی شانۆ دانیشتبووم. کاتی ناوبڕ هەستامەوە و بە هەڵکەوت چاوم بە هاوڕێی دێرینم، *کارناخۆف* کەوت... دەبێ بڵێم، کوڕێکی بێوێنەیە. ئەوەی ڕاستی بێ ماوەی شەش ساڵ بوو یەکدیمان نەبینیبوو. لە هێرشەکاندا بەشداریی کردبوو و مەدالیای زۆریشی وەرگرتبوو، لەو دواییانەدا بیستبووم کە بووەتە ڕاوێژکاری پارێزگایەکیش، لە خزمەتی نێو سووپاوە گوێزرابووەوە بۆ خزمەتی نێو وڵات و پلەی بەرز کرابووەوە... ئێ، بێگومان ئێمە بە بینینی یەکدی دڵخۆش بووین. باسمان لە بابەتگەلی جۆراوجۆر کرد. جا سێ خاتونی بەڕێز لە تەکمانەوە دانیشتبوون، ئەوەی لای دەستە ڕاستیان، لە دونیادا وێنەی نەبوو بۆ ناشیرینی... دواتر تێگەیشتم کە هەتا بڵێی ژنەچاکەیە، دایکێکی دڵسۆز و هاوسەرێکی لەخۆبردوو... دەی، وەکو دەبەنگێك لە کارناخۆفم پرسی: *بڵێ بزانم، براله، دەزانی ئەم دامۆلە کێیە؟*

- مەبەستت کێیە؟

- ئەوەی کە ئالەوێ دانیشتووە.

- خۆ ئەوە ئامۆزامە.

شەیتان بە نەفرەت بی! جا بزانە لەو ساتەدا حاڵم چۆن بووە! بۆ ئەوەی خۆم بێنمەوە، گوتم: «نا، ئەمەیان ناڵێم، تۆش چاوت کز بووە! مەبەستم ئەوەیانە کە ئالەویا دانیشتووە: ئەوە کێیە؟ »

- ئەوەش خوشکمە.

ئەی دوای برێ بەختی وا! بۆ نەگبەتیی من خوشکەکەی جوانی نێو جوانان بوو، ئەوەی ڕاستی بێ نازدار و خوێنگەرمیش بوو، جلێکی کەشخەی پۆشیبوو، بە گوڵسینە و دەستکێش و دەستبەند ڕازابووەوە... بە کورتی، وەك فریشتەیەکی بچکۆلانە دانیشتبوو. دواتریش لەگەڵ پیاوێکی باشدا بە ناوی پیختین زەماوەندی کرد، چیتان لێ بشارمەوە، لەگەڵ ئەودا ڕای کردوو و بێ ڕەزامەندیی دایباب زەماندیان کرد، وەلێ ئێستە ئیدی هەموو شتێ ئاسایی بووەتەوە و ژیانێکی باش و حورمەتدارانەیان هەیە، باوکەکانیشیان بێڕادە دڵیان بەم زەماوەندە خۆشە!... دەی، نەمدەزانی چۆن خۆم لەم گێچەڵە نەجات بدەم، هاوارم کرد: «نا! مەبەستم ئەوە نییە!... ئەو خاتونەی کە لەنێوانیان دانیشتووە؟... ئەوەی بەینیان دەڵێم، کاکە. »

- دەی، براڵە، ئەوەشیان هاوسەرمە...

بەینی خۆمان بێ، ژن ژن نەبوو، نووقڵ بوو! یانی پیاو حەزی دەکرد ڕێك قووتی بدا... گوتم: «هیچ، لێی گەڕێ، لەقەیەکم وەشاند!

بلێ بزانم، تا ئێستە هیچ مرۆڤێکی دەبەنگت دیوە؟ گەر نەتدیوە، لێرەیە، وا لە بەرچاوتە، ئەوەش سەری، ها بیبڕە، بەزەییش مەنوێنە!». تەنیا پێکەنی. دوای نمایشەکە، منی بەوان ناساند و زۆڵی وا پێدەچوو مەسەلەکەی بۆ گێڕابنەوە، چونکە لە بەرخۆوە تریکەیان دەهات! دەبێ دانی پێدا بنێم کە هەرگیز کاتی وا خۆشم ڕانەبواردبوو. بەڵێ، برالە فۆما، دەی هەندێ جار مرۆڤ ئاوا تێدەکەوێ! ها... ها... ها... ها!

وەلێ پێکەینەکەی خاڵەی داماو، هیچ بەرهەمێکی نەبوو و نیگای شاد و سۆزداری بێهوودە بەسەر ئامادەبووانندا دەگەڕا، وەڵامی بەسەرهاتە پێکەنیناویەکەی تەنیا بێدەنگییەکی دڵتەقێن بوو. فۆما فۆمیچ قرقەپ و قەڵس دانیشتبوو و ئەوانی دیکەش پەیڕەوییان لەو دەکرد، تەنیا ئابنۆسکین بزەیەکی کاڵی بەسەر لێوەوە بوو، چونکە سۆسەی ئەوەی دەکرد کە خاڵە هەر ئێستە چ حەشرێکی پێ دەکرێ. خاڵە بەسەر خۆیدا شکایەوەوە و سوور هەڵگەڕا. فۆماش هەر ئەوەی دەویست. دواجار ڕووی کردە چیرۆکبێژی تەریقەوەبوو و بە ویقارەوە گوتی:

– چیرۆکەکات تەواو بوو؟

– بەڵێ، فۆما.

– ئێستە دڵتان ئاوی خواردەوە؟

خاڵەی داماو زۆر خەمگینانە پرسیی:

– مەبەستتان چییە، فۆما، دڵم لە چی ئاوی خواردەوە؟

– دەڵێم ئێستە هەست بە ئاسوودەیی دەکەن؟ لەوە ڕازین کە گفتوگۆی ئەدەبیی دڵخوازی هاوڕێیانتان تێك دا و بە پەڕینە نێو قسەکانیانەوە خۆپەرستیی بێنرخی خۆتاتان سەپاند؟

– بیبڕنەوە، فۆما! من تەنیا دەمویست دڵخۆشتان کەم، جا ئەوسا ئێوەش...

فۆما کە لە کتوپڕێکدا بە شێوەیەکی تەواو نائاسایی هەڵچووبوو، قیراندی:

– ئێمە دڵخۆش کەی؟ ئێوە لەجێی ئەوەی ئەوانی دی دڵخۆش کەن تەنیا دەزانن بێزاریان بکەن. *دەمویست دڵخۆشتان کەم!* ئایا دەزانن چیرۆکەکەی ئێوە تا ڕادەیەك نائەخلاقی بوو؟ ئەوە هەر ناڵێم کە بێئەدەبانە بوو... چونکە خۆی هاوار دەکا... ئێوە هەر ئێستە ڕاتان گەیاند کە بە بێئەدەبییەکی کەموێنەوە گاڵتەتان بە حورمەتی خانمێکی نەجیب و بەڕێز کردووە، جا ئەوەش تەنیا لەبەر ئەوەی کە شانازیی بەدڵبوونی ئێوەیان پێ نەبڕاوە. جا دەشتانویست ئێمە بێننە پێکەنین، یانی بێینە ئاستی ئێوە و ئەم ناشیرینی و بێئەدەبییەتان پەسەند بکەین، جا هەموو ئەمانەش تەنیا لەبەر ئەوەیە کە ئێوە گەورەی ماڵەکەن! ئێوە سەرپشکن، سەرهەنگ، دەتوانن بەلاشخۆر و کاسەلێس و هاوەڵ لە دەوری خۆتان کۆ بکەنەوە، تەنانەت دەتوانن ئەوانە لە شوێنی دوور کۆ بکەنەوە و بیانهێنن، بێمەرامی و ڕاستگۆیی و دلێری ژێرپێ بنێن و ژمارەی ئەڵقەلەگوێیانی خۆتان زیاتر بکەن، وەلێ فۆما ئۆپیسکین ماستاوچییەتی و کاسەلێسی و مشەخۆریی ئێوە ناکا! ڕەنگە هەر کارێکی دی بکا، بەس دڵنیاتان دەکەوە کە ئەم کارە ناکا!...

– ئاخ، فۆما! ئێوە لە مەبەستم حاڵی نەبوون!

– نەخێر، سەرهەنگ، دەمێکە من دەتانناسم و درزەم کردووەتە قووڵایی ڕۆحتانەوە! خۆپەسەندییەکی بێڕادە دەورەی ئێوەی داوە، ئێوە خۆتان بەوەوە هەڵدەکێشن کە گوایە خاوەن ژیری و زیرەکییەکی بێوێنەن، کەچی لەوەش بێئاگان کە هەر خودی خۆهەڵکێشان بۆخۆی نیشانەی نەزانییە. ئێوە...

– فۆما، دەی توخوا بیبڕەوە! لانیکەم شەرم لەوانی دی بکە!...

– ئاخ، سەرهەنگ، من ناتوانم لەم بارودۆخە خەمناکە بڕوانم و بێدەنگ بم. بەڵێ، من کەمدەستم و بە جەرجیی دایکتان ژیان بەڕێ دەکەم. دەترسێم گەر بێدەنگ بم، ئەوانی دی لایان وا بێ بەم بێدەنگییە خەریکی مەراییکاریتانم، نامەوێ هەر هیچوپووچێ وا بزانێ من پاشماوەخۆری ئێوەم! تەنانەت بگرە وەختێ چەند خولەکێك لەمەوبەر هاتمە ژووری، دەستبەنقست ئاوا بە ڕاشکاوی و بێباکییەکی زیاترەوە هاتمە قسان و پێویست بوو بە زبری بدوێم، چونکە ئەوە هەر خۆتان بوون منتان خستە هەلومەرجێکی لەو جۆرەوە. سەرهەنگ، ئێوە هێندە بە فیزەوە هەڵسوکەوتم لەگەڵ دەکەن کە، ڕەنگە ئەوانی دی وا بزانن من کۆیلە و نانەخۆری ئێوەم. ئێوە چێژ لەوە دەبەن کە لە بەردەم بێگاناندا سووکایەتیم پێ بکەن، ئەمەش لە بارێکدایە کە من هاوشانی ئێوەم، دەبیستن؟ لە هەموو ڕوێکەوە هاوشانین. تەنانەت ڕەنگە ئەوە من بم بە مانەوەم لێرە پیاوەتی لەگەڵ ئێوە بکەم، نەك ئێوە لەگەڵ من. لێرانە سووکایەتی بە من دەکەن، دواجار منیش، ناچارم تاریفی خۆم بدەم... ئەمە

شتێکی ئاساییە! من ناتوانم بێدەنگ بم، دەبێ قسەی خۆم بکەم، یەکسەر دەبێ ناڕەزایی خۆم نیشان بدەم، هەر لەبەر ئەوەشە کە بێ پێچوپەنا وا پێتان دەڵێم کە هەتا بڵێی بەخیلن! بۆ نموونە کە دەبینن کەسێ لە گفتوگۆیەکی سادە و هاوڕێیانەدا، نائاگایانە خەریکی دەرخستنی زانست و زانیاری و سەلیقەی خۆیەتی، خێرا سرەوتتان لێ دەبڕێ و لە بەرخۆوە دەڵێن: *ئادەی با منیش زانست و سەلیقەی خۆمی بۆ دەرخەم!* دەکرێ بپرسم بۆ نموونە ئێوە چ سەلیقەیەکتان هەیە؟ سەرهەنگ تێگەیشتن و دەرکی ئێوە بۆ هونەر... هەڵبەتە بە داوای لێبووردنەوە... هەر هێندەی تێگەیشتن و دەرکی گایەکە بۆ گۆشتی گوێرەکە! ڕاستە کە ئەمە دەربڕینێکی ڕەق و زبرە، بەس لانیکەم بێپەردە و ویژدانارانەیە. سەرهەنگ، ئێوە ئەم جۆرە قسانە لە زاری ماستاوچییەکانتانەوە نابیستن.

– ئاخ، فۆما!

– بەڵێ: *ئاخ فۆما!* دیارە کە هەق ڕەقە. دەی، دواتر دێینەوە سەر ئەم باسە، جارێ مۆڵەت بدەن با منیش کەمێ ئامادەبووان بخەمە پێکەنین. خۆ ناکرێ هەر ئێوە خەریکی خۆنواندن بن. پاول سیمیۆنیچ! ئایا ئێوە ئەم دێوە دەریاییە مرۆڤشێوەیەتان دیوە؟ من دەمێکە خەریکی سەیرکردنیم.

مەبەستی گاڤریلا بوو. خزمەتکاری پیر لە بەردەرگەکە ڕاوەستابوو و بە سەروسەکوتێکی خەمگینەوە لەوەی دەڕوانی کە چۆن خەریکی لەقاڵبدانی گەورەکەیین.

– پاول سیمیۆنیچ، دەمەوێ بە شانۆیەکەوە سەرگەرمتان کەم. هێی تۆ، پیرەقالاو، وەرە ئێرە! گاڤریلا ئەیگناتیچ، ئەو شانازیەمان

پێ ببڕن و تەشریف بێننە پێشەوە! پاول سیمیۆنیچ، دەبینن، ئەم گاڤریلایە لەبەر زماندرێژیەکەی تەمبێ کراوە و دەبێ زمانی فەڕەنسی بخوێنێ. من وەکو ئەرفیۆس، کەسانی ئێرە هێور دەکەمەوە، وەلێ نەك بە گۆرانی، بەڵکە بە زمانی فەڕەنسی. دەی، کاکی فەڕەنسی، مسیۆی هەرزە[1](لە بەردڵی گرانە پێی بڵێن مسیۆی هەرزە)، خۆ وانەکەتت لەبەرە؟

گاڤریلا بە سەرکزی گوتی:

– بەڵێ، لەبەرمە.

- parlez-vous francais?[2]

- oue, monsieur, je parle un peu.[3]

هەرکە گاڤریلا هاتە گۆ، هەمووان دەستیان کردە حیلکەحیلك، نازانم کە ئاخۆ ئەم کارەیان بە بۆنەی سەروشکڵی داتەمیوی گاڤریلاوە بوو لە کاتی دەربڕینی ڕستە فەڕەنسییەکەدا یان دەرکیان بەوە کردبوو کە فۆمای حەز دەکات هەمووان پێبکەنن. تەنانەت ژنەی جەنەراڵیش لە تریقەی پێکەنینی دا. ئامفیسا پیترۆڤنا، پاڵی بە قەنەفەوە دابوو و خەریکبوو لەبەر پێکەنین ببووریتەوە و باوەشێنێکی بە ڕووخسارییەوە نابوو. لە هەمووشی پێکەنیناویتر ئەوە بوو کە وەختێك گاڤریلا سەیری کرد تاقیکردنەوەکەی گۆڕاوە

1. بە فەڕەنسی واتای وێڵگەڕی و بێکارەیی دەگەیەنێت، کە واتای بەرەڵا و بێکارە و خوێڕیشی لێ دەبێتەوە. لە بەرهەمی پووشکیندا، ئەم وشەیە هەندێك جار بە ڕێنووسێکی هەڵە هاتووە. «و. ف»

2. ئێوە فەڕەنسی دەزانن؟ «و. ف»

3. بەڵێ بەڕێز، تۆزێك دەزانم. «و. ف»

بۆ چی، ئیدی خۆی پێ ڕانەگیرا و تفێکی کردە سەر زەوی و بە شێوازێکی لۆمەکەرانەوە گوتی:

– تەماشا بەم پیرییەوە تووشی چ ڕسواییەك بووین!

فۆما فۆمیچ ڕاچەنی.

– چی؟ تۆ چیت گوت؟ ئەوە بێئەدەبیش دەکەی؟

گاڤریلا قورسوقۆڵانە هاتە وەڵام:

– نەخێر، فۆما فۆمیچ، قسەکانی من بێئەدەبی نین و ئەوەش شیاو نییە کە منی خزمەتکار، لە بەردەم ئێوەومانان کە هەر بە سرووشت نەجیبزادەن، بێئەدەبی بکەم، وەلێ بوونی هەر مرۆڤێ، شتێ لە خوای تێدایە، هەر مرۆڤێ وێنایەکی خوا و شتێکی لەو بابەتەیە. من ئێستە شەستوسێ ساڵ تەمەنم هەیە. باوکم هاوسەردەمی *پۆگاچۆف*ی بێبەزەیی بووە و باپیریشم لەگەڵ *ماتۆی نیکیتیچ*ی گەورەی، کە خوا لێی خۆش بێ، –پۆگاچ (پۆگاچۆف)ی بە سێپێدارێکەوە هەڵواسی و هەر لەبەر ئەوەش، گەورە ئافاناسی ماتۆی خوالێخۆشبوو ڕێزێکی تایبەتیی بۆ باوکم دادەنا و ئەوی کردە خزمەتکاری تایبەتیی خۆی و تا کۆتای تەمەنیش گەورەی پێشخزمەتەکان بوو. منیش، جەنابی فۆما فۆمیچ، گەرچی خزمەتکاری گەورەکەمم، وەلێ بە درێژایی تەمەنم تووشی شوورەییەکی لەو جۆرە نەبوومە!

گاڤریلا کە قسەی تەواو بوو، دەستەکانی ئاوەڵا کردنەوە و سەری دانەواند. خاڵە دڵپەشێوانە لێی دەڕوانی و دواجار هاواری کرد:

- ئـێ، بیربــڕەوە، بیــبڕەوە ئیــدی، گــاڤریلا! پێویســـت بـــە خۆهەڵکێشـــــــــــان ناکـــــــــــا، بیـــــــــــبڕەوە دەی!

فۆما کە تۆزێك ڕەنگی پەڕی بوو و بە زۆر بزەی دەکرد، گوتی:

- قەینا، قەینا، لێگەڕێن با قسەی خۆی بکا، ئەوەش بەرهەمی ئێوەیە...

گاڤریلا بە هەڵچوونێکی نائاساییەوە گوتی:

- هەموو شتێ دەڵێم، هیچ شتێکیش ناشارمەوە! گەر دەست و پێشم ببەستنەوە، خۆ دەمم کراوەیە! فۆما فۆمیچ، هۆکاری ئەوەی کە من لە بەرچاوی ئێوەدا کەسێکی بێزراوم تەنیا یەك وشەیە: کۆیلەیی، جا ئەمەش من ئازار دەدا! ئەوە ئەرکی منە کە لە هەموو هەلومەرجێکدا خزمەت و نۆکەریی ئێوە بکەم، چونکە بە خزمەتکاری هاتوومە دونیاوە و دەبێ هەموو ئەرکەکانم بە ترس و لەرزەوە ئەنجام بدەم. بۆ نموونە ئێوە دانیشتون و کتێب دەنووسن و من ئەرکم ئەوەیە کە نەهێڵم هیچ کەسێ بێزارتان بکا، چونکە ئەمە ئەرکی سەرەکیی منە. پێویست بە هەر خزمەتێ بکا، من بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە ئەنجامی دەدەم، وەڵێ ئەوە شوورەییە کە بەم پیرییەوە لە بەردەم خەڵکی و بە زمانێکی دی دەست بە ترتەترت بکەم! من وا ئێستە ئیدی لە بەردەم ئەوانی دیکە ڕووم نایێ تەنانەت سەریش هەڵبڕم. پێم دەڵێن *منیی فەڕەنسیی، تۆ فەڕەنسیی!* نەخێر، جەنابی فۆما فۆمیچ، نەك هەر بە تەنیا منی دەبەنگ، بەڵکە هەموو مرۆڤە بەویژدانەکان پێکڕا دەڵێن کە ئێوە بێبەزەیی و زۆردارن و گەورەشم لەبەرانبەر ئێوەدا لە منداڵێکی کەمتەمەن بەولاوە هیچی دی نییە، ئێوە گەرچی لە بنەچەی جەنەراڵانن و ڕەنگە خۆشتان شتێکی وای

نەمابێ ببنە جەنەراڵ، وەڵێ هەر بە تەنیا ئەهریمەنێکی ڕاستەقینە دەتوانێ تا ئەم ڕادەیە ڕقاوی بێ.

گاڤریلا قسەکانیی تەواو کردن. من لە خۆشیان جێم بە خۆم نەدەگرت. لەنێو ئامادەبووانی تاساو و سەرسووڕماودا، فۆما فۆمیچ، کە لە تاو ڕق ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو، هەروا لە جێی خۆیدا وشک بووبوو و دەتگوت ناتوانێ کاردانەوە چاوەڕوانینەکراوەکەی گاڤریلا هەزم بکات. دەتگوت لەو ساتانەدا هێشتا خەریکە بیر لەوە دەکاتەوە کە پێویستە تا چ ڕادەیەك بە گژیدا بچێتەوە؟ دواجار تەقاندی و لەسەر کورسیەکە هەستایەوە و هاواری کرد:

– چی؟ ئەو وای لێ هاتووە سووکایەتی بە من بکا... بە من! ئەمە بەرهەڵستیکردنە!

بەدوایدا ژنی جەراڵیش بە تەکانێك لە جێگەکەی ڕاست بووەوە و دەستەکانیی بە یەکدا کێشان. فەرتەنەیەك هاتە ئارا کە ئەوسەری دیار نەبوو. خاڵە خێرا ڕۆیشت تا گاڤریلای تاوانبار لە ژوورەکە وەدەربنێ. ژنی جەنەراڵ هاواری کرد:

– زنجیری کەن، ئەمە زنجیر کەن! ئیگۆرۆشکا، خێرا ئەمە دەبەی بۆ شار و ڕادەستی پۆلیسی دەکەی، دەنا گەردنت ئازاد ناکەم! هەر ئێستە پەلبەستی کە و بیدە دەست پۆلیس!

فۆما هاواری کرد:

– چی... کۆیلەی چەپەڵ! گەپجاڕ! بێناوڕوو! وای لێ هاتووە سووکایەتی بە من بکا! ئەمە... ئەمەی کە پەڕۆی پێڵاوسڕینەکەی منە! وای لێ هاتووە بە من بڵێ ئەهریمەن!

بەوپەڕی لێبڕاوییەوە چوومە نێو شەڕەکە. لە بارێکدا کە هێندە هەڵچووبووم لەرز گرتبوومی، ڕێك چاوم بڕییە نێو چاوی فۆما و گوتم:

– دەبێ دانی پێدابنێم کە لەم بارەیەوە منیش ڕێك هاوڕای گاڤریلام.

ئەم ڕووبەڕووبوونەیەی من، بە چەشنێك فۆمای تووشی شۆك کردبوو کە دەتگوت ناتوانێت بڕوا بە گوێی خۆی بکات. دواجار شێتئاسا بەرەو ڕووم هەڵمەتی هێنا و چاوە بچووك و سوور هەڵگەڕاوەکانی لێ بڕیم و قیڕاندی:

– باشە ئەمە لە کوێوە پەیا بووە؟ پێم ناڵێی تۆ کێی؟

خاڵە کە بە تەواوی شپرزە و حەپەسا بوو، پەلەپەل گوتی:

– فۆما فۆمیچ، ئەمە سیرۆژایە، خوشکەزام...

فۆما هاواری کرد:

– یارۆی زانستمەند، ئەریێ؟ کەواتە ئەمەیە زانستمەندەکەتان؟ liberte, egalite fraternite![1] ئەرێ؟ jurnal desdebats[2] ها؟ نەخێر، براله، قسەی قوڕ دەکەی! ئێرە پترسبورگ نییە، ناتوانی بمخەڵەتێنی! تف لەو des debats ـەی کە تۆ پێشی دەخەی! بێ گومان ئەو بۆ ئێوە des debats ێکە، وەلێ لای ئێمە لە شتێکی

---

١. به زامانی فەڕەنسی، ماناى ئازادی، یەکسانی و برایەتی دەگەیەنێت، درووشمی شۆڕشی گەورەی فەڕەنسا. «و. ف»

٢. ناوی ڕۆژنامەیەکی سیاسییە، کە لە ساڵی ١٧٨٩دا ڕێکخرا و بەشێکی هەرە زۆری تایبەت بوو بە ئەدەبیاتەوە. ئەم ڕۆژنامەیە لە ساڵانی ١٨٥٠دا پەیوەندییەکی زۆر نزیکی لەگەڵ حکومەتدا هەبوو، بەم پێیە، بۆچوونی فۆما ئۆپیسکین لە بارەی ئازادیی بیروڕای ئەم ڕۆژنامەیەوە بە تەواوی بێبنەمایە. «و. ف»

پیس و چەپەڵ بەولاوە هیچی دی نییە! کاکی زانستمەند! تۆ هاتووی و خۆت بە زانستەکەتەوە هەڵدەکێشی!

لام وایە گەر بەریان پێ نەگرتبا، بە بۆگز دەکەوتە سەروگوێلاکم.

من تاسابووم، ڕووم کردە ئەوانی دی و گوتم:

– دەڵێی سەرخۆشە!

فۆما بە دەنگێکەوە کە دەتگوت دەنگی خۆی نییە، قیڕادنی:

– کێ؟ من؟

– بەڵێ، تۆ!

– من سەرخۆشم؟

– بەڵێ.

ئەمە شتێك نەبوو کە فۆما بتوانێ بەرگەی بگرێت. بەدەم هاتوهاوارێکەوە کە دەتگوت وا خەریکە سەری دەبڕن، لە ژوورەکە چووە دەرێ. ژنەی جەنەراڵ وا دیاربوو بە تەمایە خۆی ببوورێنێتەوە، بەس بیری کردەوە و وای پێ باش بوو کە شوێن فۆما بکەوێت. ئەوانی دیکەش بەدوایدا ڕایانکرد و خاڵەش بە شوێنیاندا. کاتێك هاتمەوە سەرخۆم و لە چواردەورم ڕوانی، تەنیا یژێڤیکینم لە ژوورەکەدا بینی کە بزەیەکی بەسەر لێوەوە بوو و دەستەکانی هەڵدەگلۆفین. جا بە دەنگێکی فرەزانانەوە گوتی:

– بەڵێنتان دا کە باسی یەسووعیەکانم بۆ بکەن.

من کە لە مەبەستی تێنەگەیشتبووم، پرسیم:

– چی؟

– بابە، هەر دوو خولەکێ لەمەوبەر بەڵێنتان دا باسیانم بۆ بکەن.

فڕکەیەکم کردە بەرهەیوان و لەوێشەوە بازم دایە نێو باخەکە. سەرم دەسوو...

# وەرزی هەشتەم

## دەربڕینی ئەوین

بۆ ماوەی چارەکێك بە تووڕەییەوە پیاسەم بە باخەکەدا کرد. لە خۆم قەڵس بووم و بیرم لەوە دەکردەوە کە دەبێت ئێستە چی بکەم؟ خۆر لە ئاوابووندا بوو. کتوپڕ لە پێچی کوچەیەکی باخەکەدا تووشی ناستینکا بووم. بە دەسڕ خەریکی سڕینی چاوە هەڵساوییەکانی بوو[1]. ناستینکا گوتی:

- بەدوای ئێوەدا دەگەڕام.

لە وەڵامدا گوتم:

- منیش هەر وا. ئادەی بزانم، ئەرێ من لە شێتخانەم؟

لێم ڕاما و زویرانە گوتی:

- نەخێر، ئەسڵەن لە شێتخانە نین.

---

١. هەڵساوی: فرمێسکاوی، ئەسرینبار.

– ئـەی ئـەم فەرتەنەیـە چـییە؟ بیکەنـە خـاتری مەسـیح و تـێم گەیەنن! ئێستە خاڵە لە کوێیە؟ دەتوانم بچم بۆ لای؟ زۆر دڵخۆشـم کە بینیتانم، لەوانەیە ئێوە بتوانن یارمەتیم بدەن.

– نەخێر، وا باشە ئێوە نەچن بۆ ئەوێ. من هـەر ئێستە لـەوێوە هاتووم.

– ئاخر بۆ کوێ ڕۆیشتوون؟

بە پەستییەوە گوتی:

– من چووزانم؟ لەوانەیە چووبن بۆ بێستان.

– کامە بێستان؟

– حەفتەی ڕابردوو فۆما فۆمیچ کردبوویە هەراوهوریا کە نایەوێ لـەم ماڵـەدا بمێنێتـەوە و بـەرەو بێسـتان کەوتـە ڕاکـردن و بێڵێکـی لـە تەویلەکەدا هەڵگرت و دەسـتی کـردە زەویکـێڵان. ئێمـە تێکڕا واقمـان وڕمابوو، گوتمان تۆ بڵێی شێت نەبووبێ؟ دەیگوت، بۆیە *ئەمە دەکەم تا دوایی ئەوەم بە ڕوودا نەدەنەوە کە نانی بەلاشـم خـواردووە، زەوی دەکێڵم و پارەی ئەو نانە دەردەهێنمـەوە کـە خـواردوومـە و پاشـانیش ئـەم ماڵـە جـێ دەهێڵم. سـەیر کـەن بـە کوێتـان گەیانـدووم!* هـەمووان یەکسەر دایانە پرمـەی گریـان و لـە بەردەمیـدا کەوتنـە سـەر ئـەژنۆ تـا بێڵەکەی دانێ، وەلێ فۆما هەروا خەریکی کێڵان بوو، جا بەم کارەشـی تەنیا شێلمەکانی هەڵکەندنەوە. ئەو جارەیـان کـەس ئەمـەی بـە ڕووی خۆیدا نـەهێنا، ئێسـتە بـۆی هـەیە هـەر هـەمان کـار دووبارە بکاتـەوە. لێی دەوەشێتەوە.

بەوپەڕی ڕقەوە هاوارم کرد:

– جا ئێوەش... ئێوەش ئاوا خەمساردانە باسی لێوە دەکەن!

بە چاوە درەوشاوەکانی لێم ڕاما. گوتم:

– داوای لێبـووردن دەکـەم، وام لێهـاتووە خۆیشـم نـازانم چـی دەڵێم! گـوێ بگـرن! ئێـوە دەزانـن مـن بـە چ مەبەسـتێکەوە هـاتووم بـۆ ئێرە؟

سـوور هەڵگـەڕا و هەسـتێکی خـەمگین لـە ڕووخسـاری ناسـکیدا وەدەرکەوت. وەڵامی دامەوە:

– نـ... نە.

درێژەم پێ دا:

– داوای لێبووردن دەکەم! ئێستە لەسەر خۆم نیم، هەست دەکـەم نـەدەبوو ئـاوا ئـەم باسـە بکەمـەوە... وەڵێ ئیدی جیاوازیی نییە! لام وایە باشترین شت ئەوەیە کە بە ڕاشکاوی ئەم مەسەلانە باس بکرێن. دانی پێدا دەنێم... یانی دەمویست بڵێم... ئێوە دەزانن خاڵە گیان نیازی چیی هەیە؟ داوای لە من کردووە کە خوازبێنیی ئێوە بکەم...

ناسـتینکا کـە لـە تـاو هەیـەجان سـوور هەڵگـەڕابوو، دەمودەسـت قسەمی پێ بڕی و گوتی:

– ئاه، قسەی بێمانا مەکەن! تکا دەکەم قسەی وا مەکەن!

کیرم خواردبوو. گوتم:

– بێمانای چی؟ خۆی ئەوەی بۆ نووسیوم.

زۆر بە ڕاشکاوی پرسیی:

– یانی دواجار ئیشی خۆی کرد؟ وای کە مرۆڤێکی سەیرە! بەڵێنی دابوو نەینووسیٚ! حەیاچوونە! خوایە گیان، چ حەیاچوونێکە!

من کە نەمدەزانی دەبێت چی بڵێم، بە منگەمنگ گوتم:

– داوای لێبووردن دەکەم، پێدەچێ بێڕێزیم کردبێ... بەس هەر بە ڕاستی بارودۆخێکی سەیرە! خۆ خۆتان دەیبینن، هەر بە تەنیا خوا دەزانێ چی بە چییە...

– ئاخ، توخوا داوای لێبووردن مەکەن! بڕوا بکەن بیستنی ئەم قسانە بیٚ هیچ لە بەردڵم گرانن، جا ڕوونکردنەوەشی بۆ بدەن. هەر خۆشم دەمویست قسەتان لەگەڵ بکەم تا هەندیٚ شت بزانم... وای کە چەندە مایەی داخە! لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، هەر ئیشی خۆی کرد! هەر لەوە دەترسام! خوایە گیان، مرۆڤێکی چەندە سەیرە! جا ئیوەش بڕواتان کرد و خێرا بە ڕاکەڕاك خۆتان گەیاندە ئێرە؟ هەر ئەوەمان کەم بوو!

ناستینکا داخلەدڵی و پەژارەی خۆی نەدەشاردەوە. بارودۆخێکی سەیر بوو. بەوپەڕی شەرمەزارییەوە گوتم:

– دانی پێدا دەنێم، بە هیچ شێوەیەك چاوەڕێی بارودۆخێکی لەو جۆرە نەبووم... بە پێەوانەوە، وام بیر دەکردەوە کە...

وەك گاڵتەپێهاتنێك گوتی:

– بیرتان لە چی دەکردەوە، ها؟

وەلێ دواتر لێوی گازاند و لەسەری ڕۆیشت:

– دەکرێ ئەو نامەیەم نیشان بدەن، کە نووسیویەتی؟

– بێ گومان.

پاشان بزەیکی شیرین و دڵگیر نیشتە سەر لێوە جوانەکانی و بە شێوازێکی مەیلەوپاڕانەوەوە گوتی:

– تکایە لێم قەڵس و نیگەران مەبن، بەشی خۆم مەینەتی و چارەڕەشم!

بە تین و تاوەوە گوتم:

– ئۆو، تکایە، نەکا بە نەفامم بزانن! وا دیارە ئێوە بە هەڵە لە من تێگەیشتوون. لەوانەیە کەسێك لای ئێوە خراپەی منی گوتبێ. ڕەنگە لەبەر ئەوەش بێ کە لەوێ، لە ژوورەکەدا سەرسمم دا، ها؟ بەس ئەوە گرنگ نییە. دڵنیا بن. خۆم دەزانم ئێستە چەندە نەفام دێمە بەرچاوتان. تکایە پێم پێمەکەنن! ئەسڵەن نازام چی دەڵێم... ئەمە هەمووشی بە بۆنەی ئەو بیستودووساڵییە نەفرەتییەوەیە!

– ئۆو، وای خوایە! ئاخر بۆچی؟

– چۆن بۆچی؟ دەی نەزانی لکاوە بە تەویڵی هەر مرۆڤێکی بیستودوو ساڵەوە، بۆ نموونە، هەر ئەمڕۆ کتوپڕ پەڕیمە ناوەڕاستی ژوورەکەوە، یان بۆ نموونە، هەڵسوکەوتی ئێستەم لەگەڵ ئێوە... تەمەنێکی شوومە ئەم بیستودوو ساڵییە.

ناستینکا لە بارێکدا کە بە زۆر بەری بە پێکەنینی خۆی گرتبوو، گوتی:

– ئۆو، نا، نا! دڵنیام کە ئێوە هەم میهرەبانن و هەم ژیر. ئەوە راستە، من راستگۆیانە وا دەڵێم! وەڵێ... تەنیا زۆر لووتبەرز و خۆپەرستی، جا بۆ چاککردنی ئەوەش هێشتا درەنگ نییە.

– لام وایە هەر ئەوەندە لووتبەرزم کە پێویستە.

– نەخێر. بۆ نموونە ئەمڕۆ تەریق بوونەوە. ئاخر بۆچی؟ هەر لەبەر ئەوەی کە لە بەردەرگەکەدا سەرسمتان دا!... یانی مافی ئەوەتان هەبوو کە خاڵەی نەرمونیان و شەریفتان، کە ئەو هەمووە چاکەیەی بەسەرتانەوە هەیە، بکەنە گاڵتەجاڕی ئەوانی دی؟ بۆ ئەوتان کردە گاڵتەجاڕ، لە بارێکدا کە خۆتان مایەی پێکەنین بوون؟ هەر بە ڕاستی شوورەییە! ئەم کارە لە سەنگتان زیاد ناکا و دەبێ دانی پێدا بنێم کە لەو ساتەدا زۆر ڕقم لێتان کەوت. دەی، خۆتان داوەری بکەن!

– ڕاستە! نەفام بووم! تەنانەت لەوەش خراپتر: کارێکی ناشیرینم کرد! ئێوە باش تێگەیشتن و ئێستاکەش دەبێ باجەکەی بدەم! بەڵێ، سەرکۆنەم بکەن، پێم پێبکەنن، وەڵێ گوێ لە قسەکانم بگرن...

جا بە هەستێکی سەیرەوە لەسەری ڕۆیشتم:

– ڕەنگە لە داهاتوودا بۆچوونتان لە بارەی منەوە بگۆڕێ. ئێوە هیچ لەسەر من نازانن... کە پاشان زیاترتان زانی، ئەوسا... لەوانەیە...

ناستینکا پشتووکورتانه هاواری کرد:

– بۆ خاتری خوا با سەری ئەم بابەته بنێینەوە!

– زۆر باشه، ئیدی لەسەری ناڕۆم! وەلێ... بۆ جاری داهاتوو له کوێ بتان بینم؟

– مەبەستتان چییه؟

– دەی، ناستاسیا یۆگرافاونا، خۆ ناکرێ ئەمە دواهەمین گفتوگۆی ئێمە بێ! توخوا لانیکەم با هەر ئەمڕۆ دیدەنیتان بکەم. گەرچی وا، خەریکە هەوا تاریك دادێ. کەواته داینێن بۆ بەیانی، تەنیا گەر دەکرێ با کاتی دیدارەکەمان زوورتر بێ، دەڵێم زووتر بەئاگام بێننەوە. دەزانن، لەوێ لەتەنیشت ئەستێڵکەکەوە کەپرێك هەیه. هێشتا له بیرمە، ڕێگەکەی پێدەزانم. ئاخر بە منداڵی، لەوێ دەژیام.

– دیدەنی؟ بۆچی؟ دەی، خۆ وا ئێسته قسان دەکەین.

– ناستاسیا یۆگرافاونا، وەلێ ئێسته من هیچ نازانم. دەبێ له ئەوەڵین دەرفەتدا هەموو شتێ له خاڵه گیان بپرسم. دواجار دەبێ ئەو باسی هەموو شتێکم بۆ بکا، ئەوسا ڕەنگه باسی بابەتێکی زۆر گرنگتان بۆ بکەم...

ناستینکا هاواری کرد:

– نا، نا! پێویست ناکا! با لێرە هەموو شتێ ببڕینەوە و ئیدی هیچ قسەیەك نەمێنێتەوە و هەموو شتێ له بیر بکرێ. جا هەر لەخۆشتانەوە مەچنە ژێر کەپرەکە: دڵنیا بن کە نایێم، تکا دەکەم

هەموو ئەم هەڵیتوپەڵیتانە لە مێشکتان دەرکەن. هەر بە جددی تکاتان لێ دەکەم...

من کە تەریق بووبوومەوە و بێهیواییەکی سەیر دایگرتبووم، هاوارم کرد:

- کەواتە خاڵم وەك شێتێك هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردووم! مادام وایە، ئەی بۆ منی بانگهێشت کردووە بۆ ئێرە؟... ئەی ئەم بگرە و بەردەیە لەسەر چییە؟

ئێمە هێندە لە ماڵەوە دوور نەبووین. لە پەنجەرەکانەوە دەنگی قیژەووڕ و هاوارگەلی سەیروسەمەرە دەهات. ناستینکا کە ڕەنگی بە ڕووەوە نەمابوو، گوتی:

- خوایە گیان! دیسان دەستیان پێ کردەوە! هەر دەمزانی!

- چیتان دەزانی؟ ناستاسیا یۆگرافاونا، پرسیارێکی دی، ڕاستە من بە هیچ شێوەیەك مافی خۆهەڵقوورتاندنم لەوەدا نییە، وەلێ دەمەوێ دواهەمین پرسیاری خۆمتان لێ بکەم کە لە بەرژەوەندیی هەمووماندایە. پێم بڵێن -هەڵبەتە تا ئەو ڕۆژەی کە زیندووم، قسەکەتان لە بیر ناکەم- ڕاستگۆیانە پێم بڵێن، ئایا خاڵە دڵی بە ئێوەوەیە یان نا؟

ناستینکا کە لە ڕقان سوور هەڵگەڕابوو، هاواری کرد:

- ئاە! تکا دەکەم بۆ تاهەتا ئەم هەڵیتوپەڵیتانە لە مێشکی خۆتاندا بسڕنەوە!

جا پاشان بە بزەیەکی تاڵەوە درێژەی پێدا:

– خۆ ئێوەش هەر ئەو قسەیە دەکەن! گەر دڵی بە منەوە با، خۆی نەیدەویست بە ئێوەم بداتە شوو. بۆچی، بۆچی وا بیردەکەنەوە؟ هەر بە ڕاستی تێناگەن مەسەلە چییە؟ ئەم هاتوهاوارە نابیستن؟

– وەڵێ... ئەمە هەمووی بە بۆنەی فۆما فۆمیچەوەیە...

– بەڵێ، بێ گومان بە بۆنەی فۆما فۆمیچەوەیە، وەڵێ ئێستە کێشەی سەرەکی منم، چونکە ئەوانیش هەمان قسەی ئێوە دەکەن، هەر ئەم هەڵیتوپەڵیتانە دەڵێن، ئەوانیش وا دەزانن کە شەیدای من بووە. من کەسێکی داماو و بێپشت و پەنام و لەکەدارکردنم کارێکی ئاسانە، ئەوانیش هەموو هەوڵی خۆیان دەخەنە گەڕ تا ئەو لەگەڵ کەسێکی دیکە زەماوەند بکا. جا بۆ ئەوەی ئیدی خەمی هیچ شتێکیان نەبێ، سوورن لەسەر ئەوەی لەم ماڵەم دەرپەڕێنن و بمنێرنەوە ماڵی باوکم. بەس کاتێ وەها قسەیەك بەو دەڵێن، وا هار دەبێ کە تەنانەت ئامادەیە فۆما فۆمیچ لەتوپەت بکا. ئێستە هاتوهاواریان لەسەر ئەمەیە، دڵم خەبەری داوە کە دەمەقاڵەیان لەسەر ئەم بابەتەیە.

– کەواتە ڕاستە! یانی دەیەوێ لەگەڵ ئەم تاتیانایەدا زەماوەند بکا؟

– کامە تاتیانا؟

– دەی، لەگەڵ هەمان ئەو چەتیوە گەمژەیە ئیدی.

– ئەسلەن گەمژە نییە! ژنێکی باشیشە. ئێوە مافی ئەوەتان نییە بەم جۆرە قسەی لەسەر بکەن! دڵێکی باشی هەیە، باشتر لە دڵی زۆر کەسانی دی.

– ببوورن. با وای دانێین کە ئێوە بە تەواوی لەسەر هەقن، وەلێ شتێکی زۆر گرنگتان لە بیر کردووە. گەر وایە، ئەی بۆچی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ باوکی ئێوەدا باشە؟ گەر وەك خۆتان دەڵێن ئەوان تا ئەم رادە لێتان پەستن و دەیانەوێ لەم ماڵەتان دەرپەڕێنن، کەواتە دەبێ لەویش پەست بن و هەڵسوکەوتێکی خراپیان لەگەڵیدا هەبێ.

– بۆ نابینن باوکم لەبەر خاتری من چی دەکا! خۆی کردووە بە گەپجاڕی ئەوان! تەنیا لەبەر ئەوە پێشوازیی لێ دەکەن کە باش دەتوانێ مەراییکاری بۆ فۆما فۆمیچ بکا. بۆ فۆما فۆمیچێك کە خۆی سەردەمانێ گەپجاڕ بووبێ، ئێستە زۆر خۆشە خۆی گەپجاڕێکی هەبێ. ئێوە بیر لە چی دەکەنەوە، لەوەی کە باوکم بۆ وا دەکا؟ لەبەر من، تەنیا لەبەر من. ئەو بۆخۆی هەرگیز پێویستیی بەوە نییە، لەبەر خۆی هیچ کاتێ سەر بۆ کەس دانانەوێنێ. ڕەنگە بۆ کەسانێ گاڵتەجاڕ بێتە بەرچاو، وەلێ کەسێکی ئێجگار ئاوڕوومەندە! تەنیا خوا ئاگادارە کە بۆچی وا دەزانێ باشتر وایە لەم ماڵە بمێنمەوە. هەڵبەتە باوەڕ کەن، لەبەر ئەوە نییە کە من لەم ماڵەدا مووچەیەکی باش وەردەگرم. وەلێ دواجار بە تەواوی لەم کارەم پەشیمان کردەوە. زۆر لێبڕاوانە بۆم نووسی. وا ئێستەش هاتووەتە ئێرە تا لەگەڵ خۆییم ببا. گەر قسە بگاتە ناسکی، بەیانی ئێرە جێ دێڵم، چونکە دۆخەکە بە بەریەوە نەماوە. لێرە هیچ کەسێ چاوی بە ڕوومدا

هەڵنایێ. ئامادەن لەتوپەتم بکەن و دڵنیاشم کە هەراوهوریاشیان هەر لەسەر ئەم بابەتەیە. ئەوان لەسەر من، ئەو دەکوژن! بە هەرحاڵ، ئەو وەك باوکم وایە. گوێتان لێیە؟ تەنانەت زۆر لە باوکیشم باشتر بووە بۆ من! ئیدی نامەوێ چاوەڕوانی بکەم. لە هەموویان زیاتر ئاگاداری مەسەلەکەم. بەیانی، هەر ئەم بەیانییە لێرە دەڕۆم! کێ چووزانێ: لەوانەیە بەم کارە، لانیکەم بۆ ماوەیەك زەماوەندەکەی لەگەڵ تاتیانا ئیڤانۆڤنا دوابخەن... دەی ئیدی، هەموو شتێکم پێ گوتن. ئەم قسانەش بگەیەننە خاڵەتان، چونکە ئێستە ناتوانم قسەی لەگەڵ بکەم. هەمووان بە وردی چاودێریمان دەکەن، بە تایبەت ئەم پرەی پێلیتسینایە. پێی بڵێن خەمی نەبێ. وام پێ باشترە نانی ڕەش بخۆم و لە کەویڵەکەی باوکمدا بژیم تا لێرە ببمە هۆی دەردیسەری بۆ ئەو. من هەژارم و هەر دەبێ وەك باوکیشم هەژارانە بژیم. ئای خوایە، چ هەڵایەکیان ناوەتەوە! وای لەو قیڕوهووڕە! هەر بە ڕاست لەوێ چ باسە؟ نا، لێگەڕێ، قیروسیا، هەر ئێستە خۆم دەچمە ئەوێ! چی دەبێ با ببێ، خۆم هەموو شتێکیان پێ دەڵێم! دەبێ وا بکەم. خواحافیز!

جا ڕایکرد و ڕۆیشت. لە جێی خۆم ڕاوەستابووم و بیرم لەو ڕۆڵە گاڵتەجاڕانەیە دەکردەوە کە دەبوو بیگێڕم و نەمدەتوانی سۆسەی ئەوە بکەم کە مەسەلەکە بە کوێ دەگات. دڵم بەو کچە داماوە دەسووتا و خەمی خاڵەم بوو. کتوپڕ سەروشکڵکی گاڤریلا وەدەرکەوت. هێشتا تێنووسی ڕاهێنەکەی بە دەستەوە بوو. بە دەنگێکی زویرەوە گوتی:

– تەشریف بەرن بۆ لای خاڵە گیان!

کتوپڕ ڕاچەنیم و هاتمەوە سەر خۆم.

– بۆ لای خاڵە؟ وەڵێ ئەو لە کوێیە؟ چیی بەسەر هاتووە؟

– لـە هـۆدەی چـاخواردنەوەن. هـەمان ئـەو شـوێنەی کـە ئـەمڕۆ چاتان تێدا نۆشی.

– کێی دیکەی لێیە؟

– هەر خۆیانن و چاوەڕێن.

– چاوەڕێی کێ؟ چاوەڕێی من؟

– ناردوویانە بەدوای فۆما فایچدا.

جا ئاهێکی هەڵکێشا و بۆی زیاد کرد:

– ڕۆژانێکی خۆشمان لە بەردەمدان!

– بەدوای فۆما فۆمیچدا! ئمم! ئەی ئەوانی دی لە کوێن؟ خانم لە کوێن؟

– لــە ئــەپارتمانی ژنەکانــدان. بووڕابوونــەوە و ئێســتەش بــێ هەپوکۆ کەوتوون و دەگریێن.

بەدەم قسەرکردنەوە گەیشتینە هەیوان. هەوا بە تەواوی تاریکی کردبوو. خاڵە هەر بە ڕاستی لەو ژوورەدا تەنیا بوو. لەو کاتەی کە من و فۆما فۆمیچ گیرابووینە یەکدی، ئەو بە هەنگاوگەلی درێژەوە هەر هاتوچۆی بوو. مۆم بەسەر مێزەوەکانەوە داگیرسابوو. کە چاوی پێم کەوت، فرکەیەکی بەرەو لام کرد و توونـد دەسـتمی گوشـی. ڕەنگـی پـەڕی بـوو و بـە دژواری هەناسـەی دەدا، دەسـتەکانی دەلـەرزین و جاروبار لەرەیەکی دەماریی بە لەشدا دەهات.

# وەرزی نۆیەم

## پایەبەرز

خاڵە بە ئاوازێکی خەمگین و هێمن گوتی:

- هاوڕێکەم! هەموو شتێ کۆتایی هات، بڕیاری خۆمم داوە!

گوتم:

- خاڵە گیان، دەنگی قیژوهووڕم بیست.

- بەڵێ، ئەوەی بیستووەتە ڕاستە، برالە، هەمووان قیژوهووڕیانە! دایە گیان بووراوەتەوە و دۆخەکە تێك چووە، وەلێ من بڕیاری خۆمم داوە و ئیدی پاشگەز نابمەوە. سیریۆژا، ئێستە ئیدی سڵ لە هیچ کەسێ ناکەمەوە. دەمەوێ نیشانی هەموانی بدەم کە مرۆڤێکی بەئیرادەم، جا بە چاوی خۆیشت دەیبینی کە ئەوە دەسەلمێنم! بە تایبەت ناردمە شوێنت تا لەم مەسەلەیەدا یارمەتیم بدەی... سیریۆژا، دڵم شکاوە... وەلێ ناچارم بەوپەڕی توندییەوە هەڵسوکەوت بکەم. خۆ ئەو کابرایە لە کەلی شەیتان نایێتە خوارێ!

- بۆ چی ڕووی داوە، خاڵە گیان؟

خاڵە بە شێوازێکی لێبڕاوانە گوتی:

- دەمەوێ ئیدی لە فۆما جیا بینەوە.

به دڵخۆشییەوە هاوارم کرد:

– خاڵە گیان! جا چی لەوە باشتر! بۆ هەر شتێ لـه خزمەتانـدام و درێغی ناکەم... بۆ هەمیشە دەتوانن پشتم پێ ببەستن.

– سوپاسـت دەکـەم برالـە، سوپاسـت دەکـەم! بـە هـەرحاڵ، مـن بڕیاری خۆم داوە. چاوەڕێی فۆمام، ناردوومە بە دوایدا. یـان ئـەو، یان من! دەبێ لێك جیا بینەوە. یـان ئـەوەتا سـبەینێ فۆمـا ئێـرە جـێ دێڵـێ یـان –سـوێند بـە خـوا– دەسـت لـە هـەموو شـتێ بـەردەدەم و دەچمە ڕیزی سوارەی سـەربازی! بـێ گومـان پێشوازیم لـێ دەکـەن و گوردانێکم پێ دەسپێرن. تف لە ژیانی ئاوا! ئیدی لە ئێستە بەدواوە هەموو شتێ دەگۆڕێ!

جا ڕووی کردە گاڤریلا و گوتی:

– ئەو دەفتەری وانە فەڕەنسییە چـی دەکا بە دەستتەوە؟ ئادەی فڕێـی دە! خێـرا ئـاگری تێبـەردە! بیخـە ژێـر پـێ، لەتوپـەتی کـە! مـن گەورەی تۆم، هەر منیش فـەرمانت پـێ دەدەم کـە ئیـدی فێـری زمـانی فەڕەنسـی نـەبی. تـۆ نـاتوانی لـە فـەرمانی مـن دەرچـی، یـانی زاتـی ئەوەشت نییە، چونکە من گەورەتم، نەك فۆما فۆمیچ!...

گاڤریلا لە بەرخۆوە ورتاندی:

– خوایە، شوکرم بە بەشت!

وا دیـاربوو مەسـەلەکە جددییـە. خاڵـە بـە هەسـتێکی قووڵـەوە درێژەی پێ دا:

– هاوڕێکـەم، ئـەوەی کـە لـە بەنـدەیان دەوێ، شـتێکی نەکردەیـە! خـۆت داوەری بکـە، وەك داوەرێکـی بێلایـەن داوەری لـەنێوان مـن و

فۆمادا بکە. تۆ نازانی چاوەڕوانیی چیم لێ دەکەن. هەر بە فەرمی داواکەیانیان ڕاگەیاند و قسەی خۆیان کرد! بەس ئەمە پێچەوانەی مرۆڤدۆستی و دلێری و ئاوڕوومەندییە...

قسەم پێ بڕی و گوتم:

– خاڵە گیان، ئیدی هەموو شتێ دەزانم! یانی دەتوانم سۆسەی بکەم... هەر ئێستە قسەم لەگەڵ ناستاسیا یۆگرافاونا کرد.

خاڵە کە دەتگوت ترساوە، قسەی پێ بڕیم و گوتی:

– هاوڕێکەم، ئێستە هیچ مەڵێ، لەم بارەیەوە هەر هیچ مەڵێ! دوایی خۆم هەموو شتێکت بۆ دەگێڕمەوە، بەس جارێ...

کتوپڕ بەسەر ڤیدۆپلیاسۆڤدا، کە تازە هاتبووە ژوورێ، قیڕاندی:

– چی بووە؟ ئەی کوا فۆما فۆمیچ؟

ڤیدۆپلیاسۆڤ هاتبوو تا ڕایبگەیەنێت کە فۆما فۆمیچ *دڵیان پێوە نییە بێن و بڕوایان وایە کە ئەم داوایە لە ڕادەبەدەر زۆردارانەیە و ئەو ئیجگار زویرە.*

خاڵە پێی بە زەویدا کوتی و هاواری کرد:

– بڕۆ بیهێنە! گەر بە کێشەکێشیش بووە بیهێنە ئێرە! بیهێنە ئێرە! بە زۆر کێشی کە ئێرە!

ڤیدۆپلیاسۆڤ، کە هەرگیز خودانەکەی خۆی ئاوها بە تووڕەیی نەدیتبوو، لە ترسان قووچاندی. زۆر حەپەسابووم. لە دڵی خۆمدا گوتم:

– دەبێ بابەتێکی زۆر گرنگ لە ئارادا بێ کە مرۆڤێک بەو کەسایەتییەوە تا ئەم ڕادەیە تووڕە ببێت و وەها بڕیارێك بدات.

خاڵە، وەك ئەوەی کە لەگەڵ خۆی لە کێشمەکێشدا بێت، بۆ چەند خولەکێك بە ژوورەکەدا ئەمبەر و ئەوبەری دەکرد. دواجار بە گاڤریلای گوت:

– تۆش پێویست ناکا دەفتەرەکەت بدڕێنی. جارێ پەلە مەکە و لێرە بمێنەوە نەکا پێویستیم پێت بێ.

پاشان ڕووی کردە من و گوتی:

– هاوڕێکەم، وا دیارە من هاتوهاواری زۆرم کرد. هەموو کارێك پێویستە بە قوورسوقوڵی و پیاوەتی و بێ هاتوهاوار و سووکایەتیپێکردن ئەنجام بدرێ. وایە. دەزانی، سیریۆژا، ئەسڵەن باشتر نییە تۆ لێرە بڕۆی؟ خۆ بۆ تۆ جیاوازیی نییە. دواتر خۆم هەموو شتێکت بۆ دەگێڕمەوە، ها؟ ڕات چییە؟ تکا دەکەم لەبەر من ئەوە بکە.

واقووڕ تەماشای چاویم کرد و گوتم:

– خاڵە گیان، ئێوە دەترسێن؟ پەشیمان بوونەوە؟

خاڵە بە جددییەتێکی زیاترەوە گوتی:

– نا، نا، هاوڕێکەم، پەشیمان نەبوومەتەوە! ئیدی ترسم لە هیچ شتێ نییە. ئیدی لە بڕیارداندا جددیم، بە لێبڕاوانەترین شێوە بڕیارم داوە! تۆ نازانی، تۆ تەنانەت ناتوانی وێنای ئەوە بکەی کە ئەوانە چییان لە من دەوێ! یانی دەبێ من بچمە ژێر باری قسەکانیان؟ نا،

من مل نادەم! لە بەردەمیاندا ڕادەوەستم و حاڵییان دەکەم! دواجار درەنگ یان زوو دەبێ خۆمیان بۆ بسەلمێنم! وەڵێ دەزانی، هاوڕێکەم، لەوە پەشیمانم کە بۆچی تۆم بانگ کرد. ڕەنگە ئەوە بۆ فۆما فۆمیچ زۆر سەخت بێ کە تۆ لێرە بی و حورمەتشکانی ببنی. سەیر کە، دەمەوێ بە شێوەیەکی دلێرانە و بێ سووکایەتیپێکردن جوابی بکەم. هەڵبەتە وشەی بێ سووکایەتیپێکردن تەنیا قسەیە. براله، بێ گومان دەربڕینی نیازێکی لەو جۆرە، تەنانەت بە شیرینترین وشەش هەر سووکایەتیپێکردنە. ئاخر من بێئەدەب و نەزانکەلامم و ڕەنگە لە گەمژەیی خۆمەوە بە جۆرێك هەڵسوکەوت بکەم کە پاشان خۆم لێی پەشیمان ببمەوە. بە هەرحاڵ، ئەو ئیشی زۆری بۆ من کردووە... بڕۆ، هاوڕێکەم... هاکا ئەویان هێنا! سیریۆژا، تکا دەکەم ئێرە جێبێڵە! دواتر هەموو شتێکت بۆ دەگێڕمەوە. بۆ خاتر مەسیح لێرە بڕۆ!

هەر لەو ساتەدا کە فۆما خەریکبوو دەهاتە ژوورێ، خاڵە منی ناردە هەیوانەکە. دانی پێدا دەنێم کە بڕیام دا هەر لەوێ، لە هەیوانەکەدا بمێنمەوە. هەیوانەکە تاریك بوو و بە دژواری کەسێك دەیتوانی لە ژوورەوەڕا بمبینێت. بڕیارم دا بە دزییەوە گوێ هەڵبخەم!

هەڵبەتە من پاکانە بۆ کارەکەی خۆم ناکەم، بەس دەتوانم بە بوێرییەوە بڵێم هەمان ئەو نیو کاتژمێرەی کە بە پشوودرێژییەوە لە هەیوانەکەدا ڕاوەستام، بۆ خۆی کارێکی سەخت و دلێرانە بوو. لەو شوێنەی کە لێی ڕاوەستابووم، نەك هەر بە تەنیا دەمتوانی قسەکانیان ببیستم، بەڵکە بە باشی هەردووکیشیانم دەبینی، ئاخر

دەرگەکان شووشەیی بوون. ئێستە داواتان لێ دەکەم فۆما فۆمیچێك بێننە بەرچاوی خۆتان کە فەرمانی پێ کرابوو بێتە ئەوێ و هەڕەشەشی لێ کرابوو گەر مل نەدات، ئەوا بە زۆر بیهێنن. فۆما کە چووە ژوورێ، هاواری کرد:

- سەرهەنگ، ئەوە ئەو هەڕەشانە ڕاستن کە بەر گوێم کەوتوون؟ ئەم قسانە هی خودی ئێوەن؟

خاڵە ئازایەنە هاتە وەڵام:

- بەڵێ، ڕاستن فۆما، لەسەرخۆ بە. دانیشە با وەکو دوو هاوڕێ، دوو برا، بە جددی پێکەوە قسان بکەین. دانیشە فۆما.

فۆما فۆمیچ قورسوقۆڵانە لەسەر قەنەفەکە دانیشت. خاڵە بە هەنگاوگەلی خێرا و ناڕێکەوە بە ژوورەکەدا ئاموشۆی دەکرد. وا دیاربوو نازانێت لە کوێوە دەست پێ بکات. دواجار گوتی:

- ڕێك وەکو دوو برا. فۆما، تۆ باش لە قسەکانم حاڵی دەبی، منداڵ نیی، منیش منداڵ نیم. بە کورتییەکەی، تەمەنێکمان کردووە... ئا! دەزانی، فۆما، ئێمە لە بڕێ مەسەلەدا ناکۆکین... بەڵێ، تەنیا لە بڕێ مەسەلەدا. هەر لەبەر ئەوەش، برالە، باشتر نییە لێك جیا بینەوە؟ دڵنیام کە تۆ ئینسانێکی ئاوڕووداری و چاکە و بەرژەوەندیی منت دەوێ، هەر لەبەر ئەوەش... جا بۆچی مەسەلەکە ئەوەندە درێژ بکەینەوە! فۆما، من بۆ هەمیشە هاوڕێت دەبم، ئامادەم سوێند بە تەواوی پیرۆزییەکان بخۆم! ها ئەو پازدە هەزار ڕۆبڵە زیوە بگرە: برالە، ئەمە دارونەداری منە، بە هەزار حاڵێ قرووش قرووش

کـۆم کردووەتـەوە، لـە دەمـی خێزانەکـەمم گرتووەتـەوە. بێمنەتانـە هەڵیگرە! ئەوە ئەرکی منـە کە داهاتوویێکت بۆ دەستەبەر کەم! ئەمـە زۆربـەی ئەسکەناسـە و تـەنیا برێکـی کـەمی پـارەی وردەیـە. هـا، بێمنەتانە هەڵیگرە! تۆ بە هیچ شێوەیەك قەرزاری من نیی، چونکە بە هیچ شێوەیەك ناتوانم قەرەبووی ئەو کارانەت بۆ بکەمەوە کە بۆت کردووم. بەڵێ، بەڵێ، ڕاستە، ئەمە هەستی منـە، گەرچی ئێستە لـە سەرەکیترین مەسەلەدا ئێمـە ناکۆکین. سبەی یان دووسبەی... یان هـەرکات کـە حـەزت کـرد... لێك جیا دەبینـەوە. فۆمـا، بچـۆ بـۆ ئـەو شارۆچکەیەی تەنیشتمان. تەنیا دە وێرستایەك لێرەوە دوورە. لەوێ لە ئەوەڵین کۆڵانـدا کووخێکی پەنجـەرە سـەوزی جوان هەیـە کـە هـی ژنەقەشەیەکە. بڕوا کـە هـەر دەڵێی ئەو کووخـەیان بە تایبـەت بۆ تـۆ درووست کـردووە. ئـەو ژنـە کووخەکـەی دانـاوە بـۆ فرۆشـتن. بـیٚ لـەم پارەیـە، ئـەو کووخەشـت بـۆ دەکـڕم. هـەر لـەوێ لـەنزیك خۆمانـەوە نیشتەجیٚ بـە. خـەریکی کـارە ئـەدەبی و زانیسـتییەکانی خـۆت بـە و ناوبـانگ بەدەسـت بێنـە... کارکـەرانی ئـەوێ هـەمووی ڕووخـۆش و ڕەسەن و میواندۆستن، سەردەستەی قەشەکانیش ئەهلی زانستە. بۆ کاتی ئاهەنگەکانیش وەرەوە بـۆ لای خۆمـان. ئاوهـا ئیـدی وەك ئـەوە وایە لە بەهەشتدا بژین! ئێستە ڕازیی یان نا؟

لە دڵی خۆمدا گوتم:

– کەواتـە بـەم حاڵـەوە دەیـەوێ فۆمـا دەربکـا! خـۆ خاڵـە هـیچ شتێکی لە بارەی پارەوە پیٚ نەگوتبووم.

تا ماوەیەك بێدەنگییەکی قووڵ باڵی بەسەر کەشەکەدا کێشـابوو. فۆمـا وەك ئـەوە کـە تاسـا بێـت، هـەروا بێجووڵـە لەسـەر قەنەفەکـە

دانیشتبوو و سەیری خاڵەی دەکرد، جا وا دیار بوو کە خاڵەش، بەم بێدەنگی و سەیرکردنەی ئەو ئازار دەچێژێت. دواجار فۆما، کە دەسئەنقەست دەنگی کز کردبوو، گوتی:

– پارە! کوا، کوا ئەو پارەیە؟ ئادەی بیهێنن، خێرا بیهێننە ئێرە!

– ئەوەتانێ، فۆما، تا دواهەمین قرووشی من، رێك پازدە هەزارە. هەموو دارونەداری من. هەم کەلاَیە و هەم وردە، ئێستە خۆت دەیبینی... ها ئەوەتا!

فۆما بە نەرمی گوتی:

– گاڤریلا! ئەم پارەیە هەڵگرە بۆ خۆت. ئەم پارەیە بە کەڵکت دێ، پیرەمێرد.

جا پاشان کتوپڕ لەسەر قەنەفەکە درپەڕی و بە زیقەزیقێکی نائاساییەوە گوتی:

– وەلێ نا! نا! گاڤریلا، پارەکانم بدەرێ! بیاندە من! بیاندە من! ئەو ملیۆن ملیۆنانەم بدەیە تا بیانخەمە ژێر پێم، بمدەیە تا بیاندڕێنم و بەر تفیان دەم و پەخشی سەر زەوییان کەم، بمدەیە با باش باش پیساییان بەسەردا کەم!... بەرتیل، بەرتیل دەدەنە من! دەیانەوێ بمکڕن و بە زەبری پارە لەم ماڵەم وەدەرنێن! ئەوە من بووم کە ئەو جۆرە قسانەم بیست؟ یانی منی چارەڕەش بۆ بینینی ئەم ڕسواییانە زیندوو مام؟ ها، ئەوەش ملیۆنەکانتان! سەیر کەن: تەماشا، تەماشا، تەماشا! سەرهەنگ گەر تا ئەمڕۆش منتان نەناسیوە، ئەوا ببینن کە فۆما ئاپاسکین چی دەکا!

جا سەفتە پارەکانی بە ژوورەکەدا پژاندن. سەیر ئەوەبوو کە بە پێچەوانەی هاشوهووشەکانییەوە، هیچ یەك لە کاغەزەکانی نەدڕاندن و تفی لێ نەکردن، تەنیا کەمێك گرمۆڵەی کردن، جا ئەم کارەشی زۆر بە پارێزەوە ئەنجام دا. گاڤریلا ڕایکرد و پارەکانی بەسەر زەوییەوە کۆ کردنەوە و کاتێك کە فۆما ڕۆیشت، لەسەرخۆ دانیەوە دەست گەورەکەی.

ئەم هەڵسوکەوتەی فۆما، بە تەواوی خاڵەی تاساند. ئێستە ئیدی خاڵە بە دەمێکی داچەقیو، تاساو و بێجووڵە لە بەردەم فۆمادا ڕاوەستابوو. فۆما دووبارە گەڕایەوە و لەسەر جێگەکەی دانیشت و وەك کەسێك کە تووشی هەیەجانێکی وەسفهەڵنەگر بووبێت، کەوتبووە هەناسەبڕکێوە. دواجار خاڵە هاتەوە سەرخۆ و گوتی:

– فۆما، تۆ پیاوێکی گەورەی! تۆ جوامێرترینی نێو مرۆڤەکانی.

فۆما بە دەنگێکی نزم، وەلێ هەتا بڵێی بڕوابەخۆبووانەوە گوتی:

– خۆم دەزانم.

– فۆما، بمبوورە! فۆما، من لە ئاست تۆدا کەسێکی چەپەڵم!

فۆما وەك پاڵپشتیکردنی قسەکەی گوتی:

– بەڵێ، ڕاستە!

خاڵە ورووژاوانە درێژەی پێ دا:

– فۆما، من سەرم لە جوامێریی تۆ سووڕ نامێنێ، سەرم لە خۆم سووڕ دەمێنێ کە چۆن توانیم تا ئەم ڕادەیە خۆویست و کوێر و چەپەڵ بم و لە هەلومەرجێکی لەو شێوەیەدا پێشنیاری وەرگرتنی پارەت بۆ بکەم؟ بەس، فۆما، تۆ بە هەڵە لە شتێ تێگەیشتووی، من

نیازی کڕینی تۆم نەبوو. بۆ ئەوە ئەم پارەیەم نەدایتێ تا ئەم ماڵە جێبێڵی، بەڵکە تەنیا دەمویست پارەیەکت پێ بێ و کاتێکیش لە من دوور دەکەویەوە، ئاتاجی کەس نەبی. سووێند دەخۆم نیەتم وا بوو! فۆما، ئامادەم، بکەومە سەر ئەژنۆ، سەر ئەژنۆ و داوای لێبووردنت لێ بکەم. گەر بتەوێ هەر ئێستە دەکەومە سەر ئەژنۆ... تەنیا گەر بتەوێ...

– سەرهەنگ، پێویستیم بە کەوتنەسەرئەژنۆی ئێوە نییە!...

– بەس، خوایە گیان! فۆما، خۆت داوەری کە، ئاخر من تووڕە بووم، تووشی شۆك بووبووم، لەسەر خۆم نەبووم... دەی ئێستە چی بکەم، بڵێ چۆن دەتوانم، چۆن دەتوانم وا بکەم دڵت لێم پاك بێتەوە؟ بڵێ، چۆن...

– بە هیچ جۆرێ، سەرهەنگ، بە هیچ جۆرێ! دڵنیا بن کە سەرلەبەیانی ئەم ماڵە جێدێڵم.

فۆما ویستی لەسەر قەنەفەکە هەستێتەوە کە خاڵە تۆقیوانە ڕایکرد تا بەر بە ڕۆیشتنی بگرێت و هاواری کرد:

– نا، فۆما، تۆ ناڕۆی، دڵنیا بە! فۆما، نابێ باسی ڕۆیشتن بکەی! تۆ ناچی بۆ هیچ کوێ، گەرنا تا ئەوسەری دونیاش دوات دەکەوم. ئەوەندە دوات دەکەوم تا دواجار لێم خۆش بی... فۆما، سوێند دەخۆم کە وا دەکەم!

فۆما گوتی:

– لە ئێوە خۆش بم؟ وەلێ ئێوە گوناحکارن. ئێوە دەزانن کە هەڵەیەکی دیکەشتان بەرانبەر کردووم؟ دەزانن، هەر ئێستە، تەنانەت

لەبەر ئەو پاررووە نانەش کە پێتان داوم گوناحکارن؟ دەزانن هەموو ئەو پاررووە نانانەی کە پێشتر لە ماڵەکەتاندا خواردوومن، لە یەک ساتدا ژەهراویتان کردن؟ ئێستە ئێوە ئەو پاررووە نانانەتان بە ڕوودا دامەوە کە پێشتر خواردوومن، ئێوە سەلماندتان کە من لە ماڵی ئێوەدا وەك بەندە و خزمەتکارێکم و لە ئاستی دەسرِی پێلاوە بۆیاخکراوەکانتاندام! کەچی منی دڵساف وام دەزانی تا ئێستە وەك هاوڕێ یان برایەکی ئێوە لەم ماڵەدا دەژیم! چما ئێوە بەو زمانە چزوودارەی خۆتانەوە تا ئێستە هەزار جار باسی ئەم هاوڕێیەتی و برایەتییەی نێوان ئێمەتان نەکردووە؟ ئەی بۆچی لەژێرەوە ئەم داوەتان نایەوە تا من وەکو گەمژە تێی کەوم؟ بۆ لە تاریکیدا ئەم چاڵەتان هەڵکەند و بە پاڵێك منتان خستە ناوی؟ بۆ هەر لە سەرەتاوە تێلایەکتان بە سەرمدا نەکێشا؟ بۆ هەر لە سەرەتاوە سەرمتان لە لەشم جیا نەکردەوە؟ ڕێك وەکو کەڵەشێرێك... تەنیا لەبەر ئەوەش کە هێلکە ناکا. بەڵێ، ڕێك وایە! گەرچی ئەم پێکچوواندنە لە ژیانێکی لادێییانەوە وەرگیراوە و نزمیی ئاستی ئەدەبیاتی هاوچەرخ نیشان دەدا، لەگەڵ ئەوەشدا، من جەخت لەسەر ئەو پێکچوواندنە دەکەمەوە، چونکە هەر هێندەی ئەو کەڵەشێرە نەگبەتە تاوانبارم کە نەیتوانیووە بە هێلکەکردن ڕەزامەندیی خاوەنە بێمێشکەکەی بەدەست بهێنێ! ئێوە سەرپشکن، سەرهەنگ! ئایا ئەمە ڕاستە کە هاوڕێ یان براکەتان بە پارە بکڕن... ئاخر لەپای چی؟ ئەوە گرنگە کە لەپای چی؟ دەڵێن *وەرە، برای ئازیزم، من قەرزای تۆم: تۆ تەنانەت ژیانی منت نەجات داوە: ها ئەو بڕە زیوە یەموودیە بگرە، بەس لە بەرچاوم ون بە!* ئای لەو ساویلکەییە! ئێوە هەڵسوکەوتێکی

فرە زۆردارانەتان لەگەڵ کردم! واتان زانیوە چاوم لە پارەی ئێوەیە و کەچی منیش، بە ڕۆحێکی بەهەشتییەوە تەنیا ویستوومە بەختەوەریی ئێوە دەستەبەر کەم. وای چۆن دڵتان شکاندم! ئێوە وەك چۆن کوڕیژگەیەك یاریی سوایکا[1] دەکا، بە هەمان شێوە یاریتان بە هەستە پاکەکانی من کرد! جەنابی سەرهەنگ، هەر لە زووەوە پێشبینیی هەموو ئەم شتانەم دەکرد... هەر لەبەر ئەوەش لەو کاتانەوە نانی ئێوەم لە قوڕگ ناچێتە خوار و وا دەمخنکێنێ! هەر لەبەر ئەوەشە کە جێخەوە پەڕییەکەی ئێوە لەباتی ئەوەی بملاوێنێتەوە، هەراسانم دەکا! هەر لەبەر ئەوەشە کە شەکر و شیرینیی ئێوەم لێ بووەتە بیبەری کاییێنی![2] نەخێر، سەرهەنگ! وا باشە بە تەنیا بژین و بۆ خۆتان خۆش ڕایبوێرن و فۆما پشتگوێ خەن تا بە دونیایەك کوێرەوەری و خەفەتەوە کۆڵ و باری خۆی بپێچێتەوە و بەڕێی خۆیدا بڕوا. سەرهەنگ، هەر وا دەبێ!

خاڵە لە بارێکدا کە بە تەواوی تێك شکابوو، بە کڕووزە و نووزەوە گوتی:

– نا، فۆما، نا! ئەوە ڕوو نادا! ناکرێ ئەوە ڕوو بدا!

– بەڵێ، سەرهەنگ، بەڵێ! بە دڵنیاییەوە ئەوە ڕوودەدا، هەر دەبێ ئەوە ڕووبدا. هەر ئەم بەیانییە جێتان دێڵم. گەر ملیۆنە

---

١. جۆرە یارییەکی میلیی ڕووسییە.

٢. ناوی پایتەختی گوایا، لەو شوێنانەی کە فەرەنسا لە ئەمریکای باشوور دەستی بەسەردا گرتبوون. ئەم شارە بە یەکێك لە هەناردەکەرانی بیبەر بۆ ئەورووپا دەهاتە ئەژمار.

پارەکانیشتان فڕێدەنە بەر پێم و ڕێگەکەشم فەرش بکەن، گەر بە ئەسکەناسەکانتان ڕێگەی ئێرە تا مۆسکۆشم بۆ بارەپۆش بکەن، ئەوا بە فیز و گاڵتەپێهاتنەوە بەسەریاندا ڕادەبوورم، هەر ئەم پێیە، جەنابی سەرهەنگ، ئەم پێیە بەسەریاندا ڕادەبووڕێ و پیسیان دەکا. فۆما ئۆپیسکین هەر بە تەنیا پاکیی ڕۆحی بەسە! من قسەی خۆمم کرد و دەشیبەمە سەر! ماڵئاوا، جەنابی سەرهەنگ. ماڵ... ئا... وا، سەرهەنگ!...

فۆما دیسان ویستی لەسەر قەنەفەکە هەستێتەوە. خاڵە بەدەم پاڕانەوەوە دەیگوت:

– ببوورە، ببوورە، فۆما! لە بیری کە!...

– یانی ببوورم! وەڵێ ئێوە چ پێویستییەکتان بە لێبووردنی من هەیە؟ زۆر باشە، گریمان لێتانم بووری. من کابرایەکی مەسیحیم و ناتوانم دڵئاوا نەبم، دەکرێ بڵێم کە ئیدی لێتانم بووریوە، بەس ئادەی خۆتان داوەر بن، ئەوە لەگەڵ هیچ ئەقڵێکی ساغ و ڕۆحێکی پاکدا کۆکە کە من یەك خولەکی دی لەم ماڵەدا بمێنمەوە؟ خۆ ئێوە منتان جواب کرد!

– بەڵێ، کۆکە، فۆما!

– کۆکە؟ ئادەی بزانم، لاتان وایە کە ئێستە ئێمە هاوشانی یەکدیین؟ ئەرێ! نەکا هەر بە ڕاستی لەوە حاڵی نەبن کە من –چۆن بیڵێم– بە شەرەف و ویژدانی خۆم ئێوەم هاڕی، جا ئێوەش خودی خۆتان بە هەڵسوکەوتی سووکایەتیئامێزتان هەر بە یەکجاری

خۆتانتـان تـەفروتوونا كـرد! ئێـوە سووكوچـوورك بـوون، كەچـی مـن شكۆدار بووم. ئەی كوا هاوشانی؟ ئایا بیێ ئەم هاوشانییە دەتوانین هاوڕێی یەكدی بین؟ كە ئەمە دەڵێم، دڵم چزەی لێوەدێ، نەك وەكو ئەوەی كە ڕەنگە ئێستە ئێوە وا بیری لێ بكەنەوە كە من پێی دڵخۆش بم و لافتان بەسەردا لێدەم.

– دڵی منیش چزەی لێوە دێ، فۆما، بڕوا كە...

فۆمـا شـێوازە قینئامێزاكـەی خـۆی گـۆڕی و بـە شـێوازێكی شكۆمەندانە درێژەی پێ دا:

– یانی ئەمە ئەو پیاوەیە كە شەوانە لەبەر ئەو خەو نەدەچووە چاوم! چەندان شەو لە جێگەكەم هەڵدەستامەوە و لە بەر ڕووناكیی مۆمەكـەدا دەمگـوت، *ئـەو ئێسـتە بـە پشـتیوانیی تـۆوە ئـاوا بـە ئاسوودەیی خەوتووە. كەواتە فۆما، تۆ مەخەوە و لەبەر ئەو هایی بە*[1]*، ڕەنگە بۆ كامەرانیی ئەم پیاوە، بیرێكی باشترت بە زەینـدا بـێ.* بەڵێ سەرهەنگ، فۆما بەدەم ئێشكگرتنەوە لەم فكر و خەیاڵانەدا بوو! جا ئێسە تەماشا كە ئەم سەرهەنگە چۆن پاداشتی دایەوە! ئیدی بەسە، بەسە!...

– وەلێ، فۆمـا، مـن شـایەنیم، مـن شـایەنی هاوڕێیـەتیی تـۆم... سوێند دەخۆم!

– تـۆ شـایەنی ئـەوەی؟ وەلێ چ گرێنتییـەك لـە ئارادایـە؟ مـن وەك مەسیحییەك لێتـان دەبوورم و تەنانـەت خۆشیشم دەوێن، بەس وەك

---

١. هایی: بەئاگا، بێدار، بەخەبەر. هایی بە: بەئاگا بە، بێدار بە. وشەكە هەورامییە.

مرۆڤیٚ، وەك مرۆڤێكی ئاوڕوودار، نائاگایانە بە چاوێكی سووكەوە لێتان دەڕووانم. من نەك هەر بە تەنیا پێویستە ئێوە بە كەم بزانم، بگرە ئەوە وەك ئەركێك وایە لەسەر شانم، هەمدیسان دەیڵێمەوە، بە حوكمی ئەخلاق ئەركی من ئەوەیە كە ئێوە بە كەم بزانم، لەبەر ئەوەی ئێوە بوونە هۆی سووك و ڕسوابوونی خۆتان، كەچی من لەبەرانبەردا هەڵسوكەوتێكی تەواو دلێرانەم نواند. كامیەك لە پیاوەكانی ئێوە وەها كاردانەوەیەكیان دەبیٚ؟ كامەیان چاو لەو هەموو پارەیە دەپۆشیٚ كە فۆمای هەژار و سووكایەتیپێكراو لە لایەن هەمووانەوە، لەبەر هۆگربوونی بە شكۆ و حورمەتەوە نادیدەی گرت؟ نا، سەرهەنگ، ئێوە بۆ ئەوەی بگەنە ئاستی من، دەبیٚ دونیایەك كاری دلێرانە ئەنجام بدەن. وەلیٚ ئێوە چ كارێكی دلێرانەتان لیٚ دەوەشێتەوە، لە بارێكدا تەنانەت ئەوەندەشتان لیٚ نایێ كە وەك هاوئاستێكی خۆتان، بە «ئێوە» بانگم بكەن و وەك خزمەتكارێك پێم نەڵێن «تۆ»؟

خاڵە بە ناڵاندنەوە گوتی:

– ئاخر فۆما، تۆ هاوڕێمی بۆیە بە تۆ بانگم كردووی! نەمدەزانی پێت ناخۆشە... ئەی خوایە! گەر ئەمەم بزانیبا...

فۆما هەمدیس لەسەری ڕۆیشت:

– ئێوە، ئێوە نەتانتوانی، یان با باشتر بڵێم، نەتانویست ئەم داواكارییە بچووك و بێبایەخەم بهێننە دی كە لێتانم ویستبوو وەك جەنەراڵێك بە *پایەبەرز* بانگم كەن...

– وەڵێ فۆما، ئاخر ئەمە، چووزانم، بە ناپاکییەکی گەورە دادەنرێ.

– ناپاکیی گەورە! دەستەواژەیەك کە لە کتێبەوە فێری بوونە و وەکو تووتی هەر دەیڵێنەوە! وەڵێ ئێوە دەزانن بە نەگوتنی *پایەبەرز*، لە شکۆ و حوورمەتی منتان دا؟ ئێوە پاساوەکانی منتان ڕەد کردنەوە و ڕسواتان کردم و بوونە هۆی ئەوەی کە لە بەرچاوی ئەوانی دیکە وەك دەبەنگێکی هەوەسباز دەرکەوم کە پێویستە ڕێی شێتخانە بگرێتە بەر! یانی خۆم لەوە تێناگەم شتێکی چەندە گاڵتەجاڕانەیە کە بمەوێ بە پایەبەرز بانگ بکرێم، جا منێکیش کە هیچ نرخێ بۆ ئەو پلە و پایە دونیاییانە دانانێم کە ئەگەر بە بەرزەئاکاری پیرۆز نەکرابن؟ گەر ملیۆنێکیشم بدەنێ، ئامادە نیم پلەی جەنەراڵییەکی خاڵی لە بەرزەئاکاری پەسەند بکەم! جا ئێوە، منتان بە بێناوەز دانا! من لەبەر ئێوە حورمەتی خۆمم خستە ژێر پێ و لێگەڕام کە *ئێوە* و ئەو *زانستمەندەتان* بە بێناوەزم دانێن! من بۆ ئەوە داوام لێ کردن ناسناوی جەنەراڵم بدەنێ تا زەینتان ڕووناك بکەمەوە و گەشە بە ئەخلاقتان بدەم و بە تیرێژی ئەندێشەی نوێ بوونتان بشەوقێنم. لە بنەڕەتەوە بۆ ئەوەم بوو تا ئێوە جەنەراڵەکانی دیکەتان لێ نەبنە دیارترین ئەستێرە، دەمویست بۆتان بسەلمێنم کە پلەوپایەی بەری لە ئینسانیەت، بێنرخە و هیچ هۆکارێك لە ئارادا نییە تا بە هاتنی ئەو جەنەراڵەتان ئەوەندە دڵخۆش بن، ئەمەش لە بارێکدا کە ڕەنگە لە دەوری ئێوەدا کەسانێ هەبن کە بە بەرزەئاکاری شەوقێنرابن. وەڵێ ئێوە هەمیشە بەو پلەی سەرهەنگییەتان ئەوەندە

خۆتان بەسەر مندا هەڵکێشاوە کە ئیدی لاتان قوورسە بە پایەبەرز بانگم بکەن. بەڵێ، ئەوە هۆکارەکەیەتی! دەبێ لێرانەدا بۆ هۆکارەکەی بگەڕێی نەك لە کەمکردنەوەی شکۆی ئەوانی دیکەدا! بە گشتی هۆکارەکەی ئەوەیە کە ئێوە سەرهەنگن و منیش تەنیا فۆمایەکی ڕووت...

– نا، فۆما، نا! بڕوا کە وا نییە. تۆ زانستمەندی، تۆ تەنیا فۆما نیی... من ڕێزت لێ دەنێم...

– ڕێزم لێ دەنێن! زۆر باشە! مادام ڕێزم لێ دەنێن، ئادەی بڵێن بزانم، بە بڕوای ئێوە من شیاوی پێگەی جەنەراڵیم؟ خێرا و زۆر بە ڕاشکاوی وەڵام بدەنەوە، شیاوی ئەم پێگەیەم یان نا؟ دەمەوێ ئاگایی و ئاستی تێگەیشتنی ئێوە هەڵبسەنگێنم.

خاڵە بە شانازییەوە گوتی:

– لەبەر حورمەت، ئینسانیەت و تێگەیشتوویی و ئەوپەڕی پاکیی ڕۆحت شایەنی ئەوەی!

– گەر شایەنی ئەوەم، کەواتە بۆ پێم ناڵێن پایەبەرز؟

– فۆما، من... ڕەنگە دواتر بڵێم...

– وەلێ من ئێستە دەمەوێ! من ئێستە ئەوەم دەوێ، سەرهەنگ، من مکووڕانەوە ئەوەم دەوێ! دەزانم کە چەندە ئەمەتان بەلاوە قوورسە و هەر لەبەر ئەوەش لەسەری سوورم. ئەم لەخۆبردوویییەی ئێوە یەکەمین هەنگاوتانە لە ڕێگەی دلێریدا و ئیدی ئەوەتان لە بیر ناچێ کە دەبێ دونیایەك کاری دلێرانە ئەنجام بدەن تا بگەنە ئاستی

من، ئێوە دەبێ بەسەر نەوسی خۆتاندا زاڵ بن، هەروەها من تەنیا بەو شێوەیە بڕوا بە ڕاستگۆیی ئێوە دەکەم...

– فۆما، بێ گومان سبەینێ بە پایەبەرز بانگت دەکەم.

– نەخێر، سەرهەنگ، سەبەینێ نا، سبەینێ لە جێی خۆی. دەمەوێ ئێستە، یانی هەر ئێستە، پێم بڵێن پایەبەرز.

– سەرچاو، فۆما، ئامادەم... بەس بۆ ئێستە، فۆما؟

– جا قەیدی چییە؟ نەکا شەرم بکەن؟ جێی داخە کە شەرم دەکەن.

– دەی، فۆما لام وایە ئامادەم... تەنانەت شانازیش دەکەم... بەس چۆن بیڵێم فۆما، هەروا لە خۆوە بڵێم سلاو، پایەبەرز؟ ئاخر خۆ وا نابێ...

– نەخێر، مەڵێن *سلاو، پایەبەرز*. ئەم شێوازی قسەکردنەتان سووکایەتیئامێزە، شێوەی قسەکردنتان زیاتر لە گاڵتە و لاقردیکردن دەچێ. مۆڵەت نادەم بەم جۆرە گاڵتەم پێ بکرێ. وەرنەوە سەرخۆ، وەرنەوە سەرخۆ سەرهەنگ، خێرا وەرنەوە سەرخۆ! شێوەی قسەکردنتان بگۆڕن!

– فۆما، ئەوە گاڵتە دەکەی؟

– ئیگۆر ئیلیچ، سەرەتا تۆ نا و ئێوە... ئەمە لە بیر مەکەن، هەروەها، فۆماش نا و فۆما فۆمیچ.

– فۆما فۆمیچ، بە خوا خۆشحاڵم! هەر بە ڕاستی خۆشحاڵم... تەنیا نازانم دەبێ چی بڵێم!

- ئێوە لە هەوڵی ئەوەدان تا بزانن لەگەڵ وشەی پایەبەرزدا چ وشەیەکی دیکە بە کار بێنن. لەمە تێدەگەم. وەڵێ دەبوو دەمێ لەوەوبەر بیرتان لەوە بکردباوە! هەڵبەتە دەکرێ چاوپۆشی لەمە بکەین، بە تایبەت بۆ کەسێ کە -گەر بمەوێ بەڕێزانە بیڵێم- نووسەر نییە. کەواتە لەبەر ئەوەی ئێوە نووسەر نین، من یارمەتیتان دەدەم. بەدوای مندا بیڵێنەوە پایەبەرز!

- دەی، پایەبەرز.

- وا نابێ، *دەی، پایەبەرز* نا. تەنیا بڵێن: *پایەبەرز!* سەرهەنگ وا پێتان دەڵێم شێوازی قسەکردنتان بگۆڕن! لەگەڵ ئەوەشدا، هیوادارم پێتان ناخۆش نەبێ ئەگەر ڕاتان دەسپێرم کڕنۆش ببەن و بەدەم دەبڕینی ئەم وشەیەوە کەمێ بەرەو پێش بچەمێنەوە. لە کاتی قسەکردن لەگەڵ جەنەراڵێکدا پێویستە خۆتان بەرەو خوار بچەمێننەوە و بەم کارەش ڕێز و ئامادەیی خۆتان بۆ جێبەجێکردنی فەرمانەکانی نیشان دەدەن. من خۆم لە کۆڕی جەنەراڵەکاندا بوومە و هەموو ئەم شتانەدا دەزانم... کەواتە بڵێن پایەبەرز.

- پایەبەرز...

- *بڵێن پایەبەرز، زۆر خۆشحاڵم کە دواجار ئەو دەرفەتەم بۆ ڕەخسا تا داوای لێبووردنتان لێ بکەم، چونکە لە سەرەتاوە ڕۆحی باڵای ئێوەم نەناسی. ئەرخەیان بن لە داهاتوودا کەمتەرخەمی ناکەم لە وەگەڕخستنی توانای خۆم بۆ بەرژەوەندیی گشتی...* دەی، جارێ ئەمەندەتان بەسە!

ئای خاڵەی داماو! دەبوو سەرلەبەری ئەم گاڵتەجاڕییانە ڕستە بە ڕستە و وشە بە وشە پاتە بکاتەوە! من ڕاوەستابووم و وەك ئەوەی کە تاوانبار بم، سوور هەڵگەڕابووم. لە ڕقان خەریکبوو دەتەقیمەوە. کتوپڕ جەنابی ئەشکەنجەدەر گوتی:

– باشە، ئێستە هەست بە سووکبوون دەکەن، وەك ئەوەی کە فریشتەیەکتان بۆ دابەزیبێ؟... هەست بە ئامادەیی ئەم فریشتەیە دەکەن یان نا؟ وەڵام بدەنەوە!

خاڵە هاتە وەڵام:

– بەڵێ، فۆما، هەر بە ڕاستی هەست بە سووکبوون دەکەم.

– ئێستە کە بەسەر خۆتاندا زاڵ بوون، وا نایێتە بەرچاو، چووزانم، وەك ئەوەی کە ڕۆحتان بە ڕۆنێکی پیرۆز ناورابێ؟[1]

– بەڵێ، فۆما، هەر بە ڕاستی وەك کەرە وابوو.

– وەك کەرە؟ ئم... بەس خۆ من باسی کەرەم نەکردووە... با واز لەوە بێنین! سەرهەنگ، بەمە دەڵێم ئەنجام! بەسەر خۆتاندا زاڵ بن. ئێوە خۆپەرستن، هەتا بڵێی خۆپەرستن!

خاڵە ئاهێکی هەڵکێشا و گوتی:

– خۆپەسەندم، فۆما، خۆم دەزانم.

– ئێوە خۆویستن، خۆویستێکی مرومۆن...

– ڕاستە، فۆما، خۆویستم، خۆم ئەوە دەزانم، هەر لەو کاتەوە دەرکم بەمە کرد کە تۆم ناسی.

---

[1] ناورین: لێماڵین، پێداساوین، چەورکردن.

- من ئێستە وەك باوكێكی خەمخۆر قسە بۆ ئێوە دەكەم... ئێوە هەمووان لە خۆتان دەتارێنن و بیرتان دەچێ كە وەك دەڵێن، بە قسەی خۆش مار لە كون دەربێنن.

- ڕاستە، فۆما!

- ئێوە شەرەنگێزن. هێندە شەرەنگێزن كە مرۆڤ دڵی لێتان دەشكێ، هەروەها هێندە خۆویستانە چاوەڕێی ئەوەن گرنگیتان پێ بدرێ كە مرۆڤ حەز دەكا هەتا ئەوپەڕی دونیا لێتان هەڵبێ![1]

خاڵە دیسان ئاهێكی هەڵكێشایەوە.

- كەمێ نەرمونیانتر بن لەگەڵ ئەوانی دی، گرنگی زیاتریان پێ بدەن و خۆشتان بوێن. دڵئاوا بن لەگەڵیان، بەو جۆرە ئیدی لە یادگەی هەموواندا دەمێننەوە. یاسای من ئەمەیە كە بژی و لێگەڕێ با ئەوانی دیكەش بژین! دان بەخۆتدا بگرە، خۆت ماندوو بكە، بپارێوە و هیوادار بە، ئەمانە ئارەزووگەلێكن كە من هەمیشە ئاواتم بووە بتوانم بە گوێی هەموو مرۆڤایەتییاندا بدەم! پەیڕەوی لەم ئامۆژگارییانە بكەن تا منیش دەلاقەی دڵمتان بە ڕوودا بكەمەوە، سەر بنێمە سەر سنگتان و فرمێسك بڕێژم... هەڵبەتە گەر پێویست

---

١. شێوازی ئەم ئامۆژگارییانەی فۆما، وەك ئامۆژگارییەكانی گۆگۆڵ وان لە كتێبی *بژاردەیەك لە نامە بۆ دۆستان*. گۆگۆڵ لە نامەیەكدا بۆ هاوڕێیەكی نەزان دەنووسێت:

پێت دەڵێم تۆ خۆویستیت و هەمدیسان دووبارەی دەكەمەوە كە لووتبەرزیت. وریای خۆت بە و تا زووە خۆت لەو لووتبەرزییە نەجات بدە. لەوێوە دەست پێ بكە كە دان بەوەدا بنێیت لە ڕووسیادا لە هەمووان نەزانتریت و، جا پێویستە لەو ساتەوە هەر بە ڕاستی ژێر ببیت و بە چەشنێك گوێ بۆ قسەی كەسانی بەئەزموون بگریت، وەك ئەوەی كە هیچ نەزانیت و بتەوێ سەرلەنوێ هەموو شتێك فێر ببیتەوە. «و. ف»

بوو... نەك هەر من، من و چاكیی من بگرنەوە! هەر بە ڕاستی ئەم چاكییەی ئێوە گیانەسەری كردین، هەڵبەتە ببوورن ها!

گاڤریلا كە لە سەرسامییان دەمی بەش بووبووەوە، بە هەستێكی بەڕێزانەوە گوتی:

– بەخ بەخ، ئای كە كەسێكی زمانشیرینن!

خاڵە كەوتبووە ژێر كاریگەرییەوە و وەك پشتڕاستكردنەوەی قسەكانی فۆما، گوتی:

– ڕاستە، فۆما! من بە تەواوی هەست بەمە دەكەم. وەڵێ فۆما، خۆ خەتاكەش لە گەردنی من نییە. دەی من وا پەروەردە كراوم، لەگەڵ سەرباز و شتا ژیاوم. وەڵێ فۆما، سوێند دەخۆم، منیش هەستم هەیە، بۆ نموونە كاتێ ماڵئاواییم لە كوڕانی كەتیبە كرد، هەمووان كەوتبوونە گریان و دەیانگوت، ئیدی كەسێكی وەك منیان بۆ هەڵناكەوێتەوە!... ئەو كاتە وام بیر كردەوە كە وەك بڵێی هێشتا بە تەواوی لەدەست نەچوومە هیوایەك هەیە.

– دە فەرموو، دیسان خۆپەسەندی. هەمدیسان لە ترۆپكی خۆپەسەندیدا تێكەوتن! ئێوە پۆز لێدەدەن و خۆتان بە فرمێسكی سەربازەكانتانە هەڵدەكێشن. ئەی بۆچی من خۆم بە فرمێسكی كەسەوە هەڵناكێشم؟ ئەمە لە بارێكدا كە وەها شتانێك بوونیان هەبووە، ڕەنگە شتانێكی لەو بابەتە بوونیان هەبووبێ.

– لە دەمم دەرچوو، فۆما، ڕۆژانی خۆشی ڕابردووم بیر هاتنەوە، هەر لەبەر ئەوە خۆم پێ ڕانەگیرا.

– ڕۆژانی خۆش خۆ لە ئاسمانەوە نابارێن، ئێمە خۆمان سازیان دەدەین، ئەوە پەیوەندیی بە دڵی خۆمانەوە هەیە، جەنابی ئیگۆر ئیلیچ. جا من هەر لەبەر ئەوەشە کە دایمە هەست بە کامەرانی دەکەم –سەرباری مەینەتەکانم– ئاسودەییەکی ڕۆحیم هەیە و قاییلم، هەروەها بەدەر لە کۆمەڵێ گەمژە و تەڵەکەچی و شەهادەدار کە بەزەییم پێیاندا نایێتەوە و ناشمەوێ بەزەییم پێیاندا بێتەوە، سەرودڵی هیچ کەسێ ناگرم[1]. کەیفم بە گەمژەکان نایێ! بۆ مەگەر ئەم شەهادەدار و خوێندەوارانە کێیان پێ دەڵێن؟ *پیاوی زانیست!* خۆ ئەوان وەك زانست لە زانست ناپوانن، بەڵکە بۆ تەڵەکەبازی بە کاری دەهێنن. باشە، بۆ نموونە ئەمڕۆ ئەو جەنابە چیی گوت؟ بیهێننە ئێرە! کورە هەموو زانستمەندانیش بێنن! دەرەقەتی هەموویان دێم، دەتوانم هەموو بۆچوونەکانیان ڕەد بکەمەوە! لەم ڕۆژانەدا باو باوی پاکیی ڕۆحە...

– بێ گومان، فۆما، بێ گومان. کێ هەیە نکۆڵی لەوە بکا؟

– بۆ نموونە، من ئەمڕۆ زیرەکی و توانا و زانیاریی بەربڵاو و ئاشناییم لەگەڵ ڕۆحی ئادەمیزاد و ئەدەبیاتی هاوچەرخدا نیشان دا، بە شێوەیەکی لێهاتووانە ئەوەم نیشان دا کە چۆن دەکرێ

---

١. لێکچوونی لەگەڵ دەقێکی گۆگۆڵدا هەیە:

من گەرچی خۆم لاواز و بێتاقەت بووم، کەچی هەر دەبوومە مایەی دڵخۆشیی هاوڕێیانم و لەم دواییانەدا هەرکام لەوان، کە پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ مندا هەبوو، لە کاتی خەم و خەفەتیدا هیچ ئاسەوارێکی بێزاریی بە ڕووخساری منەوە نەدەدیت، گەرچی من خۆشم لە ساتگەلێکی سەختدابووم و خەم و خەفەتم لەوانی دی کەمتر نەبوو. «و. ف»

بوو... نەك هەر من، من و چاكیی من بگرنەوە! هەر بە ڕاستی ئەم چاكییەی ئێوە گیانەسەری كردین، هەڵبەتە ببوورن ها!

گاڤریلا كە لە سەرسامییان دەمی بەش بووبووەوە، بە هەستێكی بەڕێزانەوە گوتی:

- بەخ بەخ، ئای كە كەسێكی زمانشیرینن!

خاڵە كەوتبووە ژێر كاریگەرییەوە و وەك پشتڕاستكردنەوەی قسەكانی فۆما، گوتی:

- ڕاستە، فۆما! من بە تەواوی هەست بەمە دەكەم. وەڵێ فۆما، خۆ خەتاكەش لە گەردنی من نییە. دەی من وا پەروەردە كراوم، لەگەڵ سەرباز و شتا ژیاوم. وەڵێ فۆما، سوێند دەخۆم، منیش هەستم هەیە، بۆ نموونە كاتێ ماڵئاواییم لە كوڕانی كەتیبە كرد، هەمووان كەوتبوونە گریان و دەیانگوت، ئیدی كەسێكی وەك منیان بۆ هەڵناكەوێتەوە!... ئەو كاتە وام بیر كردەوە كە وەك بڵێی هێشتا بە تەواوی لەدەست نەچوومە هیوایەك هەیە.

- دە فەرموو، دیسان خۆپەسەندی. هەمدیسان لە ترۆپكی خۆپەسەندیدا تێكەوتن! ئێوە پۆز لێدەدەن و خۆتان بە فرمێسكی سەربازەكانتانە هەڵدەكێشن. ئەی بۆچی من خۆم بە فرمێسكی كەسەوە هەڵناكێشم؟ ئەمە لە بارێكدا كە وەها شتانێك بوونیان هەبووە، ڕەنگە شتانێكی لەو بابەتە بوونیان هەبووبێ.

- لە دەمم دەرچوو، فۆما، ڕۆژانی خۆشی ڕابردووم بیر هاتنەوە، هەر لەبەر ئەوە خۆم پێ ڕانەگیرا.

– ڕۆژانی خۆش خۆ لە ئاسمانەوە نابارێن، ئێمە خۆمان سازیان دەدەین، ئەوە پەیوەندیی بە دڵی خۆمانەوە هەیە، جەنابی ئیگۆر ئیلیچ. جا من هەر لەبەر ئەوەشە کە دایمە هەست بە کامەرانی دەکەم –سەرباری مەینەتەکانم– ئاسوودەییەکی ڕۆحیم هەیە و قاییلم، هەروەها بەدەر لە کۆمەڵێ گەمژە و تەڵەکەچی و شەهادەدار کە بەزەییم پێیاندا نایێتەوە و ناشمەوێ بەزەییم پێیاندا بێتەوە، سەرودڵی هیچ کەسێ ناگرم[1]. کەیفم بە گەمژەکان نایێ! بۆ مەگەر ئەم شەهادەدار و خوێندەوارانە کێیان پێ دەڵێن؟ *پیاوی زانیست!* خۆ ئەوان وەك زانست لە زانست ناڕوانن، بەڵکە بۆ تەڵەکەبازی بە کاری دەهێنن. باشە، بۆ نموونە ئەمڕۆ ئەو جەنابە چیی گوت؟ بیهێننە ئێرە! کورە هەموو زانستمەندانیش بێنن! دەرەقەتی هەموویان دێم، دەتوانم هەموو بۆچوونەکانیان ڕەد بکەمەوە! لەم ڕۆژانەدا باو باوی پاکیی ڕۆحە...

– بێ گومان، فۆما، بێ گومان. کێ هەیە نکۆڵی لەوە بکا؟

– بۆ نموونە، من ئەمڕۆ زیرەکی و توانا و زانیاریی بەربلاو و ئاشناییم لەگەڵ ڕۆحی ئادەمیزاد و ئەدەبیاتی هاوچەرخدا نیشان دا، بە شێوەیەکی لێهاتووانە ئەوەم نیشان دا کە چۆن دەکرێ

---

١. لێکچوونی لەگەڵ دەقێکی گۆگۆلدا هەیە:

من گەرچی خۆم لاواز و بێتاقەت بووم، کەچی هەر دەبوومە مایەی دڵخۆشیی هاوڕێیانم و لەم دواییانەدا هەرکام لەوان، کە پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ مندا هەبوو، لە کاتی خەم و خەفەتیدا هیچ ئاسەوارێکی بێزاریی بە ڕووخساری منەوە نەدەدیت. گەرچی من خۆشم لە ساتگەلێکی سەختدابووم و خەم و خەفەتم لەوانی دی کەمتر نەبوو. «و. ف»

کامارینیەك بۆ کەسێکی ورد و بەسەلیقە ببێتە بابەتێکی گرنگ. بەس چی بوو؟ ئایا هیچیەك لە ئامادەبووانی ئەو کۆڕە، بە شێوەیەکی شیاو ستاییشی منیان کرد؟ نەخێر، هەمووان ڕوویان لێ وەرگێڕام! دڵنیام ئەو جەنابەش بە نیوەی گوتووە کە ئەو کابرایە هیچ نازانێ. کەچی نازانن بۆی هەیە کەسانی وەك *ماکیاڤیلی* و *مردکادانتی* لە بندەستی ئەم بەندەی خوایەدا بووبن و تاکە گوناحیشی ئەوەیە کە نەدار و ونناوە[1]... نا، دەردیان لە گیانم!... جا لەم دواییانەشدا شتگەلێکم سەبارەت بە کارۆفکین بیستوون. باشە ئەم کابرایە چ جانەوەرێکە؟

– فۆما، کارۆفکین پیاوێکی زیرەکە، پیاوی زانستە... چاوەڕێیم. بە دڵنیاییەوە کەسێکی باشە، فۆما!

– ئم! بڕوا ناکەم. دەشێ یەکێ لەو وڵاخە تازەمۆدیلانە بێ کە کتێبیان لێ بارکردوون. ئەم جۆرە مرۆڤانە نە ڕۆحیان هەیە، سەرهەنگ، نە دڵ! زانستی بەری لە حورمەت بەکەڵکی چی دێ؟

---

١. نیکۆلۆ دی برنادۆ ماکیاڤیللی (١٤٦٩-١٥٢٧) چالاکی سیاسی و نووسەری سەردەمی ڕێنسانس، هەروەها ساڤێریۆ مرکادانتی (١٧٩٧-١٨٧٠) ئاوازدانەری ئیتاڵی و ئافرێنەری بەرهەمی جۆراوجۆری سەمفۆنیا و ئاوازییە. لە ساڵانی ٣٠ و ٤٠ بەرهەمەکانی مردکادانتی لە ساڵۆنەکانی ئۆپێرای پترسبورگدا کۆنسێرتیان لێ سازدرا و برانە سەر سەحنە. وەلێ ئەم پێکەوەهێنانەی ناوی چالاکی سیاسی سەدەی شازدە و مۆسیقاری ئیتاڵیی سەردەی نۆزدەیەمە، بە هیچ شێوەیەك بۆ نیشاندانی هێژاییی بەرزی فۆما فۆمیچ نییە. بێ هۆکار ناوی مردکادانتی نەبراوە... ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەو ڕۆژگارانە زیادتر دەپەرژانە سەر مردکادانتی لەچاو میکیا ڤیللیدا. هەر لەبەر ئەوەشە کە ناوی بنەماڵەیی لێکدراوی ئەم مۆسیقارە لە زەینی بیرمەندانەی فۆمادا چەسپیوە، هەڵبەتە گەر ئەو –چونکە وەها شتێك زۆر ڕێتێچووە– لەبەر شپرزەیی زەینی مردکادانتیی لەگەڵ دانتیدا تێکەڵ نەکردبێت، چونکە ئەگەری وەها شتێك زۆرە. «و. ف»

- نا، فۆما، نا! دەبێ بە چاوی خۆت ببینی کە چۆن باسی بەختەوەریی خێزان دەکا! فۆما، دەمودەس دڵت دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە!

- ئم! دەیبینین، کارۆفکینیش تاقی دەکەینەوە.

فۆما، لە بارێکدا کە لەسەر قەنەفەکە هەڵدەستایەوە، گوتی:

- باشە، بەسە ئیدی. سەرهەنگ، من هێشتا ناتوانم بە تەواوی لێتان ببوورم. سووکایەتی پێکردنەکەتان لە دڵی دام، بە هەرحاڵ، دوعا دەکەم و ڕەنگە خودا ئارامییەك ببەخشێتە دڵەی ڕەنجاوم. سەبەینێ دیسان لەم بارەیەوە قسان دەکەینەوە. ئێستە مۆڵەت بدەن جێتان بێڵم. شەکەتم و ئیدی هێزم...

خاڵە کەوتە کردوکۆش.

- ئاخ، فۆما! تۆ هەر بە ڕاستی ماندووی! پێت چۆنە؟ ناتەوێ دەست لەمە هەڵگری و شتێ بخۆی؟ هەر ئێستە ڕادەسپێرم شتێکت بۆ بێنن.

فۆما بە قاقایەکی تەوسئامێزەوە هاتە وەڵام:

- شتێ بخۆم! ها... ها... ها! شتێ بخۆم ها! سەرەتا ژەهرت دەرخوارد دەدەن و دواتر دەپرسن هیچ ناخۆی؟ دەیانەوێ برینەکانی دڵت بە قارچکی لێنراو و ترشیی سێو هەتوان بکەن! سەرهەنگ، ئای کە ماددەگەرایەکی بەدبەختێ!

- ئاخ، فۆما، سوێند بە خوا من لە ناخی دڵەوە...

- زۆر باشە. ئیدی بەسە. من جێتان دێڵم و ئێوەش دەمودەس بچن بۆ لای دایکتان. بکەونە سەر ئەژنۆ، بکڕووزێنەوە، چوزانم،

بگرین و هەرچۆنێ بووە داوای لێبووردنی لـێ بکـەن... ئەمـە ئـەرکی سەر شانی ئێوەیە، جەنابی سەرهەنگ!

– ئاخ، فۆما، بە درێژایی ئەو ماوەیە تـەنیا بیرم لـەوە دەکـردەوە، تەنانـەت ئێستەش کە قسەم لەگـەڵ تـۆ دەکـرد، زەیـنم سـەرقاڵی ئـەم مەسەلەیە بوو. ئامادەم تا بەربەیان لە بەردەمیدا بکەومە سەرئەژنۆ، وەڵێ بـیر لـەو شـتە بکـەوە کـە ئـەو لـە منـی دەوێ؟ ئەمـە شـتێکی ویژدانـدارانە نییە، فۆما، زۆردارانەیە! وەرە پیاوەتی بکە و ببە مایەی بەختەوەریی من، کەمێ بیر بکەوە و کێشەکەم چارە کە. جا دواتـر... دواتر... سوێند دەخۆم!...

فۆما گوتی:

– نـا، ئیگـۆر ئیلیـچ، نـا. ئەمـە پەیوەنـدیی بـە منـەوە نییـە. ئێـوە خۆتـان دەزانـن کـە مـن هـەرگیز خـۆم لـەم بابەتـەدا هـەڵناقورتێنم. تەنانەت ڕەنگە لاشتان وا بێ، کە هـەموو شـتێ لـەژێر سـەری منـدایـە، وەڵێ باوەڕ کەن من هەر لە سـەرەتاوە خـۆمم لـێ لادا. هـەموو شـتێ لـە دەست دایکتانە. بێ گومان ئەو تـەنیا چاکەی ئێوەی دەوێ... بـڕۆن ئیدی، خێرا کەن، بڕۆن و بـەو گوێڕایەڵییـەی خۆتـان دۆخەکـە ڕاسـت بکەنەوە. با خۆر بەسەر تووڕەییتاندا ئاوا نەبێ![1] منیش... منیش بە

١. ئایەتێکی کتێبی پیرۆزە، پەیمانی نوێ، پاژی چوارەم و ئایەتی ٢٦: ٢٥ئیدی درۆ لەگەڵ یەکدیدا مەکەن، بەڵکە با هەمیشە قسەکانتان ڕاست بن، چونکە ئێمە ئەندامی یەکدیین و گەر درۆ لەگەڵ یەکدا بکەین، ئەوا لە ڕاستیدا، زیان لە خۆمان دەدەین. ٢٦گەر تووڕە بوون، مۆڵەت مەدەن تاوانێکتان لێ بوەشێتەوە. بەر لە

درێـژایی شـەو دوعاتـان بـۆ دەکـەم. ئیگـۆر ئیلیچ، دەمێکـە بـە خـەو بێگانەم. خواحافیز.

جا ڕووی لە گاڤریلا گوتی:

- لـە تـۆش خـۆش بـووم، پیرەمێـرد. دەزانم کـە بەدەسـت خـۆت نەبوو. تۆش گەر لێم نارەحـەتی، بمبـوورە... خواحـافیز، خواحـافیز، خواحافیزتان بێ، خوا خێر و بەرەکەتتان بەسەردا بڕژێنێ!...

فۆمـا ڕۆیشـت. بـە فڕکەیـەك خـۆم گەیانـدە نێـو ژوورەکـە. خاڵـە هاواری کرد:

- ئەوە تۆ گوێت هەڵخستبوو؟

- بەڵێ، خاڵە گیان، بە دزییەوە گوێم لە قسەکانتان دەگرت! ئێوە، ئێوە چۆن توانیتان بەو بڵێن پایەبەرز؟

- ئـەی دەبـوو چـی بکـەم، برالـە؟ تەنانـەت مـن شـانازیش بـەوەوە دەکـەم... ئەمـە لەچاو کـرداری جوامێرانـەدا هـەر هـیچ نییـە. ئـای کـە نـەجیب و بێوەیـە، ئـای کـە پیـاوێکی گـەورەیـە! سیریۆژا، بـێ گومـان تۆیش بیستت... باشە مـن چـۆن تـوانیم پێشـنیاری پـارەی بـۆ بکـەم، هـەر بـە ڕاسـتی تێناگـەم! هاوڕێکـەم! مـن لەسـەر خـۆم نـەبووم، تـووڕە بووم، لێی تێنەدەگەیشتم، لێـی بـەگومان بـووم و تۆمـەتم دایـە پـاڵ... وەڵێ نـا! ناچـێتە ئەقڵـەوە ئـەو دژمنـی مـن بـێ... ئێسـتە لـەوە تێگەیشتم... بینیت کە چەندە قوورسوقۆڵانە پارەکەی ڕەد کردەوە؟

---

ناوابوونی خۆر، تووڕەیی لە خۆتان بتارێنن، ٢٧ئاخر گەر بە تووڕەیی بمێننەوە، ئەوا دەرفەت دەدەنە شەیتان تا ناچار بە ئەنجامدانی تاوانتان بکات. «و. ف»

– باشەی، خاڵە گیان، تا پێتان خۆشە شانازیی پێوە بکەن، من دەبێ بڕۆم. ئیدی بەرگە ناگرم! بۆ دواهەمین جار لێتان دەپرسم، چیتان لە من دەوێ؟ بۆ داواتان کرد بێم و چ چاوەڕوانییەکتان لێم هەیە؟ گەر لە مەسەلەکە پاشگەز بوونەتەوە و ئیدی پێویست بە من ناکا، کەواتە با بڕۆم. من تاقەتی ئەم جۆرە نواندنانەم نییە! هەر ئەمڕۆ ئێرە جێدێڵم!

خاڵە، وەك خووی هەمیشەیی خۆی، کەوتە کردوکۆش و گوتی:

– هاوڕێکەم... من... تەنیا دوو خولەك چاوەڕێ بە. برالە، من ئێستە دەچم بۆ لای دایە گیان... مەسەلەیەکی ئێجگار گەورە و گرنگ هەیە کە دەبێ بیبڕم بە لایەکدا!... تۆش جارێ بچۆ بۆ ژوورەکەت. گاڤریلا ڕێنوێنیت دەکا بۆ ماڵە هاوینییەکە. خۆ ماڵە هاوینییەکە پێدەزانی؟ ڕێك لەناوەڕاستی باغەکەیە. گوتوومە جانتاکانت ببەنە ئەوێ. من ئێستە دەچم بۆ لای دایە گیان و داوای لێبووردنی لێ دەکەم و ئەو مەسەلە دەبڕم بە لایەکدا... ئێستە ئیدی دەزانم کە دەبێ چۆن ئەم کارە بکەم... پاشان یەکسەر دێم بۆ لای تۆ و گرێی دڵمت بۆ دەکەمەوە و بە تێروتەسەلی هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم... جا... جا... جا بەم نزیکانەش نۆرەی ڕۆژانی خۆشی ئێمە دێ! دوو خولەك، سیریۆژا، تەنیا دوو خولەك!

خاڵە دەستمی گوشی و بە پڕتاو ڕۆیشت. بێ لەوەی کە دووبارە بکەومەوە گەڵ گاڤریلا، نەمدەتوانی هیچ کارێکی دی بکەم.

# وەرزی دەیەم

## میزینچیکۆڤ

ئەو ماڵەی کە گاڤریلا بەرەو لای ڕێنوێنیی کردم، کووخێکی چکۆڵەی تەختـەیی جـوان بـوو، کـە دەکەوتـە ناوەڕاستی باخەکـەوە و چـەند هـەنگاوێك لـە کۆنەخانوێکـەوە دوور بـوو. زۆر لـە مێـژ بـوو ئـەم ماڵـە لەلایـەن موڵکـداری پێشـووی ئـەوێوە درووسـت کرابـوو، لەگـەڵ ئەوەشـدا، بـە پێـی خـووی جـاران، هـەر بـە *بینـای تـازە* نـاو دەبـرا. زیزفۆنـەکان لـە سـێ لاوە دەورەی ماڵەکـەیان دابـوو و چـڵەکانیان باوەشیان بـە شـێروانییەکەیدا دەکـرد. هەرچوار ژووری ماڵەکـە، بـە کەرەستەگەلێکی تا ڕادەیەك تازە بۆ میوانـان ڕازێنرابووەوە. چوومـە نێـو ژوورێکـەوە کـە پێشـتر جانتاکـەیان بردبوومـە ئـەوێ. لەگـەڵ چوونەژوورەوەمدا، لەسـەر مێـزی تەنیشـت تەختەخەوەوە، چاوم بـە لاپەڕەیەك کەوت کە سەرەڕای دەستخەتێکی خۆش، بە نەخشـونیگار و پەراوێز و هێڵکاری ڕازێنرابووەوە. پیتگـەلی گـەورە و نەخشـونیگار بـە ڕەنگـی جۆراوجـۆرەوە. هـەموو ئەمانـە وایـان کردبـوو کـە دەستخەتەکە لە جوانیدا بێهاوتا بێت. کە دەستم کردە خوێندنەوەی، هەر لە ئەوەڵین وشەوە تێگەیشتم کە نامەکە بۆ من نووسراوە و تێیدا

بە *ڕووناکبیر* و *چاکەکار* ناو برابووم. ناونیشانی نامەکەش «ناڵەکانی ڤیدۆپلیاسۆڤ» بوو. هەوڵێکی زۆرم دا تا سەر لە نووسینەکە دەربهێنم و کەچی هەر بێسوود بوو، چونکە سەرلەبەری نامەکە، پڕ بوو لە هەڵیتوپەڵیتی مەراییکارانە کە بە زمانی باقوبریقداری پێشخزمەتێك نووسرابوو. تەنیا دەمتوانی سۆسەی ئەوە بکەم کە ڤیدۆپلیاسۆڤ کەوتووەتە هەلومەرجێکی سەختەوە و داوای یارمەتیی لە من کردووە و وا دیاریشە کە هیوایەکی زۆری بە من هەیە: *لەبەر ئەوەی من ڕووناکبیرم*، هەروەها لە کۆتاییشدا داوای کردبوو لای خاڵەگیان پشتگیریی بکەم و، هەر بەو جۆرەی کە لە کۆتایی نامەکەدا هاتبوو، بە جۆرێك لە جۆرەکان *خۆمئاسایی* کارگەریی بخەمە سەر. هێشتا هەر خەریکی خوێندنەوەی نامەکە بووم کە دەرگە کرایەوە و میزینچیکۆڤ هاتە ژوورێ و بێ زمانبازی و بەوپەڕی ڕێزەوە تەوقەی لەگەڵ کردم و گوتی:

– هیوادارم مۆڵەت بدەن کە شەرەفی ناسینتانم پێ ببڕێ. ئەم عەسرە تەنانەت دەرفەتی ئەوەش نەبوو دوو قسەتان لەگەڵ بکەم، ئەمەش لە بارێکدا کە هەر لە یەکەمین نیگاوە هەستم کرد کە زۆرم حەزلێیە باشتر بتانناسم.

گەرچی لەو ساتەدا باری دەروونیم زۆر خراپ بوو، بەس خێرا هەڵمدایێ کە منیش بە ناسینی ئەو زۆر دڵخۆشم. هەردووکمان دانیشتین. چاوی بە لاپەڕەکەی نێو دەستم کەوت و گوتی:

– ئەی ئەمە چییە؟ نەکا ناڵەکانی ڤیدۆپلیاسۆڤ بێ! بەڵێ، خۆیەتی! دڵنیا بووم کە ڤیدۆپلیاسۆڤ هانا بۆ ئێوەش دەهێنێ.

کتومت وەها نامەیەکی هەر بەم گازاندانەوە بۆ منیش نووسیووە، دەمێك بوو چاوەڕێی هاتنتانی دەکرد و پێدەچێ پێشەکی خۆی ئامادە کردبێ. سەرتان نەسووڕمێ، ئێرە لەم جۆرە عەنتیکانەی زۆر لێیە و ئەوەی ڕاستی بێ بابەتی زۆر هەن بۆ پێکەنین.

- تەنیا پێکەنین؟

- دەی ئەرێ، ئەی چی، بگرییێن؟ گەر بتانەوێ دەتوانم ڕابردووی ئەم ڤیدۆپلیاسۆڤەتان بۆ بگێڕمەوە. دڵنیام کە زۆرتان دەخاتە پێکەنین.

بە نیگەرانی گوتم:

- ئەوەی ڕاستی بێ پێویستە دانی پێدا بنێم کە جارێ کەڵکەڵەی من ڤیدۆپلیاسۆڤ نییە.

لێم ڕوون بوو کە ئەم کاکی میزینچیکۆڤە لە ڕێی ئەم دەبڕینی ئارەزوورەوە بۆ ئاشنابوون و وتووێژی هاوڕێیانە، بەدوای مەبەستێکی تایبەتییەوەیە و بێ ئەملا و ئەولا بۆ کارێك پێویستیی بە منە. ئەوێك کە عەسر ئاوها مۆن و جددی دانیشتبوو، وا ئێستاکە بە تەواوی کەیفخۆش بوو و پێدەکەنی و ئامادە بوو باسی بەسەرهاتە دوورودرێژەکانیم بۆ بکات. هەر لە یەکەمین نیگاوە دیاربوو کە ئەم پیاوە لە هەڵسوکەوت و چۆنیەتیی قسەکردندا دەستێکی باڵای هەیە و بە باشی دەتوانێت مرۆڤەکان بناسێت. من لە تاو تووڕەیی مستێکم بە مێزەکەدا کێشا و گوتم:

– نەفرەت لە تۆ فۆما! دڵنیام کە ئەم بەزمانە هەمووی لەژێر سەری تۆدان! ئەی نەفرەت لە تۆی چەپەڵ!

میزینچیکۆڤ گوتی:

– وا دیارە ئێوە زۆر لێی تووڕەن.

من وەك ئەوەی کتوپڕ گڕم تێبەربووبێت، قیڕاندم:

– زۆریش تووڕەم! ئەوە ڕاستە کە ئەمڕۆ من زیاد لە ڕادە هەڵچووم و هەر لەبەر ئەوەشە کە هەموو کەسێ مۆڵەت بە خۆی دەدا تاوانبارم بکا. زۆر باش دەزانم کە نابەجێیانە خۆم هەڵقوورتاند و هەموو شتێکم تێك دا، وەڵێ دەی، لام وایە هیچ هۆکارێ لە ئارادا نییە تا ئەوەندە ئەم بابەتەم بە ڕوودا بدەنەوە!... دەزانم کە ئەو هەڵسوکەوتە شیاوی وەها کۆڕێك نییە، بەس بیهێننە بەرچاوی خۆتان، بۆ دەکرێ لە هەلومەرجێکی ئاوهادا هەڵنەچی؟ گەر ڕای منتان دەوێ لە بارەی ئێرەوە، ئەوا دەڵێم لە شێتخانەیەك بەولاوە هیچی دی نییە و... دەی... دواجار... ئەوەی ڕاستی بێ من لێرە دەڕۆم... تەواو!

میزینچیکۆڤ لەسەرخۆ گوتی:

– ئێوە جگەرە دەکێشن؟

– بەڵێ.

– کەواتە پێدەچێ مۆڵەتی داگیرساندنی جگەرەیەکم بدەنێ. لەوێ وەها مۆڵەتێکم نادەنێ و سوێم بووەتەوە بۆ جگەرەیەك.

جا پاشان، بەدەم داگیرساندنی جگەرەوە، لەسەری ڕۆیشت:

- هاوڕام کە ئێرە لە شێتخانە دەچێ و دڵنیا بن مۆڵەتی لۆمەکردنی ئێوە بە خۆم نادەم، چونکە گەر منیش لەجێی ئێوە بام، بۆی هەبوو زۆر لەوە زیاتر هەڵبچم و کۆنترۆڵی خۆم لەدەست بدەم.

- گەر ئێوە هەر بە ڕاستی دڵگران بوون، ئەی بۆچی هیچ کاردانەوەیەکتان نەبوو؟ هێندەی من بیرم بێ، ئێوە زۆر بێباك بوون و دەبێ دانی پێدا بنێم کە زۆرم بەلاوە سەیر بوو کە هیچ بەرگرییەك لە خاڵەی داماوم ناکەن کە دایمە چاکەی بەسەر هەمووتانەوەیە!

- ئێوە ڕاست دەکەن. چاکەی لەگەڵ زۆر کەسدا کردووە، بەس لام وایە بەرگریلێکردنی بێسوودە، سەرەتا، ئەم کارە هیچ کەڵکێکی ناگرێ و بە جۆرێ لە جۆرەکان خراپ بەسەریدا دەشکێتەوە، دوای ئەوەش، بەم کارە، هەر سبەینێ وەدەرم دەنێن. ڕاستگۆیانە پێتان دەڵێم کە هەلومەرجی ئێستەم وا دەخوازێ پێزان بم لەبەرانبەر میواندۆستیی ئەندامانی ماڵەکەدا.

- وەلێ من ئەسڵەن هەقم بەسەر ڕاستگۆیی ئێوەوە نییە سەبارەت بە هەلومەرجی ئێرەتان... تەنیا لەبەر ئەوەی کە بۆ مانگێك دەچێ لێرە دەژین، دەمویست بپرسم...

میزینچیکۆڤ شوێنگۆڕکێی بە کورسییەکەی کرد و گوتی:

- لە خزمەتتانم، بە دڵی خۆتان پرسیار بکەن.

- باشە، بۆ نموونە ئەم بابەتەم بۆ شەنوکەو کەن، هەر ئێستە دەیانویست پازدە هەزار ڕۆبڵی زیوی بدەنە فۆما فۆمیچ و کەچی ئەو ڕەدی کردەوە... من ئەمەم بە چاوی خۆم بینی.

میزینچیکۆڤ هاواری لێ هەستا:

- چی؟ بە ڕاست؟ تکایە بە باشی هەموو شتێکم بۆ باس کەن!

من بەسەرهاتەکەم گێڕایەوە، وەلێ هیچ شتێکم لە بارەی «پایەبەرز»ەوە نەگوت. میزینچیکۆڤ بە کونجکۆڵییەکی زۆرەوە گوێی دەگرت، تەنانەت لەو ساتانەی کە باسی پازدە هەزار ڕۆبڵەکەم کرد، بە جۆرێك لە جۆرەکان باری سەروسیمای گۆڕانی بەسەردا هات. کە هەموو بەسەرهاتەکەی بیست، گوتی:

- ئای لەو زۆڵە! هەرگیز چاوەڕوانیی وەها شتێکم لە فۆما نەدەکرد.

- ئێ، ئەوەی کە ئەو پارەکەی ڕەد کردەوە! باشە بۆچوونتان چییە لەسەر ئەم بابەتە؟ یانی هەر بە ڕاستی لەبەر چاوتێریی بوو؟

- پازدە هەزار ڕۆبڵی ڕەد کردووەتەوە هەتا دواتر سی هەزار وەربگرێ.

جا کەمێك تێفکری درێژەی دایێ:

- هەڵبەتە دەزانن؟ لام وا نییە فۆما نەخشەیەکی لەژێر سەردا بێ. ئەو کابرایەکی بەکردار نییە، بە جۆرێ لە جۆرەکان شاعیرێکە بۆخۆی. پازدە هەزار ڕۆبڵ... ئم! دەبینن، گەر وا نەبا ئەو نەیدەتوانی

پارەکە ڕەد بکاتەوە و لە بەرانبەر ئەو وەسوەسەیەدا لەوچەلەوچ بکا و خۆی هەڵکێشێ. با پێتان بڵێم، ئەو وێڕای ئەوەی کە پیاوێکی ئێجگار ناحەز و بێغیرەت و بۆڵەبۆڵکەرە، هەتا بڵێی کەسێکی خۆپەرستیشە!

میزینچیکۆ تووڕە بوو. دیار بوو کە داخی لێ دەهات، یان تەنانەت بۆشی هەبوو ئیرەیی پێ ببات. کونجکۆڵانە لێیم دەڕوانی. دوای کەمێك تێفکرین لەسەری ڕۆیشت:

– ئم! دەبێ چاوەڕێی گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی بین. ئێستە ئیدی ئیگۆر ئیلیچ ئامادەیە فۆما بپەرستێت.

جا بەدەم ددانەجیڕەوە بۆی زیاد کرد:

– خوانەخواستە، تەنانەت بۆشی هەیە نەرم ببێ و بچێتە ژێر باری زەماوەنکردنەوە.

– یانی ئێوە لاتان وایە، هەر دەبێ ئەم زەماوەندە سەیر و پیسە لەگەڵ ئەو ژنە شێتە گەمژەیەدا سەربگرێ؟

میزینچیکۆ بە کونجکۆڵییەوە تەماشایەکی کردم. قینلەدڵانە قیڕاندم:

– هەی نارەسەنی نە!

– هەڵبەتە بۆچوونەکەشیان زۆر مەنتیقییە، ئەوان بڕوایان وایە دەبێ لە پێناو بنەماڵەکەیدا شتێ بکا.

بە هەڵچوونەوە گوتم:

– ئادەی بزانم، ئەو کەم چاکەی لەگەڵیان کردووە؟ خۆ ئێوەش، خۆ ئێوەش وا دەڵێن کە بیرۆکەی زەماوەندکردن لەگەڵ ئەو ژنەتیوە دەبەنگە مەنتیقییە!

– بێ گومان من لەو قسەیەدا هاوڕاتانم کە ئەو دەبەنگە... ئم! ئەوە زۆر باشە کە ئێوە بەو ڕادەیە خاڵتانتان خۆش دەوێ، گەرچی بە پارەی ئەو ژنە دەتوانێ زەوی و زارەکەی بەرفراوانتر بکا، وەلێ منیش ئەم کارەم پێ ناخۆشە و هەست بە هاوخەمی دەکەم! جا وێڕای ئەوەش، ئەوان پاساوی دیکەشیان هەیە بۆ کارەکەیان، دەترسێن ئیگۆر ئیلیچ لەگەڵ ئەو ژنە مامۆستایە زەماوەند بکا... خۆ ئەمڕۆ چاوتان پێی کەوت؟ کچێکی دڵڕفێنە!

بە نیگەرانییەوە پرسم:

– وەلێ بۆ... بۆ ئەگەری وەها شتێ لە ئارادایە؟ لام وایە بوختانیان بۆ کردووە. بۆ خاتری خوا، ڕاستییەکەم پێ بڵێن. ئەم بابەتە بۆ من ئێجگار گرنگە...

– ئۆو، ئەو خراپ شەیدای بووە! هەڵبەتە ڕوونیشە کە خۆی ئەم بابەتە دەشارێتەوە.

– دەیشارێتەوە؟ ئێوە وای بۆ دەچن؟ ئێ، ئەی خاتونی مامۆستا چی؟ مامۆستا خاتونیش ئەوی خۆش دەوێ؟

– بە ئەگەرێکی زۆر، بەڵێ. جا ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە لە بەرژەوەندییەتی زەماوەند لەگەڵ خاڵەتاندا بکا، ئاخر ئەو کەمدەستە.

– وەلێ ئێوە لەسەر بنەمای چ بەڵگەیەك سۆسەی ئەوە دەکەن کە ئەوان یەکدییان خۆش دەوێ؟

– دەی ئەمە بابەتێك نییە کە هەستی پێ نەکرێ، سەرەڕای ئەوەش، وا دیارە ئەوان ژوانی نهێنییان هەیە. تەنانەت دەشڵێن پەیوەندیی ناشەرعییان هەیە. تەنیا داواتان لێ دەکەم کە ئەم قسانە لە هیچ کوێ باس نەکەن. با ئەمە لە بەینی خۆمان بێ.

هاوارم کرد:

– ئەسڵی نییە! یانی ئێوە دەتانەوێ بڵێن بڕواتان بەم قسانە هەیە؟

– ئەوە ڕوونە کە بە تەواوی بڕوام پێیان نییە. خۆ من بە چاوی خۆم نەمدیوە. وەلێ ئەگەری زۆرە.

– چۆن ئەگەری زۆرە؟ بیر لە جوامێری و نەوسبەرزیی[1] خاڵە بکەنەوە!

– هاوڕام، بەس بۆی هەیە مرۆڤ بەدەم ئەو خەیاڵەوە کە بێ گومان پەیوەندییەکە بە زەماوەنکردن دوایی دێ، کۆنتڕۆڵی خۆی لەدەست بدا. زۆربەی کات ئەوە ڕوودەدا. وێڕای ئەوەش، دووبارەی دەکەمەوە، من لە بنەڕەتەوە بڕوام بەم قسانە نییە، بە تایبەت لەبەر ئەوەی لێرە هەوڵ دەدەن ئەو کچە داماوە لەکەدار بکەن، تەنانەت دەڵێن لەگەڵ ڤیدۆپلیاسۆڤیش پەیوەندیی هەیە.

---

١. نەوسبەرز: نەفسبەرز، چاوتێر، بەحوورمەت. نەوس، نەفس.

قیڕاندم:

- خۆ دەبینن! لەگەڵ ڤیدۆپلیاسۆڤ! ئەسڵەن وەها شتێ ناچێتە ئەقڵەوە؟ باشە ئەم قسانە مرۆڤ ناخەنە هێڵنجدانەوە؟ نەکا ئێوەش باوەڕتان بەم قسانە هەبێ؟

میزینچیکۆڤ بە ئەهوەنی هاتە وەڵام:

- خۆ من پێم گوتن، سەد لە سەد بڕوام پێیان نییە، وەلێ دەی، ئەگەری هەیە. لەم دونیایەدا ئەگەری هەموو شتێ هەیە. من بە چاوی خۆم نەمدیوە. سەرەڕای ئەوەش، لام وایە ئەم بابەتە هیچ پەیوەندییەکی بە منەوە نییە. بەس لەبەر ئەوەی کە دەبینیم زەینی ئێوە بە تەواوی گیرۆدەی ئەم بابەتەیە، بە ئەرکی خۆمی دەزانم کە بڵێم ئەگەری پەیوەندیی ئەو لەگەڵ ڤیدۆپلیاسۆڤ زۆر کەمە. ئەمە هەمووی لەژێر سەری ئانا نایلۆڤنا، یانی هەمان ئەو پەرەی پێلیتسینایەیە، لە ئیرەییان ئەم هەموو قسەوقسەلۆکانەی بلاو کردوونەتەوە، چونکە پێشتر لەسەر بنەمای ئەوەی کە کچە سەرهەنگە، نەخشتەی کێشابوو تا لەگەڵ ئیگۆر ئیلیچ زەماوەند بکا... سوێند بە خوا درۆ ناکەم! ئێستەش وا لە نامورادییان تەواو تووڕەیە. زۆر باشە، وا دیارە سەرلەبەری باسەکەم بۆ گێڕانەوە. دەبێ دانی پێدا بنێم کە هەتا بڵێی لە زەمکردن بێزارم. سەرەڕای ئەوەش، بەم کارە تەنیا کاتی بەنرخی خۆمان بە فیڕۆ دەدەین. سەیر کەن، من تکایەکی بچووکم لێتا هەیە.

- تکای بچووک؟ باشە، فەرموون، هەرچیم لەدەست بێ...

– من ئەوە دەزانم و تەنانەت هیواداریشم تا ڕادەیەك بتوانم لەگەڵتان بم، چونکە دەبینم خاڵە گیانتانتان خۆش دەوێ و لە پێناو چارەنووسی ئەو و پەکخستنی ئەم زەماوەندەدا چیتان لەدەست بێ دەیکەن، وەلێ بەر لە باسکردنی تکا سەرەکییەکە، دەمەوێ تکایەکی بچووکترتان لێ بکەم.

– چ تکایەك؟

– تکاکەم ئەمەیە: بۆی هەیە ئێوە لەگەڵ داوا سەرەکییەکەی مندا بن و بۆشی هەیە لەگەڵیدا نەبن، وەلێ بەر لە باسکردنی چاکەیەکی گەورەم لەگەڵ بکەن و وەك خانەدانێکی ئاوڕوومەند و بەڕێز بەڵێن بدەن کە ئەوەی دەیبیستن، وەك نهێنییەکی گرنگ لەنێوان خۆمان بمێنێتەوە و لەژێر هیچ هەلومەرجێکدا بۆ هیچ کەسێکی نادرکێنن و لە بەرژەوەندیی خۆتاندا ئەم بیرۆکەیە بە کار ناهێنن کە ئێستە دەمەوێ پێتانی بڵێم. ڕازین یان نا؟

پێشەکییەکی فەرمی و بەپێز بوو. منیش ڕازیبوونی خۆمم ڕاگەیاند و گوتم:

– باشە، بابەتەکە چییە؟

میزینچیکۆڤ دەستی پێ کرد:

– ئەوەی ڕاستی بێ بابەتەکە زۆر سادەیە. سەیر کەن، دەمەوێ تاتیانا ئیڤانۆڤنا هەڵگرم و زەماوەندی لەگەڵ بکەم، بە کورتییەکەی، شتێکی هاوشێوەی گرێتنا گرین[1]... خۆ تێدەگەن؟

---

١. Gretan Green: گوندێکە لە باشووری سکۆتلەندا و نزیکی سنووری ئینگلیز، کە لە ڕابردوودا زۆر ناسراو بووە. هۆکارەکەشی ئاسنگەرێك بوو کە لەم گوندەدا، ئەو

ڕاستەوڕاست چاوم لە دیدەی بەڕێز میزینچیکۆڵ بڕی و تا ماوەیەك هیچم پێ نەگوترا. سەرئەنجام گوتم:

– دەبێ دانی پێدا بنێم هیچ سەر لەوە دەرناکەم کە... بێ لەوەش، وام دەزانی سەروکاریم لەگەڵ مرۆڤێکی ژیردا هەیە، ئەسڵەن چاوەڕێی ئەوە نەبووم کە...

میزینچیکۆڵ قسەی پێ بڕیم:

– هەم چاوەڕێ بوون و هەمیش چاوەڕێ نەبوون... مانای قسەکەتان ئەوەیە کە نەخشەکەی من نەفۆمانایە... ئەرێ؟

– نا، وا نییە... وەلێ...

– ئۆو، تکایە شەرم مەکەن، قسەی خۆتان بکەن! خەمتان نەبێ، ئێوە بەم کارەتان تەنانەت منیش دڵخۆش دەکەن، چونکە بەم جۆرە زیاتر لە ئامانجەکەم نزیك دەبمەوە. سەرەڕای ئەوەش، من دەزانم کە ڕەنگە هەموو ئەمانە لە سەرەتاوە وەك شتانێکی نامۆ دەرکەون. لەگەڵ ئەوەشدا، دەمەوێ دڵنیاتان بکەمەوە کە ئەم نەخشتەیە نەك هەر تەنیا نەفامانە نییە، بەڵکە هەتا بڵێی زیرەکانەیە، وەلێ بەو مەرجەی کە ئێوە پیاوەتی بکەن و گوێ لە هەموو باسەکە بگرن...

– حەیفتان نەکرد! من سەراپا گوێم.

---

کوڕ و کچانەی کە –لە ڕووی یاسایی و تەمەنەوە کێشەیان هەبوو و پەنایان دەبردە ئەوێ– بێ هیچ ڕێوڕەسمێکی یاسایی لێك مارە دەکردن. دواجار ئەم کارە، کە بۆخۆی بووبووە دابێك، لە ساڵی ١٧٥٤ تا ١٩٤٠ درێژەی کێشا، وەلێ دوای ئەوە، ئەم جۆرە زەماوەندانە بە نایاسایی درانە قەڵەم. «و. ف»

– ئەوەی ڕاستی بێ، من قسەی زۆرم نییە بۆ گوتن. دەزانن، لە ئێستەدا من کەوتوومەتە ژێر قەرز و تەنانەت کۆپیکێکیشم نییە. سەرەڕای ئەوەش، خوشکێکی هەتیوی نۆزدە ساڵانم هەیە کە لە خانووی کرێیە و ئەوەی ڕاستی بێ، قرووشێکی لە باخەڵدا نییە. لەم مەسەلەیەدا تا ڕادەیەك من خەتابارم. ئێمە مووڵکێکی چڵ ڕەعیەتیمان بە میرات بۆ مایەوە. بۆ نەگبەتی، ڕێك لە هەمان ئەو کاتەدا، پلەم بەرز کرایەوە بۆ ئەفسەری سوارەی چەکدار. ئێ، ئەوە ڕوونە کە سەرەتا خستمە ڕەهنەوە و دواتریش دەستم کردە پەخشانوتەخشان. ژیانێکی گەمژانەم هەبوو، کتوپڕ خۆم لە جێیەکی دیکەدا بینییەوە، خۆم لێ بووبوە بۆرتسۆف[1]، قومارم دەکرد و مەیم دەخواردەوە... بە کورتیەکەی، ژینێکی گەمژانە دەژیام، تەنانەت بە بیرلێکردنەوەشی تەریق دەبمەوە. ئێستە هاتوومەتەوە هۆش خۆم و دەمەوێ بە تەواوی ژیانم بگۆڕم، وەلێ بۆ ئەم مەبەستە دەبێ سەدهەزار ڕۆبڵم هەبێ. جا ئێستەش لە سووپادا شتێکی وام دەست ناکەوێ و هیچ کارێکیش نازانم و خوێندەوارییەکی واشم نییە، کەواتە تەنیا دوو ڕێچارەم لە بەردەستە: دزی یان زەماوەندکردن لەگەڵ ئافرەتێکی دەوڵەمەند. من تەنانەت دەکرێ بڵێم بە پێی پەتی

---

١. ئالێکسی پیترۆڤیچ بۆرتسۆف (مێژووی مردن ١٨١٣)، ئەفسەرێکی سوارەی سووپا کە بە ڕابواردن و سەرخۆشی بەناوبانگ بوو و لە شیعری داڤیداڤد ئاماژەی پێ کراوە:

ئەی بۆرتسۆفی قەڵەندەر

دۆستی هاوپیاڵەی ڕێ!

سەرێك بدە لە کووخەکەم

وەرە با مەی بخۆینەوە!

(داوەتی شەراب، ١٨٠٤) «و. ف»

هاتوومـە ئێـرە، جـا بـە پیـادەش. لـە مۆسـکۆوە، بـە سـێ ڕۆبڵـی خوشکمەوە بە ڕێ کەوتم کە هەموو دارایی ئەو بوو. لێرانە چاوم بە تاتیانا ئیڤانۆڤنا کەوت و دەستبەجێ ئەو بیرەم بە زەیندا هات. خێرا بڕیـارم دا پـێ لـە جـەرگی خـۆم بنـێم و زەماوەنـدی لەگـەڵ بکـەم. پەسەندی بکەن کە ئەمە بێ لە زیرەکی ناکرێ هیچ ناوێکی دیکەی لـێ بنێـی. وێـڕای ئـەوەش، مـن تـەنیا لەبـەر خوشـکەکەم ئـەم کـارە دەکەم... جا ئێ، هەروەها لەبەر خۆشم...

– ئادەی بزانم، یانی ئێوە دەتوانن بە فەرمی خـوازبێنیی تاتیانا ئیڤانۆڤنا بکەن؟

– خوا نەکا! دەسبەجێ لێرەم وەدەر دەنێن. جا ئەگەر وای پـێ بڵێم ئەو هەر لەگەڵم نایێ، وەلێ گەر پێشنیار بکەم پێکەوە ڕاکەین، خێـرا قاییـل دەبـێ. کرۆکـی بابەتەکـەش لێرانەیـە، تـەنیا پێویسـتە هـەلێکی ڕۆمـانتیکی و دڵـڕفێن بـوونی هـەبێ. هەڵبەتـە دواتـر زەماوەندێکی فـەرمیی بەدوادا دێ و هـەموو شـتێ دەبڕێتـەوە. تـەنیا دەبێ لە خشتەی بەرم و لێرەی دوور بخەمەوە!

– چۆن ئاوا دڵنیان کە ئەو یەکسەر قاییل دەبێ و لەگەڵتان دێ؟

– ئۆو، خەمتان نەبێ! لەوە بێگومانم. بابەتە سەرەکییەکە ئەوەیە کە هـەر کـەس تـۆزێ ڕوو بداتـە تاتیانـا ئیڤانۆڤنـا، ئـەو ئامادەیـە لـە پێناویدا خۆی بخاتە مەترسییەوە. بە کورتییەکەی، دەکەوێتە گـەڵ هەر کەسـێ کە وەڵامـی سـۆزی ئـەو بداتـەوە. هـەر لەبـەر ئـەوەش بـوو داوام کرد سوێند بخۆن کە نەخشەکەی من لە بەرژەوەندیی خۆتان بە کار نەهێنن. هەڵبەتە، ئێوە لەگەڵ ئەو ڕایەن کە لە وەها دۆخێکدا کە

من تێی کەوتووم، گەر ئەو بابەتە لە بەرژەوەندیی خۆمدا بە کار نەهێنم ئەوا هەڵەیەکی گەورەم کردووە.

کتوپڕ گوتم:

– گەر بە پێی قسەکانی ئێوە بێ، ئەو شێتێکی ڕاستەقینەیە... ئاخ! ببوورن... بیرم لای ئەوە نەبوو کە ئێوە بەتەمای ئەون، کەواتە ئیدی...

– تکا دەکەم، شەرم مەکەن، خۆ پێشتریش داوام لێ کردن. پرسیتان ئەو شتێکی ڕاستەقینەیە؟ چووزانم؟ بێ گومان شێت نییە، چونکە هێشتا نەکەوتووە شێتخانەوە. سەرەڕای ئەوەش، من ئەم سەودا عاشقانەیە بە بەڵگەیەك نازانم بۆ شێتیی تاك. ئەو –سەرباری هەموو شتێ– کچێکی سەرڕاستە. سەیر کەن، تا پاریش کچێکی ئێجگار دەستکورت بووە و هەر لە سەرەتای ژیانییەوە لەژێر ستەمی ئەو خانمەدا بووە کە بەخێوی کردووە. دڵێکی ئێجگار جوانی هەیە و کەچی هیچ کەسێکیش نەهاتووەتە داوای. دەی خۆ دەزانن کە تێکڕای ئەم فکروخەیاڵ و هیوا و ئارەزووانە و ئەو ئاگرەی ناخی کە دایمە ناچار بووە خەفەی بکات و ئەو ئەشکەنجانەی کە بەدەست خانمە بەخێوکەرەکەیەوە کێشاونی، بێ گومان دەشێ کەسایەتییەکی شێواو و هەستیاری لێ درووست بکەن. جا ئەو، کتوپڕ میراتێکی پێ دەبڕێ. دەی دانی پێدا بنێن کە ئەمە هەر کەسێکی دیکەش ژێرەوژوور دەکا. جا ئێستە بێ گومان هەموان دەوروخولی دەدەن و لێی نابنەوە و ئەریش هەموو هیواکانی زیندوو بوونەتەوە. هەر ئەمڕۆ باسی کەسێکی تەرپۆشی پەستەك سپیی

دەکرد، ئەم ڕووداوە بەو پێیەی کە خۆی لێی دەدوا، تەواو ڕاستە. جا لەسەر بنەمای لێکدانەوەی ئەم ڕووداوە، دەتوانی سۆسەی وردەکارییەکانی دیکە بکەی. ئێوە بە هەڵکێشانی ئاهێك، بە نامەیەك یان شیعرێك دەتوانن شەیدای خۆتانی بکەن، جا ئێستە سەرەڕای ئەمەش، گەر ئاماژەیەك بە پەیژەی ئاوریشمی[1]، گۆرانی و هەڵیتوپەڵیتەکانی دیکە بدەن، ئەوسا ئیدی دەتوانن چیتان پێ خۆشە لەگەڵی بکەن. من جارێکیان تاقیم کردەوە و دەمودەست توانیم ژوانێکی نهێنیانەی لەگەڵ ڕێك بخەم. هەڵبەتە جاری تا هەڵکەوتنی هەلێکی گونجاو بەرنامەکەمم دواخستووە، وەلێ بێ چەندوچۆن تا نزیکەی چوار ڕۆژێکی دی، دەبێ ئەو لەگەڵ خۆم ببەم. ڕۆژێ بەر لەوە، دەست بە ئاهەڵکێشان و دونیایەك قسەی قۆڕ دەکەم، جا باش گیتار دەژەنم و دەنگیشم خراپ نییە. دیداری ڕێك دەخەین، نیوەشەو لەژێر کەپرەکەدا یەك دەبینین و بەربەیانیش ئیدی ئامادەین سواری گالیسکە ببین. لە خشتەی دەبەم و جا پاشانیش سوار دەبین و ئێرە جێ دێڵین. هەر بەو جۆرەی کە دەیبینن، هیچ مەترسییەك لە ئارادا نییە، ئەو گەیشتووەتە تەمەنی یاسایی و جا بە ویستی خۆیشی ئەم کارە ئەنجام دەدا. هەرکە کەوتە گەلم و لەگەڵم هەڵهات، ئەوە مانای وایە تا کۆتای لەگەڵم دەبێ... دەیبەم بۆ لای خێزانێکی بەڕێزی هەژار... چل وێرستایەك لێرەوە دوورە... جا تا کاتی زەماوەندکردن، بە ڕێزەوە ئاگایان لێی

---

[1]. مەبەست لە ئۆپێرای پلیکانی ئاوریشمییە، کە بەرهەمی *کیاکینۆ ڕۆسینی*ی ئاوازدانەری ئیتاڵییە. «و. ف»

دەبێ و ناهێڵن هیچ کەسێ لێی نزیک بێتەوە، لەم کاتەدا، منیش هەلەکە دەقۆزمەوە و بە سێ ڕۆژ زەماوەندەکە ڕێك دەخەم... ئەمە کارێکی دژوار نییە. هەڵبەتە بەر لە هەموو شتێ من پێویستیم بە پارەیە. حسێبم کردووە، بۆ ئەم کارە، ئەوپەڕی هەر پێنجسەد ڕۆبڵێکم پێویستە. جا بۆ دەستخستنی ئەم برە پارەیەش پشتم بە ئیگۆر ئیلیچ بەستووە: ئەو بێ ئەوەی بپرسێ بۆ چیمە، یەکسەر پارەکەم دەداتێ. ئێستە تێگەیشتن؟

دواجار کە کۆی باسەکەم بیست، گوتم:

– بەڵێ، تێگەیشتم، وەلێ بڵێن بزانم، من چ یارمەتییەکم لەدەست دێ؟

– ئاخ، حەیفتان نەکرد، ئێوە یارمەتیی زۆرتان لەدەست دێ! ئەگەر وا نەبا خۆ داوام لێ نەدەکردن. پێم گوتن کە من خێزانێکی هەژار و بەڕێزم دیاری کردووە. ئێوە دەتوانن لێرە و لەوێ و وەکو شاهێدێکیش یارمەتیم بدەن. دانی پێدا دەنێم کە بێ یارمەتیی ئێوە دەستەپاچە دەبم.

– وەلێ پرسیارێکی دی. بۆ ئەو شەرەفەتان پێ بەخشیم و وەك متمانەپێکراوی خۆتان هەڵتان بژاردم، ئەمەش لە بارێکدا کە بە هەمووی چەند کاتژمێرێکە من هاتووم و ئێوە من هەر ناشناسن؟

میزینچیکۆڤ بەدەم زەردەخەنەیەکی ڕێزدارانەوە هاتە وەڵام:

– ڕاستگۆیانە دانی پێدا دەنێم کە پرسیارەکەتانم بە دڵە، چونکە ئەو دەرفەتەم بۆ دەڕەخسێنێ تا بڵێم ئێوە چ ڕێزێکتان لای من هەیە.

– ئۆو، ئێوە زۆر بە شانوباڵمدا هەڵدەدەن!

– نا، ئەوەی ڕاستی بێ ئەم عەسرە کەمتازۆر چاوم لەسەرتان بوو. ڕاستە کە ئێوە توونەمەزاجن و... جا... هەم باش و هەمیش لاون، وەلێ بە تەواوی لەوە دڵنیام کە قسەکانم بۆ کەس ناگێڕنەوە و بێ گومان بەڵێنی خۆتان دەبەنە سەر. خۆ ئێوە ئابنۆسکین نین... ئەمە یەك، دووەمیش، ئێوە مرۆڤێکی ئاوڕوومەندن و ئەم بیرۆکەیە لە بەرژەوەندیی خۆتان بە کار ناهێنن، تەنیا مەگەر ئەو کاتەی کە بتانەوێ مامەڵەیەکی هاوڕێیانەم لەگەڵ بکەن کە من ئەوسا ئامادەم بیرۆکەکەی خۆم، یانی تاتیانا ئیڤانۆڤناتان ڕادەست بکەم. سەرەڕای ئەوەش، بە هەموو توانامەوە یارمەتیتان دەدەم تا هەڵیگرن، بەس بە مەرجێك، ئەویش ئەوەیە کە دەبێ مانگێ پاش زەماوەندکردن پێنجسەد هەزار ڕۆبڵ ببژێرن، کە هەڵبەتە بەر لەوە دەبێ وەك گرێنتییەك، نووسراوەیەکم بۆ واژۆ بکەن.

قیڕاندم:

– چی؟ ئەوە خەریکن ئەوم بۆ پێشنیار دەکەن؟

– گەر ئێوە دڵتان پێوە بێ من ئامادەم. هەڵبەتە ئەوم لەدەست دەچێ، بەس... ئەمە ئیدی بیرۆکەی منە و هەموو بیرۆکەیەکیش نرخی خۆی هەیە. سێیەمش، بۆیە ئێوەم دەستنیشان کرد کە هیچ پڕاردەیەکی دیکەم نەبوو. بە لەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی ئێرە، ناکرێ پلانەکە دوابخەم. سەرەڕای ئەوەش، بەم نزیکانە ڕۆژووی

ئۆسپێنسکی[1] دەست پێدەکا و ئیدی ئەنجامدانی ڕێوڕەسمی زەماوەندکردن قەدەغەیە. هیوادارم ئێستە لە کرۆکی بابەتەکە تێگەیشتبن!

– کتومت! جارێکی دیکەش بەڵێن دەدەم کە نهێنییەکەتان بپارێزم، وەلێ بە ئەرکی خۆمی دەزانم کە هەر ئێستە پێتان بڵێم من ناتوانم لەم کارەدا هاودەستتان بم.

– ئاخر بۆچی؟

من کە ئیدی کەلەیی بووبووم[2]، هاوارم کرد:

– بۆچیی چی؟ یانی ئێوە نازانن ئەمە کارێکی ناپیاوانەیە؟ گریمان بۆچوونەکەی ئێوە لە بارەی کەمئەقڵی و خەیاڵی عاشقانەی ئەم پاکیزەیەوە ڕاست دەرچوو، باشە خۆ هەر ئەوە دەبێ واتان لێ بکا خۆ بەدوور بگرن لە ئەنجامدانی وەها کارێك لەبەرانبەر کەسێکی دڵپاکدا! ئێوە خۆتان گوتتان کە ئەو –سەرەڕای گاڵتەجارییەکەی– شیاوی ڕێزلێنانە. کەچی ئێوە داماوییەکەی ئەو دەقۆزنەوە و دەتانەوێ سەدهەزار ڕۆبڵی لێ بکێشنەوە! بێ گومان ئێوە نابنە مێردێکی باش و بەرپرسیار بۆ ئەو، بێ چەندوچوون وازی لێ دێنن... ئەمە زۆر نامەردانەیە و بە داوای لێبووردنەوە دەبێ بڵێم، تێناگەم بە چ ئەقڵێکەوە منتان کردووە بە هاودەستی خۆتان!

---

١. ڕۆژووی ئۆسپێنسکی: لە ڕۆژووی ئەرتەدۆکسییەکانە، کە لە یەکەوە تا ١٥ی مانگی ئاب، یانی تا ڕۆژی جەژنی هەڵکشانی مریەمی پیرۆز دەخایەنێت. «و. ف»

٢. کەلەییبوون: دەربیبوون، هەڵچوون، شێتبوون، تووڕەبوونی لە ڕادەبەدەر.

میزینچیکۆڤ بە سەرسوورمانێکەوە کە دیاربوو دەستکرد نییە، هاواری کرد:

– ئاه، خوایە، چەندە ڕۆمانتیسمە! تەنانەت ناشکرێ بڵێین ڕۆمانتیک! ئێوە هەر تێنەگەیشتوون مەسەلە چییە. دەڵێن نامەردانەیە، کەچی ئەم کارە تەنیا لە بەرژەوەندیی مندا نییە، لە بەرژەوەندیی ئەویشدایە... باش بیری لێ بکەنەوە!

بە زەردەخەنەیەکی مانادارەوە گوتم:

– هەڵبەتە گەر لە دیدگەی ئێوەوە لێی بڕوانین، ڕەنگە وا بێتە بەرچاو کە بە زەماوەندکردن لەگەڵ تاتیانا نیڤانۆڤنادا کارێکی دلێرانە ئەنجام دەدەن.

میزینچیکۆڤیش بەش بە حاڵی خۆی تووڕە بووبوو و هاواری کرد:

– یانی چی کە دلێرانەیە! هەر وایە، ئەوەندە دلێرانەیە هەر نەبێتەوە! خۆتان داوەری بکەن، من چاوپۆشی لە خۆم دەکەم و بەوە قاییل دەبم کە ببمە مێردی ئەو... دەی، یانی ئەمە شتێکی کەمە؟ جا دوای ئەوەش، سەرەڕای ئەوەی کە ئەو سەدهەزار ڕۆبڵی زیویی ئەسڵی هەیە، من تەنیا چاوم لە سەدهەزار ڕۆبڵی ئەسکەناسە و بەڵێنیشم بە خۆم داوە کە ئیدی بە درێژایی تەمەنم تەنانەت یەك کۆپیکیشی لێ وەرنەگرم، ئەمەش لە بارێکدا کە من دەتوانم وەها کارێ بکەم، کەچی نایکەم... دەی خۆ ئەمەش هەر کەم نییە! دواجار، باش بیری لێ بکەنەوە، ئایا ئەو دەتوانێ ژیانێکی بێخەمانە بژی؟ جا بۆ ئەوەی ژیانێکی بێخەمانەی هەبێ، پێویستە پارەکەی لێ

وەرگری و لە نەخۆشخانەی دەروونیدا بیخەوێنی، چونکە ئەگەری ئەوە هەیە کە لە هەر ئان و ساتێکدا کابرایەکی تەڵەکەچی و زمانلووس و خوێریی بە ڕیش و سمێڵێکی پرۆفیسۆرییەوە، گیتاربەدەست و بەدەم گۆرانیگوتنەوە لێی پەیدا ببێ و لە خشتەی بەرێ، دواجار زەماوەندی لەگەڵ دەکا و هەتا دواهەمین کۆپیك دەیدۆشێ و جا پاشانیش، لە جێیەکی شەقامی سەرەکیدا بەرەڵای دەکا. جا لێرەش، کە گوایە ماڵی خانەدانانە، تەنیا لەبەر خاتری پارەکەی ڕاگیراوە. ئەو پێویستە ئەم بەدبەختییەی لە کۆڵ بکرێتەوە، دەبێ نەجات بدرێ. دەی، خۆ دەزانن هەرکە زەماوەندی لەگەڵ من کرد، ئیدی سەرلەبەری هەموو ئەم بەدبەختیانە کۆتاییان پێ دێ. ئاخر من دەبێ وا بکەم کە ئیدی تووشی دەردیسەری نەیێ، سەرەتا، خێرا دەیبەمە لای خێزانێکی کەمدەست و بەڕێز لە مۆسکۆ... ئەمە ئەو خێزانە نییە کە پێشتر باسم کرد، خێزانێکی دیکەیە، خوشکەکەم بەردەوام لای دەبێ، وەك گلێنەی چاوی ئاگای لێی دەبێ. نزیکەی دووسەدوپەنجا ڕۆبڵیشی بۆ دەمێنێتەوە، یان لەوانەشە سێسەد هەزار. دەزانن، ئەم هەموو پارەیە ژیانێکی باشی پێ دەستەبەر دەکرێ! دەتوانێ هەموو چێژێ تاقی بکاتەوە، دەتوانێ چۆنی پێ خۆشە بۆخۆی ڕابوێرێ و بچێ بۆ کۆڕی سەما و کۆسەکاری[1] و کۆنسێرت. تەنانەت دەتوانێ بە خەیاڵیش لەگەڵ ئەم و ئەودا ڕابوێرێ، هەڵبەتە من لەم بارەیەوە بە تەواوی چاوم لەسەری دەبێ، لێگەڕێ با چیی پێ خۆشە بە خەیاڵ بیکا، وەلێ بە کردار، نەخێر! ئێستە بۆی هەیە هەر کەسێ ئازاری پێ بگەیەنێ، بەس کە

1. کۆسەکاری: ئاهەنگگێڕانێکی تایبەت کە لە هەڵپەڕکێ و گۆرانیگوتن و شایی پێك دێت و ئامادەبووان بە جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگ و دەمامکەوە هەڵدەپەڕن و لاسایی گیانەوەران دەکەنەوە.

زەماوەندی لەگەڵ من کرد، ئیدی هیچ کەس مۆڵەتی وەها کارێك بە خۆی نادا. چونکە ئەو ئیدی هاوسەری منە، ئەوسا دەبێتە خانم میزینچیکۆڤا. من مۆڵەت بە هیچ کەسێك نادەم سووکایەتی بە ناوم بکا! خۆ دەزانی ئەوە مەسەلەیەکی چەندە گرنگە؟ جا سرووشتی ئێمە وا دەخوازێ لە یەك شوێندا نەژیین. ئەو لە مۆسکۆ دەمێنێتەوە و منیش لە جێیەکی پترسبورگدا. وا دان بەوەدا دەنێم، چونکە لەم کارەدا لەگەڵ ئێوە ڕووڕاستم، جا ئەوە کەی کێشەیە کە ئێمە بە جیا بژیین؟ باش بیری لێ بکەوە. ئاخر خووڕەوشتی ئەو ئافرەتە لە بەرچاو بگرن. ئایا ئەو دەتوانێ شوودار بێ و لەگەڵ مێردەکەی لە یەك شوێندا هەڵبکا؟ بۆ مەگەر دەکرێ لەگەڵی هەڵبکەی؟ ئاخر زەینکوێرترین بوونەوەری سەر ڕووی زەوییە! هەر دەمەو لەسەر بارێکە، تەنانەت ڕەنگە کە بۆ سبەینێی ڕۆژی زەماوەندەکەی ئەوەی بیر چێ کە شووی کردووە و بە پێی یاسا بووەتە ژنی کەسێ. من گەر لەگەڵ ئەو لە شوێنێکدا بژیم و بمەوێ بە شێوەیەکی جددی ئەرکەکانی سەر شانی ڕاپەڕێنێ، ئەوا لە بنەڕەتدا ئەوم چارەڕەش کردووە. هەڵبەتە من ساڵی جارێ یان ڕەنگە زیاتریش سەردانی بکەم، جا نەك لەبەر پارە... لەوە دڵنیا بن. خۆ گوتم، لە سەدهەزار ئەسکەناس زیاتری لێ ناسەنم و لەسەر قسەی خۆشم سوورم! تا ئەو جێیەی کە بابەتەکە پەیوەندیی بە پارەوە هەبێ، من بە دلێرانەترین شێوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکەم. من گەر ئاوها ساڵی دووسێ جارێك سەردانی بکەم، زیاتر چێژ لەو دیدارانە وەردەگرێ و وەڕەزیشی ناکەم. بەدەمیەوە دەقلێمەوە[1]، نوکتەی بۆ دەکەم، دەیبەم بۆ کۆڕی سەما، پێکەوە ڕادەبووێرین، دیاریی بۆ دێنم، گۆرانیی بۆ دەڵێم، بە دیاری سەگی ژیکەڵەی دەدەمێ و زۆر ڕۆمانتیکیانە لێك

---

١. دەقلێمەوە، قاقا لێ دەدەم، قلیەوە، قللێ میەو وەنە. قللە، قاقا.

جیا دەبینەوە و جا نامەی عاشقانەش بۆ یەکدی دەنێرین. ئەو بە هەبوونی مێردێکی هێندە ڕۆمانسی و عاشق و ڕووخۆش شاگەشکە دەبێ! بە بڕوای من، ئەمە کارێکی ژیرانەیە، پێویستە هەموو مێردێك هەڵسوکەوتی ئاوها بێ. ئەوان تەنیا کاتێ لای هاسەرەکانیان خۆشەویست دەبن کە لێیانەوە دوور بن. جا بەم پێیە، من بە شیرینترین شێوە تا کۆتایی تەمەن دڵی تاتیانا ئیڤانۆڤنا بەدەست دێنم. ئادەی بڵێن بزانم، ئیدی لەمە زیاتر چیی دەوێ؟ دەی بڵێن! بەمە دەڵێن بەهەشت، نەك ژیان!

من سەراسیمە و بێدەنگ گوێم بۆ شل کردبوو. دەمزانی مشتومڕ لەگەڵ میزینچیکۆڤ هیچ سوودێکی نییە. زۆر مکووڕانە بڕوای بە ڕاستیی پلانەکەی خۆی و هەروەها ئەو بەها سەیرە هەبوو کە بۆی دادەنا و جا وەك داهێنەرێك، بە جۆشوخرۆشێکی زۆرەوە لێی دەدوا.

بەو پێیە، تەنیا کێشەیەك مابوو کە دەشیا بە لایەکدا ببڕێت. پرسیم:

– باشە، ئێوە نازانن کە ئێستە ئەو وەك دەزگیرانی خاڵە وایە؟ ئێوە بە هەڵگرتنی سووکایەتییەکی گەورە بەو دەکەن، ڕێك لە بەرەبەری زەماوەنکردندا بووکێ هەڵدەگرن و جا سەرباری ئەوەش، ئێوە پارەی ئەنجامدانی ئەم کردەوە دلێرانەیەتان لە خاڵە وەردەگرن!

میزینچیکۆڤ بە جۆشوخرۆشەوە هاواری کرد:

– ئاوا ناکاوگیر دەکەم! نیگەران مەبن، من پێشتر پێشبینیی پرسیارەکەی ئێوەم کردبوو. سەرەتا لە هەموو شتێ گرنگتر ئەوەیە کە خاڵە هێشتا خوازبێنیی نەکردووە، سەرەڕای ئەوەش، یانی لە ئێوە وایە من ئاگادار نیم کە دەیانەوێ ئەوی بۆ بخوازن؟ جا

پێویستە بیرتان بهێنمەوە کە من وا بۆ ماوەی سێ حەفتەیە کار لەسەر ئەم پلانە دەکەم، یانی لەو کاتەوەی کە من هێشتا ئاگاداری نیازی ئەوانەی ئێرە نەبووم. جا هەر لەبەر ئەوەش، لە ڕووی ئەخلاقییەوە، ئەوە مافی منە و تەنانەت گەر داوەرییەك ڕێك بکەین، ئەوە من نیم کە دەزگیرانی ئەو دەدزم، بەڵکە ئەوە ئەوە کە دەزگیرانەکەی من زەوت دەکا. هەروەها، دەبێ بڵێم، پێشتر لەگەڵ ئەو و لەژێر کەپرەکەدا ژوانێکمان هەبووە. دواجار ئادەی بزانم، ئەوە ئێوە نەبوون پێشتر سکالاتان لەوە دەکرد کە دەیانەوێ خاڵە گیانتان ناچار بکەن تا لەگەڵ تاتیانا ئیڤانۆڤنا زەماوەند بکا؟ کەچی ئێستە ئەم زەماوەندەتان کردووە بە گرێی سەر دڵتان و باسی ئاوڕوو و سووکایەتیی خێزانی دەکەن! لە بارێکدا کە من خەریکم پیاوەتی لەگەڵ خاڵە گیانی ئێوەدا دەکەم، من وا قوتاری دەکەم... دەبێ لەوە تێبگەن! ئەو بێزی لەم زەماوەندە دەبێتەوە و لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو دڵی بە کچێکی دیکەوەیە! ئاخر تاتیانا ئیڤانۆڤنا کەی کەڵکی ئەوەی هەیە ببێتە هاوسەری ئەو؟ جا تاتیانا لەگەڵ ئەودا بەختەوەریش نابێ، چونکە ئەوسا سنووری بۆ دادەنرێ و ئیدی نابێ سوورەگوڵ فڕێداتە بەرپێی گەنجان. من کە دەمەو شەو ئەوم هەڵگرت، ئیدی نە ژنی جەنەراڵ هیچی پێ دەکرێ و نە فۆما، چونکە گەڕاندنەوەی دەزگیرانێك کە لە بەرەبەری ڕێوڕەسمی مارەبڕیندا هەڵهاتووە، مایەی ڕسوایییە. ئادەی بزانم، بۆ خوا، ئەمە چاکە و پیاوەتی نییە کە لەگەڵ ئیگۆر ئیلیچی دەکەم؟

– ئەی ئەگەر هەر سبەینێ خوازبێنیی لێ کرد؟ خۆ ئەوسا تا ڕادەیەك درەنگە، چونکە ئیدی تاتیانا ئیڤانۆڤنا دەبێتە دەزگیرانی.

– بەڵێ، بێ گومان درەنگ دەبێ! وەلێ دەی، پێویستە ئێمە کارێ بکەین تا ئەمە ڕوونەدا. لاتان وایە بۆ داوای یارمەتیم لە ئێوە کردووە؟ ئەمە بۆ من بە تەنیایی زۆر دژوارە، وەلێ پێکەوە دەرەقەت دێین و دەتوانین وا بکەین کە ئیگۆر ئیلیچ خوازبێنیی نەکا. دەبێ بە هەموو توانای خۆمانەوە بەر بەم کارە بگرین، تەنانەت لەوانەشە پێویست بەوە بکا فۆما فۆمیچ قامچیکاری بکەین و سەرنجی هەمووان بە لاڕێدا بەرین، ئەوسا ئیدی هیچ کەسێ بیر لە زەماوەند ناکاتەوە. هەڵبەتە ئەمە لە بارێکدا کە هیچ ڕێچارەیەکی دیکەمان لە بەردەستدا نەبێ، ئەمەم هەروا بۆ نموونە هێنایەوە. لەم مەسەلەیەدا من هەموو هیوایەکم بە ئێوەیە.

– دواهەمین پرسیار: ئێوە بێ لە من پلانەکەی خۆتان بۆ هیچ کەسێکی دی باس کردووە؟

میزینچیکۆڤ سەری خوراند و ڕووخساری تاڵ بووەوە و هاتە وەڵام:

– دانی پێدا دەنێم کە ئەم پرسیارە لە تاڵترین حەبیش تاڵترە. ئەوەی ڕاستی بێ من بیرۆکەکەی خۆمم لای کەسێکی دیکەش باس کردووە... بە کورتییەکەی ئیشەکەم زۆر گەمژانە بوو! بە بڕوای ئێوە بۆ کێم باس کردبێ باشە؟ بۆ ئابنۆسکین! خۆشم بڕوا ناکەم. هەر نازانم ئەمە چۆن ڕووی دا! ئابنۆسکین بەردەوام لەم دەوروبەرانە دەخولایەوە و منیش ئەوسا باش نەمدەناسی، کاتێکیش ئەم

بیرۆکەیەم بە مێشکدا هات، زۆر خرۆشابووم و جا لەبەر ئەوەی هەر لە سەرەتاوە دەمزانی پێویستیم بە هاودەستێکە، ئیدی هانام بۆ ئەو برد... شیاوی لێخۆشبوون نییە، شیاو نییە!

– ئێ، ئابنۆسکین کاردانەوەی چی بوو؟

– بە خۆشحاڵییەوە لەگەڵم ڕێك کەوت، وەڵێ بۆ بەیانییەکەی پێوار بوو. جا بۆ سێ ڕۆژ دواتر، لەگەڵ دایەگیانی سەروسەکوتی دەرکەوتەوە. وا ئێستەش یەك وشەم لەگەڵ ناڵێ و وەك ئەوەی کە ترسی لە شتێ هەبێ، خۆی دەدزێتەوە کە قسە لەو بارەیەوە بکا. دەستبەجێ تێگەیشتم مەسەلە چییە. دایکی هەتا بڵێی تەڵەکەچییە و هەر بە ڕاستی گورگی ناو هەمبانەیە. پێشتریش دەمناسی. بێ گومان ئابنۆسکین هەموو شتێکی بۆ گێڕاوەتەوە. ئێستاکە منیش خۆم بێدەنگ کردووە و چاوەڕێم، ئەوان پەیجۆریم دەکەن و دۆخەکەش تۆزێ ئاڵۆز بووە... هەر لەبەر ئەوەشە کە پەلەمە.

– بۆ نموونە ترستان لە چی هەیە؟

– لە زۆر شت. خۆیان شتێکی وا ناکەن، بەڵکە بێ چەندوچۆن دەست دەدەنە هەندێ کردەوەی دزێو... وەك ئەوەی کە لە بری بێدەنگبوون و هاوکارییان داوای پارە بکەن. چاوەڕێم تا بزانم کەی پێشنیار دەکەن... بەس ناتوانم پارەیەکی زۆریان بدەمێ و هەر ناشمەوێ شتی وا بکەم... بڕیاری خۆمم داوە: لە سێهەزار ڕۆبڵی ئەسکەناس زیاتر نادەم. بابە، ئاخر هەر خۆتان بڵێن، لێرە سێهەزار، پێنجسەد ڕۆبڵی زیویش بۆ زەماوەندەکە، چونکە دەبێ هەموو پارەکانی خاڵە بدەمەوە، دوای ئەوە قەرزە کۆنەکانیش، دەی، بڕە

پارەیەکیش دەدەمە خوشکم، هەڵبەتە بڕێك. گەر ئاوا بێ، ئەو هەزارە چەندی لێ دەمێنێتەوە؟ مایەپووچ دەبم!... جا ئابنۆسکین و دایکی ڕۆیشتن.

بە کونجکۆڵییەوە پرسیم:

– ڕۆیشتن؟

– دوای چاخواردنەوە ڕۆیشتن. دەك بە ملی شکاویان بچن! جا بەیانی تەماشا دەکەی دیسان سەروسەکوتیان دەرکەوتووەتەوە. دەی، ئێستە دوای ئەم هەموو ڕوونکردنەوانە لەگەڵمدان یان نا؟

خۆم کۆ کردەوە و هاتمە وەڵام:

– دەبێ دانی پێدا بنێم کە نازانم چی بڵێم. مەسەلەکە ئێجگار ئاڵۆزە... هەڵبەتە نهێنییەکەتان دەپارێزم، من وەك ئابنۆسکین نیم، وەلێ... لام وایە وا باشترە پشت بە من نەبەستن.

میزینچیکۆڤ لەسەر کورسی هەستایەوە و گوتی:

– وا دیارە هێشتا بە دەست دایەگەورە و فۆما فۆمیچەوە تێرتان نەخواردووە و سەرەڕای ئەوەی کە خاڵەی میهرەبان و ئاوڕومەندتانتان خۆش دەوێ، کەچی هێشتا دەرکتان بەوە نەکردووە کە چ ئازارێکی دەدەن. ئێوە تازە هاتوونەتە ئێرە... بەس پەلەتان نەبێ! گەر تا بەیانی لێرە بن و بە چاوی خۆتان هەموو شتێ ببینن، ناکاتە عەسر لەگەڵم دەسازێن. گەر وا نەکەن، خاڵە گیانتان دەفەوتێ... تێدەگەن؟ بێ سێودوو بە ناچاری مل بۆ ئەو زەماوەندە دەدا. بیرتان نەچێ کە بۆی هەیە هەر ئەم بەیانییە بچێتە خوازبێنی. جا ئەوسا ئیدی بێسوودە، دەبێ هەر ئێستە بڕیار بدەین!

– ئەوەی ڕاستی بێ هیوای سەرکەوتن بۆ ئێوە دەخوازم، وەلێ یارمەتی... نازانم، دەڵێی...

**میزینچیکۆ تیزخەنێکی[1] کرد و گوتی:**

**- تێدەگەم! تا بەیانی چاوەڕێ دەبم. La nuit porte conseil[2]. جارێ ماڵئاوا. سەبەی سەرلەبەیانی دێم... تا ئەو کات خۆتان یەکلایی بکەنەوە...**

**ئەمەی گوت و بەدەم فیکەلێدانەوە ئەوێی جێهێشت. منیش بەدوایدا چوومە دەرێ تا هەوایەك بگۆڕم. مانگ هێشتا هەڵنەهاتبوو، شەو تاریك و هەوا گەرم و قوورس بوو و تەنانەت گەڵای دارانیش نەدەبزووتن. سەرەڕاسەی ماندوویەتی، حەزم دەکرد بەدەم پیاسەکردنەوە پشووێك بە مێشکم بدەم و بیروهۆشم کۆ بکەمەوە، وەلێ هێشتا دە هەنگاوێکم نەنابوو کە لە ناکاو دەنگی خاڵەم بیست کە لەگەڵ کەسێك بە پلیکانی بیناکەدا سەردەکەوت و بە جۆشوخرۆشێکی فرەوە دەدوا.**

**ئەو پیاوە ڤیدۆپلیاسۆ بوو.**

---

١. تیزخەن: زەردەخەنەی سووکایەتیئامێز و گاڵتەکەرانە بە بەرانبەر. ئەم دەستەواژەیەم بە یارمەتیی هەردوو فەرهەنگی (دانشگا کردستان) و (هەمبانە بۆرینە) لەبەرانبەر وشەی «ریشخند» یان «پوزخند»ـی فارسی داتاشیوە کە هێندەی من ئاگاداربم، وەها وشەیەکمان نەبووە یان لایەنی کەم من بەرچاوم نەکەوتووە. وشەکە لێکدراوە و لە ڕەگی چاوگی «خەنین، واتە پێکەنین " خوای " کەنین»ـەوە وەرگیراوە، کە دەبێت بە «خەن» و وشەی «تیز» کە لە فەرهەنگی هەمبانە بۆرینەدا دەرهێنراوە و بە واتای گاڵتەپێکردن و تەوسلێدان دێت. کەواتە «تیزخەن» بە واتای زەردەخەنەیەکی گاڵتەئامێز و سووکایەتیپێکەرانە دێت. هیوادارم پێکابێتم و ئەم وشە لێکدراوە لەجێ بێت.

٢. پەندێکی فەڕەنسییە. واتای ئەوە دەگەیەنێت کە بڕیاردان یان ئەنجامدانی کار بخرێتە سەبەینێ، چونکە بەیانیان بیری مرۆ کراوەترە و بڕیاری باش و ژیرانەتر دەدات. «و. ف»

# وەرزی یازدەیەم

## ئەوپەڕی ڕاڕایی

– خاڵە گیان! وا دواجار ئێوەم دۆزییەوە.

– هاوڕێکـەم، خۆشـم نیـازم بـوو بـێم بـۆ لات. بـەس لێگـەڕێ بـا قسەکانم لەگەڵ ڤیدۆپلیاسۆڤ تەواو بن، جا پاشان دەتوانین بە دڵی خۆمان قسان بکەین. قسەی زۆرم هەیە.

– چی، یانی ئێستە ئیدی سەرەی ڤیدۆپلیاسۆڤە؟ خاڵە گیان، وێڵی کە.

– سیریۆژا، باوانم، تەنیا پێنج تا دەقەی دی، دوای ئەوە ئیدی لە خزمەتت دام. هینە، بابەتەکە زۆر گرنگە.

بە قەڵسییەوە گوتم:

– بێ گومان دیسان خەریکی قسەی کەمژانەیە.

– چـی بڵـێم، هاوڕێکـەم؟ دواجـار هـەر یەکـەو بـە جـۆرە هەڵیتوپـەڵیتێ بـەرۆکمان دەگرێ! کاکە گریگۆری، ئەوە کـەی کـاتی

گلەیی و گازاندەیە؟ دەی، من دەتوانم چیت بۆ بکەم؟ کاکە، کەمێکیش بەزەییت بە مندا بێتەوە. ئاخر ئیدی ماندووم بە دەستتانەوە، وا خەریکە بە زیندووی قووتم دەدەن! سیریۆژا، ئیدی برستم لێ براوە بەدەست ئەمانەوە!

جا بە پەژارەیەکی قووڵەوە دەستەکانیی لە هەوادا چەرخاندن. پرسیم:

- باشە ئەم کارە گرنگە چییە کە نابێ دوابخرێ؟ من کارێکی خێرام پێتانە، خاڵە گیان...

- ئاە، براله، هیچی هیچ نەبوو هەمووان پرتەوبۆڵەیانە کە گوایە گوێ بە ئاکار و هەڵسوکەوتی خزمەتکارەکان نادەم! دەشێ هەر سبەینێ دەست بکاتە گازاندە کە گوێم بۆ قسەکانی نەگرتووە و جا ئەوسا فەرتەنەیەك دێتە ئارا...

دیسان دەستی ڕاوەشاند.

- باشە، کەواتە تا زووە قسەکانتان لەگەڵ ئەو تەواو کەن! لەوانەیە منیش بتوانم یارمەتیتان بدەم. وەرن بچینە سەرێ.

کە چووینە ژوورێ، پرسیم:

- ئیشی چییە؟ چیی لێتان دەوێ؟

- هینە، براله، ئەو کەیفی بە ناوە بنەماڵەییەکەی نایێ، دەیەوێ بیگۆڕێ. بە ڕای تۆ دەبێ چی بکەین؟

لە سەرسامییان دەستەکانم ئاوەڵا کردبوونەوە و گوتم:

- ناوی بنەماڵەیی؟ ئەمە یانی چی؟... خاڵە گیان، بەر لەوەی قسەکانی ئەو ببیستم، مۆڵەت بدەن بڵێم کە تەنیا لە ماڵەکەی ئێوەدا ئەگەری ڕوودانی ئەم شتە سەیروسەمەرانە هەیە.

– ئاخ، براله! خۆ منیش دەتوانم دەستەکانم ئاوا لێ بکەم، بەس سوودی چییە... وەرە و خۆت قسەی لەگەڵ کە، وەرە تاقیی کەوە. وا بۆ دوو مانگ دەچێ گیری داوم...

ڤیدۆپلیاسۆڤ بە شێوازێکی نارازییانە گوتی:

– ناوە بنەماڵەییەکەم هیچ ڕەسەنایەتییەکی نییە، قوربان!

بە سەرسامی پرسیم:

– بۆ ڕەسەنایەتیی نییە؟

– وایە ئیدی! مایەی شوورەییە، قوربان.

– بۆ مایەی شوورەییە؟ ئاخر چۆن دەبێ بیگۆڕی؟ تا ئێستە دیوتە کەس ناوی بنەماڵەیی خۆی بگۆڕێ؟

– حەیفتان نەکرد، بۆ مەگەر کەس هەیە ناوە بنەماڵەییەکەی ئاوا بێ، قوربان؟

من کە بە تەواوی سەراسیمە بووبووم، لەسەری چووم:

– ڕاستە ناوە بنەماڵەییەکەت کەمێ سەیرە، وەلێ ئێستە دەبێ چی بکەین؟ دەی ناسناوی بنەماڵەی باوکت هەر ئەمە بووە!

ڤیدۆپلیاسۆڤ گوتی:

– بەڵێ، قوربان، من دەبێ بۆ تاهەتا بەدەست باوانمەوە ئەشکەنجە بکێشم و ناچار بە بۆنەی ناوەکەمەوە بەرگەی تیزخەنی ئەوانی دیکە بگرم و ئەم هەموو بەدبەختییە بکێشم، قوربان.

بە نیگەرانییەوە بە خاڵەم گوت:

– خاڵە گیان، گرەو دەکەم ئا ئەمە لەژێر سەری ئەو فۆما فۆمیچەدایە!

– نا، براله، نا، نا، تۆ بە هەڵەدا دەچی. ئەوەی ڕاستی بێ، فۆما چاکە و پیاوەتیی بەسەر ئەوەوە هەیە. ئەوی کردووە بە سەرقەڵەمی خۆی، هەموو ئەرکی ڤیدۆپلیاسۆڤ ئەمەیە. دەی، هەڵبەتە فۆما ئەوی پەروەردە کردووە و شتێ لە ڕۆحی پاکی خۆی ئاوێتەی ئەو کردووە، وای لێ هاتووە لە هەندێ ڕووەوە ئاستی تێگەیشتن و دەرکپێکردنی زۆر بەرز بووەتەوە... سەیر کە، ئێستە هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم...

ڤیدۆپلیاسۆڤ پەڕییە نێو قسەکانی و گوتی:

– ڕاستە، فۆما فۆمیچ نانبدەی ڕاستەقینەی منن، قوربان، جا لەبەر ئەوەی نانبدەی ڕاستەقینەمن، منی بێکەڵکیان تێگەیاند کە چ کرمێکم بەسەر ئەم زەوییەوە. لە سایەی ئەوانەوە دەرکم بە چارەنووسم خۆم کردووە، قوربان.

خاڵە بە هەمان پەلەپەلی هەمیشەییەوە لەسەری ڕۆیشت:

– بینیت، سیریۆژا، ئێستە بینیت مەسەلە چییە؟ ڤیدۆپلیاسۆڤ هەر لە سەرەتاوە، یانی کەمتازۆر هەر لە سەردەمی منداڵییەوە لە خزمەت مامۆستایەکی خۆشنووسیی مۆسکۆدا بووە. دەبێ ببینی کە چەندە جوان لێیەوە فێری خۆشنووسی بووە. دەزانی، بە بۆیە و زێڕکاری وا کوپیدۆ[1] بە دەوری لاپەڕەدا دەکێشێ کە هەر لە باسا نییە... بە کورتییەکەی، هونەرمەندێکە بۆ خۆی! ئالیۆشا لە

---

١. Cupido: کوپید یان کوپیدۆ، لە ئەفسانە ڕۆمییەکاندا خودای عەشق بوو کە لە سەروسیمای منداڵێکی ڕووت و باڵدار (فریشە)دا بەرجەستە دەبوو. «و. ف»

بندەستی ئەودا فێر دەبێ، لەبەرانبەر هەر وانەیەکیشدا کۆپیك و نیوێك دەدەم. هەڵبەتە فۆما خۆی ئەم بڕەی دیاری کردووە. دەچێ بۆ ماڵی مۆڵکدارانی دراوسێش، ئەوانیش لەبەرانبەر وانەکاندا دەستهەقی دەدەنێ. خۆ دەبینی چۆن جلوبەرگ لە بەر دەکا! جا لە شیعریشدا دەستی هەیە.

– شیعر! بەڵێ، هەر ئەمەمان کەم بوو!

– بەڵێ، برالە، شیعر. وا نەزانی بە گاڵتەمە ها. شیعری چاك دەنووسێ، چووزانم، کێشیان هەیە و... دەزانی، لەسەر هەموو بابەتێکیش دەنووسێ، دەمودەس هەموو بابەتێ دەکاتە شیعر. هەر بە ڕاستی خاوەن بەهرەیە! بۆ ئاهەنگی ناولێنانی دایە گیان، وەها وتارێکی نووسی کە ئێمە هەموو دەممان بەش بووبووەوە. وتارەکەی پڕ بوو لە ئەفسانە و خوابانووی شیعری کە هەڵدەفڕین، بە چەشنێك کە، تەنانەت دیار بوو کە ئەم وتارە... چووزانم؟ پاراو و ئاهەنگدار بوو... بە کورتیەکەی، سەرلەبەر سەرروادار بوو. فۆما خۆی هەڵەبڕیی بۆ کردبوو. دەی، هەڵبەتە منیش لەم بارەیەوە هیچ لارییەکم نییە، سەرباری ئەوەش، بەش بە حاڵی خۆم تەنانەت خۆشحاڵیشم. لێگەڕێ با بۆ خۆی شیعر بنووسێ، تەنیا ئاژاوە نەنێتەوە. گریگۆری، برالە، وەك باوکێ ئەمەت پێ دەڵێم... فۆما دەرکی بە بەهرەکەی کرد، چاوێکی بە شیعرەکانیدا خشاند و هانی دا و کردی بە کتێبخوێنەرەوە و ڕوونووسکەری خۆی... بە کورتی، بووە هۆی بەرەوپێشچوونی. گریگۆری ئەو ڕاست دەکا فۆما چاکەی بەسەریەوەیەتی. دەی، دەزانی، ئێستە ئەو ئیدی ڕۆحیەتێکی

شاعیرانە و بەرزی هەیە و هەست بە ئازادی دەکا. فۆما ئەمانەی بۆ ڕوون کردمەوە. هەڵبەتە هەموو قسەکانی ئەوم بیرنەماون، بەس دانی پێدا دەنێم کە بەر لەوەی فۆما بڵێ خۆم هەر نیازی ئازادکردنیم هەبوو. دەزانی، بە جۆرێ لە جۆرەکان شەرمەزار بووبووم!... وەلێ فۆما لەگەڵ ئەم کارەدا نەبوو، دەڵێ ئەو بە کەڵکی دێ و هۆگری بووە، سەرەڕای ئەوە، دەڵێ *بۆ گەورەیەکی وەك من ئەوە شانازییە کە لەنێو خزمەتکارەکانمدا یەك دوو شاعیریشم هەبن، هەروەها ئەوەی کە هەندێ لە بارۆنەکان وا دەژین و بە کورتییەکەی ئەمە زۆریش* engrand[1] یە. دەی، قەیدی چییە ژیانێکی بەباقوبریقمان هەبێ! براله، منیش وا ئیدی ڕێزی لێ دەگرم... تێدەگەی؟... بەس مەگەر هەر خوا بزانێ کە چیی کردووە. لە هەمووی خراپتر ئەوەیە کە لەو کاتەوەی دەستی بە شیعر نووسین کردووە، ئەوەندە بە خۆیەوە دەنازێ کە ئیدی ئامادە نییە قسە لەگەڵ خزمەتکارەکان بکا. گریگۆری، بابە گیان، نەکا تۆ دڵگران بی ها، وا من لە جێی باوکتدا ئەم قسانە دەکەم، بۆ نموونە، زستانی ساڵی پار بەڵێنی دابوو زەماوەند بکا. بڕیار بوو یەکێ لە کچە ڕەعیەتەکانی ئێرە بهێنێ. ناوی ماترینایە و کچێکی زۆر باشیشە. کچێکی ڕاستگۆ و بەدەستوبرد و زیتەڵە. کەچی ئێستە دەڵێ *نا، ئەوم ناوێ، تەواو و بڕایەوە*، بەڵێنەکەی شکاندووە. نازانم لە خۆی بایی بووە یان بڕیاری داوە سەرەتا ناوبانگ پەیدا بکا و جا پاشان لە شوێنێکی دی بیخوازێ...

---

١. دەربڕینێکی فەرەنسییە، بە واتای شکۆدار و ڕازاوە. «و. ف»

ڤیدۆپلیاسۆڤ گوتی:

– زیاتر لەبەر قسەی فۆما فۆمیچە، قوربان، ئاخر ئەوان چاکەویستی ڕاستەقینەی منن...

من نەسرەوتانە گوتم:

– دەی ئەرێ، بۆ دەکرێ ئەمە دەستی فۆما فۆمیچی لەپشت نەبێ!

خاڵە خێرا پەڕییە نێو قسەکانم:

– ئاخ، براله، مەسەلە ئەمە نییە! بەس دەزانی، ئێستە ئیدی هیچ چارەیەك نییە. ئاخر ماترینا کچێکی ڕووقاییم و لاسارە و هەمووانی لەدژی فۆما فۆمیچ هەڵناوە، هەمووان سەر دەنێنە سەری و قەشمەریی پێ دەکەن و تەنانەت وای لێ هاتووە منداڵە ڕەعیەتەکانیش وەك گەپجاڕێ لێی دەڕوانن...

ڤیدۆپلیاسۆڤ گوتی:

– ئەمە هەمووی لەبەر ئەو ماترینایەیە، قوربان. ئەوەی ڕاستی بێ ماترینا گەمژەیە و منیش لەبەر ئەم گەمژەیی و لاسارییە دەبێ لە ژیانمدا ئەم هەموو بەدبەختییە بکێشم، قوربان.

خاڵە نیگایەکی لۆمەکەرانەی گرتە ڤیدۆپلیاسۆڤ و گوتی:

– ئاخ گریگۆری، براله گیان، خۆ من پێم گوتی، دەزانی سیریۆژا، ئەوەی ڕاستی بێ وشەیەکی ناشیرینیان لەسەر سەروای ناوە بنەماڵەییەکەی داتاشیوە. وا ئێستەش هاتووە بۆ لای من تا گەر

بکرێ ناوەکەی بگۆڕێ، چونکە لەبەر نەشیاویی ناوەکەی ئازارێکی زۆر دەچێژێ...

ڤیدۆپلیاسۆڤ هەڵیدایە نێو قسەکانی.

- ناوێکی ئاوڕوومەندانە نییە، قوربان!

- باشە، گریگۆری، تۆ بێدەنگ بە! فۆماش ئەمەی پشتڕاست کردووەتەوە... یانی نەك پاڵپشتیی کردبێ، دەزانی، مەسەلەکە ئەوەیە گەر ڕۆژێ بیەوێ شیعرەکانی چاپ بکا (ئاخر فۆما نیازیەتی ئەم کارە بکا) ئەوسا ڕەنگە ئەم ناوە زیان بە کتێبەکە بگەیەنێ، وا نییە؟

- خاڵە گیان، هەر بە ڕاست نیازیەتی شیعرەکانی چاپ بکا؟

- بەڵێ، برالە. ئەمە ئیدی بڕیاری لەسەر دراوە، هەڵبەتە لەسەر حسێبی من. بۆ ناونیشانەکەشی دەنووسرێ: ڕەعیەتی فلانە کەس، جا بڕیاریش وایە نووسەر لە پێشەکییەکەدا سوپاسی فۆما بکا لەبەرانبەر تێبینیەکانیدا. کتێبەکەش پێشەکەش بە فۆما دەکرێ. پێشەکیشەکەشی هەر لەلایەن فۆماوە دەنووسرێ. دەی، ئێستە تۆ بیری لێ بکەوە کە لەسەر بەرگی کتێبەکە نووسیبێتیان: *شیعرەکانی ڤیدۆپلیاسۆڤ*...

ڤیدۆپلیاسۆڤ بۆی ڕاست کردەوە و گوتی:

- *ناڵەکانی ڤیدۆپلیاسۆڤ*، قوربان.

– دەبینـی، شـیعرەکانیش نـا و ناڵـەکان! ئـاخر ڤیدۆپلیاسـۆ ناسناوە؟ هەستی ناسکی خوێنەر دەڕووشێنێ، فۆما وا دەڵێ. دەڵێ ئـەم ڕەخنەگرانـە، هـەمووی کۆمـەڵێ تانەوەشـێنی فشقیاتچین، بـۆ نموونە هەر ئەم بارۆن برامبیۆشە... خۆ بێ لەمە گوێ بە هیچی دی نادەن! تەنیا قەشمەری بە ناسناوەکەت دەکەن، کارێکت پێ دەکەن ڕووی ئاواییت نەبێ ... ڕاست ناکەم؟ وا من دەڵێم: هـەر ناوێکـت پـێ خۆشە بیخە سەر کتێبی شیعرەکانت... بۆ نموونـە نـاوێکی... چیی پێ دەڵێن... نـاوی خـوازراوی پـێ دەڵـێن، هـا؟... ئـەی بابـە، بیرم نەماوە، خوازراو بوو؟ چی چیراو بوو؟ لێـی گـەڕێ. کەچـی دەڵێ: نـا، فەرمان بە هەموو خزمەتکارەکان بکەن تـا هەمیشە بەم نـاوە نوێیـەوە بانگم بکەن تا ناسناوەکەشم وەك بەهرەکەم ئاوڕومەندانە بێ...

– خاڵە گیان، گرەو دەکەم ئێوەش لەسەری ڕێك کەوتوون.

– سیرۆژا، برالـە، تـەنیا لەبـەر ئـەوە بـوو کـە تاقـەتی مشـتومڕم لەگەڵ ئەوانەدا نەبوو، لێگەڕێ چییان دەوێ بیکەن! دەزانـی، سـەرەتا بەدحاڵیبوونێ لەنێوان من و فۆمادا هاتە ئارا. ئیدی لەوسا بەدواوە گریگۆری هەر حەفتەو ناسناوێکی ناسکی هەڵدەبژارد: ئالی ئانراف[1]، تۆلپاناف[2]... تۆ بیری لێ بکەوە، گریگۆری، خۆ سەرەتا دەتویست بە ڤێرنـی[3] بانگـت بکـەن... گریگـۆری ڤێرنـی، جـا پاشـان خـۆت ئـەم ناسناوەت لە بەرچاو کەوت، چونکە کەسێکی دەبەنگ، لەجێی ئەوە،

١. ژاڵە. «و. ف»

٢. گوڵجاڕ. «و. ف»

٣. بەوەفا. «و. ف»

هاوسەرواکەی، یانی سکۆرنیی[1] پێ گوتبووی[2]. تۆش شکاتت کرد و ئەو دەبەنگەش تەمبێ کرا. جا هەمدیس دوو حەفتە بیرت کردەوە تا ناسناوێکی تازە بدۆزییەوە... جا چ ناسناوێکت نەدۆزییەوە... دواجار گەیشتیە ئەنجام و هاتی و گوتت بە ئەولاناف بانگت بکەن. دەی، براله، بڵێ بزانم، هیچ شتێ هەیە لە ئەولاناف گەمژانەتر بێ؟ جا من تەنانەت ئەوەشم پەسەند کرد و هەمدیس فەرمانم دا بە ئەولاناف بانگت بکەن.

پاشان ڕووی کردە من و گوتی:

– براله، تەنیا لەبەر ئەوە بوو کە شەڕیانم لێ لادەن. تۆ سێ ڕۆژ ناوت ئەولاناف بوو، وا نییە؟ بە قەڵەم هەموو دیوار و لێواری پەنجەرەکانت پڕ کرد لە خەت و نووسیت ئەولاناف. وای لێ هات ناچار بووین بۆیەی بکەینەوە. بە واژۆی ئەولاناف یەك سەفتە کاغەزی هۆڵەندیشت خەسار کرد کە ئەولاناف، یەکەمین ئەزموونی ئەدەبی، ئەولاناف، یەکەمین ئەزموونی ئەدەبی. دواجار ئەم ناوەش

---

١. چەپەڵ. «و. ف»

٢. هەردوو وشەی هاوخێزانی ڕووسیی ڤێرنی و سکۆرنی، ئاماژە بە ڕووداوێکی ژیانی ئیڤان ڤاسیلی یۆڤیچ شێرۆڤد (١٧٩٨-١٨٦٧) دەکەن. ئەو ئەفسەرێکی هێزە چەکدارەکانی ئیمپراتۆری ڕووسیا و یەکەمین کەسێك بوو کە ڕاپۆرتی لەسەر ئامادەبوونی دکابریستەکان بۆ ڕاپەڕین گەیاندە تزار ئالێکساندەری یەکەم. لە ئەنجامی ئەم چالاکییە جوامێرانەیەی شێرۆڤددا، تزار نیکۆلای یەکەم لە ئەوەڵی حووزەیرانی ١٨٢٦دا فەرمانی دا تا پاشناوی ڤێرنی (بە واتای بەوەفا) بلکێنن بە ناوە بنەماڵەییەکەیەوە. جا لەبەر ئەوەی خەڵکی بە تەواوی ئاگاداری ئەو ڕۆڵەی شێرۆڤد بوون، لەکەنامەی شێرۆڤدی سکۆرنی (شێرۆڤدی چەپەڵ)یان پێیەوە لکاند. «و. ف»

ڕووبەڕووی شکست بووەوە، چونکە هاوسەروای بالوانافی[1] دەرچوو. جا هەمدیسانەوە گوتت بالوانافت ناوێ... دیسان گۆڕینی ناوی بنەماڵە! دوای ئەوە چ ناسناوگەلێکی دیکەت هەڵبژارد؟ بە خوا ئیدی بیرم نەماوە.

ڤیدۆپلیاسۆڤ هاتە وەڵام:

– تانتسێف[2]، قوربان. ئێستە مادام چارەنووسی من ئەوەیە کە ناسناوەکەم بە جۆرێ لە جۆرەکان پەیوەندیی بە سەماکردنەوە، یانی مانای ناوی بنەماڵەکەی خۆمەوە هەیە، لانیکەم ناوە بیانییەکەی ئەو زۆر ئاوڕوومەندانەترە: یانی تانتسێف، قوربان.

– ڕاستە، تانتسێف بوو، برالە سیریۆژا، من ئەوەشم پەسەند کرد، وەلێ بۆ ئەم ناوەش وشەیەکی هاوسەروای وایان دۆزیبووەوە کە من ڕووم نایێ بیڵێم! جا ئەمڕۆش دیسان شتێکی نوێی بە مێشکدا هاتووە و هەڵساوە و هاتووەتە گیانی منی چارەڕەش. گرەو دەکەم ناسناوێکی تازەی دۆزیوەتەوە. وا نییە، گریگۆری؟ دانی پێدا بنێ!

– ئەوەی ڕاستی بێ دەمێک بوو دەمویست بە ناوێکی ئاوڕوومەنداوە بێمە خزمەتتان، قوربان.

– چ ناوێک؟

– ئێسبۆکتاف.

1. خەرفاو. «و. ف»
2. سەما. «و. ف»

– دە فەرموو، تەریق نابیەوە، گریگۆری، شەرم لە خۆت ناکەی؟ باشە ئەم ناوەت لە قتووی چ عەترفرۆشێکدا دەرهێناوە؟ وات زانیوە مرۆڤێکی ئەوەندە زیرەکی؟ بێگومان زۆریش بیرت لێ کردووەتەوە، ها؟ ئاخر خۆ ئەمە ناوی سەر شووشەی عەترانە و کەچی تۆش، هاتوویە ئێرە تا کتومت بیکەی بە ناسناوی خۆت؟

بە چپە بە خاڵەم گوت:

– تکا دەکەم، خاڵە گیان، ئەو هەر بە ڕاستی گەمژەیە، گەمژە بە تەواوی مانا!

خاڵەش بە چپە گوتی:

– دەی چی بکەین، براله؟ هەمووان دەڵێن کەسێکی زیرەکە و هەر لەبەر ئەم پیاهەڵدانەشە کە ئیشەکانی نائاسایی دێنە بەرچاو....

– بۆ خاتری خوا لە کۆڵ خۆتانی بکەنەوە!

خاڵە کە دەتگوت تەنانەت لە ڤیدۆپلیاسۆڤیس دەترسێت، بە بارێکی مەیلەوپاڕانەوەوە گوتی:

– گوێ بگرە، گریگۆری! خۆت داوەری بکە، ئاخر من لەنێو ئەم بێنەوبەرەیەدا چۆن دەتوانم کێشەی تۆ چارە بکەم! دەڵێ دیسانەوە سووکایەتییان پێ کردووەتەوە؟ دەی، باشە، بەڵێنی شەرەف بێ بەیانی بپەرژێمە سەر ئەم مەسەلەیە، ئێستە ئیدی بڕۆ، خوات لەگەڵ... بوەستە! ئەی فۆما فۆمیچ خەریکی چییە؟

– ڕۆیشتوون بخەون، قوربان. گوتیان گەر هەر کەس هەواڵیان پرسین، بڵێم بەتەمان بە درێژایی شەو بە پێوە دوعا بکەن.

– ئم! باشە، بڕۆ ئیدی، برالە، بڕۆ! دەبینی، سیریۆژا، ڤیدۆپلیاسۆڤ دایمە لای فۆمایە. جا لەبەر ئەوە تەنانەت لەویش دەترسێم. هەر بەو بۆنەیەشەوە خزمەتکارەکان کەیفیان پێی نایێ و لای فۆما فیتنەییان دەکا. دەی، وا ئیدی ڕۆیشت، ڕەنگە بەیانی بەدەست شتێکی دیکەوە گازاندە بکا! برالە، تەماشا، کە لەوێ بووم وا هەموو شتێکم ڕایی کرد کە ئیدی خەمی هیچم نییە... پەلەم بوو بێم بۆ لات. وا دواجار بە تەنیا ماینەوە!

جا هاوڕێیانە دەستمی گوشی و گوتی:

– برالە، وام زانی تەواو تووڕە بوویتە و بێ ئەملا و ئەولا لێرە هەڵدێی. ناردبووم تا ئاگادارت بن. دەی، شوکر بۆ خوا نەڕۆیشتی! وەڵێ گاڤریلا ئەمڕۆ کارێکی سەیری کرد! خۆ ڤالالیش پشتی گرت، جا پاشانیش تۆ! دەی، سوپاس بۆ خوا، سوپاس بۆ خوا! دواجا دەتوانم بە دڵی خۆم قسەت لەگەڵ کەم. دەمەوێ قسەی دڵم بکەم. سەیر کە، سیریۆژا، لێرە مەڕۆ، ئاخر، من تەنیا تۆم هەی، تۆ و کارۆفکین...

– وەڵێ خاڵە گیان، بڵێن بزانم، چیتان ڕایی کردووە و دوای ئەوەی کە ڕووی داوە من دەتوانم چی بکەم؟ دانی پێدا دەنێم، سەرم گێج دەخوا!

– ئادەی بزانم، تۆ لات وایە سەری من گێج ناخوا؟ برالە، سەری من وا ئێستە ماوەی شەش مانگە سەمای ڤالس دەکا! سەرباری ئەوەش، هەر سوپاس بۆ خوا! ئیدی هەموو شتێ ڕایی بووە. بەر لە هەر شتێ لێیان بووریم، بە تەواویش لێیان بووریوم، هەڵبەتە بە کۆمەڵێ مەرج، وەڵێ دەی، ئێستە ئیدی کەمتازۆر ترسم لە هیچ شتێ نییە. لە ساشینکاشیان بووریوە. ئاخ، ساشینکا، ساشینکا، ئەمڕۆ چیت کرد تۆ... ڕۆحێکی سرگی[1] هەیە! هەڵچووبوو، وەڵێ دڵی لە زێڕە! سیرۆژا، من شانازی بەم کچەوە دەکەم! ئەمانەتی خوا بێ. لە تۆشیان بووری و تەنانەت لەوەش زیاتر! دەتوانی هەرچیت پێ خۆش بوو بیکەی، بۆ نموونە دەتوانی بچیە نێو هەموو ژوورەکان و بە باخدا پیاسە بکەی، تەنانەت دەشتوانی لە بەردەم میوانەکاندا دەرکەوی... بە کورتیەکەی، دەتوانی چیت پێ خۆش بوو بیکەی، بەس یەك مەرجی هەیە و ئەویش ئەوەیە کە نابێ سبەینێ لە بەردەم دایە گیان و فۆمادا قسە بکەی... ئەم مەرجە بێچەندوچۆنە، یانی هەر تەنیا قسە نییە... من لەجێی تۆ بەڵێنم دا.... تەنیا دەبێ هەرچی گەورەکان... یانی دەمویست بڵێم هەرچی ئەوانی دەیڵێن، لێی دەرنەچی. گوتیان تۆ هەرزەکاری. سیریۆژا، لە دڵی مەگرە، دەی تۆ هەر بە ڕاستی هەرزەکاری... ئانا نایلۆڤنا وا دەڵێ...

بێ گومان من هەرزەکار بووم و هەر لەبەر ئەوەش بە بیستنی ئەم مەرجانە چاوم پەڕیبووە تەوقی سەرم. ئیدی هێندەی نەمابوو لە تووڕەییان هەناسەم بگیرێت. هاوارم کرد:

---

[1] سرگ: جڵەونەکراو، هار، کێوی.

– خاڵە گیان، گوێ بگرن، تەنیا یەك شتم پێ بڵێن و ئاسوودەم کەن. هەر بە ڕاستی ئێرە شێتخانەیە؟

خاڵە زویرانە گوتی:

– دەبینی، براله، هەر لە ئێستەوە دەستت کردە ڕەخنەگرتن! بە هیچ جۆرێ ناتوانی دان بە خۆتدا بگری... نەخێر، ئێرە شێتخانە نییە، تەنیا مەسەلەکە ئەوەیە کە هەردوو لا هەر لە خۆوە خۆتان گیڤ کردووەتەوە. براله، دانی پێدا بنێ کە تۆش هەڵسوکەوتێکی باشت نەنواندووە. ئاخر چۆن لە ڕووی کەسێکدا وەستایتەوە کە لانیکەم لەبەر تەمەنەکەی شایەنی ڕێزلێگرتنە؟

– خاڵە گیان، ئەم جۆرە مرۆڤانە تەنانەت لەبەر تەمەنیشیان هەر شیاوی ڕێزلێگرتن نین.

– براله، من شتێ دەڵێم و تۆش شتێکی دی! ئاخر ئەمە بیرئازادییە! براله، خۆ منیش لاریم لە بیرئازادییەکی درووست نییە، وەلێ براله، ئەمە ئیدی زیادەڕۆییە، سیرۆژا، بە ڕاستی سەرم لە تۆ سووڕماوە.

– خاڵە گیان، تووڕە مەبن، من خەتابارم، وەلێ تەنیا لەبەرانبەر ئێوەدا خەتابارم. بەس لە بارەی ئەو فۆما فایچەی ئێوەوە...

– دەبینی، ئێستە ئیدی بووەتە فۆما فۆمیچی ئێمە! ئاه، براله سیرۆژا، وا بە خراپی داوەریی لە بارەوە مەکە: ئەو تەنیا کەسێکی لاتەریکە... نەك هیچی دی، زۆریش لاتەریکە! نابێ ئەوەندە بە قووڕسی بیگری. لە بەرانبەر ئەمەدا، کەسێکی زۆر نەجیبە، یانی

نەجیبترین مرۆڤی سەر زەوییە! هەر خۆت یەك دوو کاتژمێری لەمەوبەر بینیت. هەر بە ڕاستی نوورانی بوو. نابێ زۆر ئەو ئاین و ئۆینانە لە بەرچاو بگری کە جاروبار لێی دەوەشێنەوە. ئەمە بۆ هەموو کەسێ دێتە پێش.

– حەیفتان نەکرد! خاڵە گیان، ئەسڵەن بە پێچەوانەوە، بۆ هیچ کەسێ نایێتە پێش.

– ئاخ، هەر قسەی خۆی دەکاتەوە! سیریۆژا تۆ کەسێکی دڵنەرم نیی، ناتوانی لە کەس ببووری!...

– زۆر باشە، خاڵە گیان، زۆر باشە! با واز لەمە بێنین. بڵێن بزانم، ناستاسیا یۆگرافاوناتان دیوە؟

– ئاە، براڵە، هەموو کێشەکان لەسەر ئەو بوون. بڕوانە سیریۆژا، ئێمە دەبێ ئەم کارە بکەین، سەرەتا، لە هەمووی گرنگتر، ئێمە بڕیارمان داوە سبەینێ بێ ئەملا و ئەولا پیرۆزبایی یادی لەدایکبوونی لێ بکەین، یانی یادی لەدایکبوونی فۆما فۆمیچ، چونکە هەر بە ڕاستی سبەینێ یادی لەدایکبوونیەتی. ساشینکا کچێکی نەرمونیانە، وەلێ بە هەڵەدا دەچێ، لەگەڵ ئەوەشدا، سبەینێ زوو، بەر لە ڕێوڕەسمی عەشای ڕەبانی، تێکڕا دەچینە لای فۆما. بڕیار وایە ئالیۆشا شیعری بۆ بخوێنێتەوە، ئەمە وەك ئەوە وایە کە بە ڕۆن دڵی بناون... بە کورتییەکەی، دڵی نەرم دەبێ. چەندە باش بوو گەر ئێوەش لەگەڵ یەکدی ئاشت بانەوە! سیرۆژا، هیچ لە دڵ مەگرە، براڵە، ئاخر تۆش ئەوت ئازار دا... پیاوێکی بێوێنەیە!

من کە ئیدی کاسەی سەبرم لێی دەڕژا، قیڕاندم:

- خاڵە گیان! خاڵە گیان! من دەمەوێ باسی بابەتێکی گرنگتان بۆ بکەن، کەچی ئێوە... ئێوە دەزانن کە، وا دیسان دووبارەی دەکەمەوە، دەزانن کە ناستاسیا یۆگرافاونا خەریکە چیی بەسەر دێ؟

- چی بووە، براله؟ بۆ دەقیڕێنی؟ ئەسڵەن ئەمڕۆ هەموو کێشەکان لەسەر ئەو بوون. گەرچی ئەم بەزمە هی ئێستە نییە و دەمێکە سەری هەڵداوە. من سەرەتا پێم نەگوتی، چونکە نەمدەویست نارەحەتت کەم. ئەوان دەیانەوێ هەرچۆنێ بووە دەرییپەڕێنن و داواشیان لە من کردووە جوابی کەم. ئێستە خۆت بخە جێی من... هەڵبەتە (سوپاس بۆ خوا) ئیدی هەموو شتێ ڕایی بووە. ئێستە لێگەڕێ دان بە هەموو شتێکدا بنێم... دەزانی، ئەوان لایان وابوو کە دڵم چووەتە سەر ئەو و دەمەوێ زەماوەندی لەگەڵ بکەم. بە کورتیەکەی، دەمەوێ خۆم ماڵوێران کەم، چونکە بەم کارە هەر بە ڕاستی تیادەچم. ئێستە لەوێ زۆر بە جوانی هەموو شتێکیان بۆ ڕوون کردمەوە... دەبینی، دەیانویست ئەو بکەنە دەرێ تا من نەجات بدەن. ئەمە ڕای دایە گیان و لە هەمووشیان زیاتر ڕای ئانا نایلۆڤنایە. فۆما جارێ هیچ نالێ. وەلێ من ئیدی هەموو شتێکم پینە کرد و دانی پێدا دەنێم کە بەوانم گوت تۆ بە کردەوە دەزگیرانی ناستینکای و هەر لەبەر ئەوەش هاتوویە ئێرە. ئەمە کەمێ ئەوانی هێور کردەوە و ئەویش ئێستە دەتوانێ لێرە بمێنێتەوە، هەرچەند نەک بە تەواوی، تەنیا وەك تاقیکردنەوە، وەلێ هەرچۆنێ بووە دەمێنێتەوە. تەنانەت کاتێ گوتم،

بڕیار وایه تۆ خوازبێنیی بکەی، ڕایان لەسەرت گۆڕا. لانیکەم دایە گیان ئەرخەیان بوو. ئانا نایلۆڤنا هێشتاش هەر بۆڵەبۆڵیەتی! ئیدی نازانم چی بکەم تا ئەویش قاییل بێ. ئەرێ بە ڕاست، ئەم ئانا نایلۆڤنایە دەردی چییە؟

- خاڵە گیان، خاڵە گیان، ئای کە ئێوە لە چ هەڵەیەکدان! بۆ نازانن کە ناستاسیا یۆگرافاونا دەیەوێ بەیانی لێرە بڕوا، هەڵبەتە گەر تا ئێستە نەڕۆیشتبێ؟ دەزانن باوکی بە تایبەت بۆ ئەوە هاتووەتە ئێرە تا ئەو لەگەڵ خۆی ببا؟ ئەمڕۆ خۆی پێی گوتم، ئەم بڕیارەی داوە و لە کۆتاییشدا داوای لێ کردم سڵاوی بە ئێوە بگەیەنم... ئاگاتان لەم بابەتە هەیە؟

خاڵە لە بەردەم مندا وشك بوو و دەمی بەش بووەوە. هەستم کرد لە کتوپڕێکدا لەرزی لێ نیشت و ناڵەیەکی لە سینگەوە هاتە دەر.

بێ بە فیڕۆدانی کات، خێرا هەموو گفتوگۆکانی نێوان خۆم و ناستینکام بۆ گێڕایەوە و باسی مەسەلەی خوازبێنیەکەم بۆ کرد و ئەوەی کە ئەو دەستی ناوە بە ڕوومەوە و لە خاڵە تووڕەیە لەبەر ئەوەی کە نامەی بۆ من نووسیوە و داوای لێ کردووم بێم، هەروەها ئەوەش کە لێرە دەڕوات تا ئەو لە زەماوەندکردن لەگەڵ تاتیانا ئیڤانۆڤنا نەجات بدات. بە کورتیەکەی، هیچم نەشاردەوە، بە تایبەت لە بەشە خەمناکەکانیشدا زیادەڕۆیم کرد. دەمویست کاریگەریی بەخەمە سەر تا لەم بارەیەوە بڕیارێکی شیاو بدات... قسەکانیشم هەر بە ڕاستی کاریگەریی خۆیانیان دانا. هاوارێکی لێ هەستا و

سەری خستە نێوان لەپەکانی دەستی. لە ترسان ڕەنگی پەڕیبوو. دواجار گوتی:

- ئەی نازانی لە کوێیە؟ ئێستە ئەو لە کوێیە؟

جا بێهیوایانە هاواری کرد:

- تۆ سەیری منی گەمژە کە چۆن ئەرخەیان بووبووم! وام دەزانی هەموو شتێ ڕایی بووە...

- نازانم ئێستە لە کوێیە، ئەمڕۆ هەرکە بووە قیڕوهووڕ، بەرەو لای ئێوە هات، دەیویست لە بەردەم هەمووان‌دا ڕایبگەیەنێ کە بە تەمای چییە. ڕەنگە ڕێگەیان پێ نەدابێ.

- وای ئەگەر ڕێگەیان دەدا! هەر خوا دەزانێ چ پەننێکی دەنایەوە! ئای کە چەندە لووتبەرز و کەللەڕەقە! باشە ئێستە دەیەوێ بۆ کوێ بچێ، کوێ، ها؟ بەس خۆ تۆ کەسێکی باشی! بۆ پێشنیارەکەتی ڕەد کردەوە؟ گاڵتەجاڕانەیە! دەبوو کەیفی بە تۆ بێ. ئەی بۆ کەیفی پێت نەهاتووە؟ بۆ خاتری خوا وەڵامم بدەوە، دەی بۆ وا بێدەنگی؟

- خاڵە گیان، بەزەییتان هەبێ! ئاخر ئەمە چ پرسیارێکن لە منیان دەکەن؟

- وەڵێ ئاخار ئەمە نەکردەیە! تۆ دەبێ، دەبێ زەماوەندی لەگەڵ کەی. ئەی من بۆچی لە پترسبورگەوە تۆم کێش کردوەتە ئێرە؟ تۆ دەبێ ئەو بەختەوەر کەی! ئاوا لێرەی وەدەر دەنێن، وەڵێ ئەگەر ببێتە هاوسەری خوشکەزای من... وەدەری نانێن. گەر وا نەبێ، ئەی کوێی

هەیە بچێ بۆی؟ چیی بەسەر دێ؟ یانی دیسان دەبێتەوە بە ماموستای مالان؟ ئاخر ئەمە کارێکی نەفۆمانەیە گەر بیەوێ هەمدیسان ببێتەوە بە ماموستای مالان! ئەی تا ئەو کاتەی دەکەوێتە سەر کار، بژێوییان لە کوێوە دابین دەبێ؟ ئەو پیرەمێردە خۆی نۆ سەر کلفەتی بووە بە ملا، خۆیان هیچیان نییە بیخۆن. من ناتوانم یەك قرووشی بدەمێ گەر بەو بوختانە ناشیرینانەوە لێرە بڕوا کە بۆی هەڵبەستراون، نە بەو و نە بە باوکی. گەر ئاوا ئێرە جێبێڵێ کارێکی تۆقێنەرە! لێرە فەرتەنەیەك دەنرێتەوە... لەوە دڵنیام. ئەو دەمێکە دەستەهەقی خۆی وەرگرتووە بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی خێزانەکەی، ئاخر خێزانەکەی لە سایەی ئەودا دەژین. ئێستە با وای دابنێین کە من خێزانێکی نەجیب و ئاوڕووداریشم دۆزییەوە و پێشنیارم کرد وەك ماموستای نێو ماڵ وەری بگرن... هەڵبەتە وەها شتێکیش نەکردەیە! دەی باشە مرۆڤی بەشەرەف، جا بەشەرەفی ڕاستەقینەش، لە کوێ دەست دەکەوێ؟ جا، با وای دابنێین کە دەست دەکەوێ، تەنانەت با وای دابنێین کە لەم جۆرە مرۆڤانە زۆرن، باشە خۆ ئەمە هەر جێگەی گومانە! وەلێ هاوڕێکەم، ئەمە زۆر ترسناکە، ناکرێ متمانە بە خەڵکی بکەی! سەرباری ئەوەش، مرۆڤی هەژار هەمیشە بەدگومانە، لای وایە لەبەرانبەر ئەو خۆشەویستی و نانەی کە دەیدەنێ، ناچارە بچێتە ژێر باری سووکایەتییەوە! ئەوانە سووکایەتی بە مرۆڤ دەکەن، ئەویش حورمەتی هەیە و جا ئەوسا... هەر بە ڕاست، ئەوسا چی دەقەومێ؟ ئێستە گریمان ئەو کەوتە چنگی مرۆڤێکی بەدئاکار و خوێڕییەوە، ئەوسا چی دەبێ؟... ناستینکا تفی دەکاتە

ڕووخساری... دەزانی کە تفی لێ دەکا... بەس هەرچۆنێ بووە ئەو خوێڕییە هەر بێحورمەتیی پێ دەکا! جا کچەی پاك و داماو ناوی دەزڕێ و گومانی خراپی دەکەوێتە سەر، ئەوسا... وای، وا خەریکە سەرم دەتەقێتەوە! ئاخ، ئای خوایە!

لەسەرخۆ گوتم:

– خاڵە گیان! بوورن کە ئەم پرسیارە دێنمە پێش. تکا دەکەم لێم دڵگران مەبن. دەبێ بڵێم کە وەڵامی ئێوە زۆر شت ڕوون دەکاتەوە، خاڵە گیان، من تا ڕادەیەك مافی خۆمە وەڵامی ئەم پرسیارە بزانم!

– مەسەلە چییە؟ چ پرسیارێ؟

– وای دانێن کە لە بارەگای خوا دان، ڕاستگۆیانە و بێ پێچوپەنا پێم بڵێن، هەست ناکەن کەمتازۆر عاشقی ئاستاسیا یۆگرافاونان و دڵتان پێوەیە زەماوەندی لەگەڵ بکەن؟ داوای لێبووردن دەکەم، وەڵێ هەر لەبەر ئەوەشە کە وا لێرەی وەدەر دەنێن.

– من؟ عاشقم؟ عاشقی ئەو؟ یان ئەوان تێکڕا سەرخۆشن یان ئەوەیە کە پیلانم لەدژ دەگێڕن. ئەی بۆچی من داوام لە تۆ کرد بێیە ئێرە؟ دەمویست بۆ هەموویانی بسەلمێنم کە ئەقڵیان لەدەست داوە! ئەی بۆ داوام کرد خوازبێنیی بکەی؟ من عاشقم؟ عاشقی ئەو بم؟ هەموویان تێك چوونە، تەرا و بڕایەوە!

– خاڵە گیان، ئێستە مادام وایە، لێگەڕێن با قسە دڵی خۆم بکەم. دەمەوێ بە فەرمی پێتانی ڕابگەیەنم کە من هیچ عەیبەیەك لەم کارەدا نابینم. بە پێچەوانەوە، ئێوە مادام هێندە ئەوتان خۆش دەوێ، بێ

گومان دەتوانن بەختەوەری بکەن، جا... جا خوا بکا وا بێ! خوا سۆز و سازان بخاتە نێوانتانەوە!

خاڵە تۆقیوانە هاواری کرد:

– ویژدانت هەبێ، گەنجۆ! ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی! سەیرم پێ دێ کە تۆ دەتوانی ئاوا بێباکەنە لەو جۆرە قسانە بکەی... جا... برالە تۆ بە گشتی، کەسێکی هەڵەشەی... ئەمە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی تۆ! وا نازانی ئەو قسانەی کە کردووتن، نەفۆمانەن؟ بڵێ بزانم، من چۆن دەتوانم زەماوەند لەگەڵ ئەو بکەم لە کاتێکدا کە من، تەنیا وەك کچی خۆم لێی دەڕوانم؟ من تەریق دەبمەوە گەر بە چاوێکی دی لێی بڕوانم، ئەمە گوناحە! من پیرەمێردێکم، کەچی ئەو... گوڵێکی تازەپشکوتوو! تەنانەت فۆماش وەها بۆچوونێکی هەیە، خۆی بۆی ڕوون کردمەوە. دڵی من بڵێسەی دێ لە عەشقێکی باوکانە بەرانبەر بە ئەو، کەچی تۆ باسی زەماوەند دەکەی! ئێستە ڕەنگە ئەو لەبەر بەئەمەگییەکەی دەست نەنێ بە ڕوومەوە، وەڵێ هەرکە من بە خراپە ئەمەگناسییەکەی ئەوم قۆستەوە، ئیدی لێم بە ڕقدا دەکەوێ. ئاوا ئەو لەناو دەبەم و سۆزی لەدەست دەدەم! ئامادەم ڕۆحی خۆمی پێشکەش کەم. ئەو کچە بچکۆلەی منە! وەك ساشینکای خۆم خۆشم دەوێ، تەنانەت زیاتریش، دان بەوەدا دەنێم. ساشینکا کچی ڕاستەقینە و شەرعیی منە، وەڵێ ئەمەیانم بە سۆز و خۆشەویستی کردووە بە کچی خۆم. من ئەوم لە هەژاری نەجات داوە و پەروەردەم کردووە. بۆ فێربوونی مامۆستام گرتووە، زمانی فەرەنسی دەزانێ، پیانۆ دەژەنێ و کتێب دەخوێنێتەوە و زۆر

شتی دیکەش... ئای کە بزەیەکی چەندە دڵڕفێنی هەیە! تۆش سەرنجت داوە، سیریۆژا؟ دەڵێی پێت پێدەکەنێ، وەڵێ سەیردەکەی پێت پێناکەنێ، بە پێچەوانەوە، بەڵکە خۆشتی دەوێ... من وامدەزانی تۆ دێی و دەیخوازی و هەمووان بڕوا بەوە دێنن کە من چاوم لەسەری نییە و ئیدی واز لەم قسەوقسەڵۆکە پیسانە دێنن. جا ئەویش دەتوانێ بە ئاسوودەیی و ئاشتی لای ئێمە بمێنێتەوە و جا ئەوسا ژیانمان دەبێتە یەك پارچە بەختەوەری! ئێوە هەردووکتان منداڵی منن و هەردووکیشتان کەمتازۆر هەتیون و خۆم گەورەم کردوون... من ئێوەم زۆر خۆش دەوێ، زۆر! ئامادەم دەست لە ژیانی خۆم هەڵگرم تەنیا بەو مەرجەی لێتان جیا نەبمەوە و بۆ هەرکوێ بچن لەگەڵتان بم! دەکرا ئێمە زۆر بەختەوەر بین! ئاخر ئەمانە بۆ هێندە قەڵس و ڕقلەدڵ و شەڕانین؟ چەندەم حەز دەکرد ڕۆژێ دانیشم و بە باشی هەموو شتێکیان تێگەیێنم! چەندەم حەز دەکرد حەقیقەتی ڕەسەنیان بخەمە بەردەست! ئاه، خوایە!

– خاڵە گیان، ئێوە ڕاست دەکەن، وەڵێ کێشە ئەوەیە کە ئەو پێشنیارەکەمی پەسەند نەکرد...

خاڵە، بەدەم تێفکرینەوە گوتی:

– وەڵێ نا! باوەڕ ناکەم! نەکردەیە! ئاوا بڕوا، هەموو شتێ لەدەست دەردەچێ! هەبێ‌ونەبێ هاکەزاریی سەری قسەت لەگەڵدا کردووەتەوە و ئەویش دڵگران بووە، ڕەنگە... ڕەنگە دەستت بە پیاهەڵدان کردبێ... سیرۆژا، جارێکی دی بۆم بگێڕەوە بزانم چیت گوتووە!

منیش جارێکی دی هەموو شتێکم بە تەواوی وردەکارییەوە بۆ گێڕایەوە. کاتێك گەیشتمە ئەوەی کە ناستینکا بۆیە دەڕوات تا ئەو ناچار نەبێ زەماوەند لەگەڵ تاتیانا ئیڤانۆڤنا بکات، بزەیەکی تاڵی هاتێ و گوتی:

– یانی بۆ ئەوەی ناچار نەبم! تەنیا تا سبەینێ ناچار نابم!

تۆقیوانە پرسیم:

– وەڵێ خاڵە گیان، خۆ ناتانەوێ بڵێن نیازتانە زەماوەند لەگەڵ ئەو تاتیانا ئیڤانۆڤنایە بکەن؟

– بێ لەمە چیی دیکەم لەدەست دێ بۆ ئەوەی سبەینێ ئەو وەدەرنەنێن؟ سەرلەبەیانی خوازبێنیی دەکەم، بابە، بە فەرمی بەڵێنم داوە.

– خاڵە گیان، هەر بە ڕاستی بڕیارێکی واتان داوە؟

– ناچارم، برالە، ناچارم! ئەم کارە دڵم دەڕووشێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا، هەر بڕیارم لەسەر داوە. سبەینێ خوازبێنیی دەکەم، بڕیاریان داوە زەماوەندێکی بێ دەنگوهەرا و خۆمانەیی بێ، برالە، وا باشترە خۆمانەیی بێ. بڕیارم داوە تۆ برازاوام[1] بی. ئاماژەیەکیشم بەم مەسەلەیە داوە، بەم پێیە، تا ئەو کاتە وەدەرت نانێن. چیمان لەدەست دێ، برالە؟ بەمە دەڵێن *هەنگاونان لە پێناو کامەرانیی منداڵاندا!* لەبەر خاتری منداڵ ئامادەی دەست بدەیە هەر کارێ!

١. برازاوا، برازەما، کەسێك لە تیرەی زاوا، لە کاتی زەماوەندا لەتەنیشت زاواوە دادەنیشێ و ڕێنوێنیی دەکا.

ئامادەی قاچەکانت بکەیە ئاسمان و لەسەر دەستەکانت ڕێ بکەی، قووربانی بدەی، بە تایبەت لەبەر ئەوەی کە ڕەنگە ئەمە کارێکی ویژداندارانەش بێ. ئاخر خۆ دەبێ منیش کارێ بۆ بنەماڵەکەم بکەم. خۆ ناکرێ هەر سەرباری ئەوانی دیکە بی!

من کە بە تەواوی تاسابووم و دڵم هاتبووە ژان، هاوارم کرد:

– وەڵێ خاڵە گیان، خۆ یارۆ شێتە!

– دە فەرموو، ئێستە ئیدی ئەویش بووە شێت! ئەسڵەن شێت نییە، تەنیا دەزانی، کوێرەوەرییەکی زۆری چەشتووە... چیمان لەدەست دێ براله؟ دەی، خۆ گەر ئاقڵ با ئەوە باشتر بوو... گەرچی لەنێو ئاقڵەکانیشدا مرۆڤانێ پەیدا دەبن کە هەر مەپرسە! وەڵێ ئەو زۆر نەرمونیانە، وای ئەگەر دەتزانی خاتونێکی چەندە نەجیبە!

بە بێهیواییەوە گوتم:

– وای خوایە! دەڵێی هەر بە تەواوی ملی داوە!

– دەی، بێ لەمە چیم لەدەست دێ؟ ئاخر ئەوان چاکەی منیان دەوێ. وێڕای ئەوەش، دایمە هەستم بەوە کردووە کە هیچ ڕێچارەیەکی دیکەم نەبووە و هاکا ناچاریان کردم ژن بێنم. کەواتە باشتر وایە بەر لەوەی ئاژاوەیەك بنرێتەوە، مل بۆ ئەم بابەتە بدەم. براله سیریۆژا، ڕاستگۆیانە دەیڵێم، من تەنانەت تا ڕادەیەکیش بەوە خۆشحاڵم. هەر چۆنێ بووە، دواجار بڕیاری خۆمم داوە و لانیکەم بارێك بە کۆڵمەوە داگیراوە و بە جۆرێ لە جۆرەکان هەست بە ئاسوودەییەکی زیاتر دەکەم. کە بەڕێوە بووم بەرەو ئێرە، بە تەواوی

ئاسوودە بووم. وا دیارە قسمەتی من هەر ئەمەیە! لە هەمووی گرنگتر، ناستینکا لای خۆمان دەمێنێتەوە. منیش بەو مەرجە هاتمە ژێر باری زەماوەندەکە، جا خۆشت دەیبینی؟ یانی ناستینکا بەتەمایە هەڵبێ!

خاڵە پێی بە زەویدا کوتی و گوتی:

– نابێ ئەمە ڕوو بدا!

جا بە سیمایەکی لێبڕوانە درێژەی پێ دا:

– گوێ بگرە، سیریۆژا، لێرە چاوەڕێ بە، مەڕۆ بۆ هیچ کوێ، خێرا دەگەڕێمەوە.

– خاڵە گیان، بۆ کوێ دەچن؟

– سیریۆژا، ڕەنگە چاوم پێی بکەوێ، هەموو شتێ چاک دەبێ، دڵنیا بە، هەموو شتێ چاک دەبێ و... جا... جا تۆ لەگەڵ ئەو زەماوەند دەکەی... بەڵێنی شەرەفت دەدەمێ!

خاڵە دەستبەجێ لە ژوورەکە چووە دەرێ و لەجێی ئەوەی بچێتەوە ماڵێ، بەرەو باخ چوو. منیش لە پەنجەرەکەوە شوێنیم هەڵدەکرد.

# وەرزی دوازدەیەم

## کارەسات

خاڵە ڕۆیشت و من تەنیا مامەوە. لە دۆخێکی بەرگەنەگیراودا بووم، دەستیان بە ڕوومەوە نابوو، وەلێ خاڵە دەیویست گەر بە زۆریش بووە، هەر ژنم بۆ بهێنێ. بە تاساوی لە فکردا ڕۆچووبووم. میزینچیکافیش بەو پێشنیارەیەوە بۆ ساتێك لە زەینم دەرنەدەچوو. دەشیا هەرچۆنێك بووە خاڵە قوتار بکەم! تەنانەت ئەو بیرەشم بە مێشکدا هاتبوو کە بچم و میزینچیکاف بدۆزمەوە و هەموو شتێکی بۆ باس بکەم. وەلێ لەو ساتەدا خاڵە بۆ کوێ چووبوو؟ خۆی گوتی دەچێتە دووری ناستینکا، وەلێ بەرەو باخ چوو. بۆ ساتێك فکری ئەو دیدارە نهێنیانەم بە سەردا ڕابرد و هەستێکی ناخۆش لەرزی خستە دڵمەوە. قسەکانی میزینچیکافم لە بارەی پەیوەندیە نهێنیەکەوە هێنانەوە بیر... وەلێ دوای ساتێك تێفکرین، بە تووڕەییەوە ئەو فکرە چەپەڵانەم لە خۆم تاراندن. نەدەچووە ئەقڵەوە خاڵە من فریو بدات، لەوە دڵنیا بووم. سات دوای سات زیاتر نیگەران دەبووم. نائاگایانە چوومە هەیوان و لە هەمان ئەو ڕێگەیەوە کە خاڵەی پێدا ڕۆیشتبوو، بەرەو باخ کەوتمە ڕێ. مانگ خەریکبوو بەرز دەبووەوە. شارەزای

کونج و کەلەبەری باخەکە بووم، جا هەر لەبەر ئەوەش ترسی ونبوونم نەبوو. بەدەم ڕێکردن بەرەو کەپرە کۆنەکە و ڕابردن بەتەنیشت گۆمە لیتاوییەکەدا، کتوپڕ لە جێدا وشك بووم. لە کەپرەکەوە دەنگەدەنگێك دەهاتە گوێ. ئێستە ناتوانم ئەو هەستە پڕ لە داخ و نامۆیە بەیان بکەم کە لەو ساتەدا هەمبوو! دڵنیا بووم کە خاڵە و ناستینکا پێکەوە لەوێن. هەروا هەنگاوم نا و هەوڵم دەدا خۆم قاییل بکەم کە بە دزییەوە ناچمە پێش و ئاسایی هەنگاو دەنێم. کتوپڕ دەنگی ماچێکی سافم هاتە گوێ و دوای ئەوەش قسەگەلێکی سۆزدارانە و پاشانیش دەنگی قیژەی گوێکەرکەری ژنێك بەرز بووەوە. لەو ساتەدا ژنێك بە کراسی سپییەوە لە کەپرەکە بە ڕاکردن وەدەرکەوت و وەك پەرەسێلکە بە خێرایی دای بە لامدا. تەنانەت وام هاتە بەرچاو کە بە دەست ڕووخساریی داپۆشیوە تا نەناسرێتەوە. وا دیار بوو لە کەپرەکەوە چاویان بە من کەوتووە. وێڕای ئەوەش، ئەو شتەی سەراسیمەی کردم، ئەوە بوو کە ئەو عاشقە سووتاوەی بەدوای ژنە تۆقیوەکەدا فڕکەی کردە دەرێ، هیچ کەسێك نەبوو جگە لە ئابنۆسکین... هەمان ئەو ئابنۆسکینەی کە بە گوتەی میزینچیکاف، دەمێك بوو ئەوێی جێهێشتبوو! ئابنۆسکینیش بە بینینی من حەپەسابوو و لەو ساتەدا هیچ ئاسارێك لە ڕووقاییمیەکەی نەمابوو. کەوتە تەتەڵە و بەدەم بزەکردنەوە گوتی:

– ببوورن، وەڵێ... هەرگیز چاوەڕێی ئەوە نەبووم لێرە بتانبینم.

بە تانەوە هاتمە وەڵام:

– هەروەها منیش... بە تایبەت لەبەر ئەوەی کە بیستبووم ئێرەتان جێهێشتووە.

– نەخێر قوربان... تەنیا... تەنیا تا مەودایەك دایکمم ڕایی کرد. دەتوانم وەك پیاوێکی بەشەرەف متمانەتان پێ بکەم؟

– لە بارەی چییەوە؟

– بێ گومان ئێوەش ئەوە پشتڕاست دەکەنەوە کە هەندێ جار مرۆڤێکی ئاوڕوودار بە ناچاری لەبەرانبەر هەستی پاکی مرۆڤێکی ئاوڕووداری دیکەدا خۆ بەدەستەوە دەدا، جا بە تایبەت مرۆڤێکی ئاوڕووداری ڕاستەقینە... هیوادارم لە مەبەستم تێگەیشتبن...

– هیوادار مەبن، چونکە هیچ لە قسەکانتان تێنەگەیشتم.

– ئێوە ئەو خاتونەتان بینی کە لەگەڵ من لە کەپرەکەدا بوو؟

– بینیم، وەڵێ نەمناسییەوە.

– ئەها، کەواتە ئەوتان نەناسییەوە!... ئەو خاتونە بەم نزیکانە دەبێتە هاوسەرم.

– پیرۆزە، وەڵێ من لەم نێوەندەدا چیم لەدەست دێ؟

– تەنیا یەك کار، نابێ بە کەس بڵێن کە لێرە منتان لەگەڵ ئەو خاتونەدا دیوە.

بیرم کردەوە *تۆ بڵێی ئەو خاتونە کێ بووبێت؟... نەکا...* بە ئابنۆسکینم گوت:

– ئەوەی ڕاستی بێ، نازانم... هیوادارم بمبوورن، چونکە ناتوانم هیچ بەڵێنێ بدەم...

ئابنۆسکین بە پاڕانەوەوە گوتی:

– نا، توخوا، تکایە دەرك بەو هەلومەرجە بکەن، ئەمە نهێنییەکە. بۆی هەیە ئێوەش ڕۆژێ لە ڕۆژان ببنە دەسگیرانی کەسێ، ئەوسا منیش لەلایەن خۆمەوە...

– وس! وا یەکێ بەرەو ئێرە دێ!

– کوا؟ لە کوێیە؟

هەر بە ڕاستی سێبەری کەسێك لە دووریی سی هەنگاوێکەوە دەرکەوت و بەو ناوەدا ڕادەبوورد. ئابنۆسکین کە لەرزی لێ نیشتبوو، بە چپە گوتی:

– ئەمە... ئەمە بێ گومان خودی فۆما فۆمیچە! بە ڕەوتەکەیدا زانیم. خوایە گیان! وا دەنگی پێی کەسێکی دیکەش دێ! گوێ بگرن... من دەبێ بڕۆم، خواحافیز! سوپاستان دەکەم و... تکایە...

جا لەو ناوە دوور کەوتەوە. بۆ خولەکێك دواتر، کتوپڕ خاڵە لەبەرانبەرمدا قووت بووەوە. بانگمی کرد و گوتی:

– سیریۆژا، ئەوە تۆی؟ تێك چوو! هەموو شتێ تێك چوو!

سەیر دەکەم ئەویش کەوتووەتە لەرزین.

– خاڵە گیان، چی تێك چوو؟

توورند دەستمی گرت و لە بارێکدا کە بەدوای خۆیدا ڕای دەکێشام، گوتی:

– وەرە با بڕۆین!

وەلێ بە درێژایی ڕێگە تا ماڵەوە، یەك قسەی نەکرد و نەیهێشت منیش هیچ بڵێم. هەستم کرد ڕووداوێکی سەیر قەوماوە. هەر واش

بوو. که چووینه ژوورەکەوە، دۆخی تێك چوو و وەك تـەرمێك ڕەنگی سپی هەڵگەڕا. خێرا کەمێك ئاوم پژانده ڕووخساری. لـه دڵی خۆمدا گوتم، *بێ گومان ڕووداوێکی تۆقێنـەر ڕووی داوه کـه پیاوێکی وەك ئەو ئاوای بەسەر هاتووه.* دواجار پرسیم:

– خاڵه گیان، چی بووه؟

– سیریۆژا، هـەموو شـتێ تێك چوو! من و ناستینکا پێکەوه لـه باخ بووین و ڕێك لەو کاتەی که خەریکبووم ئەوم ماچ دەکرد، کتوپڕ سەروسەکوتی فۆما فۆمیچ دەرکەوت و ئێمەی بینی.

سەرسامانه له خاڵەم ڕوانی و هاوارم لێ هەستا:

– ماچتان دەکرد! لەنێو باخ؟

– بەڵێ براله، ماچم کرد. شەیتان لـه خشـتەی بردم! ڕۆیشتبووم چاوم پێی بکەوێ. دەمویست هەموو شتێکی پێ بڵێم و قاییلی بکـەم تا زەماوەندت لەگەڵ بکا. داماوی وا یەك کاتژمێری تەواو لەسەر ئـەو نیمکۆتـه شـکاوەی ئەوبـەری ئەسـتێڵکەکه بـەدەم چـاوەڕوانیمەوه دانیشتبوو... زۆربەی ئەو کاتانەی کـه پێویسـته قسـه لەگـەڵ یەکدی بکەین، دەچێ بۆ ئەوێ.

– زۆربەی کات، خاڵه گیان؟

– بـەڵێ، براڵـه، زۆربـەی کـات! لـەم دواییانـه کـەمتازۆر هـەموو شـەوێ دیـدارمان هـەبوو. بـەس وا دیـاره چـاودێرییان کـردووین... ئێستە ئیدی گومـانم لەوەدا نییـه کـه چـاودێرییان کـردووین و دەزانم کـه هـەمووی لـەژێر سـەری ئـەو ئانـا نایلۆڤنایەدایـه. ماوەیـەك بـوو وازمان لەم کاره هێنابوو، چوار ڕۆژێ دەبوو که ئیدی هیچ دیدارێ له

ئارادا نەبوو، وەلێ ئەمڕۆ دیسان پێویستی کرد قسە لەگەڵ یەکدی بکەینەوە. خۆ خۆت شاهێد بووی، گەر چاوم پێی نەکەوتبا چۆن دەمتوانی تێی گەیێنم؟ بە هیوای چاوپێکەوتنی چوومە ئەوێ و سەیر دەکەم کاتژمێرێ دەبێ بەدیارمەوە دانیشتووە. ئەویش قسەگەلێکی هەبوون کە دەیویست بۆمیان بکا...

- ئەی هاوار، لەو هەموو کەمتەرخەمییە! بۆ نەتاندەزانی چاودێریتان دەکەن؟

- ئاخر، سیریۆژا مەسەلەکە هەر بە تەواوی هەستیار بووبوو، قسەی زۆرمان هەبوو کە دەشیا بۆ یەکدییان بکەین. خۆ بە ڕۆژ تەنانەت ناوێرم لێشی بڕوانم. ئەو چاو دەبڕێتە لایەك و منیش لە لایەکی دی ڕادەمێنم، وەك ئەوەی کە ئەو هەر بوونی نەبێ، وەلێ شەوانە چاومان بە یەکدی دەکەوێ و قسەی خۆمان دەکەین...

- ئێستە چی بوو، خاڵە؟

- تەنانەت نەمتوانی دوو قسەی ڕێکوپێکیشی لەگەڵ بکەم، دەزانی، دڵم کەوتە ترپەترپ و فرمێسك بە چاومدا هاتە خوارێ، دەمویست قاییلی بکەم تا لەگەڵ تۆ زەماوەند بکا کەچی گوتی، *وا دیارە ئێوە منتان خۆش ناوێ، دیارە کە هەر هیچ شتێ نابینن* جا کتوپڕ دەستی ئاڵاندە ملم و باوەشی پێدا کردم و لە پرمەی گریانی دا و کەوتە شیوەن! گوتی، *من تەنیا ئێوەم خۆش دەوێ و زەماوەندیش لەگەڵ هیچ کەسی دی ناکەم. دەمێکە ئێوەم خۆش دەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا، زەماوەند لەگەڵ ئێوەش ناکەم و سەرلەبەیانی ئێرە جێدێڵم و دەچم بۆ پەرستگە.*

– ئای خوایە! هەر بە ڕاست وای گوت؟ ئێ، ئەی دواتر؟ دوای ئەوە چی بوو، خاڵە گیان؟

– کتوپڕ سەیر دەکەم فۆما فۆمیچ لەبەردەممانـدا ڕاوەستاوە! نازانم لە کوێڕا پەیدا بووبوو؟ بێگومان لەپشت دەوەنەکاندا خۆی مات داوە تا بەسەرماندا بێ!

– ئەی ناڕەسەن!

– من لە جێدا وشك بووم. ناستینکا ڕای کرد و فۆما فۆمیچ بێ ئەوەی هیچ بڵێ، وەك هەڕەشەلێکردن پەنجەی ڕاوەشاند و ڕۆیشت... سیرۆژا، گەر بزانی سبەینێ چ فەرتەنەیەك دەنرێتەوە!

– چۆن دەکرێ ئەوە نەزانم!

جا کتوپڕ لەسەر کورسییەکە دەرپەڕی و بێهیوایانە هاواری کرد:

– دەزانی، بە تەمان ڕسوای بکەن؟ بە تەمان بێناوڕوو و بەدناوی بکەن، لە بیانوویێك دەگەڕێن تا تۆمەتی داوێنپیسیی بدەنە پاڵ و پاشانیش وەدەری بنێن، وا ئێستەش ئەو بیانوەیان دەست کەوتووە! پێشتریش دەیانگوت لەگەڵ مندا پەیوەندیی ناشەرعیی هەیە! ئەو ناڕەسەنانە دەیانگوت پەیوەندیی لەگەڵ ڤیدۆپلیاسۆڤیشدا هەیە! ئەمەش هەمووی لەژێر سەری ئەو ئانا نایلۆڤنایەدایە.

– ئێستە چی ڕوودەدا؟ بەیانی چی دەقەومێ؟ یانی فۆما بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە؟

– بێ گومان دەیگێڕێتەوە، خاڵە گیان.

جا خاڵە لێوی گازاند و دەستەکانیی کردنە مست و گوتی:

– گەر بیگێڕێتەوە، وای ئەگەر بیگێڕێتەوە... وەڵێ نا، باوەڕناکەم! نایگێڕێتەوە، دەرك بەو هەلومەرجە دەکا... مرۆڤێکی شەریفە! بەزەیی بە ناستینکادا دێتەوە...

جددییانە گوتم:

– بەزەیی پێیدا بێتەوە یان نا، هەرچۆنێك بووە، دەبێ ئێوە بەیانی خوازبێنیی ناستینکا یۆگرافاونا بکەن.

خاڵە وشك بووبوو و هەروا واقووڕ لێمی دەڕوانی.

– خاڵە گیان، ئەوە دەزانن کە ئەگەر مەسەلەکە دزە بکا، ئەم کچە حەیای دەچێ؟ ئەوە دەزانن کە دەبێ تا زووە بەر بەم ڕووداوە بگرن و بە بوێری و دلێرییەوە چاو ببڕنە چاوی هەمووان و بە دەنگی بەرز خوازبێنیی بکەن و هەموو پاساوەکانیان ڕەد بکەنەوە و بینێرنە دۆزەخ و گەر فۆما فۆمیچیش هەر نابەجێییەکی کرد، دەمودەست پێستی داماڵن؟

خاڵە قیڕاندی:

– هاوڕێکەم! ئەو کاتەی کە بەرێوە بووم بەرەو ئێرە، خۆشم هەر بیرم لەوە دەکردەوە!

– کەواتە ئەم کارە دەکەن؟

– بێ چەندوچۆن! ئەسڵەن بەر لەوەی مەسەلەکە بۆ تۆ باسکەم، خۆم وەها بڕیارێکم دابوو!

– ئافەرین، خاڵە گیان!

فڕکەیەکم کرد و خاڵەم گرتە باوەش. ئێمە تا ماوەیەکی زۆر پێکەوە دواین. بە درێژایی ئەو کاتە هەوڵی ئەوەم دەدا هۆکار و پێویستیی زەماوەندکردنی لەگەڵ ناستینکا بە گوێدا بدەم، گەرچی ئەو خۆی لە من باشتر ئەمانەی دەزانی. لەگەڵ ئەوەشدا، کەوتبوومە هەوای قسەکردن و بارودۆخی خاڵە خرۆشاندبوومی. هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی بووبووە هۆی خرۆشانی خاڵە، دەنا ئەو هەرگیز ئاوا ئامادەی بەرهەڵستیکردن نەبوو. گرنگییەکی تایبەتیی بە ئەنجامدانی ئەرك و بەرپرسیاریەتیی خۆی دەدا، لەگەڵ ئەوەشدا، کتومت نەمدەزانی کە ئەمە سەردەگرێت یان نا! وەڵێ باش دەمزانی و وەك کوێرێك باوەڕم بەوە هەبوو کە خاڵە لەبەرانبەر هەر شتێکدا کە بە ئەرکی خۆی دەزانێت، کۆڵ نادا، لە لایەکی دیکەشەوە نەمدەتوانی باوەڕ بە خۆم بهێنم کە ئەوەندە بەهێزە، کە لەبەرانبەر هەموو ئەندامانیماڵەوەدا دەوەستێتەوە. جا هەر لەبەر ئەوەش هەوڵم دەدا زیاد و زیادتر دنەی بدەم و بیخەمە ڕێ و بۆ ئەمەش، هەموو گوڕ و تینی گەنجیی خۆمم خستە گەڕ. دەمگوت:

- مل نەدەن، بە تایبەت، بە تایبەت لەبەر ئەوەی کە ئێستە بڕیاری خۆتانتان داوە و بچووکتر گومان و دوودڵیتان نییە! ئێستە ڕووداوێکتان بۆ هاتووەتە پێش کە چاوەڕێی نەبوون، گەرچی هەمووان ئاگاداری ئەوە بوون و زانیویانە کە ناستاسیا یۆگرافاونا دڵی بە ئێوەوەیە.

جا هەڵچووانە هاوارم کرد:

- نەکا بتانەوێ لێگەڕێن عەشقی بێگەردی ببێتە مایەی شووڕەیی و ڕسوابوونی؟

خاڵە باوەشی پێدا کردم و بە دەنگی بەرز گوتی:

- هەرگیز! وەڵێ هاوڕێ، یانی هەر بە ڕاستی ئەو ڕۆژە دێتە پێش کە من تا ئەو ڕادەیە کامەران بم؟ باشە ئێستە چی بووە کە ئەو دڵی چووەتە من و ئەسڵەن لەبەر چی؟ هەر بە ڕاست بۆچی؟ بە بڕوای خۆم بە هیچ شێوەیەك سەرنجڕاکێش نیم... من لەبەرانەبەر ئەودا تەنیا پیرەمێردێکم، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە چاوەڕوانییەکی لەو جۆرەم نەبوو! فریشتەکەم، فریشتەکەم!... گوێ بگرە سیریۆژا، ئەمڕۆ پرسیت کە من عاشقیم یان نا، ئادەی بزانم، چی وای کرد ئەم پرسیارە بکەی؟

- خاڵە گیان، من تەنیا بینیم کە ئێوە پڕ بە دڵ عاشقی ئەون. عاشقن و کەچی خۆشتان نازانن. ببوورن ها! ئێوە تەنیا لەبەر ئەوە منتان بانگهێشت کرد کە بێم و لەگەڵ ئەودا زەماوەند بکەم، تا ئەو ببێتە هاوسەری خوشکەزاکەتان و ئیدی بەردەوام لەتەکتانەوە بێ...

- ئێستە تۆ... سیریۆژا، لێم دەبووری؟

- ئاە، خاڵە گیان!...

جا هەمدیس باوەشمان بە یەکدیدا کردەوە.

- وریا بن، خاڵە گیان، هەمووان دژی ئێوەن. دەبێ هەر سەرلەبەیانی بەرەوڕووی هەموویان ببنەوە.

خاڵە کەمێك تێفکری و پاشان گوتی:

- بەڵێ، بەڵێ، هەر سەرلەبەیانی! دەزانی، پێویستە بە بوێری و جوامێریی ڕاستەقینە و هێزی ویست... بەڵێ کتومت بە هێزی ویستەوە بچینە پێش!

– خاڵه گیان، ئەسڵەن ترستان نەبێ!

– ناترسێم، سیریۆژا! هەر ئەوەندەیە کە نازانم لە کوێوە دەست پێ بکەم و دەبێ چی بکەم!

– بیر لەمە مەکەنەوە، خاڵە گیان. بەیانی هەموو شتێ دەکەوێتە سەر سکە. هێور بن. تا زیاتر بیری لێ بکەنەوە، خراپتر دەبێ. گەر فۆماش قسەیەکی کرد، خێرا پێستی داماڵن و وەدەری نێن.

– ئەی ناکرێ وەدەری نەنێین؟ براله، بڕیارم داوه سبەینێ زوو، بەر لە کازیوە، قۆڵی لێ هەڵماڵم و هەر بەو جۆرەی کە هەموو شتێکم بۆ تۆ باس کرد، ئاوا بۆ ئەویشی باس بکەم. ناچێتە ئەقڵەوە دەرکم پێ نەکا، پیاوێکی شەریفە، شەریفترین مرۆڤە! من تەنیا خەمی یەك شتمە، ئەویش ئەوەیە کە گەر سبەینێ دایە گیان خوازبێنیی لە تاتیانا ئیڤانۆڤنا کردبێ، ئەی ئەوسا چی؟ ئەوە شتێکی زۆر خراپە!

– خەمی تاتیانا ئیڤانۆڤناتان نەبێ، خاڵە گیان.

جا بەسەرهاتی دیداری ناو کەپرەکەی ئابنۆسکینم بۆ گێڕایەوە. خاڵە واقی وڕ مابوو. لە بارەی میزینچیکافەوە هیچم بۆ نەگێڕایەوە. خاڵە گوتی:

– کەسێکی هەوەسبازە! هەوەسبازێکی ڕاستەقینەیە! ئای تاتیانا ئیڤانۆڤنای داماو! ئە ئاوا خەڵکی خۆیانی لێ دەبەنە پێش و سادەییەکەی دەقۆزنەوە! جا هەر بە ڕاست ئابنۆسکین بوو؟ ئاخر خۆ ئەو لێرە ڕۆیشتبوو... سەیرە، زۆریش سەیرە! خۆ من تاساوم، سیریۆژا... بێ گومان دەبێ سبەینێ مەسەلەکە شەنوکەو کەین... بە تەواوی دڵنیای کە تاتیانا ئیڤانۆڤنا بوو؟

گوتم، گەرچی ڕووخساریم نەبینی، بەس لەبەر چەند هۆکارێك بە تەواوی دڵنیام کە خودی تاتیانا ئیڤانۆڤنا بوو.

– ئم! ڕەنگە لەگەڵ یەکێ لە کارەکەرەکاندا خەریکی ڕابواردن بووبێ و تۆش وات زانیوە کە تاتیانا ئیڤانۆڤنایە؟ خۆ *داشا*ی کچە باخەوان نەبوو؟ کچێکی زۆر شەیتانە! هەمووان دەزانن، هەر لەبەر ئەوەشە کە وا دەڵێم، هەمووان دەزانن کە ئانا نایلۆڤنا بەسەریدا چووە... بە هەرحاڵ، ئەوەی کە گوتت ڕێی تێناچێ! ئاخر ئابنۆسکین دەیگوت، بە تەمایە زەماوەندی لەگەڵ بکا. سەیرە! سەیرە بە خوا!

دواجار لێك جیا بووینەوە. کاتی خواحافیزی، بەدەم گرتنەباوەشەوە، دوعام بۆ کرد. خاڵە هەیتاهەیتا دەیگوت:

– سبەینێ، سبەینێ هەموو شتێ یەکلایی دەبێتەوە، بەر لەوە تۆ بەئاگا بێی هەموو شتێ بڕاوەتەوە. دەچمە لای فۆما و ئازایانە ڕووبەڕووی ڕادەوەستم و وەك برایەك هەموو هەستە نهێنییەکانی دڵمی بۆ باس دەکەم. خواحافیز سێریۆژا. بچۆ بخەوە، ماندوو بووی، ئەوە بێ گومان من بە درێژایی شەو چاو لێك نانێم.

خاڵە ڕۆیشت و منیش کە هەتا بڵێی سەراسیمە و ماندوو بووم، دەمودەست ڕاکشام. ڕۆژێکی هیلاککەر بوو. مێشکم جەنجاڵ بووبوو و تەنانەت بەر لەوەی بە تەواوی خەوم لێ بکەوێت، چەند جارێك بەدەم هەڵلەرزینەوە لە خەو ڕاپەڕیم. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو تاسان و سەرسامییەی کە بە بۆنەی ئەو ڕووداوانەوە لە کاتی خەوتندا بەرۆکی پێ گرتبووم، لەچاو سەیروسەمەریی و سەرسووڕهێنیی ڕووداوەکانی دوای بەئاگاهاتنەوەی بەیانیم هیچ نەبوو.

# وەرزی یەکەم

## شوێنهەڵکردن

خـەوێکی قـووڵم لـێ کـەوتبوو و هـیچ خەونێکیشـم نـەدیت. کتـوپڕ هەستم کرد کێشێکی دە پودی[1] خراوەتە سەر پێیەکانم. لە پڕێکدا بـەدەم هاوارکردنـەوە لـە خـەو ڕاپـەڕیم. هـەوا ڕوونـاك بـوو و خـۆری پڕشنگدار لە پەنجەرەکـەوە سـەیری دەکـرد. بەڕێز باخچییڤ لەسـەر تەختەخەوەکەم، یان باشتر وایە بڵێم لەسەر پێیەکانم دانیشتبوو.

ئیـدی هـیچ گومـانێکی تێـدا نـەبوو، ئـەوە خـودی خـۆی بـوو. هـەر چۆنێك بووە پێیەکانم لەژێری دەرهێنان، هەستام و دانیشتم، گێژ و وێژ دەمڕوانی کە کابرایەکی خەپە هاواری کرد:

– خـۆ هـەروا خەریکـە سـەیرم دەکـا! ئـەوە بـۆ وا لـێم ڕامـاوی؟ هەستە، باوکە گیان، هەستە! وا نیـو کاتژمێرێکـە بانگت دەکـەم، دە ئەو چاوانەت بکەوە ئیدی!

– چی بووە؟ ئێستە کاتژمێر چەندە؟

---

١. پوود: یەکەی کێشانی کۆن، نزیکەی ١٦ کیلۆگرام. «و. ف»

– جارێ بەربەیانە، وەڵێ *فیۆرۆنیا*[1] ی ئێمە، بەر لە هەڵهاتنی خۆر، تێی تەقاندووە. هەستە، دەبێ شوێنی هەڵکەین!

– فیۆرۆنیا کێیە ئیدی؟

– یارۆ خانومان سەرخۆشەکەمان! تێی تەقاند و بۆی دەرچوو! بەر لە هەڵهاتنی خۆی تێی تەقاند! باوکە گیان، باوکە گیان من هاتم بە دوو خولەکێ هەڵتسێنم، کەچی ئەوە دوو کاتژمێرێ دەبێ کە چەنەت بۆ دەدەم! هەستە، باوکە گیان، خاڵەشت چاوەڕێیە، دە یەڵا هەستە!

جا پاشان بە دەنگێکەوە کە لەرەیەکی شەرەنگێزانەی تێدابوو، درێژەی پێ دا:

– لای خۆی ئەمڕۆ ئاهەنگ بوو!

من کە لەلایەن خۆمەوە سۆسەی چەند شتێکم کردبوو، پشوکورتانە پرسیم:

– ئێوە باسی چی و کێ دەکەن؟ نەکا مەبەستتان تاتیانا ئیڤانۆڤنا بێ؟

---

١. شازادە پیۆتر و فیۆرۆنیای هاوسەری، لە قەدیسانی ئەرتەدۆکس و هێمای ئەوین و زەماوەندن. چیرۆکی پیۆتر و فیۆرۆنیای مورامسکی، بە یەکێك لە چڵەپۆپەکانی ئەدەبی سەدەی شازدەیەمی ڕووسیا دادەنرێت. یێرمالای یێرازم، نووسەری ڕووسی، لەسەر بنەمای ئەفسانە میللیەکان ئەم چیرۆکەی نووسیوە. شازادە پیۆتر و فیۆرۆنیا، هەم لە ژیان و هەم لە مەرگدا هێمای ئەوین و خێزانن. ئەوان پێکەوە لە حوزەیرانی ١٢٢٨دا کۆچی دواییان کرد و لاشەی هەردووکیانیان پێکەوە خستە نێو تابووتێك. «و. ف»

– ئەی چی؟ خۆیەتی! خۆ من گوتبووم، ئاگادارم کردبوونەوە... بەس کەس مێشیَ نەدەبووە میوانی! دە فەرموو، خاتون لەم ڕۆژی ئاهەنگەدا چ پیرۆزباییەکی لیَ کردین! عاشقێکی شێتە، عەشقەکەی داویەتی لە کەللەی! تفوو! ئەی ئێستە چی لە بارەی ئەو جەنابەوە بڵێم، ها؟ ئەو خوێڕیی ڕیش بزنییە؟

– لەگەڵ میزینچیکۆڤ هەڵهاتووە؟

– هەی نەفرەتی، تف لە چڕوچاوت! تۆش باوکە گیان، چاوەکانت بسڕە و لانیکەم گەر لەبەر خاتری جەژنی پیرۆزیش بووە، با کەمیَ فکر و هۆشت لەسەر خۆی بیَ! وا دیارە دوێشەو ئەوەندەت هەڵداوە کە هێشتا سەرت دەسووڕیَ! میزینچیکۆڤی چی باوکە گیان؟ لەگەڵ ئابنۆسکین هەڵهاتووە، نەك میزینچیکۆڤ. ئەو ئیڤان ئیڤانۆڤیچ میزینچیکۆڤە، مرۆڤێکی ئاوڕووداره، ئێستەش لەگەڵمان دیَ بۆ شوینهەڵکردنی هەڵهاتووەکان.

کتوپڕ لە جێگەکەم دەرپەڕیم و هاوارم کرد:

– ئەوە چی دەڵێن؟ هەر بە ڕاست لەگەڵ ئابنۆسکین هەڵهاتووە؟

کابرای خڕوخەپ لە جێگەکەی هەستا و هاتە وەڵام:

– هەی نەفرەتت لیَ بیَ، مرۆڤێکی زۆر ناحاڵیی ها! تۆ بڕوانە من کە هەڵاهەڵا هاتوومە لای مرۆڤێکی خوێنەوار تا هەواڵێکی گرنگی بدەمیَ، کەچی جەنابیان هێشتا گومانیان هەیە! ئێستە باوکە گیان، گەر دەتەویَ لەگەڵمان بێی خێرا هەستە و پانتۆڵەکانت لە بەر کە!

ئەسڵەن من بە خۆڕایی چەنە دەدەم، تا ئێستەش هەر بە خۆڕایی وەختی زێڕینمم بە فیڕۆ داوە!

جا بە توورەییەوە لە ژوورەکە چووە دەرێ.

مـن کـە بـە بیسـتنی ئـەم هەواڵـە شـۆك بووبـووم، لەسـەر تەختەخەوەکە پڕتاوێکم کرد و خێرا جلم پۆشی و بە پلیکانەکانـدا ڕامکردە خوارێ. وا دیار بوو کە ئەندامانی ماڵەکە خەوتوون و نازانن چی قەوماوە. بە هیوای پەیداکردنی خاڵە، لە پلیکانەکانـەوە چوومە هـەیوانی پێشـەوەی ماڵەکـە. لـە هۆڵەکـەدا تووشـی ناسـتینکا هـاتم. پێدەچوو پەلەپەل جلی لـە بەر کردبێت، پۆشاکێکی وەك جلی خـەو یان جۆرە ڕۆبێکی لە بەر بوو و قژیشی بژابوو. دیاربوو کـە هـەر ئـەو ساتە لـە تەختەخـەو هاتووەتـە دەر و دەتکـوت لـە هۆڵـدا چـاوەڕێی کەسێکە. هەتا بڵێی تۆقی بوو و ڕەنگی بە ڕووەوە نـەمابوو. پەلەپـەل و پچڕ پچڕ پرسیی:

– بڵێن بزانم، ئەوە ڕاستە کە تاتیانا ئیڤانۆڤنا لەگـەڵ ئابنۆسـکین هەڵهاتووە؟

– وا دەڵـێن. لـە دوی خاڵـە گیـان دەگـەڕێم، دەمانـەوێ شـوێنیان هەڵکەین.

– وای! بیهێننەوە، بۆ خاتری خوا تا زووە بیهێننەوە! گەر فریای نەکەون، تیادەچێ.

– ئێستە خاڵە گیان لە کوێیە؟

– دەبێ چووبێ بۆ گەوڕ، خەریکی ئامادەکردنی گالیسکەن. من لێرە چاوەڕێیم. گوێ بگرن، پێی بڵێن کە من بێ گومان ئەمڕۆ دەچم،

ئیدی بڕیاری خۆمم داوە. وا بڕیارە باوکم لەگەڵ خۆیم ببا، گەر بکرێ هەر ئێستە دەچم. هەموو شتێ شێوا و تێك چوو!

ئەمەی گوت و وەك شکستخواردوویێك لێمی ڕووانی و کتوپڕ فرمێسك بە چاوانیدا هاتە خوارێ. دەتگوت تووشی نۆرەی دەماری بووە.

تکاکارانە پێم گوت:

– هێور بن! ئەسڵەن وا باشترە... ئێستە دەبینن... ناستاسیا یۆگرافاونا، ئێوە چیتا بەسەر هاتووە ئاخر؟

نائاگایانە دەستمی گوشی و بە هەناسەبڕکێوە گوتی:

– من... نازانم... بۆ وام لێ هاتووە. پێی بڵێن...

لەم ساتەدا بوو کە لەپشت دەرگەی لای ڕاستەوە دەنگ و هەرایەك بەرز بووەوە. ناستاسیا، بێ ئەوەی قسەکەی تەواو بکات، دەستمی بەردا و تۆقیوانە ڕایکردە سەر پلیکانەکان.

دواجار لە حەوشەی پشتەوە و لەتەك گەوڕەکە، چاوم بە هەموو کەسانی دەستەی شوێنهەڵکردن، یانی خاڵە و باخچێنێڤ و میزینچیکۆڤ کەوت. ئەسپی تەیاریان بە گالیسکەکەی باخچێنێڤەوە بەستبوو. هەموو ئامادەکارییەك بۆ ڕۆیشتن کرابوو و تەنیا ماتڵی من بوون. خاڵە هەرکە چاوی پێم کەوت، هاواری کرد:

– ئەرەتانێ!

جا بە سیمایەکی سەیرسەمەرەوە لێمی پرسی:

– بیستت چی بووە، براڵە؟

لە نیگا و دەنگ و جووڵەیدا، تاساوی و ترس و تا ڕادەیەکیش هیوا بەدی دەکرا. دەتگوت هەستی بەوە کردووە کە گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی لە ژیانیدا ڕووی داوە.

دەمودەست لە هەموو وردەکارییەکانی ڕووداوەکەی ئاگادار کردمەوە: بەڕێز باخچییێڤ، کە شەوێکی ناخۆشی بەسەر بردبوو، لە بوولێڵی بەیانیدا هاتبووە دەرێ تا بە بۆنەی ڕێوڕەسمی عەشای ڕەبانییەوە بچێت بۆ پەرستگە کە پێنج ویرستایەك لە گوندەکەیانەوە دوور بوو. ڕێك لەسەر پێچی شەقامی بەرەو پەرستگە، چاوی بە گالیسکەیەك کەوتبوو کە بەوپەڕی خێرایییەوە لە جووڵەدا بووە و تاتیانا ئیڤانۆڤنا و ئابنۆسکینیشی تێدا بوونە. جا قسەکانی ئەو وایان دەگەیاند کە تاتیانا ئیڤانۆڤنا بەدەم گریان و تۆقینەوە دەستی بەرەو بەڕێز باخچییێڤ درێژ کردووە وەك بڵێی لێی دەپاڕێتەوە تا یارمەتیی بدات. هەروەها، ئەوەشی بۆ زیاد کرد کە *ئابنۆسکین وەك تەرمێك بێ جووڵە دانیشتبوو و گوایە خۆی حەشاردابوو، کاکی خۆم، وات زانیوە دەتوانی لە دەستی ئێمە هەڵبێی!* ئەوجا ستێپان ئالێکسییڤیچ باخچییێڤ دەمودەست بادەداتەوە و بە هەڵەداوان بەرەو ستێپانچیکۆڤۆ دێ و خاڵە و میزینچیکۆڤ و دواجار من هەڵدەستێنێ. دەستبەجێش بڕیار لەسەر ئەوە دەدرێت کە شوێنیان هەڵبکەین! خاڵە دەیگوت:

– ئابنۆسکین، هاوار بەدەست ئەم ئابنۆسکینەوە... ئاخر کێ شتی وای بە خەیاڵدا دەهات!

خاڵە لە وەختی دەبڕینی ئەم قسانەدا، بە چەشنێك چاوی تێبڕیبووم کە وەك بڵێی بەتەمای گوتنی شتێکی دیکە بووە. میزینچیکۆڤیش لەوپەڕی تووڕەییدا هاواری کرد:

– ئەم مرۆڤە سووکە هەموو چەپەڵکارییەکی لێ دەوەشێتەوە!

جا لە ترسی ئەوەی کە نەکا نیگای بگیرێتە نیگای من، ڕووی لێ وەرگێڕام. بەڕێز باخچیێڤ، بەدەم سواربوونی گالیسکەوە، قسەی پێ بڕی و گوتی:

– ئەرێ ئێمە ئاقیبەت دەکەوینە ڕێ یان نا؟ نەکا بتانەوێ تا شەو لێرە دایکوتن و چیرۆك بگێڕنەوە؟

خاڵە دەستبەجێ گوتی:

– دەی با بڕۆین، با بڕۆین!

لەسەرخۆ بە گوێی خاڵەمدا چپاند:

– ئەسڵەن ئەمە شتێکی باشیش بوو، خاڵە گیان! دەبینن چۆن هەموو شتێ بە باشترین شێوە ڕایی بوو؟

– بیبڕەوە، براله، گوناحە... ئاخ، هاوڕێکەم! ئێستە ئەوان تەنیا بۆ قەرەبووکردنەوەی دەستڕانەکەیشتن بە ئامانجەکەیان، ئەو داماوە دەکەنە دەرێ... تێدەگەی؟ ئەمە تۆقێنەرە، من هەستێکی خراپم هەیە!

بەڕێز باخچیێڤ دیسان قیژاندییەوە:

– چی بوو، ئیگۆر ئیلیچ، بڕیار وایە هەر خەریکی چپەچپ بین یا ئاقیبەت دەکەوینە ڕێ؟ گەر دڵتان پێوەیە با ئەسپەکان لە گالیسکەکە بکەینەوە و بەرکوڵێکی بۆ بکەین... ئەسڵەن چی دەڵێن کە بڕێ فۆدگاشی بۆ هەڵدەین؟

ئەم قسانە هێندە تەزێنەر بوون کە خێرا هەموو بە گوێمان کرد و لە گالیسکەدا دانیشتین و ئەسپەکان بە غار کەوتنە ڕێ. تا ماوەیەك هەمووان بێدەنگ بوون. خاڵە تەماشایەکی مانا‌داری کردم، وەلێ حەزی نەکرد لە بەردەم ئەواندا هیچ بڵێت. هەر لە فکردا بوو، بەس دوای کەمێك، وەك ئەوەی کە تازە گیانی بە بەردا هاتبێتەوە، لە جێوە دەرپەڕی و دڵپەرۆشانە دەستی کردە چاوگێڕان بە چواردەوریدا. میزینچیکۆڤ بە ڕواڵەت هێور بوو، جگەرەی دەکێشا و وەك کەسێك کە مافیان خواردبێت، بە قورسوقۆڵییەکی تێکەڵ بە ڕەنجانەوە تەماشای دەکرد. لە بەرانبەردا، باخچیێڤ لەجێی هەمووان کەلەیی بووبوو، لەژێر لێوەوە پرتەوبۆڵەی دەهات و بە تووڕەیی لە هەموو ئێمە و گشت شتێکی دەڕوانی و سوور هەڵدەگەڕا و دەکەوتە هەناسەبڕکێ و یەك لەدوای یەك تفی دەکرد و بە هیچ شێوەیەك نەدەسرەوت.

کتوپڕ خاڵە پرسیی:

– ستێپان ئالێکسییڤیچ ئێستە ئێوە دڵنیان کە ڕۆیشتوون بۆ میشنۆ؟

جا پاشان ڕووی کردە من و درێژەی پێ دا:

– بیست وێرستایەك دەبێ تا ئێرە، براله! گوندێکی بچووکە و سی ڕەعیەت زیاتری نییە، لەم دواییانەدا یەکێ لە بەرپرسانی سەر بە پارێزگە لە خاوەنەکەی پێشووی کڕیوەتەوە. کابرا کلاوچییەکە لەم دونیایەدا تاکی نییە! خەڵکی وا دەڵێن، ڕەنگە ڕاستیش نەبێ.

– ئێستە ستێپان ئالێکسییڤیچ باخچیێڤ لەوە دڵنیایە کە ئابنۆسکین چووە بۆ ئەوێ و ئەو بەرپرسەش هاودەستیەتی؟

کتوپڕ باخچییێڤ لە جێگەکەی ڕاپەڕی و گوتی:

– ئەی چی؟ باوکە گیان خۆ گوتم کە ڕۆیشتوون بۆ میشینۆ. بەس ڕەنگە ئێستە ئابنۆسکین لە میشینۆیش تێی تەقاندبێ! دەبوو سێ کاتژمێری دیکەش لە حەوشە ڕابوەستین و چەنە بدەین!

میزینچیکۆڤ گوتی:

– خەمتان نەبێ، هەر دەیانگرین.

– بەڵێ، دەیانگرین! ڕەنگە لەوێ لەسەر ڕێگە وەستابێ و دەست ڕابوەشێنێ تا تۆ بگەی. کاکە گیان، گەنجینەی دەست کەوتووە، بێگومان تا ئێستە بووەتە دووکەڵ و چووە بە ئاسماندا!

خاڵە گوتی:

– خەمت نەبێ، ستێپان ئالێکسییێڤیچ باخچییێڤ، خەمت نەبێ، دەیانگرین. خۆ جارێ ئەوان فریای هیچ نەکەوتوون... ئێستە خۆشت دەیبینی.

بەڕێز باخچییێڤ بە پەستییەوە گوتی:

– یانی جارێ فریای هیچ نەکەوتوون، ها؟ ئاخر چی هەیە کە ئەو نەتوانێ فریای بکەوێ؟ جا دەشڵێن ژنێکی بێوەی و کەمدووە!

ئینجا وەك ئەوەی لاسایی کەسێك بکاتەوە، دەنگیی باریك کردەوە و گوتی:

– *دەڵێن وااای، داماوە زۆر کەمدووە، کوێرەوەریی زۆری چەشتووە!* ئەوە هەمان ئەو داماوە بێوەیە دەستی هەمووومانی لە خەنە ناوە و بۆی دەرچووە! ئێستە دەبێ بەم ناوەختە و بە دەم و لەوسی شۆڕەوە بەم شەقامانەدا لەدوی خانم خاس بگەڕێین!

تەنانەت لەم ڕۆژە پیرۆزەشدا لێناگەڕێن پیاو بپەرژێتە سەر دوعا و خواپەرستیی خۆی. ئەی تف لە ڕۆحت!

گوتم:

– دەی باشە، خۆ ئەو منداڵ نییە تا سەروەسیەتی هەبێ. گەر خۆی نەیەوێ خۆ ناکرێ بیهێننەوە. باشە ئێمە چۆن بیهێنینەوە؟

خاڵە لە وەڵامدا گوتی:

– بێ گوما، وەڵێ دڵنیات دەکەمەوە کە هەر خۆی دوامان دەکەوێ و لەگەڵمان دێتەوە. تۆ لەوە مەڕوانە کە ئێستە خەریکیەتی... هەرکە ئێمەی بینی، دەمودەست دوامان دەکەوێ... بەڵێن دەدەم. برالە، نابێ هەروا دەستی لێ بەردەین... چۆن بیڵێم ئاخر، ئێمە بەرپرسیارین باوکە...

باخچییێڤ دەمودەست پێمدا هەڵشاخی و هاواری کرد:

– خۆ منداڵ نییە تا سەروەسیەتی هەبێ؟ ئەو دەبەنگە، باوکە گیان، بە تەواوی مانا دەبەنگە... گرنگ نییە سەروەسیەتی هەبێ یان نا. ئەوە دوێنێ نەمویست باسی کەم. لەم دواییانەدا جارێکیان بە هەڵە خۆم بە ژوورەکەیدا کرد، سەیرم کرد و بینیم خۆی تاق و دەست لەسەر کەمەر لەبەرانبەر ئاوێنەدا ڕاوەستاوە و لە بەرخۆوە سەمای سکۆتلەندی دەکا! جلەکانیشی جۆرێ بوون کە هەر وەك ئەوەی هیچی لە بەر نەبێ! ڕێك وەکو مۆدێلی ڕۆژنامە! تفێکم ڕۆ کرد و هاتمە دەرێ. جا هەر لەو کاتەوە پێشبینیی ڕۆژێکی وەك ئەمڕۆم کردبوو، وەك ئەوە وابوو لە بەرچاوم بێ!

بە تۆزێك ترسەوە گوتم:

– بۆ خراپەی دەڵێن؟ گشتمان دەزانین کە تاتیانا ئیڤانۆڤنا کەمئەقڵە... یا با جوانتر بیڵێم، تا ڕادەیەك خۆشکەیفە و وەك ئەوەی... بە ڕای من ئابنۆسکین خەتابارە، نەك ئەو.

باخچیێڤی خەپە، کە لە تاو تووڕەیی سوور بووبووەوە، پەڕییە نێو قسەکانمەوە و گوتی:

– یانی کەمئەقڵە؟ تۆ و ئابنۆسکین هەردووکتان تاکی یەکدین! ئەسڵەن ئەم کابرایە دەڵێی سوێندی خواردووە کە پیاو دەیری بکا! واش دیارە لە دوێنێوە ئەم سوێندەی خواردووە! ئەو ژنە دەبەنگە، باوکی من! هەمدیس پێت دەڵێمەوە، نەك هەر بە تەنیا کەمئەقڵە، بەڵکە هەر لە بنەڕەتەوە دەبەنگە، هەر بە منداڵی عەشقی کۆپیدۆ ئەقڵی لە سەردا نەهێشتووە! وا ئێستەش کۆپیدۆ دواتیری لە دڵی دا و بڕایەوە. بەس چی بڵێم لە بارەی ئەو خوێڕییە ڕیشبزنییەوە! بێ گومان ئێستە خەریکە زرنگ زرنگ پارەکانی دەژمێرێ و قەشمەریی بە ئێمە دێ.

– یانی ئێوە لاتان وایە، دوای ئەوەی تاتیانا ئیڤانۆڤنای هێنا، یەکسەر وێڵی دەکا؟

– ئەی چی؟ ڕەنگە وات زانیبێ ئەم گەوهەرە بە ملیەوە هەڵدەواسێ و بەملا و بەولایدا دەگێڕێ، ها؟ باشە ئەم ژنە چ کەڵێکی ئەو دەگرێ؟ هەموو پارەکەی لێ دەکێشێتەوە و لە لایەك لەسەر شەقامێ و لەژێر دارێ دایدەنیشێنێ و دەڕوا (لەو جۆرە

بەسـەرهاتانەمان زۆر بیسـتوون))، جـا تاتیانـا ئیڤانۆڤنـاش لـەژێر دارەکە دەمێنێتەوە و بۆ خۆی بۆنی گوڵ دەکا!

خاڵە هاواری کرد:

– ستیپان، ئیدی وا خەریکە گەورەی دەکەی، یەکجار واش نییە! باشە تۆ بۆ ئاوا هەڵچووی؟ پێم سەیرە. ئەسڵەن ئەم مەسـەلەیە چ پەیوەندییەکی بە تۆوە هەیە؟

– خۆ دواجار ئێمەش مرۆڤین ها؟ ئاخر ئەو داماوە کەوتووەتە چنگی مرۆڤێکی ناڕەسەنەوە، کابرا کەسێکی غەریبی بەگیر هێناوە. ئاخر، خۆشـم دەوێ بۆیـە ئـەم قسـانە دەکـەم... ئـەی نـەفرەت لـەم دونیایە! ڕاست دەکەی، ئەسڵەن من بۆ لە خۆمەوە هاتم بۆ ئێرە؟ بۆ نەچوومە پەرستەگە و بام دایەوە و گەڕامەوە؟ ئاخر چ پەیوەندییەکی بە منەوە هەیە؟ هەر بە ڕاست چ پەیوەندییەکی بە منەوە هەیە؟

باخچیێڤ هـەر وا پرتەوبۆڵـەی بـوو، وەڵ مـن ئیـدی گـوێم لـێ نـەدەگرت و بیرم لـە تاتیانـا ئیڤانۆڤنـا، یـانی لـەو ژنـە دەکـردەوە کـە شوێنیمان هەڵدەکرد. ئێستە لێگەڕێن با بە کـورتی باسێکی ژیـانی ئـەو بکـەین، چـونکە بـۆ ڕوونبوونـەوەی هەڵسـوکەوت و کەتنگێڕییەکانی شتێکی پێویستە. من دواتر و لە ڕێی سەرچاوەگەلی تەواو بڕواپێکراوەوە ئەم زانیاریانەم دەست کەوتن.

ئێستە منداڵێکی هەتیوی داماو وێنا بکەن کە لـە ماڵی کەسێکی بێگانـە و دڵڕەقدا دەژی، جـا پاشـانیش کچۆڵەیەکی هـەژار و کـەمێك دواتـریش خاتونەکچـێك و دواجـاریش پاکیزەیـەکی چـارەڕەش بـە

ناوی تاتیانا ئیڤانۆڤناوە بێننە بەرچاوی خۆتان کە لە درێژەی ژیانی هەژارانەی خۆیدا فنجانی لێوڕێژ لە ژەهری نەهامەتی، هەتیوی، نەگبەتی و سووکایەتی تا بن هەڵدەقوڕێنێ و بە تەواوی هەست بە ناخۆشیی نانی دەستی ئەوانی دی دەکات. هەر بە سرووشت مرۆڤێکی خۆشکەیف و دڵشاد و هەتا بڵێی کەمئەقڵ دەبێ، سەرەتا تا ڕادەیەك دەرەقەتی چارەنووسی تاڵی خۆی دێ و تەنانەت دەشتوانێت جاروبار بە شاد و بێخەمترین پێکەنینەوە بیداتە بەر گاڵتە، وەلێ بە تێپەڕینی کات، دواجار چارەنووس سەردەکەوێت و هەوساری خۆی لە دەست دەستێنێ. تاتیانا ئیڤانۆڤنا، بەرەبەرە زەرد و لاواز و بەدخوو و هەستیار دەبێ و بەردەوام لە خەیاڵگەلێکی بێکۆتادا ڕۆدەچێ کە هەمیشە بە فرمێسکی هیستری و شیوەن و کەشەنگبوون دوایی دێت. تا زیاتر لە حەقیقەتەکانی ئەم دوینایە تێدەگەیشت، زیاتر لە دونیای وەهمدا نغرۆ دەبوو و تێیدا لە سووکناییەك دەگەڕا. تا زیاتر دواهەمین هیوای لەنێو دەچوو، خەیاڵە بەدینەهاتووەکانی زیادتر بە لاوە سەرنجڕاش دەبوون. خەیاڵگەلی سامانی بێحسێب، جوانیی بێوێنە، خوازبێنیکەرانی هەڵبژاردە و دەوڵەمەند و ناودار کە هەموویان کوڕە شازادە و جەنەراڵ بوون و بە دڵێکی پاك و مندالانەوە ئامادە بوون لە پێناو ئەودا بمرن، جا دواجار ئەو... ئەو سەردەستەی جوانان و هەڵگری هەموو کەمالاتە یان ئەو نیگارکێش، شاعیر و جەراڵزادە عاشق و دڵسووتاوانە، بە یەکجاری یان یەك لەدوای یەك لە خەون و بگرە لە دونیای ڕاستەقینەش لە بەرچاویدا بەرجەستە دەبوون. وای لێهاتبوو کە ئیدی بەرەبەرە خەریکبوو ئاوەزی لەدەست دەدا و نەیدەتوانی

بەرگـەی تریـاکی ئـەو خەیاڵـە نهێنـی و بێکۆتایانـە بگرێـت... تـا لـە کتوپڕێکدا دەستی چارەنووس یارییەکی سەرسوورهێنی بۆ هێنایە پێش. لـەو کاتانـەدا کـە ئـەو، لەگـەڵ پیرێـژنێکی بێدانـدا دەژیا کـە بۆڵبۆڵکەرترین خودانی سەر زەوی بوو و هەمیشە لـە هـەر بابەتێکدا ئەوی خەتابار دەکرد و لەبەرانبەر ئـەو جلـە کۆنانـەی کـە بـە ئەمانەت دەیـدایێ، سـەرکۆنەی دەکـرد، لـە وەختێکـدا کـە خـەریکی ئـەزموونکردنی دواهـەمین ڕسوایی و بەئازارترین و برینداركـەرترین حەقیەقەت بوو و لە لایەن هەر کەس و ناکەسێکەوە سووکایەتیی پێ دەکـرا و، بـێ هـیچ پشـت و پەنایـەك لەگـەڵ چارەڕەشـیی خۆیـدا کـەوتبووە ملمڵانـێ و بـۆ ڕاکـردن لێـی، پـەنای بـۆ شـێتانەترین و وڕووژێنەرترین خەیاڵ دەبرد، کتوپڕ هـەواڵی پـێ گەیشت کە یـەکێك لە خزمـە دوورەکـانی، کـە بـە هەڵکـەوت لـەم دواییانـەدا هـەموو کەسـە نزیکەکانیی لەدەست دابوون، کۆچی دوایی کردووە (کەچی ئـەم ژنـە هێندە لاژگ[1] بوو کە هەرگیز بەمەی نەزانیبوو). ئەم خزمـە دوورەشـی کەسـێکی سـەیر بـوو، تـەنیا و خـەمۆك و بێـدەنگ لـە شـوێنێکی ئەوسـەری دونیـا و لـە شارۆچـکەیەکی چـەپەکدا، سووچـێکی لـێ گرتبوو. کتوپڕ وەك ئەوەی کە پەرجوویەك ڕووی دابێت، سامانێکی بێکۆتا وەك بارانی زێڕ بەسەر تاتیانا ئیڤانۆڤنادا باری، لەبەر ئـەوەی کە ئەو، تاکە میراتگری ئـەو کۆچکردووە بـوو. لە ناکـاو سـەد هـەزار ڕۆبڵی زیوی پێ برا. ئەم یاریی چارەنووسە، ئیدی بـە تـەواوی ئـەوی شادیمەرگ کرد. ئەم جۆرە ڕووداوانە هەموو مرۆڤێك شێت دەکەن...

---

[1]. لاژگ، گەمژە، کەمئاوەز، گێلۆکە، خاوەن لێهاتوویەکی کەمی زەین و هۆش.

جا چۆن دەکرا ئەوێك، کە هەر لە بنەڕەتەوە ئەقڵێکی ڕێکوپێکی نەبوو، باوەڕ بە هاتنە دیی ئەو خەونە بکات کە وا لە بەرچاویدا دەبووە حەقیقەت؟ ئیدی بەم شێوەیە بوو کە کچەی داماو ماڵئاوایی لەو کەمە ئەقڵەش کرد. ئەو کە ئەم خۆشبەختییە شاگەشکەی کردبوو، ئیدی بە تەواوی خزایە نێو دونیای سیحراوی و پڕ لە خەیاڵی نەکردە و ئاواتی فریودەری خۆیەوە. ئیدی هەموو خەیالات و گومان و تەواوی کۆسپەکانی ژیانی ڕاستەقینە بەو یاسا ڕوون و قسەهەڵنەگرەی خۆیەوە -دوو کەڕەت دوو یەکسانە بە چوار-، لەنێو چوون و بڕایەوە! ئەو لەو ساتەدا، ژنێکی سیوپێنج ساڵە بوو بە خەیاڵی جوانییەکی دڵڕفێن و شکۆی کامەرانیی عەشقێکی بێکۆتاوە لەناو پاییزێکی ساردی خەمناکدا، هەموو ئەمانەش بێ هیچ ناکۆکییەك لەودا کۆ بووبوونەوە و هاوژینییەکی درووستیان هەبوو. بەشێك لە خەونەکانی بە ڕاست گەڕابوون، کەواتە بۆ دەبێ هەر هەموویان بە ڕاست نەگەڕێن؟ ئەی بۆ دەبێ «ئەو» دەرنەکەوێت؟ تاتیانا ئیڤانۆڤنا لەم دواییانەدا هەر بە تەنیا بیری لێ نەدەکردەوە، بەڵکە بڕوایەکی تەواوی بە هاتنیشی هەبوو. وەلێ بەدەم چاوەڕوانیی شازادەی خەونەکانیەوە، وێنای خوازبێنیکەر و شەیدایانی پلەدار و بێپلە، سەر بە دەوڵەت و نادەوڵەتی، چەکدار و مەدەنی، خانەدان یان شاعیری ئاسایی، لە فەرەنسی یان تەنیا مۆسکۆیی، ڕیشن و بێڕیش، ئمپریالی و نائیمپریالی، ئیسپانی و نائیسپانی (هەڵبەتە باشتر وایە ئیسپانی بێت)، هەموو ئەمانە: چەندان کەڕەت، بە چەشنێك شەو و ڕۆژ لە بەرچاویدا دەردەکەوتن کە هەر بینەرێکی سەراسمە دەکرد و، وای لێ هاتبوو ئیدی یەك هەنگاوی مابوو بۆ

شـێتخانه. سـەرلەبەری ئـەم تارماییـە دڵگەشـێنانه، بـە عەشـقێکی شــکۆدارانه و سەرمەســتکەرانەوە، زنجیرئاســا بــەدەوری ئــەودا دەخولانەوە. ژیانی ڕاستەقینەش، لـە بەرچاوی ئەودا هـەر بە هـەمان شێوازی خەون و خەیاڵەکانی ڕادەبوورد، لـە هـەر کەسـی دەڕوانـی... کابرا عاشقی دەبوو، هەر کەس بە لایدا تێدەپەڕی... ئیسپانی بوو، جا هـەر کەسێکیش کـە دەمرد... بێ دوودڵـی لـە تاو ئـەوینی ئـەودا گیــانی دەرچــووبوو. کــاتێکیش کــە کەســانی وەك ئابنۆســکین و میزینچیکۆڤ و دەیـان کەسـی دیکـەی وەك ئـەوان کـە دەوروخولیـان دەدا، ئـەوا لـە بنەڕەتـەوە خـەون و خەیالاتـەکانی ئـەویان پشتڕاسـت دەکـردەوە. کتـوپڕ هـەمووان دەسـتیان کـردە ڕاگرتنـی دڵـی ئـەو و نازکێشــان و مــەراییکردنی. تاتیانــا ئیڤانۆڤنــای دامــاو بــە هــیچ شێوەیەك حەزی نەدەکرد باوەڕ بەوە بکات کە هەموو ئەمانـە تـەنیا لەبەر خاتر پارەکەی ئەون و بە جۆرێك لـە جۆرەکـان باوەڕی تـەواوی بـەوە هێنـابوو کـە لـە کتوپڕێکـدا خـەڵکی، وەك ئـەوەی بـە پەنجـە ئا ماژەیەکیان پێ کرابێت، هـەر هـەمووی باش بوونـە و بێ جیاوازی گشــتیان خۆشــکەیف و دڵنــەرم و شــاد و میهرەبــانن. «پیــاوی خەونـەکانی» هێشـتا هـەر دەرنەکـەوتبوو (گەرچـی هـیچ گومـانێکی لـەوەدا نـەبوو کـە ئـەو هـەر دێـت)، ئـەم ژیـانی بـێ «ئـەو»ییـە هێنـدە خـراپیش نـەبوو و تەنانـەت وەسوەسـەکەر و تـەژی لـە سـەرگەرمی و خۆشـگوزەرانی بـوو، بـەم پێیـە، چاوەڕانی ئەوەنـدەش دژوار نـەبوو. تاتیانـا ئیڤانۆڤنـا شـیرینیی دەخـوارد و گـوڵی چـێژی لـێ دەکـردە و ڕۆمــانی دەخوێنــدەوە. ڕۆمانــەکانیش دەبوونــە هــۆی زیــاتر بـەربلاوبوونی پانتـایی خـەون و خـەیالاتـەکانی، وەلێ ئـەم ڕۆمانانـەش

هەر کە دەگەیشتنە دووەمین لاپەڕە، خێرا وەلای دەنان. بە خوێندنەوەی یەکەمین دێڕ و لەگەڵ بچووکترین ئاماژەکردن بە عەشق و تەنانەت هەندێک جار بە وەسفکردنی کەشی ژوورێک و یان تەنانەت ئاودەستێک، بە چەشنێک ڕۆدەچووە نێو خەیاڵەوە کە ئیدی توانای درێژەپێدانی نەبوو. بەردەوام جلی تازەی کەشخە و ملپێچی دەستچن و کڵاو و گوڵی سەر و قردێلە و نەخشکەلی بە پارچەدووراو و نموونەی جل و نەخشی گوڵچنی و شیرینی و گوڵ و سەگی خنجیلانەی دەستەمۆی، یەک لەدوای یەک بۆی دەهاتنە ماڵێ. سێ کچ بە درێژایی ڕۆژ درووماانیان بۆ دەکرد و خاتون لە بەیانییەوە تا شەو و تەنانەت تا نیوەشەویش سینەبەند و پۆشاکی لۆچداریان بۆ ڕوودۆز دەکرد[1] و ئەو لە بەرئاوێنەدا خۆی دەنواند. دوای پێبڕانی ئەو میراتە، وا دەهاتە بەرچاو کە تەندرووستتر و تەنانەت گەنجتریش بووەتەوە. ئەوەی ڕاستی بێت تا ئەمڕۆش نەمتوانیوە لەوە تێبگەم کە چۆن ئەو لە کتوپڕێکدا خزمی جەنەراڵ کراخۆتکینی کۆچکردوو دەرچوو. هەمیشە لەوە دڵنیا بووم کە ئەم خزمایەتییە نەخشەی ژنی جەنەراڵ بووە بۆ ئەوەی هەرچیی کردووە تاتیانا ئیڤانۆڤنا لە خاڵە مارە بکات و دەست بەسەر سامانەکەیدا بگرێت. بەڕێز باخچییێڤ لەسەر هەق بوو کە دەیگوت، کۆپیدۆ[2] سەری تاتیانا ئیڤانۆڤنا دەخوات، ئەم کارەی خاڵەش هەر درووست بوو کە لەگەڵ بیستنی ئەوەی تاتیانا ئیڤانۆڤنا لەگەڵ ئابنۆسکین هەڵهاتووە، گوتی

١. ڕوودۆزکردن، پێوە نووساندنی پارچەی درووراو بۆ تاقیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی پێش دووران.

٢.کۆپیدۆ، خواوەندی عەشق. «و. ك»

پێویستە بچینە شوێنی و تەنانەت گەر بە زۆریش بووە بیهێنینەوە. کچەی داماو نەیدەتوانی بێ سەروەسیەت بژی و گەر بکەوتبا دەست کەسانی بێفەڕ، بێ چەندوچۆن دەفەوتا.

کاتــژمێر لــە نــۆ لای دابــوو کــە گەیشــتینە میشــینۆ. میشــینۆ لادێیــەکی بچــووك بــوو، هــەزار و ســێ وێرســتایەك لــە شــەقامی ســەرەکییەوە دوور بــوو و دەکەوتــە شــوێنێکی قوولــەوە. نزیکــەی شــەش حــەوت کــەویلێکی لادێییانــەی دوکــەڵگرتوو کــە بەتەنیشــتدا خوار بووبوونەوە و بە کایەکی دوکەڵاوی داپۆشرابوون، بە نیگایەکی خەمناك و دڵڕەقانەوە هەستێکی ناخۆشیان لە دەروونی ڕاویەراندا دەهێنایــە ئــارا. ئــەو نــاوە تــا مــەودای چــارەگە وێرســتایەك، نــە باخچەیەکی تێدا بەدی دەکرا و نە بنەگیایەك. تەنیا تاقە داربیەکی پڕ چڵەکانیی بەسەر چاڵاوێکدا، کە ئەستێلکیان پێ دەگوت، شۆڕ کردبوونــەوە و خــەریکی وەنــەوزدان بــوو. پێدەچــوو وەهــا شــوێنێك نــەتوانێ کاریگەرییــەکی بــاش بخاتــە ســەر تاتیانــا ئیڤانۆڤنــا. مــاڵی خاوەنەکەی بینایەکی تەختــەیی تــازە و درێــژ و باریــك بــوو بــە شــەش پەنجەرەی هاوڕیزەوە کە دەتگوت بە پەلەپەلێکی تایبەتی کاپۆش کراوە. وا دەردەکەوت خاوەنەکەی، کە بەرپرسێکی میری بوو، تازە ئەو شوێنەی کەوتووەتە دەست. تەنانەت حەوشی خانووەکە هێشتا پەرچینی بۆ نەکرابوو و تەنیا لایەکی بە چڵ و لق پەرچین کرابوو و گــەڵای چــڵەکان هێشــتاش هــەر تــەڕ و گــەش بــوون. کالیســکەکەی ئابنۆسکین لای پەرچینەکەوە ڕاوەستابوو. ئێمە وەك بەڵای ئاسمانی داباریینە سەر سەری هەڵهاتووەکان. لە پەنجەرەی کراوەوە، دەنگی

قیژوهووڕ دەهات. لە سەرسەرای ماڵەکەدا تووشی کوڕیژگەیەکی پێخواس بووین. کوڕیژگە هەرکە چاوی بە ئێمە کەوت، لە ترسان بۆی دەرچوو. لە یەکەمین ژووردا چاومان بە تاتیانا ئیڤانۆڤنا کەوت کە لەسەر قەنەفەیەکی تورکیی درێژ و بێپاڵپشت بە ڕووکێشێکی مەرمەڕشاوە دانیشتبوو. جا هەر کە چاوی بە ئێمە کەوت، قیژەیەکی لێوە هات و بە دەست ڕووخساریی شاردەوە. ئابنۆسکینیش بە شێوەیەکی خەفەتبار، ئێجگار پەشێو و نارەحەت لە تەنیشتییەوە ڕاوەستابوو. بە چەشنێك حەپەسابوو و پەلەپەل لێمان هاتە پێش تا تەوقەمان لەگەڵ بکات، کە دەتگوت بە بینینمان دڵخۆش بووە. دەرگەی ژوورەکەی تەنیشت نیوەکراوە بوو و لەپشتییەوە کراسێکی ژنانە دیار بوو: پێدەچوو کەسێك گوێی هەڵخستبێ و لە درزی دەرگەکەوە لێمان بڕوانێ. ئەندامانی ماڵەوە دیار نەبوون، هەموو خۆیان شاردبووەوە و دەتگوت لە ماڵەوە نین. بەڕێز باخچییێڤ هەر کە بەدواماندا هاتە ژوور، قیڕاندی:

– دە فەرموون، ئەوەش خانمە دەرگێڵەکەمان[1]!

میزینچیکۆڤ بە شێوازێکی ڕەق گوتی:

– ستێپان ئالێکسییێڤیچ باخچییێڤ، جڵەوی خۆتان بگرن! ئەمە بێڕێزیکردنە. لێرە تەنیا ئیگۆر ئیلیچ مافی قسەکردنیان هەیە، ئەسڵەن بابەتەکە پەیوەندیی بە ئێمەوە نییە.

---

١. دەرگێڵ، دەرگەڕ. یانەریانەکەر، ماڵەرماڵکەر، لە هەورامییەوە وەرگیراوە و تا ڕادەیەك واتای بەرەڵا دەگەیەنێت.

خاڵەش بە قەڵسییەوە ڕوانییە باخچییێڤ و وەك ئەوەی كە هەر ئابنۆسكین نەبینێت كە هاتبووە پێش تا تەوقەی لەگەڵ بكات، بەرەو لای تاتیانا ئیڤانۆڤنا چوو كە هێشتا بە لەپی دەست ڕووخساریی شاردبووەوە، جا بە شێوەیەكی ئێجگار نەرمونیان و بەوپەڕی دڵسۆزییەوە گوتی:

– تاتیانا ئیڤانۆڤنا! ئێمە هێندە ئێوەمان خۆش دەوێ و ڕێزتان لێدەنێین كە بە تایبەت هاتووین تا بزانین نیازتان چییە؟ حەز دەكەن لەگەڵ ئێمە بێنەوە بۆ ستێپانچیكۆڤۆ؟ ئەمڕۆ ئاهەنگی ئالیۆشایە. دایە گیان بە پەرۆشییەوە چاوەڕێی ئێوەن و ساشینكا و ناستینكاش لە سبەینێوە تا ئێستە بۆتان دەگرین...

تاتیانا ئیڤانۆڤنا بە ترسەوە سەری هەڵهێنا و لەنێوان پەنجەكانییەوە تەماشای كرد و كتوپڕ بەدەم فرمێسكڕشتنەوە دەستی ئاڵاندە ملی خاڵە و بەدەم هەنسكدانەوە گوتی:

– ئاه، لێرەم دوور خەنەوە، تا زووە لەگەڵ خۆتانم ببەن!

باخچییێڤ دەستێكی پێدا كێشام و بە چپە گوتی:

– خۆ بینینت، هیچ نەبوو، ڕایكرد و وا ئێستەش ترساوە و پەشیمان بووەتەوە!

خاڵە، بێ ئەوەی لە ئابنۆسكین بڕوانێت، زۆر وشك و جددییانە پێی گوت:

– مادام وایە ئیدی مەسەلەكە یەكلایی بووەتەوە. تاتیانا ئیڤانۆڤنا، دەستتانم بدەنێ و لەگەڵم وەرن!

لەپشتی دەرگەکەوە دەنگی خشەخشێك هات و دەرگەکە جیڕەجیڕێکی کرد و زیاتر کرایەوە. ئابنۆسکین سەیرێکی دەرگە نیوەکراوەکەی کرد و دڵپەرۆشانە گوتی:

– وەرن با لە دیوێکی دیکەوە لە بابەتەکە بڕوانین... ئیگۆر ئیلیچ، هەر خۆتان بڵێن... ئەم هەڵسوکەوتەی ئێوە لە ماڵەکەی مندا... ئیگۆر ئیلیچ، ئاخر هەرچییەك بێ من بەخێرهاتنم لێ کردن، وەلێ ئێوە تەنانەت وەڵامی سڵاوەکەشتان نەدامەوە...

خاڵە بە قینەوە ڕووانییە ئابنۆسکین و گوتی:

– هەڵسوکەوتی ئێوە لە ماڵی مندا، بەڕێز، هەڵسوکەوتێکی ناشیرین بوو!... وەلێ ئێرە خۆ ماڵی ئێوە نییە. خۆ خۆتان بیستتان... تاتیانا ئیڤانۆڤنا دڵی پێوە نییە تەنانەت یەك ساتیش لێرە بمێنێتەوە. ئیدی چیتان دەوێ؟ تکایە کەواتە هیچ مەڵێن... دەبیستن، تەنانەت یەك وشەش... تکاتان لێ دەکەم! لەم بارەیەوە خۆ بەدوور دەگرم لە هەر ڕوونکردنەوەیەکی زیادە، ئاوا بۆ ئێوەش باشترە.

وەلێ ئابنۆسکین کەوتبووە دۆخێکی هێندە شڕەوە کە دەستی کردە هەڵیتوپەڵیت. هێندەی نەمابوو لە شەرمان بداتە پرمەی گریان. هەیتاهەیتا دەیڕوانییە دەرگە نیوەکراوەکە و جا لە ترسی ئەوەی کە نەکا لەوێوە دەنگی ببیستن، بە هێواشی گوتی:

– ئیگۆر ئیلیچ، سووچی من نییە، ئەمە کاری دایکم بوو... نەخشەی دایکم بوو. ئیگۆر ئیلیچ، من لەبەر بەرژەوەندیی ماددی

ئەمەم نەکرد... نیازم باش بوو، ئیگۆر ئیلیچ، دەمویست لە ڕێی ئەم سەرمایەیەوە... یارمەتیی هەژاران بدەم. دەمویست یارمەتیی ئەم بزووتنەوە ڕووناکبیرییە هاوچەرخە بدەم و تەنانەت بە تەما بووم پارە بۆ دامەزراوە فێرکارییەکان دابین بکەم... ئیگۆر ئیلیچ، من دەمویست بەم سەرەوەتە ئەو کارانە بکەم، خۆ بۆ خۆمم نەدەویست...

ئێمە دەستبەجێ تووشی ئازاری ویژدان بووین. تەنانەت میزینچیکافیش سوور هەڵگەڕا و ڕووی وەرچەرخاند و خاڵەش بە چەشنێك شەرم دایگرت کە ئیدی نەیدەزانی چی بڵێ. دواجار گوتی:

- باشە، باشە، بەسە ئیدی! پاول سیمیۆنیچ، خۆت بێتاقەت مەکە. چارمان چییە؟ هەموو کەس ئەمەی دێتە ڕێ... براله، گەر حەز دەکەی بۆ فراوێن وەرە لامان... خۆشحاڵ دەبم، هەر بە ڕاستی خۆشحاڵ دەبم...

وەڵێ کاردانەوەی بەڕێز باخچیێڤ جۆرێکی دی بوو و بە توورەییەوە گوتی:

- *پارە بۆ دامەزراوە فێرکارییەکان دابین بکەم!* ئاخر تۆی قۆڵبڕ ئەو پیاوەی کە پارەی دامەزراوەی فێرکاری دابین کەی! لام وایە هەر کەست بکەوێتە بەر چنگ قوڕبەسەری دەکەی... تۆ پانتۆڵت نییە لە پێی کەی، خوێڕیی قوڕمساخ، چ جا بتەوێ پارەی دامەزراوەی فێرکاریم بۆ دابین کەی! تۆیەکی شڕپۆشی شەخەڵماش[1]! ئەوەتا ئەو

---

١. شەخەڵماش: کەسێك کە شەخەڵومەخەڵ کۆ دەکاتەوە.

کچە داماوەت هەڵخەڵەتاندووە! باشە ئێستە یارۆ لە کوێیە؟ خانمی دایکتان دەڵێم! نەکا خۆی شاردبێتەوە؟ گەڕەو دەکەم هەر لەم دەوروبەرە و لە جێیەکدا لەپشت پەردەوە دانیشتووە یان خۆی خزاندووەتە ژێر تەختەخەو...

خاڵە هاواری کرد:

– ستێپان، ستێپان!...

ئابنۆسکین لە تاو تووڕەیی سوور هەڵگەڕابوو و دەیوست وەك ناڕەزایی شتێك بڵێت، وەلێ هێشتا نەهاتبووە گۆ کە دەرگەکە بە تەواوی کرایەوە و خودی ئامفیسا پیترۆڤنا، تووڕە و هەڵچوو و بە چاوانێکی زەقەوە هاتە نێو ژوورەکە و شاتاندی:

– چی بووە؟ چ باسە لێرە؟ ئیگۆر ئیلیچ، بە مۆڵەتی کێ خۆت و داروودەستەکەت ڕژاونەتە نێو ماڵی خەڵکی ئاوڕوودار و ژنان چاوترسێن دەکەی و لەگەڵ پیاوەکانتدا خەریکی فەرماندانی!... مانای ئەم کارانە چییە؟ ئیگۆر ئیلیچ، شوکر بۆ خوا هێشتا ئەقڵم لە دەست نەداوە!

جا پاشان بە ڕووی کوڕەکەیدا هەڵشاخی و شیڕاندی:

– تۆش کەسێکی بێکەڵکی! لە بەردەم ئەمانەدا خۆت کزۆڵە کردووە ها؟ دایکت لە ماڵەکەی خۆیدا سووکایەتیی پێ دەکرێ، کەچی تۆش هەروا دەمت بەش کردووەتەوە! بە تۆ دەڵێن پیاو؟ تۆ لەمەردوا تەنیا پارچە پەڕۆیەکی چڵکنی، نەك پیاو!

ئیدی هیچ هەواڵێك لەو قورسوقوڵی و ئاینوئۆینەی ڕۆژی پێشوی ئامفیسا پیترۆڤنا و تەنانەت چاویلکەکەشی لە ئارادا نەبوو. ئێستە ئەو، بە تەواوی مانا یەك دەڵەدێوی بێدەمامك بوو.

خاڵە هەر کە چاوی بەو کەوت، خێرا ڕۆیشت و دەستی تاتیانا ئیڤانۆڤنای گرت و ویستی لە ژوورەکە بچێتە دەرەوە کە لە ناکاو ئامفیسا پیترۆڤنا چووە بەردەمی و دیسان بە شاتەشاتەوە گوتی:

– ئیگۆر ئیلیچ، ناهێڵم هەروا بڕۆن! بە چ هەقێك دەتانەوێ بە زۆر تاتیانا ئیڤانۆڤنا لەگەڵ خۆتان ببەن؟ ئێوە لەوە پەستن کە ئەو لە داوی قێزەونی ئێوە و دایە گیان و ئەو فۆما فۆمیچە دەبەنگە هەڵهاتووە! ئێوە لەبەر ئەو ئامانجە دزێوەتان زۆر دڵتان پێوەیە زەماوەندی لەگەڵ بکەن. وەڵێ ببوورن، قوربان، خۆ کارەکەی ئێمە زۆر جوامێرانەتر بوو! تاتیانا ئیڤانۆڤنا کە تەماشای کرد دەتانەوێ نەخشتەی بۆ بکێشن و چارەڕەشی بکەن، خۆی هانای بۆ پاویلۆشا[1] هێنا. خۆی داوای لەو کرد کە ، وەك دەڵێن، لە داوی شەڕی ئێوە نەجاتی بدا، هەر لەبەر ئەوەشە کە بەو شەوە لەوێ ڕایکردووە... مەسەلە ئەوەیە، قوربان! تەماشا چیتان بەسەر هێناوە! مەگەر وا نییە، تاتیانا ئیڤانۆڤنا؟ دە مادام وایە، ئێستە ئێوە چۆن وێراوتانە بە هەرچیوپەرچییەکانتانەوە بدەن بەسەر ماڵی خەڵکی خانەدان و بەئاوڕوودا و بەدەم هەڵس و ناڵەوە ئەم پاکیزە نەجیبە بە زۆر پەلکێش کەن؟ من ڕێگە نادەم! ڕێگە نادەم! هێشتا ئەقڵم لەسەر

---

١. شێوەی خۆشەویستانەی ناوی پاڤێل لە زمانی ڕووسیدا، کە لێرانەدا ناوی بچووکی ئابنۆسکینە. «و. ف»

خۆیەتی!... تاتیانا ئیڤانۆڤنا لێرە دەمێنێتەوە، چونکە خۆی وای دەوێ! تاتیانا ئیڤانۆڤنا، وەرن با بچین، گوێ لەمانە مەگرن، ئەمانە دۆستی ئێوە نین، دژمنتانن! مەترسێن، وەرن با بچین! خۆم ئێستە هەموویان وەدەر دەنێم!...

تاتیانا ئیڤانۆڤنا تۆقیوانە قیژاندی:

– نا، نا! نامەوێ، نامەوێ! ئەمە کەی مێردە! من نامەوێ ببمە ژنی کوڕی ئێوە! ئەو چۆن دەتوانێ بۆ من ببێتە مێردێکی باش؟

ئامفیسا پیترۆڤنا لە تاو ڕق هەناسەی سوار بووبوو و هەمدیس کردیەوە بە هاتوهاوار:

– ناتانەوێ؟ ناتانەوێ؟ تا ئێرە هاتوون و ئێستە ناتانەوێ؟ چۆن وێراتان پێمان ڕابوێرن؟ چۆن وێراتان بەڵێنی زەماوەند بدەن و دەمەو شەو لەگەڵی هەڵبێن؟ ئێوە خۆتان بە ملی ئەودا بڕی و گێچەڵتان بۆ نایەوە و خەرجیتان هێنایە کۆڵمان! کوڕەکەی من ڕەنگە بە بۆنەی ئێوەوە شانسی زەماوەندکردنی لەگەڵ پاکیزەیەکی خانەدانی دیکەدا لەدەست دابێ!... دەشێ بە بۆنەی ئێوەوە زیانی دەیان هەزار ڕۆبڵ پاشتێلانەی لێ کەوتبێ! نەخێر، بەقوربان! دەبێ قەرەبووی زیانەکە بکەنەوە، دەبێ قەرەبووی زیانی ئێمە بکەنەوە، ئێمە بەڵگەمان هەیە، ئێوە خۆتان نیوەشەو هەڵهاتوون...

ئێمە تا کۆتا بە دیار هەڵیتوپەڵیتەکانیەوە نەوەستاین و کتوپڕ هەموومان دەوری خاڵەمان گرت و پێکڕا بەتەنیشت ئامفیسا پیترۆڤنادا ڕابردین و بە پلیکانەکاندا هاتینە خوارێ. گالیسکە لە

بەردەم پلیکانەکاندا ئامادە بوو. ئامفیسا پیترۆڤنا لە هەیوانەکەوە دەیشیراند:

– هـەر مرۆڤـە سـووك و خوێڕیـەکان ئـەو کارانـەیان لـێ دەوەشێنەوە! من سکالاّ دەکەم! دەبێ زیانی ئێمە ببژێرن... تاتیانا ئیڤانۆڤنا، ئێوە وا بەرەو ماڵی کۆمەڵە مرۆڤێکی خوێڕی دەچن! ئێوە ناتوانن زەماوەند لەگەڵ ئیگۆر ئیلیچ بکەن، ئەو لەتەك ئێوە لەگەڵ ئەو خاتونە مامۆستایەش ڕادەبووێ کە لای خۆی ڕایگرتووە!...

خاڵە لە بارێکـدا کـە هەڵدەلـەرزی و ڕەنگـی پـەڕیبوو و لێـوی دەگازاند، پەلەپەل تاتیانا ئیڤانۆڤنای سواری گالیسکە کرد. منیش لە لایەکی دیکەی گالیسکەکەوە خەریکبوو سوار دەبووم کە کتوپڕ ئابنۆسکین خۆی گەیاندە من و دەستمی گرت و لە بارێکدا کە توونـد دەیگوشی، بە شێوەیەکی خەمگینانە گوتی:

– لانیکەم بەوە ڕازی بن هاوڕێ بین!

پێم خستە سەر شوێنپای گالیسکەکە و گوتم:

– یانی چی هاوڕێ بین؟

– هـەر وا! مـن هـەر دوێنـێ زانـیم ئێـوە کەسـێکی خوێنـدەوار و تێگەیشـتوون. خـراپ لـێم تێمەگـەن... ئـەوە دایکـم بـوو کـە منـی لـە خشـتە بـرد، مـن هیچـم بەدەسـت نـەبوو. مـن ئەسـڵەن خـۆم خـەریکی ئـەدەبیات و ئـەو شـتانەم... بـاوەڕ کـەن، هـەموو ئەمانـە نەخشـتەی دایکم بوون...

گوتم:

- باوەڕ دەکەم، باوەڕ دەکەم... خواحافیز!

هەموومان لە گالیسکەکە دانیشتین و ئەسپەکان کەوتنە ڕێ. تا ماوەیەکی زۆر هەر دەنگی قیژوهووڕ و نەفرەتەکانی ئامفیسا پیترۆڤنا بەدوامانەوە بوو، کۆمەڵە کەسانێکیش لە پەنجەرەی ماڵەکانیانەوە سەریان دەرهێنابوو و کونجکۆڵانە لێیان دەڕوانیین.

ئەو کاتە ئیدی لە گالیسکەکەدا پێنج کەس بووین، میزینچیکۆڤ لەتەک گالیسکەوانەوە دانیشتبوو و جێگەکەی خۆی بۆ بەڕێز باخچییێڤ چۆڵ کردبوو. بەم پێیە، بەڕێز باخچییێڤ ڕێک کەوتە بەرانبەر تاتیانا ئیڤانۆڤنا. تاتیانا ئیڤانۆڤنا زۆر بەوە دڵخۆش بوو کە ڕزگارمان کردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا هەر دەگریا. خاڵە دەکۆشا هەرچۆنێک بووە هێوری بکاتەوە. خۆیشی زویر و خەمگینانە بە فکر و خەیاڵدا چووبوو و وا دیار بوو کە دڵی بەو قسە بێشەرمانە ئێشاوە کە ئامفیسا پیترۆڤنا بە ناستینکای گوتن. سەرەڕای ئەوەش، لە کاتی گەڕانەوەماندا هیچ کێشەیەک درووست نەدەبوو گەر تەنیا بەڕێز باخچییێڤمان لەگەڵ نەبا.

وەک گوتم، بەڕێز باخچییێڤ لەبەرانبەر تاتیانا ئیڤانۆڤنا دانیشتبوو و هەر لەبەر ئەوەش پەست بوو، نەیدەتوانی دان بە خۆیدا بگرێت، هەر پێچی دەدایە خۆی و وەک قرژاڵ سوور هەڵگەڕابوو و بە شێوەیەکی تەواو تۆقێنەر چاوەکانیی بە چواردەردا دەگێڕان. بە تایبەت لەو کاتانەدا کە خاڵە هەوڵی ئەهوەنکردنەوەی

تاتیانا ئیڤانۆڤنای دەدا، هار دەبوو و وەك سەگێکی بۆلدار[1] کە کلکەقنگەیان دابێ، دەستی دەکردە بۆڵەبۆڵ. خاڵە دڵپەڕۆشانە چاوی لەسەری بوو. دواجار سەرنجی تاتیانا ئیڤانۆڤنا کەوتە سەر دۆخی نائاسایی باخچییێڤ و واق و وڕ لێی ڕاما، پاشان لە ئێمەی ڕوانی، کتوپڕ برزەیەکی هاتێ و دەستی دایە چەترەکەی و بە هێواشی کێشای بە شانی باخچییێڤدا و بە لاقردییەکی دڵفڕێنانەوە گوتی:

– هەی شێتە!

جا دەمودەست باوەشێنەکەی دایە بەر ڕووخساری. ئەم هەڵسوکەوتەی ئەو، دواهەمین دۆڵپ بوو کە کاسەی سەبری باخچییێڤی لێوڕێژ کرد. کابرالەی خەپە گوتی:

– چی...ی ...ی؟ تێنەگەیشتم، چی بووە، خانمخاس؟ ئەم جارەیان نۆرەی ئێمەیە!

تاتیانا ئیڤانۆڤنا هەمدیس دووبارەی کردەوە:

– شێتی بابە! شێت!

جا کتوپڕ کەوتە پێکەنین و چەپڵەلێدان. باخچییێڤ لە گالیسکەوانەکەی قیڕاند:

– ڕایگرە! ئادەی ڕایگرە!

گالیسکە ڕاوەستا. باخچییێڤ دەرگەکەی کردەوە و خێرا بازێکی دایە خوارەوە. خاڵە سەرسام و تاساو هاواری کرد:

– چچی بووە، ستێپان ئالێکسییڤیچ باخچییێڤ؟ بۆ کوێ دەچی؟

---

[1]. سەگی بۆڵدار، جۆرە سەگێکی سەرزل و کەمتووک. «و. ك»

کابرای خەپە کە لە توورەییان هەڵدەلەرزی، هاتە وەڵام:

– نەخێر، ئیدی بەسە! دەك کاول بێ ئەم دونیایە! خانمخاس، من پیر بوومە و ئیدی بە کەڵکی عاشقاتی نایێم. خانم گیان، من وا باشە لەم شەقامەدا بمرم و لەگەڵ ئێوە نەیێم! خواحافیز خانمخاس، !comment vous portez-vous[1]

جا هەر بە ڕاستیش بە پێ کەوتە ڕێ. گالیسکەکە بە هێواشی دوای کەوتبوو. خاڵە دواجار سەبری نەما و هاواری کرد:

– ستێپان ئالێکسییێڤیچ باخچییێڤ! نەفام مەبە، بیبڕەوە ئیدی، سوار بە دەبێ زوو بگەینەوە ماڵێ!

ستێپان ئالێکسییێڤیچ باخچییێڤ، کە لەبەر قەڵەوییەکەی توانای ڕێکردنیشی نەبوو، بەدەم هەناسەبڕێکوە گوتی:

– دەك بە ملی شك... او... بچن!

میزیزین چیکاف بەسەر گالیسکەوانەکەیدا قیڕاندی:

– بەوپەڕی خێراییەوە بۆی دەرچۆ!

خاڵە هاواری کر:

– ئەوە چی دەکەی، ڕایگرە، ڕایگرە!...

هاوارەکەی خاڵە بێئەنجام بوو، چونکە ئیدی گالیسکەکە گوڕی سەندبوو. میزینچیکاف بە هەڵەدا نەچووبوو، چونکە دەمودەست ئەم کارەی ئەنجامی بەدوادا هات. لە پشتمانەوە هاتوهاواری هیوابڕاوانەی باخچییێڤ دەهاتە گوێ:

– ڕایگرە! ڕایگرە! ساختەچی، ڕایگرە! ڕایگرە سەرەخۆرە!...

---

١. دەربڕینێکی فەرەنسییە و لێرانەدا واتای *ڕۆژتان خۆش* دەگەیەنێت. «و. ف»

دواجار کابرای خەپە، بە تەویڵێکی خوساو و بۆینباخی کراوە و کڵاوی لە سەرهەڵگیراو، بەدەم هەناسەبڕکێوە خۆی گەیاندە ئێمە. وسکت و مۆن سواری گالیسکە بوو. ئەم جارەیان من شوێنەکەی خۆمم بۆ چۆڵ کرد، بە هەرحاڵ، ئەو ئیدی ئەم جارەیان نەکەوتە بەرانبەر تاتیانا ئیڤانۆڤنا. تاتیانا ئیڤانۆڤنا بە بینینی ئەو دیمەنە ناوسکی بڕابوو و زوورزوو دەستەکانیی پێکدا دەکێشان و بە درێژایی ئەو ڕێگەیە، دەستی لە ستێپان ئالێکسییێڤیچ باخچییێڤ هەڵنەگرت. کابرای خەپە، تا ئەو کاتەی کە گەیشتینە ماڵێ، هەروا چاوی بڕیبووە تایەی دواوەی گالیسکەکە و یەك قسەشی نەکرد.

کە گەیشتینە ستێپانچیکۆڤۆ، ئیدی نیوەڕۆ بوو. خێرا چوومە ژوورەکەی خۆم و گاڤریلاش دەمودەست بە چایەوە پەیدا بوو. نیازم بوو پرسیاری شتانێکی زۆر لەو پیرەمێردە بکەم کە خاڵە، دەستبەجێ بەدوایدا هاتە ژوورێ و ئەوی ڕایی کرد.

# وەرزی دووەم

## هەواڵ

خاڵە پەلەپەل دەستی کردە قسە:

– براڵە، من لە خولەکێك زیاتر کاتت ناگرم. پەلەم بوو زوو هەواڵت بدەمێ... ئیدی هەموو شتێکم زانیوە. ئەمڕۆ هیچیەك لە ئەندامانی ماڵەوە نەڕۆیشتوون بۆ ڕێوڕەسمی عەشای ڕەبانی، بێ لە ئالیۆشا و ساشینکا و ناستینکا. دەڵێن دایە گیان تووشی لەرز و تا بووە و هەر خەریکی پاشۆرەکردنی بوونە[1]. جا ئێستە تۆزێ باش بووە. هەنووکەش دەبێ بچین بۆ لای فۆما، داوای کردووە منیش ئامادە بم. بەس نازانم کە ئایا بە بۆنەی ئاهەنگی ڕۆژی ناولێنانەوە پیرۆزبایی لە فۆما بکەم یان نا... ئەمە زۆر گرنگە! وای، باشە ئەوانە چۆن ڕووبەڕووی ئەم دۆخە سەیروسەمەرەیە دەبنەوە؟ دۆخێکی تۆقێنەرە، سیریۆژا، دڵم هەواڵی داوە...

منیش دەستبەجێ گوتم:

– ئەسڵەن بە پێچەوانە، خاڵە گیان، وا خۆبەخۆ هەموو شتێ چارەسەر دەبێ. لەبەر ئەم هەلومەرجەی کە هاتووەتە پێش، ئێوە بە

---

١. پاشۆرەکردن، شۆردنی پێی نەخۆش بە ئاوی سارد.

هـیچ شـێوەیەك نـاتوانن زەماوەنـد لەگـەڵ ئـەو تاتیانـا ئیڤانۆڤنایـەدا بکەن... ئەمـە هـەر خـۆی بە تـەنیا شتێکی زۆر گرنگـە! لـە ڕێگەشدا دەمویست ئەمەتان پێ بڵێم.

– ئەمە ڕاستە، هاوڕێکەم! وەلێ مەسەلە شتێکی دیکەیە. هەڵبەتـە هەموو ئەمانە، هەر بەو جۆرەی کە تۆ دەڵێی، کاری خوا بووە، وەلێ باسەکە ئەمە نییە... ئای تاتیانا ئیڤانۆڤنای داماو! جا ئێستە هـەر مەپرسە کە چ قسەوقسـەڵۆکێکی بۆ هەڵدەبەستن!... ناڕەسـەن، ئـەی ئابنۆسکینی ناڕەسـەن! باشـە ئـەوە مـن بـۆ دەڵـێم «ناڕەسـەن»؟ ئـەی هـاوار، خـۆ منـیش بـە زەمـاوەنـدکردن لەگـەڵ ئـەودا، هـەر دەمویسـت هـەمان ئـەو کـارە ئـەنجام بـدەم!... وەڵـی ئێسـتە مـن خـەمی شـتێکی دیکەمـە... ئـەمڕۆ بیسـتت کـە ئامفیسـا پیترۆڤنـا چـیی لـە بـارەی ناستینکاوە دەگوت؟

– بەڵێ بیستم، خاڵە گیان. کەواتە خۆتان تێدەگەن کە پێویستە دەستوبردی لێ بکەن؟

خاڵە وەڵامی دامەوە:

– بـێ گومـان، بـە هـەر نرخێـك بـووە! سـاتەوەختێکی شـکۆدارە. تـەنیا، براڵـە، ئێمـە دوێنـێ حسـێبمان بـۆ شـتێ نـەکردبوو، مـن بـە درێـژایی شـەو بـیرم لـێ دەکـردەوە. ئـەی ناسـتینکا خـۆی دڵـی بـەم هاوسەرگیرییەوەیە؟... ئەمە کرۆکی باسەکەیە!

– حـەیفتان نـەکرد، خاڵـە گیـان! خـۆی گـوتی ئێـوەی خـۆش دەوێ...

– هاوڕێکەم، وەلێ دەمودەست ئەوەشی خستە سەر، کە بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ من هاوسەرگیری ناکا.

– ئاخ، خاڵه گیان! ئەمە تەنیا قسە بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێستە هەلومەرجەکە گۆڕاوە.

– تۆ وای بۆ دەچی؟ نا، براله، ئەم بابەتە زۆر هەستیارە، هەتا بڵێی هەستیارە! ئم!... دەزانی، بە درێژایی دوێشەو، وێڕای ئەوەی کە نیگەرانی بووم، وەڵێ دڵم لە خۆشیی هەستکردن بەم کامەرانییە کەوتبووە ترپەترپ!... دەی ئیدی، خواحافیز، دەبێ بڕۆم خێرا. چاوەڕێمن، درەنگ کەوتووم. تەنیا گوتم، تەنیا گوتم با پێشتر سەرێکت لێ بدەم و دوو قسەت لەگەڵ کەم.

خاڵه هێشتا نەڕۆیشتبوو کە کتوپڕ ئاوڕی دایەوە و هاواری کرد:

– وای خوایە! گرنگترین شتم لە بیر چوو! دەزانی چی بووە؟ من نامەم بۆ ئەو نووسی، بۆ فۆما!

– کەی؟

– دوێشەو. ئەم بەیانییەش بەر لەوەی خۆر لە دەم کەلەوە دەربێ، دامە ڤیدۆپلیاسۆڤ تا بیگەیەنێتە دەستی ئەو. براله، هەموو شتێکم بۆ ڕوون کردەوە، بە ڕاستگۆیی و ڕاشکاوی هەموو شتێکم لە دوو لاپەڕەدا بۆ نووسی... بە کورتییەکەی، گوتم کە دەبێ، یانی... خۆ تێدەگەی؟... گوتم دەبێ بێ بێنەوبەرە ناستینکا بخوازم. تکام لێی کرد بابەتی دیدارەکەی نێو باخ ئاشکرا نەکا و سوێندم دا بە حورمەتی کە لەم مەسەلەیەدا هاوکاری بکا تا دایە گیانیش ڕازی بکەین. براله، هەڵبەتە من دارشتنێکی باشم نییە، وەڵێ قسەی دڵی خۆمم کرد و وەک دەڵێن، بە فرمێسک نامەم نووسی...

– ئێ؟ وەڵامی نەدایەوە؟

– جارێ نا، بەس بەیانی لەو کاتەی کە خۆمان بۆ شوێنهەڵکردنەکە ئامادە دەکرد، لە سەرسەراکە چاوم پێی کەوت. هێشتا کڵاو و جلی خەوی لە بەر بوو و نالۆکیشی لە پێ بوو... ئاخر دایمە بە کڵاوخەوەوە دەنوێ... بۆ شوێنێ دەچوو. هیچی نەگوت، تەنانەت سەیریشی نەکردم. لە ڕووخساریم ڕووانی، وەك ئەوەی کە من بچووکتر بم... دەی جارێ ئەمە گرنگ نییە!

– خاڵە گیان، هیچ هیوایەکتان بەو نەبێ. ئەو تا ئەژنۆ دەتانچەقێنێ.

خاڵە دەستەکانیی ڕاوەشاندن و هاواری کرد:

– نا، نا، براڵە، قسەی وا مەکە! من بڕوام پێی هەیە. وێڕای ئەوەش، ئەمە دواهەمین هیوای منە. بێ گومان دەرکم پێ دەکا، لەم کارەدا پشتم دەگرێ. فۆما بۆڵەبۆڵکەر و مۆنە... ئەمەم قەبووڵە، وەلێ هەر کە مەسەلەی حەیا و حورمەت دێتە پێش، ئیدی ئەو وەك گەوهەر دەدرەوشێتەوە. سیریۆژا، تۆ بۆیە وا بیر دەکەیەوە، چونکە هێشتا ئەوت لەوپەڕی جوامێری و نەجیبیدا نەدیوە... وەلێ، ئای خوایە! گەر بچێ و هەر بە ڕاستی نهێنییەکەی دوێنێ ئاشکرا بکا، لە وەها دۆخێکدا... ئیدی نازانم دەبێ چی بقەومێ، سیریۆژا! ئەی لەم دونیایەدا ئیدی دەبێ باوەڕ بە چی بکەی؟ وەلێ نا، ناکرێ ئەوەندەش کەموکورت بێ. من تەنانەت نابمە خۆڵی بەر پێیشی! سەر با مەدە، براڵە، ئەمە ڕاستییە... نابم ئیدی، نابم!

کتوپڕ لە خوارەوەڕا، دەنگی ناقۆڵای پاکیزە پڕەی پێلیتسینا، کە پێدەچوو توانیبێتی هەموو گفتوگۆکەمان ببیستێت، بەرز بووەوە:

– ئیگۆر ئیلیچ! دایە گیان نیگەرانتانن، قوربان. هەموو ماڵەکەی بەدواتاندا پشکنی و نەیدۆزینەوە، قوربان.

خاڵە دڵپەرۆشانە گوتی:

– ئـەی خوایـە، درەنگـی کـرد! قوڕبەسـەر بـووم! هاوڕێکـەم، بـۆ خـاتری مەسیح جلەکانت بگۆڕە و وەرە بۆ ئەوێ! من هـەر بـۆ ئـەوە هاتمە ئێرە تـا پێکـەوە بچین... وا هـاتم بابـە، هـاتم، ئانـا نایلۆڤنـا، وا دێم!

کە بە تەنیا مامەوە، قسەکانی بەیانیی ناستینکام هاتنـەوە یـاد و بیرم کـردەوە، بـاش بـوو لـەو بارەیـەوە هیچـم بـە خاڵـە نـەگوت، دەنـا زیاتر شپرزە دەبوو. هەستم دەکرد ڕووداوێکی تۆقێنەری لەپێشدایە و نەمـدەزانی کـە خاڵـە چـۆن دەتوانـێ نەخشـەکەی بکاتـە کـردار و خوازبێنیی ناستینکا بکا. هەمدیس دەیڵێمەوە– سەرەڕای ئەوەی کە بڕوایەکی زۆرم بە جوامێریی ئەو هەبوو –کەچی نائاگایانە هەر لـەوە بەگومان بووم کە بتوانێت شتێك بە شت بکات.

بە هـەرحاڵ، دەبوو پەلە بکەم. بە ئەرکی خـۆمم دەزانـی یارمـەتیی بدەم و هەر لەبەر ئەوەش خێـرا جلـەکانم گـۆڕین، وێـڕای ئـەوەی کـە پەلـەم بـوو، وەلێ بۆ ئـەرەی جلێکـی شـیاو بپۆشـم، هێنـدەم خـاوەخاو کرد تا میزینچیکۆڤ خۆی بە ژوورەکەمدا کرد و گوتی:

– بەدوای ئێوەدا هاتووم! ئیگۆر ئیلیچ داوای کردووە خێـرا بچـن بۆ لای.

– با بڕۆین، با بڕۆین!

بـە تـەواوی ئامـادە بـووم و پێکـەوە بـەڕێ کـەوتین. بـەدەم ڕێـوە پرسیم:

– هەواڵی تازە چییە؟

میزینچیکۆڤ گوتی:

– هـەموو لـە ژوورەکـەی فۆمـادا کـۆ بوونەتـەوە. فۆمـا جـارێ ناوچـاوی تـاڵ نـەکردووە، وەك فەیلەسـووفێ دانیشـتووە و کـەم قسـە دەکا و تەنیا جارجار لەژێر لێو شتێ دەڵێ. تەنانەت ئالیۆشاشی ماچ کرد و هەڵبەتە ئیگۆر ئیلیچ بەم کارەی شاگەشکە بووە. هـەر ئـەمڕۆ بـە پـاکیزە پـرەی پێلیتسـینای گوتـووە بـە هـەمووان ڕابگەیـەنێ کـە، پێویست ناکا کەس بە بۆنەی ئاهەنگی ڕۆژی ناولێنانەوە پیرۆزبایی لێ بکا، ئەو تەنیا ویستوویەتی ئەوانی دیکە تاقی بکاتەوە... ئەو پیرێژنـەش گەرچـی هێشـتا هـەر بەردەوام ئـەلکولی لـەژێر لووتـە، وەلێ لەبەر ئەوەی فۆما جارێ ئارامە، ئیدی ئەویش ئارامە. هیچ کەسیش بـاس لـە بەسـەرهاتەکەی ئـەمڕۆ ناکـا و لـەبـەر ئـەوەی فۆمـا بێدەنگـە، هەمووان وسکتن. فۆما ئەم بەیانییە ڕێی بە کەس نەداوە بچێتە لای، گەرچی ئەو پیرێژنۆکەیە، لەو کاتانەی کە ئێمـە لێـرە نـەبووین فۆمـای بە هەموو پیرۆزییەکان سوێند داوە تا بۆ ڕاوێژ بچێتە لای، تەنانەت خۆی چووەتە پشت دەرگەی ژوورەکەشی، وەلێ ئەو دەرگەکـەی کلیل داوە و گوتوویەتی دەیەوێ دوعا بۆ مرۆڤایەتی بکا، یان شتێکی لـەم بابەتە. بێ گومان شتێکی لەپشت سەردایە. بە سەروسیمایدا دیارە. بەس خۆ ئیگۆر ئیلیچ ناتوانێ ڕووخساری خەڵکی بخوێنێتەوە، هـەر لەبـەر ئەوەشـە کـە شاگەشـکەیە و زۆر لـەوە خۆشـحاڵە کـە فۆمـا نـەرم

بووە. هەر بە ڕاستی مندالّە! بۆیە منیان ناردووە بە دواتدا، گوایە ئالیۆشا شیعرێکی ئامادە کردووە و بە تەمایە بیخوێنێتەوە.

– ئەی دەنگوباسی تاتیانا ئیڤانۆڤنا؟

– یانی چی ئەی دەنگوباسی تاتیانا ئیڤانۆڤنا؟

– لەوێیە؟ لای ئەوانە؟

میزینچیکاف ساردوسڕانە هاتە وەلاّم:

– نا، چووەتە ژوورەکەی خۆی. ڕاکشاوە شین و شەپۆرەیەتی. لەوانەشە لەبەر ئەوەبێ کە هەست بە شەرمەزاری دەکا. لام وایە ئێستە... خاتونی مامۆستا چووە بۆ لای. ئەوە چییە؟ دەلّێی بە تەمایە بیکاتە هەورەشریخە. سەیری ئاسمان کەن!

تەماشای بان سەرمم کرد. ئاسمان تاریك بووبوو. لە وەلاّمدا گوتم:

– وا دیارە زریان بە ڕێوەیە.

لەم کاتەدا، بە پلیکانی هەیوانەکەدا سەرکەوتین. جا لەبەر ئەوەی زۆر کونجکۆلّ بووبووم کە کاردانەوەی میزینچیکاف بزانم، پرسیم:

– ئادەی بزانم، ڕاتان لەسەر ئابنۆسکین چییە؟

کتوپڕ سوور هەلّگەڕا، پێی بە زەویدا کوتی و قیڕاندی:

– تەنانەت ناویشیم لە بەردەمدا مەبەن! ئەو ناڕەسەنەم بیر مەهێننەوە! گەمژە! خوێڕیی گەمژە! بیرۆکەیەکی هێندە نایاب و نەخشەیەکی ئاوا باشی لەنێو برد! گوێ بگرن، من زۆر کەر بووم کە تێنەگەیشتم سەروکاریم لەگەلّ مرۆڤێکی چەندە تەلّەکەبازدا هەیە... بە قەرمی دان بە نەفامیی خۆمدا دەنێم. لام وایە ئێوە هەر دەتانویست ئەوە ببیستن. وەلّ سوێند دەخۆم گەر بیتوانیبا شتێ بە

شت بکا، لەوانەبوو لێی خۆش بم! گەمژە، گەمژە! وەها مرۆڤانێ چۆن لەنێو کۆمەڵگەدا جێگەیان دەبێتەوە! ئاخر بۆ ئەمانە نانێرن بۆ سیبیریا! بۆ دووریان ناخەنەوە بۆ ئۆردوگای بێگارەکار؟ هەمووان درۆ دەکەن! وەلێ ناتوانن من بخەڵەتێنن! ئێستە ئیدی ئەزموونیشم هەیە و جارێکی دی تاقیی دەکەمەوە. ئێستە وا خەریکی نەخشەیەکی دیکەم... خۆتان پەسەندی بکەن، من نابێ لەبەر ئەوەی کەسێکی دی بیرۆکەکەی دزیوم و نەیتوانیوە بیگەیەنێتە ئەنجام، ئیدی دەست لە بەختی خۆم بشۆمەوە! ئەمە ویژدارندارانە نییە! خۆ تاتیانا ئیڤانۆڤنا دەبێ دواجار هاوسەرگیری بکا... هۆکاری درێژەدان بە ژیانیشی هەر ئەمەیە. گەر تا ئێستەش نەیانناردووە بۆ شێتخانە، ڕێك لەبەر ئەوەیە کە هێشتا کەڵکی هاوسەرگیریی پێوە ماوە. با باسی نەخشە نوێیەکەمتان بۆ بکەم...

قسەم پێ بڕی و گوتم:

- وا دیارە دەبێ دواتر باسی کەن، چونکە وا گەیشتین.

میزینچیکۆڤ دەم و لچی بەدەم بزەیەکی درۆیینەوە لار کردەوە و گوتی:

- زۆر باشە، دواتر باسی دەکەم! کەواتە ئێستە... ئەوە بۆ کوێ دەچن؟ خۆ پێم گوتن، دەبێ بچینە خزمەتی فۆما فۆمیچ! دوام کەون، ئێوە هێشتا نەچوونەتە ئەوێ. ئێستە چاوتان بە کۆمیدیایەکی دی دەکەوێ... چونکە بەسەرهاتەکە ئیدی هەر بە ڕاستی کۆمیدی بووە...

# وەرزی سێیەم

## ئاهەنگی ناولێنانی ئالیۆشا

فۆمـا دوو ژووری گـەورە و کـراوەی داگـیر کردبـوو و هەریـەك لـەم ژوورانـە، لـە هـەر ژوورێکـی دیکـەی نێـو خانووەکـە باشـتر بـوو. ئـەم کەسـایەتییە مەزنـە، کەشـێکی ئێجگـار هێمنـی بـۆ سـاز درابـوو. کاغەزدیواریی تازە، پەردەگەلی ڕەنگینی ئاوریشمی، چەند فەرشێك، مێزتەوالێت، کوانوو و مۆبێلمانی ڕاقی و باش، تێکڕا ئامازەیان بە سۆز و خۆشەویستیی خاوەنماڵ دەکرد بەرانبەر بە فۆما فۆمیچ. گوڵدانی پڕ لـە گـوڵ، خرابوونـە سـەر لێـواری پەنجـەرەکان و مێـزە مەڕمەڕییـە خڕەکـانی بـەردەمیان. مێزێکـی گـەورە لەناوەڕاسـتی ژوورەکەدا بوو و چەرچەفێکی سووری بەسەردا درابوو. سەر مێزەکە پڕ بوو لـە کتێـب و دەسـتنووس. مرەکەبدانێکی برۆنـزی و جۆرەهـا پێنـووس لەسـەر مێزەکـە بـوون کـە ئـەرکی ڕێکوپێکردنیـان لەسـەر شـانی ڤیدۆپلیاسۆڤ بـوو. دەبـوو تێکـڕای ئـەم شـتانە، گەواهیـدەری چالاکیی بەتینی فیکریی فۆما فۆمیچ بن. لەگەڵ ئەوەشـدا، پێویسـتە بڵێم کـە فۆما لـە مـاوەی ئـەو هەشـت ساڵەی کـە لـەوێ دەژیـا، هـیچ

شتێکی بەکەڵکهاتووی نەنووسیبوو. پاشانیش، دوای ئەوەی کە ڕووی لە دوامەنزڵگە کرد، چەند جارێك نووسراوەکانیمان ژێروژوور کردن[1] و لە کۆمەڵێك قسەی هەلەقومەلەق بەولاوە هیچی دیکە نەبوون. بۆ نموونە ئێمە بەشی یەکەمی ڕۆمانێکی مێژووییمان دەست کەوت کە پەیوەست بوو بە ڕووداوەکانی سەدەی هەژدەی *نۆوگاڕادەوە*[2]، هەروەها هۆنراوەیەکی دیکەش بە ناونیشانی *گۆشەنیشنی گۆڕستان* کە لەسەر شێوازی شیعری ئازاد نووسرابوو[3]، ئیدی مابـاقیی، توێژینەوەگەلێکی بێمانا بوون لەمەڕ *خەسڵەتەکانی وەرزێری ڕووسی* و ئەوەی کە پێویستە چۆنچۆنی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێت[4]، جا دواجار، چیرۆکێکی درێژیش لە بارەی ژیانێکی

---

١. نووسینەکانی فۆما نۆپیسکین، کە لێرەوە دەژمێردرێن، هەمووی ئەوە دەردەخەن کە ئەو لاساییکەرەوەی نووسەرانی دێرینە. ژانرە ناوبراوەکان و ناونیشانی بەرهەمەکانی ئەو، تایبەتمەندییەکی لاساییکەرەوەییان هەیە. «و. ف»

٢. لێرانەدا نووسەر ئاماژە بە ڕۆمانە مێژوویيە درۆیینەکان دەکا، چونکە شاری نۆوگاراد لە سەدەی نۆیەمدا بنیاد نراوە. «و. ف»

٣. بە پێی ناونیشانی هۆنراوەکە، دەشێ سۆسەی ئەوە بکەیت کە لاساییکردنەوەیەکی ڕووتە لە هۆنراوەی عیرفانی-فەلسەفیی کۆن و باوی سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەم، کە زۆربەیان سەروایان نەبوو (وەك هۆنراوەکانی سێرگی شیرینسکی-شیخماتۆف(١٧٨٣-١٨٣٧) و سیمیۆن بۆبرۆف (١٧٦٣-١٨١٠).

٤. داشۆرینی ئەو کتێبانەیە کە بەم ناونیشان و شێوازە نووسراون، لەنێویاندا دەتوانین ئاماژە بە وتاری *خاوەنموڵکی ڕووسی* لە (بژاردەیەك لە نامە بۆ دۆستان)ی بەرهەمی گۆگۆڵ و *نامەی لادێییەك*ی بەرهەمی کارامزین (١٨٠٢) و هەروەها، *وەسیەتنامەی لادێییەکانم و ئامۆژگارییەکی ئەخلاقی بۆ ئەوان*، بەرهەمی ئالێکساندەر شیشکۆف (١٨٤٣) بکەین.

خانەدانانە بە ناونیشانی *کۆنتیس فلۆنسکایا*[1]، کە ئەمەشیان هەر بە ناتـەواوی مـابووەوە. بـەدەر لەمانــە، هــیچ شــتێکی دیمـان دەســت نەکـەوت. لەگـەڵ ئەوەشـدا، فۆمـا فـۆمیچ خاڵـەی ناچـار کردبـوو کـە سـاڵانە بڕە پارەیـەکی زۆر لـە کڕینـی کتێـب و گۆڤـاردا خـەرج بکـات، کەچی بەشی هەرە زۆریان هێشتا هەر دەقیشیان تێك نەچووبوو. مـن خۆم، چەندان جار فۆمام لە کاتی خوێندنەوەی بەرهەمەکانی پاول دو کۆك[2] دا دیوە، هەڵبەتە لەگەڵ ئەوەی کەسێك خۆی بە ژوورەکەدا دەکــرد، ئــەو خێــرا کتێبەکــەی لــە جێیــەك دەئــاخنی. لەوپــەڕی ژوورەکەوە دەرگەیەکی شیشەیی گەورە هەبوو کە بە ڕووی حەوشەی ماڵەکەدا دەکرایەوە.

هەموران چاوەڕێی ئێمە بوون. فۆما بێدەنگ و تێفکرانە لەسەر قەنەفەیەك دانیشتبوو. کۆتێکی درێژی لە بەر بوو کە دەگەیشتە سەر پێیـەکانی، وەلێ هەمـدیس بۆینبـاخی نەبەسـتبوو. کاتێـك چـووینە ژووریێ، کەمێك بڕۆی هەڵبڕی و کونجکۆڵانە چاوێکی پێدا گێڕام. من وەك ڕێزنوێنـدێك چـەمیمەوە، ئـەویش لـە وەڵامـدا زۆر بـە ڕێـزەوە کـەمێك بـەرەو پـێش دانـەوی. داپـیرە هــەر کـە بینیـی فۆمـا فـۆمیچ ڕووخۆشانە پێشوازیی لە مـن کـرد، بزەیـەکی بەدەمەوە کـردم. ژنـەی

---

١. لە ساڵانی سییەکاندا، ژیانی خانەدانان بووبووە بابەتی نێو ژانرەکانی ئەدەبیات و تا درو دەیە دواتریش ئەم بابەتە بە تاکە بواری لاساییکەرەوەکان دەهاتە ئەژمار. لەنێویاندا دەکرێت ئاماژە بە چیرۆکی *کۆنتس پالینا* (١٨٥٦) کە بەرهەمی ژنە شاعیر و نووسەری ڕووس *ئافدۆتیا گلینکا* (١٧٩٥-١٨٦٣) بکەین. «و. ف»

٢. پارل دو کوك (١٧٩٣-١٨٧١)، ڕۆماننووسی فەڕەنسی کە بەرهەمەکانی بە ڕۆمانگەلی دزێو ناوبانگیان پەیدا کردبوو. «و. ف»

چارەڕەش کە بە هیچ شێوەیەك چاوەڕێی ئەوە نەبوو دڵخوازە بێهاوتاکەی ئاوها بە سادەیی چاو لە مەسەلەی ڕاکردنی تاتیانا ئیڤانۆڤنا بپۆشێت، کە ئەم هەر لەبەر ئەوەش بوو زووزوو لەخۆ چووبوو، ئێستە هەتا بڵێیت دڵخۆش دەردەکەوت. پاکیزە پرەی پێلیتسینا وەك هەمیشە لەپشت کورسیەکەی ئەوەوە ڕاوەستابوو و دەستە ئێسکنەکانیی لێك دەسوین و بەدەم بزەیەکی تاڵ و شەرانییەوە لێوە قەیتانیەکانیی پێك دەگوشین. لەتەنیش ژنی جەنەراڵەوە، دوو دانە لە هاودەمە نەجیب و پیرەکانی، وەك هەمیشە هێور و بێدەنگ دانیشتبوون. هەروەها ڕاهیبەیەك و یەکێك لە خانمە دراوسێکانیش، کە ژنێکی نێوانساڵ بوو و دوای ڕێوڕەسمی عەشای ڕەبانی هاتبوو تا جەژنەپیرۆزە لە ژنی جەنەراڵ بکات، لەوێ ئامادە بوون. پوورە پراسکۆڤیا ئەیلی نیچنایش قڕوقەپ لە سووچێکی ژوورەکەدا ڕاوەستابوو و بە نیگەرانییەوە سەیری فۆما فۆمیچ و دایە گیانی دەکرد. خاڵە لەسەر قەنەفەیەك دانیشتبوو و لە تاو شادییەکی وەسفهەڵنەگر ڕووخساری دەگەشایەوە. ئالیۆشا کراسێکی سووری تایبەت بە جەژنی لە بەر کردبوو و بە قژێکی لوول و تێکئاڵۆزکاو، زۆر ڕێکوپێك و کەشخە وەك فریشتەیەکی ژیکەڵە لە بەردەم خاڵەدا ڕاوەستابوو. ساشینکا و ناستینکا بە درێژییەوە هۆنراوەیەکیان فێر کردبوو تا لە وەها ڕۆژێکدا بەم سەرکەوتنە زانستییە باوکی دڵخۆش بکەن. خاڵە هێندەی نەمابوو لە شادیان بکەوێتە گریان، نەرمونیانیی چارەڕوانینەکراوی فۆما، کەیفسازیی ژنی جەنەراڵ و ڕۆژی ئاهەنگی ئالیۆشا و شیعرخوێندنەوەکەی، هێندە ئەویان خرۆشاندبوو کە بە تایبەت ناردبوویە دوام تا منیش لەم بەختەوەرییەدا هاوبەش بم و

هۆنراوەکەی ئالیۆشا ببیستم. ساشینکا و ناستینکا دەمودەست بەدوای ئێمەدا هاتنە ژوورێ و لەتەك ئالیۆشاوە ڕاوەستان. ساشینکا بەردەوام دەم بە پێکەنین بوو. لەو ساتەدا ئەویش وەك خاڵە هەستی بە کامەرانی دەکرد. ناستینکایش گەرچی چەند خولەکێك لەوەوبەر و بەر لەوەی بێتە ژوورەوە، ڕەنگپەڕیو و خەمگین دەهاتە بەرچاو، کەچی بە بینینی ناستینکا ڕووی گەشابووەوە. بەر لەوەی بێتە ئەوێ، چووبووە نهۆمی سەرێ بۆ لای تاتیانا ئیڤانۆڤنای تازەگەڕاوە تا ژێری بکاتەوە. ئالیۆشای زۆرزانیش کە نیگای دەکەوتە سەر مامۆستاکانی، لە تاو پێکەنین نەیدەتوانی خۆی ڕابگرێت. وا دەردەکەوت کە ئەو سێیانە، پێکەوە گاڵتەیەکی پێکەنیناویان سازداوە و ئێستەش دەیانەوێت ئەنجامی بدەن... هەر بە ڕاست، باخچییێڤم لە بیر چوو. ئەویش بە سیمایەکی توورە و هەڵچوو، کەمێك دوورتر لەسەر کورسییەك بێدەنگ و مۆن دانیشتبوو و هەر خەریکی پاککردنەوەی لووتی بوو. ئەو لەو ئاهەنگە خێزانییەدا، ڕۆڵی مرۆڤە قەڵس و مۆنەکانی دەگێڕا. یەژێڤیکین لەتەنیشت ئەوەوە جموجووڵی بوو. یەژێڤیکین وەك خووی هەمیشەیی خۆی بە هەموو لایەکدا وەردەسووڕاند، دەستی ژنی جەنەراڵ و بە گشتی دەستی هەر کەسێکی ماچ دەکرد کە دەهاتە ژوورێ و بە گوێی پاکیزە پرەی پێلیتسینایدا دەچپاند و کلکەلەقێی بۆ فۆما فۆمیچ دەکرد، بە کورتییەکەی، لە هەموو جێیەك ئامادە بوو. ئەویش بە هەستێکی قووڵەوە چاوەڕێی بیستنی هۆنراوەکەی ئالیۆشا بوو و لەگەڵ هاتنە ژوورەوەی مندا، هاتە پێشێ و وەك نواندنی ئەوپەڕی ڕێز و خۆشەویستی، کڕنۆشێکی برد. بە هیچ

شـێوەیەك وا دەرنەدەكـەوت كـە بـۆ ئـەوە هـاتووە تـا پشـتیوانی لـە كچەكەی بكات و لـە ستێپانچیكۆڤۆی دوور بخاتـەوە. خاڵـە هـەر كـە چاوی بە من كەوت، هاواری كرد:

- دواجار هاتی! براله، ئالیۆشا شیعرێكی ئامادە كردووە... زۆر چاوەڕواننەكراو بوو، سـوپرایزێكی ڕاستـەقینەیە! براڵـە، خـۆ مـن تووشی شۆك بوومە، هەر لەبەر ئەوەش ناردمە دوای تـۆ و نەمهێشـت شیعرەكەی بخوێنێتەوە تا تۆیش بێی... لێرە دانیشـە لای خۆمـەوە! وەرە پێكەوە گوێ بگرین. فۆما فۆمیچ، براڵـە، دانـی پێدا بنـێ... بێ چەندوچـۆن ئـەوە تـۆ بـووی بـە وەهـا كارێكـت ڕاسـپاردوون تـا پیرەمێردێكـی وەك مـن دڵخـۆش بكـەی، وا نییـە؟ سـوێند دەخـۆم كـە وایە!

بە پێـی ئـەو شـێوازەی كـە خاڵـە فۆمـا فۆمیچـی پـێ دەدوانـد، وا دەردەكەوت كە هـەموو شـتێك باشـە. وەڵێ نەگبەتییەكە ئەوە بـوو كـە خاڵـە، هـەر بـەو جـۆرەی كـە میزینچـیكۆڤ گوتبـووی، نەیـدەتوانی ڕووخسـاری فۆمـا بخوێنێتـەوە، مـن بـە یـەك سـەیركردنی فۆمـا، ئاناگایانە هاتمە سـەر قسـەكەی میزینچیكۆڤ و هەسـتم كـرد شـتێكی وای نـەماوە كارەسـاتێك بقـەومێت.... فۆمـا بـە دەنگێكـی كـز، وەك دەنگـی كەسـێك كـە وا خەریكـە لـە دژمنـەكانی دەبووریـت، وەڵامـی دایەوە:

- خـەمتان نـەبێ، سـەرهەنگ... هەڵبەتـە مـن لەگـەڵ ئـەم جـۆرە سوپرایزەدام، ئەمە نیشـاندەری هەسـت و بەرزەئاكاریـی ئێوەیـە. خـۆ شـیعریش بـێ گومـان شـتێكی سوودبەخشـە، جـا تەنانـەت گـەر بـۆ

فێربوونی گۆگردنی درووستی وشەکانیش بێ... وەڵێ ئیگۆر ئیلیچ، من ئەم بەیانییە سەرقاڵی شتێکی دیکە بووم نەك شیعر. سەرقاڵی دوعاکردن بووم... خۆ خۆتان دەزانن... هەڵبەتە ئامادەی بیستنی شیعریشم.

من لەو ساتەدا پیرۆزباییم لە ئالیۆشا کرد و ماچم کرد.

– وایە، فۆما، داوای لێ بووردن دەکەم! بیرم نەمابوو... فۆما، من بڕوام بە هاوڕێیەتیی تۆ هەیە! سێرگی، جارێکی دیکەش ئالیۆشا ماچ کە! بڕوانە چۆن بووەتە پیاوێك بۆ خۆی! دەی، ئالیۆشا، بیخوێنەوە ئیدی! لە بارەی چییەوەیە؟ هەبێ‌ونەبێ چامەیەکی نایابە لە بارەی *لامانۆساف*ەوە، ها؟

جا خاڵە قیت و شکۆدارانە دانیشت. لە خۆشخاڵییان جێی بە خۆی نەدەگرت. ساشینکا، کە بە هەزار حاڵێك بەری بە پێکەنینی خۆی گرتبوو، گوتی:

– نەخێر، باوکە گیان، لە بارەی لامانۆسافەوە نییە. لەبەر ئەوەی ئێوە سەر بە سووپا بوونە و لەگەڵ دژمناندا جەنگاون، ئەیلۆشایش شیعرێکی لە بارەی جەنگەوە ئامادە کردووە... لە بارەی گەمارۆدانی پامبارەیە، بابە گیان.

– گەمارۆدانی پامبا؟ ئەها! شتی وام بیر نایێتەوە... باشە پامبا چییە؟ سێرگی، تۆ دەزانی؟ بێ گومان لە بارەی چالاکییەکی قارەمانانەرەیە.

جا خاڵە هەمدیس جددی و قیت دانیشتەوە. ساشینکا فەرمانی بە ئالیۆشا کرد:

– بخوێنەوە، ئالیۆشا!

*نۆ ساڵی تەواو*

*پێدرۆ گۆمز...* [1]

ئالیۆشا وەك هەر منداڵێکی بچووك کە شیعرێکی لەبەرکراو بە یەك ئاواز و خێرا و بێ ڕەچاوکردنی خاڵ و فاریزە دەخوێنێتەوە، ئاوا دەستی بە خوێندنەوە کرد:

*نۆ ساڵی ڕەبەق*
*قەڵای پامبا*
*لە لایەن پێدرۆ گۆمزەوە گەمارۆ درابوو*
*جا هەموو سەربازانی دۆن پێدرۆ*
*بێ لە شیر هەموو خۆراکێکیان لە خۆ گرتەوە*
*ئەوجا نۆ هەزار سەربازی کاستیلی*

---

١. شیعری گەمارۆدانی پامبا، یەکەمین جار وەك پاشبەندێکی هەجوو لە گۆڤاری سەردەمدا بە ناونیشانی «وڕێنە ئەدەبییەکان» بە واژۆی کوزما پرۆتکۆفەوە بڵاو کرایەوە. دەستپێکی شیعرەکە، کورتتر و کەمێك جیاواز بوو. بە بۆچوونی *ڤالێری کیرپاتینی* ئەدیب و ڕەخنەگری ڕووسی (١٨٩٨–١٩٩٧)، خوێندنەوەی شیعری *گەمارۆدانی پامبا* لە ڕۆمانی بێگانەدا، وەك خوێندنەوەی شیعری «سوارچاکی بێنەوا»ی پووشکین لە ڕۆمانی داهاتووی دۆستۆیڤسکی «گەمژە»دا، ڕۆڵێکی نمایشیانەی هەیە. دۆن پێدرۆ، پاڵەوانی شیعری پرۆتکۆف، بە شێوەیەکی تەنزئامێز بە گەمارۆدان چوێنراوە. «و. ف»

*لەبەر سوێندەکەیان*
*دەمیان بە نانەوە نەدا و*
*تەنیا شیریان خواردەوە.*

خاڵە واق و وڕ لە منی دەڕوانی و گوتی:
- چۆن؟ یانی چی؟ باشە بۆ شیر؟
ساشینکا بە دەنگی بەرز گوتی:
- ئالیۆشا، ماوەی شیعرەکە بخوێنەوە.

*جا دۆن پێدرۆ گۆمز*
*بە درێژایی هەر ڕۆژێك*
*بە دزییەوە، لەژێر کۆلوانەکەیدا*
*بۆ بێدەسەڵاتیی خۆی دەگریا.*
*کە ساڵی دەیەمیش گەیشت*
*ئـەعرابانی مەراکشـــی بوونـــە جـــەنگاوەرانی بـــراوەی شەڕەکە*
*هەروەها لەنێو سوپای دۆن پێدرۆدا*
*تەنیا نۆزدە کەس مانەوە...*

خاڵە بە بێزارییەوە هاواری کرد:

– ئای لـەم هەڵیتوپەڵیتـە! وەهـا شـتێ هـەر بوونی نییـە! نـاکرێ لەشکرێکی گەورە تـەنیا نۆزدە کەسـی لـێ مابێتـەوە! هـەر بە ڕاسـت ئەمە یانی چی، براله؟

لێرانەدا بوو کە ساشینکا ئیدی خۆی پێ ڕانەگیرا و پێکەنینێکی منداڵانـەی پێدا کـرد، جـا گەرچـی بابەتەکە ئەوەنـدەش پێکـەنیناوی نـەبوو، کەچـی بـە بینینـی پێکەنینەکـەی ئـەو، نـەدەکرا پێنەکـەنی. ساشـینکا، کـە لـە تـاو ئـەم یاریـە منداڵانەیـەی خۆیـدا شاگەشـکە بووبوو، هاواری کرد:

– باوکە گیان، ئەمە شیعری گاڵتەوگەپە. نووسەر بە قەستی وای نووسیوە کە پێکەنیناوی بێ، باوکە گیان.

خاڵە بە سیمایەکی گەشاوەوە گوتی:

– ئـەها! گوتـت گاڵتەوگـەپ! کەواتـە ئەمـە شـیعری گاڵتەوگەپـە! منـیش هـەر وای بـۆ دەچـووم... ڕاسـتە، گاڵتەوگـەپ! زۆر خـۆش و پێکەنیناوییـە، تـەنیا لەبـەر ئـەو نـەزرەی کـە کردوویـەتی، هـەموو سـوپاکەی لـە برسـان بـە کوشـت داوە! نـەدەبوو وەهـا نـەزرێ بکـا! تـەنزێکی خۆشـە، وا نییـە، فۆمـا فۆمیچ؟ هـە هـە... سـەیر کـەن، دایـە گیـان، شـاعیران هەنـدێ جـار چ شـیعرگەلێکی خـۆش دەنووسـن... وا نییـە، سـێرگی؟ دەی، هـەر وا دەنووسـن ئیـدی! زۆر خۆشـە! دەی، دەی، ئالیۆشا، ئێستە ئەوی دیکەشی بخوێنەوە!

*دواتر دۆن پێدرۆ*
*ئەو نۆزدە دانەیەی کۆکردنەوە و گوتی:*
*ئەی نۆزدە هەڤاڵی من!*
*با ئاڵاکانمان بەرز کەینەوە و*
*توووند فوو بە شەیپوورەکاندا بکەین و*
*تەپڵەکان لێدەین و*
*جا لە پامبا بکشێینەوە!*
*ئێمە قەڵاکەمان نەگرت، وەلێ*
*دەتوانین ئازایانە سوێند بە شەرەف و ویژدانمان بخۆین کە*
*هەرگیز سوێندی خۆمان نەشکاند و*
*نۆ ساڵی ڕەبەق*
*بێ لە شیر دەممان بە هیچی دیکەوە نەداوە!*

خاڵە دووبارە شیعرخوێندنەوەکەی بە ئالیۆشا بڕی و گوتی:

– ئای لەو فەحۆیە[1]! کابرا دڵی بەوە خۆش بووە کە نۆ ساڵ تەنیا شیری خواردووەتەوە!... ئاخر ئەمە چ ئازایەتییەکی تێدایە؟ وا باشتر نەبوو کە ڕۆژی مەڕێکی ساغ بخوا و پیاوەکانی بە کوشتن نەدا؟ شازە! بێهاوتایە! ئێستە دەبینم کە ئەمە هەجووە، یان... چیی پێ دەڵێن؟ ئەها، تەمسیل یان شتێکی لەم بابەتە؟ جا ڕەنگە مەبەستیشی لە فەرماندەیەکی بیانی بووبێ...

١. دەربڕینێکی عەوامانەیە و بە واتای مرۆڤی بێمێشک و گێل دێت. «و. ف»

پاشان برۆی هێنایەوە یەك و چاوەكانیی زیت كردنەوە و ڕوو بە من ئەمەشی بۆ زیاد كرد:

– ها؟ تۆ ڕات چییە؟ دەی، خۆ هەجوێكی بێخەوش و ئاوڕوودارانەیە، بەر دڵی هیچ كەسێكیش ناگرێ! شازە! شاز! جا لە هەمووشی گرنگتر ئەوەیە كە زۆر ئاوڕوومەندانەیە! دەی، ئالیۆشا، بەردەوام بە!

پاشان بە هەیەجانەوە تەماشایەكی ساشینكا و بە دزیشەوە چاوێكی لە ناستینكا كرد كە سوور هەڵگەڕابوو و پێكەنین گرتبووی و، ئەوجا گوتی:

– ئاخ، لە دەستی ئێوەی زۆرزان!

*نۆزدە پیاوە كاستیلیەكە*
*بەم گوتارە ورەیان بە بەردا هاتەوە*
*جا هەمووان لەسەر زینەكانیانەوە*
*بە دەنگێكی تا ڕادەیەك نزم هاواریان كرد:*
*سانتیاگۆ دێ كامپۆس تێلا!*
*ئاوبانگ و شانازی هەر شایەنی دۆن پێدرۆیە!*
*هەر بژی شێری بەناوبانگی كاستیل!*
*وەلێ كاپلانەكەی ئەو*[1]
*–دیكۆ–*

---

١. راتە ڕۆحانیی كاتۆلیكی. لێرانەدا بە واتای قەشەی سووپا دێت. «و. ف»

*بە پەستی لە بەرخۆوە گوتی:*
*گەر من فەرماندە بام*
*نەزرم دەکرد کە تەنیا گۆشت بخۆم و*
*هەر شەرابی سانتۆرینیش هەڵدەم!*

خاڵە کە زۆر کەیفخۆش بووبوو، گوتی:

– ئاە فەرموون! خۆ منیش هەر وام گوت! شینە لەشکرێ تەنیا یەك پیاوی ژیری تێدابووە، جا ئەویش کاپلانەکەیەتی! سێرگی، باشە کاپلان چ پلەیەکە، یانی دەکاتە سەرهەنگی ئەوان؟

– ڕاهیب یان ڕۆحانیی پێ دەڵێن، خاڵە گیان.

– ئەها، بەڵێ، بەڵێ! کاپلان، یانی بە قەشەی سووپا دەڵێن؟ دەزانم، ئێستە بیرم هاتەوە! خۆ ئەمەم لە ڕۆمانەکانی *رادکلیف*[1]یشدا خوێندبووەوە. ئەوانیش لەنێو خۆیاندا پێگەی جیاوازیان هەیە، وا نییە؟... بۆ نموونە بندیکت[2]... پێگەی بندیکتیشیان هەیە، ئەرێ؟...

– بەڵێ خاڵە گیان.

– ئمم!... منیش هەر وای بۆ دەچووم. دەی، ئالیۆشا، باقیەکەی بخوێنەوە! شاز و بێهاوتایە!

---

١. ئانا رادکلیف (١٧٦٤-١٨٢٣)، ژنەنووسەری ئینگلیزی و خاوەنی ڕۆمانگەلی وەك گۆتیکی *تەلیسماوی و ترسناك*. ئەم نووسەرە لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە، لە ڕووسیادا ئێجگار بەناوبانگ بوو. «و. ف»

٢. پێگەی ڕۆحانییانی کاتۆلیك، کە بنەڕەتەکەی لە لایەن بەنی دیکت نۆرسیسکی (٤٨٠-٥٤٨) لە سەدەی شەشەمی میلادیدا دارێژرا و لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، بە شێوەیەکی بەربلاو لە ئەورووپادا برەوی سەند. «و. ف»

*دۆن پێدرۆ*
*کە ئەمەی بیست*
*بە دەنگی بەرز پێکەنی و گوتی:*
*ئادەی مەڕێکی بدەنێ*
*ئەو گاڵتەیەکی زۆر خۆشی کرد!...*

– پێکەنیناویشـە! چ گەمژەیەکـە! دواجـار بـە کارەکـەی خـۆی کەوتـە پێکـەنین! خـۆ مەڕیشـیان هـەبووە. باشـە بـۆ گۆشـتی مـەڕی نـەدەخوارد؟ دەی، ئالیۆشـا، بـەردەوام بـە! شـاز و بێهاوتایـە! زۆر تەزێنەرە!

– بێ گومان، باوکە گیان!

– ئاە! بێگومان! جا چی هەیە لەمە سەرنجڕاکێشتر بێ، وا نییـە، سێرگی؟ شاز بوو، ئالیۆشا! هـەتا بڵێی باش بوو! شیرینەکەم، وەرە با ماچت کەم! ئاخ، تۆ باوانی منی! کێ ئەم نەخشەیەی کێشاوە، ساشینکا، تۆ بووی، ئەرێ؟

– نا، کاری ناستینکا بوو. چەند سـاتێك لەمەوبـەر خـەریکی خوێندنـەوەی ئـەم شـیعرە بـووین. کـە ناسـتینکا شـیعرەکەی خوێندەوە، گوتی: *ئای کە شیعرێکی خۆشە! ئەوەنـدەی نـەماوە بـۆ ئاهـەنگی ناولێنـانی ئالیۆشـا، وەرە بـا پێـی لەبـەر کـەین و لـەوێ بیخوێنێتەوە. بێ گومان هەموان دەخاتە پێکەنین!*

خاڵە گوتی:

– یانی کاری ناستینکا بوو؟

جا کتوپڕ وەك منداڵ سوور هەڵگەڕا. پاشان درێژەی پێ دا:

– ئالیۆشا، وەرە با جارێکی دی ماچت کەم!

جا پاشان خرۆشاوانە تەماشایەکی ساشینکای کرد و لە بارێکدا کە باوەشی پێدا دەکرد، گوتی:

– ئەی فرەزان، وەرە با تۆش ماچ کەم.

دواتر، وەك ئەوەی کە ئیدی نەزانێ لە خۆشیان چی بڵێت، لەسەری ڕۆیشت:

– ساشینکا، پەلەت نەبێ، جا ڕۆژی ئاهەنگی ناولێنانی تۆش دێ.

ڕووم کردە ناستینکا و پرسیم:

– ئەم شیعرە هی کێیە؟

خاڵەش بە هەیەجانەوە پرسیی:

– بەڵێ، بەڵێ! شیعرەکە هی کێیە؟ بێ گومان لە لایەن شاعیرێکی بەرزەبیرەوە نووسراوە... وا نییە، فۆما؟

فۆما، کە بە درێژایی ماوەی شیعرخوێندنەوەکە بزەیەکی زەق و تانەئامێزی لەسەر لێو بوو، منگاندی:

– ئممم!...

ناستینکا بە ترس و لەرزەوە تەماشایەکی فۆما فۆمیچی کرد و گوتی:

– ئەوەی ڕاستی بێ بیرم چووەتەوە.

ساشینکا لە ناکاو خۆی هەڵقورتاند و گوتی:

– باوکە گیان، بەڕێز کۆزما پرۆت کۆف[1] نووسیویەتی، لە گۆڤاری *سەردەم* دا چاپ کرابوو.

خاڵە گوتی:

– کۆزما پرۆت کۆف! نایناسم. من تەنیا پووشکین دەناسم!... هەڵبەتە دیارە کە شاعیرێکی لێوەشاوەیە، وا نییە، سێرگی؟ وێڕای ئەوەش، کابرا مرۆڤێکی خانەدانیشە... وەك ڕۆژ ڕۆشنە! گەرچی لەوانەشە کابرا کەسێکی خەمۆك بێ... هەر شیاوی پیاهەڵدانە! ئەم *سەردەمە*ش گۆڤارێکی بێهاوتایە! مادام شیعری وەها شاعیرانێ چاپ دەکا، بێ گومان دەبێ پەیوەندیی پێوە بکەین... من شاعیرانم خوش دەوێن! کەسانێکی باشن! لە شیعرەکانیاندا هەموو شتێ باس دەکەن! بیرت دێ، سێرگی، کە لە پترسبورگ لە ماڵەکەی تۆدا بووم چاوم بە نووسەرێ کەوت. لووتێکی چەندە سەرنجڕاکێشی هەبوو... ئەرێ بە ڕاست!... فۆما تۆ چیت گوت؟

فۆما فۆمیچ، کە تا دەهات زیاتر بەم گفتانە دەخرۆشا، قاقایەکی بەرزی لێ دا و وەك ئەوەی کە نەتوانێت لە تاو پێکەنین خۆی کۆنترۆڵ بکات، گوتی:

---

١. کۆزما پرۆتکۆف: کەسایەتییەکی خەیاڵی و جۆرێك لە ناوی خوازراوی ئەدەبی کە شاعیرانێکی وەك *ئالێکسی* و *برایان ژێمچۆژنیکۆف* لە ساڵانی ٥٠–٦٠دا بەرهەمەکانی خۆیان لە گۆڤاری *سەردەم* و پشکۆ دا بەم ناونیشانەوە بڵاو دەکردنەوە. «و. ف»

– نەخێر، هەر وا... هیچ نییە، قوربان... بەردەوام بن، ئیگۆر ئیلیچ، بەردەوام بن! من دواتر قسەی خۆم دەکەم... ستێپان ئالێکسییڤیچ باخچیێڤیش زۆری پێ خۆشە بەسەرهاتی ئاشنابوونی ئێوە لەگەڵ ئەو نووسەرەدا ببیستێ...

ستێپان ئالێکسییڤیچ باخچیێڤ باخچیێڤ، کە بە درێژایی ئەم ماوەیە بەدەم تێفکرینەوە لە سووچێك دانیشتبوو، کتوپڕ سەری هەڵبڕی، سوور هەڵگەڕا و هەر لە هەمان باری دانیشتن لەسەر قەنەفەکە، خێرا لای کردەوە و بە چاوە ورد و گۆمەخوێنەکانیەوە سەیرێکی پڕ لە قینی فۆمای کرد و گوتی:

– فۆما، سەر مەخەنە سەرم و دەستم لێ هەڵگرن! نووسەری ئێوە چ کەڵکێکی من دەگرێ؟ من تاکە داوام لە خودا ئەوەیە کە بێوەیم کا...

جا پاشان بە منگەوە گوتی:

– ئەوجا کەی گرنگە کێیە و کێ نییە... ملی هەموو ئەمانە و... نووسەرانیش بشکێ... ئەمانە هەمووی لە پەیڕەوانی ڤۆڵتێرن!

– یژێڤیکین کتوپڕ لەتەك باخچیێڤ قوت بووەوە و گوتی:

– ڤۆڵتێری، قوربان؟ ستێپان ئالێکسییڤیچ، قسەکەتان زۆر لەجێن. لەم دواییانەدا ڤالینتین ئەیگناتیچیش بۆچوونی وا بوو. خۆ بە منیش دەڵێن ڤۆڵتێری... بە خوا بە ڕاستمە، کەچی من هێشتا، هەر بەو جۆرەی کە هەمووتان ئاگادارن، شتێکی وام نەنووسیوە،

قوربان... یانی وەك دەڵێن، شیر لە گۆزەی پیرێژندا دەترشێ... هەمووی خەتای بەڕێز ڤۆڵتێرە! ئێمە هەموو شتێکمان وایە، قوربان.

خاڵە بە ویقارەوە گوتی:

– نا! بە هەڵە لێکی مەدەنەوە! ڤۆڵتێر تەنیا نووسەرێکی توندڕەو بوو، کە قەشمەریی بە دەمارگیرەکان دەکرد، وەڵێ هەرگیز ڤۆڵتێری نەبوو! هەموو ئەم دەنگۆیانە لە لایەن دژمنانیەوە بڵاو کراونەتەوە. هەر بە ڕاست، ئەوە بۆ هەمووان ئەو داماوە تۆمەتبار دەکەن؟...

دووبارە پێکەنینی ژەهراویی فۆما فۆمیچ بەرز بووەوە. خاڵە بە نیگەرانییەوە تەماشایەکی ئەوی کرد و بە تەواوی خۆی کۆ کردەوە و جا بۆ ئەوەی خۆی بێنێتەوە، بە بارێکی ڕەنجاوانە گوتی:

– نا، دەزانی فۆما، من باسم لەم گۆڤارانە بوو... تۆ لەسەر هەق بووی کە دەتگوت پێویستە پەیوەندی بەم گۆڤارانەوە بکەین. من خۆیشم لام وایە کە پێویستە وەها کارێ بکەین! ئم... هەر بە ڕاستی دەبنە هۆی بڵاو بوونەوەی ڕۆشنبیری! چۆن دەکرێ پیاو ڕۆڵەی نیشتمانەکەی بێ و پەیوەندی بەم جۆرە گۆڤارانەوە نەکا؟ ئەی وا نییە، سێرگی؟ ئم!... بەڵێ!... لانیکەم دەبێ پەیوەندی بە سەرلەمەوە بکەین... وەڵێ دەزانی، سێرگی، بە ڕای من، گرنگترین بابەت لەو گۆڤارە ئەستوورەدا بڵاودە کرێتەوە، ناوی چی بوو؟ بەرگێکی زەردیشی هەیە...

– *یادداشتە نیشتمانییەکان*، باوکە گیان.

- بەڵێ، *یادداشتە نیشتمانییەکان*، ناوێکی چەندە باشی هەیە... ئەی وا نییە، سێرگی؟ هەر دەڵێی زمانحاڵی هەموو هاونیشتمانیانە... ئامانجێکی جوامێرانەی هەیە! گۆڤارێکی بەکەڵکە! چەندە ئەستووریشە! جا وەرە شینەگۆڤارێکی وا بڵاو بکەوە! بۆ ئەمە بە هەموو کەسێ دەکرێ؟ بابەتەکانی باس لە زانستگەلێ دەکەن کە هەر ئەوەندەی ماوە چاوەکانت لە کاسەوە بێنە دەر... هەر لەم دواییانەدا چاوم بە ژمارەیەکی کەوت، هەڵمگرت و لە کونجکۆڵیان کردمەوە، کە گەیشتمە لاپەڕەی سێیەم، خێرا خستمەوە شوێنی خۆی. براله، لە سەرسامیان دەمم بەش بووبووەوە! دەزانی، باسی هەموو شتێکی دەکرد، بۆ نموونە گسك و خاکەناز و چەمچە و کەوگیری قازان مانایان چییە؟[1] بە بۆچوونی من گسك مانای گسك

---

1. مەبەست لە وتاری ئالێکساندەر ئافاناسییێفە (١٨٦٢-١٨٧١)، مانای نەتەوەیی-دینیی *کەوێلی سلاڤەکان* ـە. لەم وتارەدا دەگوترێ:

کەوێڵ لای سلاڤەکان... تەنیا بە مانای ئاسایی ئەو، شوێنێك بۆ ژیان نەبوو، بەڵکە پەرستگەیەکی ڕازئامێز بوو کە لەوێ یەزدی موقەدەس و ئافرێنەری ناوەندی بنەماڵە دەژیا و بەم بۆنەیەوە، کۆمەڵە ڕێوڕەسمێکی پیرۆزکردنی تێدا بەڕێوە دەبرا. کەوێڵ، یەکەمین پەرستگەی نەتەوەیی بوو...

هەروەها لە درێژەیدا دەخوێنینەوە:

... کەلوپەلی موبەق و ئاگردان -شیشەی سۆبە، خاکەناز، کەوگیری مەنجەڵ، پلاییس، تاوە و... - مانای کەرەستەی قوربانی و فیداکارییان پەیدا کردبوو و تا کۆتاییەکانی سەردەمی بەرەوپێشچوونی نەتەوەیی، ئەم مانایەیان پاراست.

دۆستۆیڤسکی لە کاتی بڵاوبوونەوەی بێگانە، لە گۆڤاری کرایفسکیدا، لە ٢٠ی ئۆکتۆبەری ١٨٥٩دا، بۆ براکەی نووسی:

بۆچوونە ئەدەبییەکانی سەرهەنگ ڕۆستانێڤت لە بارەی گۆڤارەکان و فەزیلەتەکانی یاددداستە نیشتمانییەکان و ئەوانی دیکەوە لە بیرە؟ لە مەرجە بێچەندوچۆنەکانی من

دەدا و کەوگیری قازانیش هەر هەمان کەوگیرقازانە! نەخێر، برالە، دەبێ تێفکری! بۆ نموونە کەوگیری قازان لە دیدگەی زانستییەوە کەوگیری قازان نییە، بەڵکە هێمایەکە، ئێستە بیرم نایێتەوە کە کتومت چی بوو، وەلێ شتێکی لەو بابەتە بوو... بەڵێ، دەی وایە! شڕوشیتاڵی هەموو شتێکیان دەرهێناوە!

نەمدەزانی دوای ئەم قسانەی خاڵە، فۆما نەخشەی کێشاوە کتومت چ کاردانەوەیەك بنوێنێت کە هەر لەو ساتەدا سەروشکڵی گاڤریلا دەرکەوت و بە لارەملە لە بەردەرگەدا ڕاوەستا. فۆما فۆمیچ قوورسوقۆڵانە تەماشایەکی ئەوی کرد و بە دەنگێکی نزم و لێبڕاوانە پرسیی:

– گاڤریلا، هەموو شتێ ئامادەیە؟

گاڤریلا ئاهێکی هەڵکێشا و بە دەنگێکی خەمگین گوتی:

– ئامادەیە، قوربان!

– بوخچەکەشمت خستووتە نێو عەرەبانەکە؟

– بەڵێ خستم، قوربان.

فۆما لە بارێکدا کە بە شێنەیی لەسەر قەنەفەکە هەڵدەستا، گوتی:

---

ئەوەیە کە کرایێفسکی تەنانەت یەك دێڕیش لەم وتووێژانە نەسڕێتەوە. بۆچوونی سەرهەنگ ڕۆستانێڤ نابێتە مایەی ناڕەحەتی و کەمکردنەوەی کرایفسکی. کەواتە تکا دەکەم پێداگری لەم بابەتە بکە و بە تایبەت ئەمە بگەیەنە! «و. ف»

- باشە، منیش ئامادەم!

خاڵە بە سەرسوورمانەوە لێی ڕوانی. ژنی جەنەراڵ کتوپڕ لە جێوە دەرپەڕی و حەپەساو چاوی بە چواردەوریدا گێڕا. فۆما شکۆدارانە گوتی:

- سەرهەنگ، مۆڵەت بدەن بۆ ساتێ گفتوگۆ ئەدەبیەکەتان لە مەڕ چەمچە و کەوگیرەوە پێ ببڕم، دوای ڕۆیشتنی من دەتوانن درێژە بەم باسە بدەن. دەمەوێ، لەگەڵ ماڵئاوایی تاهەتاییدا، دواهەمین قسەکانی خۆمتان بۆ بکەم...

هەموو ئامادەبووان حەپەساوانە بە دڵەڕاوکێوە وشك بووبوون. دواجار خاڵە هاواری کرد:

- فۆما! فۆما! ئەوە تۆ چیتە! دەتەوێ بۆ کوێ بچی؟

فۆما خاترجەمانە گوتی:

- سەرهەنگ، دەمەوێ جێتان بێڵم. بڕیارم داوە دوور بکەومەوە و هەر بەم بۆنەیەشەوە لەسەر حسێبی خۆم عەرەبانەیەکی لادێیی سادەم بە کرێ گرتووە. وا ئێستە بوخچەکەم لەنێو عەرەبانەکەدایە، هێندەش گەورە نییە، چەند کتێبێکی دڵخواز و دوو دەستە جلی ژێرەوەم تێ کردووە... هەر ئەوەندە! ئیگۆر ئیلیچ، من کەسێکی نەدارم، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، ئامادە نیم ئاڵتوون لە دەستی ئێوە وەربگرم، وەك چۆن هەر دوێنێ ڕەدم کردەوە!...

خاڵە کە ڕەنگی وەك دەستڕی سپیی لێ هاتبوو، هاواری کرد:

– فۆما، بۆ خاتری خوا! ئەمە یانی چی؟

ژنی جەنەراڵ قیژەیەکی لێ هەستا و لە بارێکدا کە دەستی بەرەو فۆما درێژ کردبوو، بێهیوایانە لێی دەڕوانی. پاکیزە پرەی پێلیتسینا فرکەیەکی بەرەو لای ژنی جەنەراڵ کرد تا ئاگاداری بێت. هاودەمەکانی لەسەر جێگەکەیان وشك بووبوون. بەڕێز باخچییێڤ بە قەڵسی و هێوری لەسەر کورسیەکەی هەستایەوە. میزینچیکۆڤ چپەچپ لە بن گوێمدا گوتی:

– دواجار بەزمەکە دەستی پێ کرد!

لەم ساتەدا کتوپڕ شریخەی هەور لە دەرێڕا بیسترا، زریان بەڕێوە بوو.

# وەرزی چوارەم

## وەدەرنان

فۆما وەك ئەوەی کە چێژ لە ئازاردانی ئامادەبووان وەربگرێت، بە ئەرخەیانییەوە گوتی:

– سەرهەنگ، وا دیارە پرسیارتان لا درووست بووە کە بۆچی من دەڕۆم؟ باشە پێم نالێن دوای ئەو هەلومەرجەی کە هاتووەتە ئارا، ئێوە ئیدی چۆن دەتوانن سەیری ناوچاوانم بکەن؟ بەڵێ، ئەم پرسە دەروونیـەم لـە بارەی ڕووقاییمیی ئینسـانەوە بۆ ڕوون بکەنـەوە، با وەخـتێ کـە ئێـرەم جێهێشـت، دەرکێکـی تـازەم لـە بـارەی چـەپەڵیی ئینسان و ڕەچەڵەکی مرۆڤایەتییەوە هەبێ و پێی دەوڵەمەند بم.

وەلێ خاڵـه لـه دۆخێکدا نـەبوو کـه توانـای وەڵامدانـەوەی هـەبێت، تۆقیـو و وێـران، بـە دەمێکـی دادڕاو و چـاوانێکی دەرپـەڕیوەوە، لـە فۆمای دەڕوانی. پاکیزە پرەی پێلیتسینا بەدەم ناڵاندنەوە گوتی:

– ئای خوایە! وای لەم نەگبەتییە!

فۆما لەسەری ڕۆیشت:

– سەرهەنگ، ئێستە ئێوە لەوە تێگەیشتن کە دەبێ لێگەڕێن بەبێ هیچ پرسیار و وەڵامێ لێرە بڕۆم؟ منێك کە پیاوێکی بەساڵاچوو و بیرمەندم، تەنانەت هەندێ کات لە ماڵەکەی ئێوەدا خەمی ئەوەمە کە نەکا ئەخلاقی بێخەوشم بکەوێتە بەر مەترسییەوە. بڕوا کەن پرسیارەکەی ئێوە بێ لە ڕسواکردنی خۆتان هیچی دیکەی لێ سەورز نابێ.

خاڵە کە ئارەقەیەکی سارد نیشتبووە سەر تەوێڵی، قیڕاندی:

– فۆما! فۆما!...

– جا هەر لەبەر ئەوە، ئیگۆر ئیلیچ، مۆڵەت بدەن بێ هیچ ڕوونکردنەوەیەك لە بارەی ڕۆیشتنمەوە، بەر لەوەی ماڵئاواییتان لێ بکەم دواهەمین قسەکانی خۆمتان لەم ماڵەدا پێ ڕابگەیەنم. ئەمە شتێکە ڕووی داوەی و ئیدی هیچ چارەیەك لە ئارادا نییە! هیوادارم تێبگەن کە باسی کامە ڕووداو دەکەم. لەگەڵ ئەوەش، دەمەوێ لە بەردەم ئێوەدا بکەومە سەر ئەژنۆ و تکا بکەم، گەر دڵتان ترووسکەیەك لە ئینسانیەتی تێدا ماوە، ئەوا شەهوەتی خۆتان جڵەو بکەن! گەر هێشتا ئاگری ژەهری بەدئاکاری هەموو لەشی ئێوەی نەتەنیوەتەوە، بە پێی توانا دایبمرکێننەوە!

خاڵە، کە کەمتازۆر بەسەر خۆیدا زاڵ بووبوو و هەستی بە گەیشتنی ساتی بەرەنگاربوونەوە کردبوو، هاواری کرد:

– فۆما! دڵنیات دەکەمەوە کە هەڵەی!

فۆما، بە جۆرێك كە وەك بڵێیت هاوارەكەی خاڵەی نەبیستووە، بە هەمان ئەو شێوازە قورسوقۆڵانەیەوە درێژەی پێ دا:

– ئەم شەهوەتەی نێو خۆتان بكوژن... بەسەر خۆتاندا زاڵ بن، بەرێز. گەر دەتانەوێ بەسەر دونیادا زاڵ بن، ئەوا سەرەتا بەسەر خۆتاندا زاڵ بن! ئەمە رێسای هەمیشەیی منە. ئێوە كابرایەكی موڵكدارن، پێویستە وەك ئەڵماسێ لەنێو موڵكەكەی خۆتاندا بدرەوشێنەوە، كەچی بە كارە دزێوەكانی خۆتان بوونەتە نموونەیەكی دزێوی بێرەوشتی! من بە درێژایی شەو خەریكی دوعاكردن بووم بۆ ئێوە و لە رێچارەیەك دەگەڕام بۆ كامەرانیتان، كەچی هەر نەمدۆزییەوە، چونكە كامەرانیی هەر كەسێ پەیوەستە بە كردارە چاكەكانی خۆیەوە...

خاڵە هەمدیس قسەكانیی پێ بڕی و گوتی:

– وەلێ ئەمە ناچێتە ئەقڵەوە، فۆما! تۆ باش تێنەگەیشتووی و لە هەڵەدای...

فۆما هەمدیس بێ گوێدانە نارەزایی خاڵە، لەسەری رۆیشت:

– كەواتە، ئەوەتان بیر بێ كە ئێوە خودانێكن. وا مەزانن كە بەشی خودانوموودانەكان تەنیا پاڵكەوتن و رابواردنە. ئەمە تێگەیشتنێكی ترسناكە! موڵكدار نابێ تەنیا خەریكی پاڵكەوتن بێ، بەڵكە پێویستە خزمەت بە خودا و تزار و نیشتمان بكا![1].

---

١. مۆچیارییەكانی فۆما، لە ئامۆژگارییەكانی گۆگۆڵ دەچن بۆ موڵكدارانی رووسی:

باخچییێڤ بە بۆڵەبۆڵ گوتی:

– یانی چی، دەبێ منیش شان بە شانی موژیکەکان ئیش کەم؟ ئاخر من خودانم...

فۆما ڕووی لـە گـاڤریلا و فـالالی کـە تـازە سـەر و سـەکوتیان لـە بەردەرگەدا دەرکەوتبوو، کرد و درێژەی پێ دا:

– دەبـێ بـە ئێوەی خزمـەتکارانی ماڵـەوەش بڵـێم کـە گـەورەکانی خۆتان خـۆش بـوێن و دڵسـۆز و خاکەڕایانـە فەرمانـەکانیان جێبـەجێ بکەن. ئاوا لە لای گەورەکانتان خۆشەویست دەبن. ئێوە، سـەرهەنگ، لەگەڵ ئەماندا بەویژدان و نـەرمونیان بـن. ئـەوانیش مـرۆڤ و جیلـوەی خـودان، یـان وەك دەڵـێن، ڕۆڵـەکانی تـزار و نیشـتمانن کـە دراونەتـە دەسـت ئێـوە. گەرچـی ئەمـە داوایـەکی گەورەیـە، وەلێ لـە بەرانبـەردا، پاداشتێکی گەورەتر هەیە.

---

کار بکە ئەی موڵکدار، بە مانا ڕاستەقینە و شەرعییەکەی کار بکە... لە هەر پێگەیەکدا بیت، خوداوەند داوای لێ کردوویت کار بکەیت، چونکە هەر کەسەو ئەرکی سەرشانییەتی خزمەتی خوداوەند بکات، نەك ئەوەی کە کەسێکی دی لەجێی ئەو ئەرکەکان ڕاپەڕێنێت.

گۆگۆڵ لە هەمان گوتاری *موڵکداری ڕووسی*دا، سپاردەی ڕوونتریشی هەیە:

لە دەستپێکی هەر کارێکی هەرەوەزیدا با دیدگەت وا بێ کە... تۆ... لەگەڵ وەرزێردا بچیتە سەر کار و دەستپێخەر بیت و دەستخۆشی لەوانە بکەیت کە باش کار دەکەن و سەرکۆنەی ئەوانەش بکەیت کە تەمەڵن، تا ئیدی هەمووان ببزوێن و بە باشی کار بکەن... جا کە دەست دەدەیتە هەر کارێك، بەدەستوبرد و جددی بە، با هەڵسوکەوتت وا بێت کە هەمووان دڵخۆش و بەجۆش بن بە ئامادەگیت... خۆت تەور و داس بگرە دەست و... . «و. ف»

ژنـی جەنـەراڵ، کـە ئیـدی خـەریکبوو لـەخۆ دەچـوو، بێهیوایانـە گوتی:

– فۆما فۆمیچ! باوانم! ئەوە چ کارێکە دەتەوێ بیکەی؟

فۆما تەنانەت گوێی بە ژنی جەراڵیش نەدا و هاواری کرد:

– دەی، وا نـازانن ئیـدی ئەمەنـدە بەسـە؟ بـا ئێسـتە بچـینە سـەر وردەکـاری، ئیگـۆر ئیلـیچ، ڕاسـتە کـە ئـەم مەسـەلەیە لاوەکییـە، وەلێ هەرچـۆنێ بـووە پێویسـتیشـە! هێشـتا دەغـڵ و دانـی *خارینسکایای* ئێـوە درووێنــە نــەکراوە. دوای مەخــەن، درووێنــەی کــەن، تــا زووە درووێنەی کەن. ئەمە سپاردەی منە بۆ ئێوە...

– وەلێ فۆما...

– جـا سـپاردەیەکی دیکـەش: دەزانم ئێـوە بەتـەمان دارەکـانی لێـرەواری[1] ناوچـەی *زرینۆفسـکی*[2] ببڕنـەوە، وا مەکـەن، بـەڕێز. ئـەو لێـرەوارە لـەنێو مەبـەن، لێرەوارەکـان شـێی زەوی دەپـارێزن... زۆر درەنگیش کشتوکیاری بەهارانتان کرد، گەلێ جێگـەی داخـە، هـەر بـە ڕاسـتی مایـەی سەرسـووڕمانە کـە ئەوەنـدە درەنـگ کەوتنـە بـیری کشتوکیاری بەهاران!...

– وەلێ فۆما...

– دەی، ئیـدی بەسـە! هـەموو شـت بـە جـارێ نـاگوترێ، کاتمـان نییە! لە دەفتەرێکی تابەتیدا سپاردەکانم دەنووسم و بۆتـان دەنێرم. دەی، خواحافیز. خواحافیزتان بێ. ئامانەتی خوا بن!

---

١. لێرەوار: دارستان، لێڕ، جەنگەڵ، لێڕەوار، گەبەلە، هورمان، نزار.

٢. ناوچەیەکە لە باکوری خۆرهەڵاتی کازاخستان. «و. ف»

پاشان ڕووی کردە ئالیۆشا و درێژەی پێ دا:

– ڕۆڵەکەم، دوعای خێری منت لەگەڵ بێ... خوا بە دوورت کا لە شەڕی هەوەس و شەهوەتی نێو ئەم دونیایە! فالالی، دوعای خێر بۆ تۆش دەکەم، واز لە سەمای کامارینی و ئەم جۆرە شتانە بێنە!... هەروەها ئێوەش، هەمووتان... فۆما لە بیر نەکەن... دەی، گاڤریلا، با بڕۆین ئیدی! یارمەتیم بدە سوار بم، پیرەمێرد.

جا بەرەو دەرگە ڕۆیشت. ژنی جەنەراڵ قیژاندی و بە ڕاکردن کەوتە شوێن فۆما. خاڵەش دوای فۆما کەوت و دەستی گرت و قیڕاندی:

– نا، فۆما! ناهێڵم ئاوا لێرە بڕۆی!

فۆما لووتبەرازنە گوتی:

– یانی دەتانەوێ بە زۆر ڕامگرن؟

خاڵە لە بارێکدا کە هێندە پەست بوو دەنگی دەلەرزی، لە وەڵامدا گوتی:

– بەڵێ، فۆما... پێویست بکا گەر تەنانەت بە زۆریش بووە ڕات دەگرم! تۆ قسەی زۆرت کرد و دەبێ ڕوونکردنەوەیان لەسەر بدەی! فۆما، تۆ باش لە مەبەستی نامەکەی من تێنەگەیشتووی!...

فۆما، وەك ئەوەی کە چاوەڕێی ئەم ساتە بێت تا بیتەقێنێ، کتوپڕ کەلەیی بوو و هاواری کرد:

– نامەی ئێوە؟... نامەی ئێوە، ها؟ ئەوەتا، ئەوەش نامەکەی ئێوە! ئەوەتا! من ئەم نامەیە دەدڕێنم، تف دەکەمە سەر ئەم نامەیە!

نامەکەتان دەخەمە ژێر پێیەکانم و بەم کارەش پیرۆزترین ئەرکی مرۆڤانەی خۆم جێبەجێ دەکەم! گەر ئێوە بتانەوێ بە زۆر ناچارم کەن تا ڕوونکردنەوە بدەم، باشە، دەیدەم! سەیر کەن! ها، سەیر کەن! سەیر کەن! ها!...

جا پارچە کاغەزەکانی پژاندنە هەواوە و بە ژوورەکەدا پەخشی کردن. خاڵە، کە تا دەهات زیاتر ڕەنگی ڕووی دەپەڕی، هاواری کرد:

- فۆما، دووبارەی دەکەمەوە، تۆ لە مەبەستی من تێنەگەیشتووی! فۆما، من دەمەوێ بیخوازم، بەدوای کامەرانیی خۆمەوەم...

- خوازبێنی؟ ئێوە ئەم کچەتان لە خشتە بردووە و ئێستەش بە مەسەلەی خوازبێنی دەتانەوێ من بخەڵەتێنن، هەر لەبەر ئەوەی کە دوێشەو ئێوەم لەژێر ئەو دەوەنانەدا پێکەوە بینیوە؟

ژنی جەنەراڵ کتوپڕ قیژەیەکی لێ هەستا و بەسەر قەنەفەکەدا بوورایەوە. فەرتەنەیەکی سەیر درووست بوو. ناستینکای داماو وەك مردوو ڕەنگی سپی هەڵگەڕا و بێ جووڵە دانیشتبوو. ساشینکاش بە تەواوی ترسابوو و لە بارێکدا کە باوەشی بە ئالیۆشادا کردبوو، لە ترسان هەڵدەلەرزی. خاڵە بە تووڕەییەوە قیڕاندی:

- فۆما گەر ئەم نهێنییە ئاشکرا کەی، ئەوا چەپەڵترین کارت کردووە!

فۆما بە زیقەزیق گوتی:

- ئەسڵەن گەر ئەم نهێنییە ئاشکرا کەم، ئەوا جوامێرانەترین کارم کردووە! بگرە خودا هەر لە بنەڕەتەوە منی بۆ ئەوە ناردووە تا

سەرلەبەری چەپەڵکارییەکانی دونیا ئاشکرا کەم! من ئامادەم بچمە سەر بانی کاگڵیی خانووێکی لادیی و لەوێوە جاڕ بدەم و کارە ناشیاوەکانی ئێوە بە گوێی هەموو موڵکدار و ڕێبوارەکاندا بدەم!... بەڵێ، هەمووتان بزانن، هەمووتان بزانن کە نیوەشەوی ڕابردوو لە باخدا، ئەم پاکیزەیەم کە بە ڕووالەت لە کەسێکی پاك دەچێ، لەگەڵ ئەو بەڕێزە لەژێر دەوەنەکاندا بینیوە!...

پاکیزە پرەی پێلیتسینا قیژاندی:

– وای، لەو ڕسواییە!

خاڵە، کە لە ڕقان چاوەکانی دەبریقانەوە و دەستەکانیی کردبوونە مشتەکۆڵە، قیراندی:

– فۆما! گەمە بە ژیانی خۆت مەکە!

فۆما هاواری کرد:

– جا ئێستەش لە ترسان هاتووە ئەم درۆیانەی لە نامەدا بۆ من نووسیوە تا چاوپۆشی لە تاوانەکەی بکەم... بەڵێ، ئەم کارە تاوانە!... چونکە ئێوە پاکیزەیەکی ئێجگار بەڕەوشت و پاکتان کردە...

– فۆما گەر یەك قسەی سووکایەتیئامێزی دی لە بارەی ئەم کچەوە بڵێی دەتکوژم، سوێند بێ دەتکوژم!...

– من ئەو قسەیەش دەکەم، چونکە ئێوە ئەم پاکیزە بەڕەوشت و پاکەتان کردە کچێکی داوێنپیس!

هەر کە فۆما ئەم قسەیەی لە دەم دەرچوو، خاڵە دەستی دایە شانی و وەك بەستە پووشێك وەری سووڕاند و بە هێزەوە بەرەو ئەو

دەرگە شیشەییەی فڕێ دا کە بە ڕووی حەوشەدا دەکرایەوە. گورزەکە هێندە بەهێز بوو کە دەرگە بە تەواو کرایەوە و فۆما بە تەپاوتلە کەوتە سەر پلیکانە بەردینەکانی هەیوان و گرمۆڵە بووە نێو حەشەکە. شیشەکەش شکا و هاڕەی کردە سەر پلیکانەکان. خاڵە، کە ڕەنگی وەك هی تەرمێك سپی بووبوو، هاواری کرد:

- گاڤریلا، بەرزی کەوە و بیخە سەر عەرەبانە. دەمەوێ تا دوو خولەکی دی لە ستێپانچیکۆڤۆ پێوار بێ!

نەخشەی فۆما فۆمیچ هەرچییەك بووبێت، بێگومان چاوەڕێی کاردانەوەیەکی لەو جۆرە نەبوو.

توانای باسکردنی ئەو دۆخەم نییە کە دەمودەست دوای ئەو ڕووداوە هاتە ئارا. ناڵینی جەرگبڕی ژنی جەنەراڵ، کە بەسەر قەنەفەکەدا کەوتبوو، واقوڕمانی پاکیزە پرەی پێلیتسینا کە لە بەرانبەر ئەم هەڵسوکەوتە چاوەڕوانینەکراوەی خاڵەدا کە تا ئەو ڕۆژە دایمە ملکەچ بوو، ئاخ و ئۆخی هاودەمەکان، ناستینکا، کە زیرەی مەرگی کردبوو، جا باوکی: کە بە دەوریەری ئەودا کردوکۆشی بوو: دواجار شیوەنی فالالی بۆ خودانەکانی، هەموو ئەمانە تابلۆیەکی وێنانەکراویان ساز دابوو. هەروەها، پێویستە ئەوەشی بۆ زیاد بکەم کە لەم ساتەدا هەورەگرمە و بروسکەیەکی بەهێز دەستی پێ کرد، دەنگی هەورەگرمە تا دەهات زیاد و زیادتر دەبوو و دڵۆپە بارانی درشت بەر پەنجەرەکان دەکەوت.

بەڕێز باخچییێڤ بە سەری کز و دەستی ئاوەڵاوە بۆڵاندی:

– دە فەرموو، ئەوەش ئاهەنگ!

منیش لە بێتاقەتیان گێژ بووبووم و لەژێر لێو ورتاندم:

– دۆخەکە باش نالّێ! وەڵێ هەر چۆنێ بووە فۆما فۆمیچیان وەدەر ناوە و بێ گومان ئیدی ناشچنە دوای.

خاڵە لە بەردەم کورسیی پیرێژندا ڕاوەستابوو و دەیپرسی:

– دایە گیان! هاتنەوە سەرخۆ؟ حاڵتان باشتر بوو؟ دواجار دەتوانن گوێ بۆ قسەی من بگرن؟

پیرێژن سەری هەڵبڕی و بە بارێکی مەیلەوپاڕانەوەوە تەماشای کوڕەکەیی کرد کە تا ئەو ساتە ئاوا هەڵنەچووبوو. خاڵە درێژەی پێ دا:

– دایە گیان! لەوە زیاتر خۆم پێ ڕانەگیرا، خۆ خۆتان ئاگادار بوون. من نەمدەویست ئاوا مەسەلەکە بخەمە بەر باس، وەڵێ لە ئەم دۆخەدا، ئیدی هیچ هۆکارێ نابینم بۆ دواخستن! ئێوە بوختانەکەتان بیست، دە ئێستەش گوێ لە پاساوی من بگرن. دایە گیان، من ئەم پاکیزە سەلار و باشەم خۆش دەوێ، زۆر دەمێکە خۆشم دەوێ و هەرگیز ئەوینی ئەوم لە دڵ دەرناچێ. ئەو منالّەکانم بەختەوەر دەکا و بۆ ئێوە دەبێتە کچێکی شاییستە، هەر لەبەر ئەوەش دەمەوێ لە بەردەم ئێوە و سەرلەبەری دۆست و نزیکاندا خۆم بخەمە بەر پێی و داوا بکەم ئەو شانازییەم پێ ببخەشێ و داخوازیی هاوسەرگیریم قەبووڵ بکا.

ناستینکا، کە ڕاچەنی بوو و ڕووخساری سوور هەڵگەڕابوو، بە پڕتاو لەسەر کورسیەکە هەستا. ژنی جەنەراڵ بۆ ماوەیەك کاس و گێژ لە کوڕەکەی وڕ ما، دەتگوت هەر ناشزانێت باسی چی دەکات و کتوپڕ بە ناڵەیەکی خەفەتاوییەوە لە بەردەم کوڕەکەیدا کەوتە سەر ئەژنۆ و هاواری کرد:

– ئیگۆرۆشکا، کوڕەکەم، باوانەکەم، فۆما فۆمیچ بگەڕێنەوە! هەر ئێستە بیگەڕێنەوە! دەنا من بێ ئەو ناگەمە ئێوارە و دەمرم!

خاڵە وەختێك تەماشای کرد دایکە لاسار و هەوەسبازەکەی لە بەردەمیدا کەوتووەتە سەر چۆك، واقی وڕما و ئاسەواری ئازار لە ڕووخساریدا دەرکەوت، دوای تێپەڕینی ساتێك، هاتە سەر خۆی و خێرا چووە پێش تا هەڵی بستێنێ و لەسەر کورسیەکەی دایبنیشێنێتەوە. پیرێژن بەدەم شیوەنەوە درێژەی پێ دا:

– ئیگۆرۆشکا، فۆما فۆمیچ بگەڕێنەوە! ئازیزەکەم بگەڕێنەوە! من بێ فۆما دەمرم!

خاڵە بە قەڵسییەوە هاواری کرد:

– دایە گیان! بۆ نەتان بیست ئێستە چیم گوت؟ من ناتوانم فۆما بگەڕێنمەوە... لەوە تێبگەن! ناتوانم و مافی ئەوەشم نییە دوای ئەو بوختانە ناشیرین و پیسەی کە بۆ ئەم فریشتەی ئاوڕوو و پاکییەی کرد، بیگەڕێنمەوە. دایە گیان، ئێوە پێویستە تێبگەن کە من ناچارم و شەرەف وا دەخوازێ کە بەرگری لە ئاوڕووم بکەم! خۆ بیستتان...

من خوازبێنیم لەم کچە کرد و داواتان لێ دەکەم بە هاوسەرگیریی ئێمە قاییل ببن و دوعای خێری خۆتانمان لێ نەگرنەوە.

ژنی جەنەراڵ دووبارە لە جێگەکەی هەستایەوە و لە بەردەم ناستینکادا کەوتە سەر ئەژنۆ و بەدەم قیژەقیژەوە گوتی:

- دایکە گیان! نازدارەکەم! ئەرێی بۆ نەکەی[1]! زەماوەندی لەگەڵ مەکە، باوانم، داوای لێ بکە فۆما فۆمیچ بگەڕێنێتەوە! ناستاسیا یۆگرافاونا، تۆ ئازیزی خۆمی! هەموو شتێکت دەدەمێ، گەر زەمامەوەندی لەگەڵ نەکەی، هەرچیم هەیە دەیخەمە ژێر پێت. من پیرێژنێکی نەدار نیم، هێشتا هەندێ شتم لەو رەحمەتییەوە بۆ ماوەتەوە. هەمووی بۆ تۆ، دایکە گیان، هەموویت پێ دەبەخشم. ئیگۆرۆشکاش شتانێکی زۆرت پێدەبەخشێ، تەنیا بە زیندوویی مەمخەنە نێو تابووت، داوای لێ بکە فۆما فۆمیچ بگەڕێنێتەوە!...

جا گەر پەرەی پێلیتسینا و هاودەمەکان، کە بە شیاویان نەدەزانی ئەو لە بەردەم مامۆستایەکی ماڵدا بکەوێتە سەر ئەژنۆ، بە قیژوهوورەوە نەڕژابانە سەری و بەرزیان نەکردباوە، پیرێژن هەروا درێژەی بە تکاولاڵە[2] دەدا. ناستینکا لە ترسان کەمێک خۆی کشاندە دواوە. پەرەی پێلیتسینا، کە لە تاو رق کەوتبووە گریان، بەسەر خاڵەیدا شاتاند:

---

١. ئەرێ بۆکردن یان نەکردن، واتە قاییلبوون یان نەبوون بە هاوسەرگیری لەگەڵ کەسێک.

١. تکاولاڵە، پاڕانەوەی یەک لەسەر یەک لەگەڵ گریاندا.

– ئێوه دواجار سەری دایکتان دەخۆن، دواجار ئەو بە کوشتن دەدەن! ناستاسیا یۆگرافاونا، جوان نەبوو ئێوەش ئاوا نێوانی دایك و کوڕ تێك بدەن، خوا هەڵناگرێ...

خاڵە قیڕاندی:

– ئانا نایلۆڤنا، ئاگاتان لە دەمتان بێ! تا کەی دەبێ بە دەستتانەوە ئازار بکێشم؟...

– ئەوە منم کە بەدەست ئێوەوە ئازار دەکێشم، قوربان. بۆچی من هەر لەبەر ئەوەی کە هەتیوم دەبێ سەرکۆنە بکرێم؟ تا کەی دەتانەوێ ئاوا لە کچێکی هەتیو بکەن؟ خۆ من کۆیلەی ئێوە نیم، قوربان! منیش بۆ خۆم کچە سەرگوردێکم! ئیدی پێ نانێمەوە نێو ئەم ماڵە، بڕاوبڕ... هەر ئەمڕۆ دەچم، قوربان!...

وەلێ خاڵە هیچ گرنگییەکی بەوان نەدا. چووە لای ناستینکا و بە ڕێزەوە دەستی گرت و خەفەتاوی و کەمتازۆر بێهوایانە تەماشای کرد و گوتی:

– ناستاسیا یۆگرافاونا! ئێوە پێشنیاری هاوسەرگیرییەکەمتان بیست؟

ناستینکا، کە ئەویش لە دۆخێکی هێندە باشدا نەبوو، هاتە وەلام:

– نا، ئیگۆر ئیلیچ، نا! وا باشە هەر باسیشی نەکەین.

جا لە بارێکدا کە دەستی ئەوی دەگوشی و فرمێسکی دەڕشت، درێژەی پێ دا:

– بێسوودە! ئێوە لەبەر ڕووداوەکەی دوێنێ وا دەڵێن... وەلێ ئەمە دژوارە، خۆ خۆتان دەبینن. ئیگۆر ئیلیچ، ئێمە هەڵەمان کرد... من هەمیشە ئێوە بە نانبدەیەکی خۆم دەزانم و... تاهەتا، تاهەتا دوعای خێرتان بۆ دەکەم!...

لێرانەدا ئیدی دایە پرمەی گریان و قسەکەی بڕی. خاڵەی بەستەزمان چاوەڕێی وەڵامێکی لەو جۆرە نەبوو، تەنانەت ملەجیڕەشی[1] نەکرد و هەوڵی نەدا قایلی بکات... هێشتا هەروا دەستی ناستینکای لەنێو دەستدا بوو و خەمۆکانە بەرەو لای ئەو چەمیبووەوە و گوێی بۆ قسەکانی دەگرت. ناستینکا درێژەی پێ دا:

– هەر دوێنێش پێم گوتن کە ناتوانم ببمە هاوسەری ئێوە. وا دەبینن کە بنەماڵەکەتان منیان ناوێ... من زۆر لە مێژە هەستم بەوە کردبوو، دایکی ئێوە لەگەڵ هاوسەرگیریەکەی ئێمەدا نییە و دوعای خێرمان بۆ ناکا... *ئەوانی دیکەش* هەر وا. ئێوەش ئەگەرچی لە داهاتوودا پەشیمان نەبنەوە، ئاخر ئێوە مرۆڤێکی بەرزەئاکارن، وەلێ هەرچۆنێ بووە لەبەر من... بەو دڵە باشەتانەوە چارەڕەش دەبن...

باوکە پیرەکەی، کە لەولای قەنەفەکەوە ڕاوەستابوو، وەک پاڵپشتیکردنی قسەکەی گوتی:

---

١. ملەجیڕەکردن: ملەجیڕەکەرەدەی، ئینکاریکردن، جەختکردنەوە و سووربوون لەسەر داوا یان ئەنجامدانی شتێک.

– کتومت، بەو دڵە باشەوە! ڕاستە، ئەوان دڵێکی باشیان هەیە! هەروایە، ناستینکا، وایە! کتومت، ئاماژەت بە وشەیەکی شیاو کرد.

ناستینکا لەسەری ڕۆیشت:

– من نامەوێ ناکۆکی بخەمە ماڵەکەتانەوە. ئیگۆر ئیلیچ، خەمی منتان نەبێ! کەس ئازار بە من ناگەیەنێ، هیچ کەسێ بێتاقەتم ناکا... دەچمەوە بۆ لای باوکم... هەر ئەمڕۆ دەچمەوە... ئیگۆر ئیلیچ، وا باشە ماڵئاوایی بکەین...

جا فرمێسکەکانی ناستینکای داماو هاتنە خوارەوە. خاڵە بە بێهیواییەکی وەسفهەڵنەگر سەیری ئەوی کرد و گوتی:

– ناستاسیا یۆگرافاونا! ئەمە قسەی ئەخیرتانە؟ ئێوە تەنیا یەك وشە بڵێن... ئەوسا هەموو شتێکتان بە قوربان دەکەم!...

یژێڤیکین هەمدیس پەڕییەوە نێو قسەکانی و گوتی:

– بەڵێ، جەنابی ئیگۆر ئیلیچ، ئەمە قسەی ئەخیریەتی! خۆ ناستینکا، زۆر بە باشی هەموو شتێکی ڕوون کردەوە، دەبێ دانی پێدا بنێم کە تەنانەت منیش چاوەڕێی ئەوە نەبووم. قوربان. ئیگۆر ئیلیچ، ئێوە میهرەبانترین مرۆڤی سەر زەوین، بەڵێ، ڕێك میهرەبانترین مرۆڤ! هەروەها پیاوەتییەکی بێکۆتاشتان لەگەڵ ئێمەدا کردووە! بێکۆتا، هەر بە ڕاستی بێکۆتا!... وەلێ هەر چۆنێ بووە، ئیگۆر ئیلیچ. ئێمە هاوشانی یەکدی نین. ئیگۆر ئیلیچ، ئێوە پێویستە لەگەڵ کەسێکدا هاوسەرگیری بکەن کە دەوڵەمەند و ناسراو و جوان بێ، هەروەها دەنگێکی خۆشیشی هەبێ، بە سەراپای ڕازاوە

و داپۆشراو بە پەڕی وشترمرغەوە هەنگاو بنێتە نێوماڵەکەتان، قوربان... ئەوسا ڕەنگە فۆما فۆمیچیش سەر بهێننە ڕاستە... هەروەها لە دوعای خێریش بێبەشتان نەکەن! ئێوەش بچن فۆما فۆمیچ بێننەوە! لە خۆڕا ئەوتان تۆراند، قوربان! ئاخر ئەو پیاوێکی جوامێرە، ئەوە ئێستە لە تاو تووڕەیی ئەوەی بە دەمدا هات... خۆشتان دواتر بۆتان دەردەکەوێ کە پیاوێکی جوامێرە... ئێستە دەیبینن، قوربان! پیاوێکی باشە. داماوە ئێستە دەخووسێ... ئیدی وا باشە بیگەڕێننەوە... دواجار هەر وا دەکەن، قوربان...

کتوپڕ ژنی جەنەراڵ هاواری کرد:

– ئەو بێنەوە! بیهێنەوە! ڕاست دەکا، باوانەکەم!...

یژێڤیکین لەسەری ڕۆیشت:

– بەڵێ، قوربان! وا دایکیشتان بە بەلاش خۆیان ئازار دەدەن، قوربان... ئەو بێننەوە! من و ناستینکاش تا ئەو کاتە ئیدی ڕۆیشتووین...

خاڵە هاواری کرد:

– بوەستە، یۆگراف لاریۆنیچ! تکا دەکەم! تەنیا یەك قسەی دی، یۆگراف، تەنیا یەك قسە دی...

ئەمەی گوت و چووە سووچێکی ژوورەکە و لەسەر قەنەفەیەك دانیشت، سەری دانەواند و بە چەشنێك دەستەکانیی نان بە نێوچاوانییەوە کە وەك بڵێیت لە فکردا قووڵ بووبێتەوە. لەم ساتەدا، ڕێك وەك ئەوەی لەسەر بانەوە بێت، دەنگی تۆقێنەری هەورەتریشقەیەك هەستا. هەموو بینانەکەی لەراندەوە. ژنی جەنەراڵ قیژاندی، پەرەی پێلیتسیناش هەر وا. هاودەمەکان، کە لە ترسان

حەپەسا بوون، پەلەپەل خاچیان دەکێشا، بەڕێز باخچییڤیش چووە ریزیانەوە. ورتەورتی پێنج شەش کەسێك دەبیستڕا کە پێکڕا دەیانگوت:

– یا ئیلیاسی پەیامبەر!

دوای هەورەتریشقەکە، دەمودەست وەها بارانێك دایکرد کە دەتگوت لە کتوپڕێکدا دەریاچەیەك بەسەر ستێپانچیکۆڤۆدا قلّپ بووەتەوە.

پاکیزە پرەی پێلیتسینا بەدەم قیژاندنەوە گوتی:

– ئای فۆمای بەستەزمان، ئاخۆ ئێستە لە دەرەوە چ بەلاّیەکی بەسەر هاتبێ؟

ژنی جەنەراڵ وەکو شێت بەرەو دەرگە فڕکەی کرد و بێهیوایانە نالاّندی:

– ئیگۆرۆشکا، تکا دەکەم بیهێنەوە!

هاودەمەکان بەردەم ئەویان گرت و دەورەیان لێ دا، بەدەم دڵنەوایکردنییەوە، دەیاننالاّند و شیوەنیان دەکرد. بە کورتییەکەی، حەشرێکی سەیر بەرپا کرابوو!

پرەی پێلیتسینا درێژەی پێ دا:

– تەنیا کۆتێکیشیان لە بەر بوو، بریا لانیکەم کۆڵوانەیەك شتێکیان لەگەڵ خۆیان دەبرد! سەیوانیشیان هەڵنەگرت. ئێستە هەورەبرووسکەیەك شەتێ دادەدا و فۆما دەکوژێ!...

باخچییڤیش سەری قسەی گرتە دەست:

– بێ گومان دەکوژرێ! لەژێر باران دەبێتە مشکی خووساو.

بە گوێیمدا ورتاند:

- لانیکەم ئێوە بێدەنگ بن!

باخچییێڤ بە تووڕەیی گوتی:

- دواجار ئەویش مرۆڤە... خۆ سەگ نییە. گرەو دەکەم تۆ خۆت لەو کەشەدا ناچیتە دەرێ. ئا بچۆ ئاوێ بە خۆتدا بکە تا حاڵی ببی.

من ئەنجامی مەسەلەکە ترساندمی و چوومە لای خاڵە کە لەسەر قەنەفەکەی وشك بووبوو. سەرم لە گوێی نزیك کردەوە و بە هێواشی گوتم:

- خاڵە گیان، یانی ئێوە هەر بە ڕاستی دەچنە ژێر باری داوای گەڕاندنەوەی فۆما؟ ئەوە بزانن کە ئەم کارە هەڵەیەکی زەقە، بە تایبەت تا ئەو کاتەی کە ناستاسیا یۆگرافاونا لێرەیە.

خاڵە سەری هەڵهێنا و بڕوابەخۆبووانە چاوی لە چاوم بڕی و هاتە وەڵام:

- هاوڕێکەم، لەم چەند خولەکەدا خۆم یەکلایی کردەوە و ئێستە دەزانم دەبێ چی بکەم! خەمت نەبێ، ناستینکا هیچ ئازارێکی پێ ناگا... باش دەزانم پێویستە چی بکەم...

جا هەستایەوە، چوو بۆ لای دایکی و گوتی:

- دایە گیان! بێخەم بن، من فۆما فۆمیچ دێنمەوە. هەر خۆشم دەچمە دوای، پێناچێ زۆر دوور کەوتبێتەوە. وەڵێ سوێند دەخۆم کە تەنیا بە یەك مەرج دەتوانێ بگەڕێتەوە، دەبێ لێرە و لە بەردەم هەموو ئەو کەسانەی کە بوختانەکەیان بیست، دان بە گوناحی خۆیدا بنێ و بە فەرمی داوای لێبووردن لەم پاکیزە نەجیبە بکا. ئەمە داخوازیی منە! ناچاری دەکەم ئەوە بکا!... دەنا ئیدی هەرگیز بۆی نییە پێ بخاتەوە نێو ماڵەکەی من! دایە گیان، لە بەردەم ئێوەشدا

سوێند دەخۆم، گەر بە ئارەزووی خۆی ئەوە قەبووڵ بکا، ئەسڵەن ئامادەم خۆم باوێمە بەر پێی و هەموو شتێکی خۆمی پێشکەش بکەم، هەڵبەتە تا ئەو جێیەی کە مافی ڕۆڵەکانم نەخورێ! خۆشم هەر لەمڕۆوە واز لە هەموو شتێ دێنم. ئەستێرەی بەختی من ئاوا بووە! ستێپانچیکۆڤۆ جێدێڵم. هیوادارم ئێوەش لێرە بە خۆشی و ئارامی بژین. من دەچمەوە ڕیزی کەتیبەکەی خۆم لە سووپا و لە گۆڕەپانی ململانێدا دەجەنگم و خەریکی بەسەربردنی ڕۆژگاری تاڵی خۆم دەبم... ئیدی بەسە! دەبێ بڕۆم!

لەم ساتەدا دەرگە کرایەوە و گاڤریلا، کە بە تەواوی تەڕ و پیس بووبوو، لە بەردەم ئەو کۆمەڵە سەراسیمەیەدا دەرکەوت. خاڵە بەرەو لای گاڤریلا پڕتاوی کرد و قیڕاندی:

- چی بوو؟ تۆ بۆچی تۆ گەڕایەوە؟ ئەی کوا فۆما؟

هەمووان بەدوای خاڵەدا ڕایان کرد و کونجکۆڵانە دەوری پیرەمێردەکەیان گرت. ئاوێکی پیس بە سەر و گوێلاکی گاڤریلای دەربەدەردا جۆگەلەی بەستبوو. لەگەڵ هەر وشەیەکیدا، هەر ئاه و ناڵە بوو و لە چواردەورەکەی بەرز دەبووەوە. گاڤریلا خەفەتبارانە گوتی:

- فۆما لە دووریی وێرستا و نیوێك لێرەوە و لای بێشەکەوە گیریان خواردووە. ئەسپەکە لەترسی هەورەشریخە تەرە بوو و بەرەو لای کەندار کەوتە غار.

خاڵە قیڕاندی:

- ئێ...

- ئێ، عەرەبانەکەش وەرگەڕا...

– ئەی... فۆما چیی لێ هات؟

– کەوتە نێو کەنداوەکە.

– ئا ڕێك بڵێ بزانم چی بووە، دیقت پێ کردین!

– لاتەنیشـتی ئـازاری پێگەیشـت و پـڕ بـە گـەرووی نالآنـدی، قوربان.

– ئێستە فۆما لەوێ جێماوە؟

– هەستایەوە و بە گاڵۆك کەوتە ڕێ.

ئەمەی گوت و ئاهێکی هەڵکێشا و سەری دانەواند. شیوەن و ئاه و ناڵەی ژنانی ئەو کۆڕە لە وەسف بەدەر بوو. خاڵە بەدەم ڕاکردنەوە، هاواری کرد:

– پولکان ئامادە کەن!

خێـرا پولکانیـان هێنـا و خاڵـە پەڕیـە سـەر ئەسـپی بێـزین و بـۆ ساتێك دواتر، بە دەنگی سمی ئەسپەکەدا دەرکەوت کە خاڵە بەدوای فۆما فۆمیچدا دەچێت. بێ ئەوەی تەنانەت کلاوێکیش لە سەر بکات، بە غار کەوتە ڕێ. خانمان فڕکەیان کردە پشت پەنجەرە. بەدەم ئاه و ناڵەوە هەندێك کاریشیان بە یەکدی ڕادەسپارد. باس باسی گەرماو و پاشـۆری بـە ئـەلکول و ئامـادەکردنی جۆشـانە بـوو لەگـەڵ ئـەوەی کـە فۆما فۆمیچ *لـە بەیانییـەوە تیکـە نانێکیـان نـەخواردووە و بـەڕێڤوون*. پاکیزە پرەی پێلیتسینا چاویلکەکەکەی فۆما فۆمیچـی دۆزییـەوە کـە لەگـەڵ چاویلکەدانەکەی جێمابوو و ئەمـەش بـووە هـۆی ئـەوەی کـە خەفەت دایان بگرێت، ژنی جەنەراڵ بە ئاه و ناڵـە هـەڵی گرتـەوە و لـە بارێکدا کە بە دەستیەوە گرتبوو، دووبارە بەرەو لای پەنجەرەکە چوو و نیگا چاوەڕێکەی لە شەقام بڕی.

دواجار چاوەڕوانی کۆتایی هات... لە سووچێکدا ساشینکا خەریکی دڵنەواییکردنی ناستینکا بوو، ئەوان یەکیدییان لە باوەش کردبوو و فرمێسکیان دەڕشت. ناستینکا دەستی ئالیۆشای گرتبوو و بەدەم ماڵئاواییکردنەوە ماچی دەکرد. ئالیۆشایش بە کوڵ کەوتبووە گیریان، بێ ئەوەی خۆیشی بزانێت بۆچی دەگریێ. لە لایەکی دیکەوە یژێڤیکین و میزینچیکۆڤ لەسەر بابەتێك مشتومڕیان بوو. باخچییێڤیش بە چەشنێك لە کچەکانی دەڕوانی کە دەتگوت هاکا کەوتە گریان. چوومە لای. کتوپڕ گوتی:

– نەخێر، بەڕێز گیان، فۆما فۆمیچ بەم زووانە ئێرە جێناهێڵێ، ئاخر هێشتا کاتی نەهاتووە، خۆ هێشتا گای شاخزێڕینیان بە گالیسکەکەیەوە نەبەستووە! بێخەم بن، بەڕێز گیان، خاوەنانی ئەم ماڵە دەردەپەڕێنێ و خۆی دەبێتە خاوەنماڵ.

زریان خۆشی کردبووە و وا دیاربوو بەڕێز باخچییێڤ بۆچوونی گۆڕابوو. کتوپڕ کەسێك هاواری کرد:

– هێنایانەوە! هات!

جا خانمان بەدەم قیژەهووڕەوە بەرەو دەرگە ڕایان کرد. هێشتا دە خولەکێك بەسەر ڕۆیشتنی خاڵەدا ڕانەبردبوو و نەدەکرا ئاوا زوو فۆما فۆمیچ بهێننەوە. هەڵبەتە ئەم مەتەڵە دواتر بە ئاسانی هەڵهێنرا: فۆما فۆمیچ، دوای ئەوەی کە گاڤریلای ناردبووەوە، بە گاڵۆکەوە کەوتبووە ڕێ تا بڕوا، وەلێ کە لەنێو ئەو زریان و هەورەتریشقە و برووسکە و لێزمەبارانەدا تەنیا مابووەوە، ترسێکی زۆری لێ نیشتبوو و جا بەرەو ستێپانچیکۆڤۆ بای دابووەوە و بەدوای

گاڤریلادا کەوتبووە ڕاکردن. هەر لەبەر ئەوەش خاڵە لەنێو ئاواییدا تووشی هاتبوو. لەو کاتەشدا عەرەبانەیەك ڕادەگرن کە بەو ناوەدا ڕادەبووریێت، جا بە یارمەتیی وەرزێرەکان، فۆمای دەستەمۆبوو لەنێو عەرەبانەکە دادەنیشێنن. بەم جۆرە، ڕاستەوڕاست ئەویان سپاردە باوەشی کراوەی ژنی جەنەراڵ کە بە بینینی دۆخی شڕی فۆما، شێت و هار بووبوو. فۆما لە گاڤریلا تەڕ و پیستر بوو. حەشرێکی تۆقێنەر هاتە ئارا: نیازیان بوو دەمودەست بیبەنە نهۆمی سەرەوە و جلەکانی بگۆڕن، هەمووان دەستیان کردبووە هاتوهاوار و شەراب و خواردنەوەی وزەبەخشی دیکەیان ڕادەسپارد، بێئامانج بەملا و بەولادا ڕاکەڕاکیان بوو و هەرهەموویان پێکڕا دەدوان... وەلێ فۆما وا خۆی دەنواند کە وەك بڵێیت سەرنجی لەسەر هیچ کەس و هیچ شتێك نییە. ئەویان لەسەر دەستان دەبرد. کاتێك گەیاندیانە سەر قەنەفەکەی خۆی، بێهەپوگۆ لەسەری دانیشت و چاوەکانیی نوقاندن. لەم کاتەدا کەسێك هاواری کرد کە وا خەریکە دەمرێت. قیژوهووڕێکی تۆقێنەر بەرز بووەوە. فالالی لەم نێوەندەدا، لە هەمووان زیاتر شین و شەپۆڕەی بوو و بە تەقەللایەکی زۆرەوە هەوڵی دەدا دڕ بە ئاپۆڕەی خانمەکان دابدا و خۆی بگەیەنێتە فۆما فۆمیچ و دەستی ماچ بکات...

ـ‌انـه *

# وەرزی پێنجەم

## فۆما فۆمیچ

### دەبێتە مایەی کامەرانیی هەمووان!

دواجار فۆما، وەك کەسێك کە وا خەریکە لە ڕێگەی حەقیقەتدا گیان دەسپێرێت، گوتی:

– منتان بۆ کوێ هێناوە؟

میزینچیکۆڤ لەتەك منەوە بە چپە گوتی:

– هەی خوێڕیی چەپەڵی زۆڵ! های های نازانێ لە کوێیە. دیسان بەزمەکەیە!

خاڵە گوتی:

– فۆما، تۆ لە ماڵی ئێمەی، بڕوانە دۆستانت! دڵ لە دڵ مەدە، خەمی هیچت نەبێ! وا باشترە تا زووە جلەکانت بگۆڕی، دەنا نەخۆش دەکەوی... دەتەوێ شتێ بخۆیتەوە و بێیتەوە سەر خۆت... ها؟ تۆزێ... پیاڵەیەکی بچووك تا گەرمت بێتەوە...

فۆما هەمدیس چاوی نوقاندەوە و بەدەم ناڵینەوە گوتی:

– گەر مالاگا[1] بێ ڕەنگە بخۆمەوە.

خاڵە بە نیگەرانییـەوە تەماشـای پراسـکۆڤیا ئیلینیچنـای کـرد و گوتی:

– مالاگا؟ لام وا نییە هێشتا مابێتمان!

پراسکۆڤیا ئیلینیچنا پەڕییە نێو قسەکانی و گوتی:

– ئەسڵەن وا نییە. هێشتا چوار بتڵی دیکەمان ماوە.

جا بەنێو خانماندا کە وەکو مێشـی دەوری شـیرینی چواردەوری فۆمایـان دابـوو و بـە چەقەچـەقەوە ڕاسـپاردەیان دەدایـێ، خێـرا بـە زرنگەزرنگی کلیلەکانییەوە ڕابرد تا مالاگا بێنێت. باخچییێڤ لێرەدا بە تەواوی تووڕە بوو و لەژێر لێوەوە بۆڵاندی:

– مالاگـاش نـەبێ ناخواتـەوە! داوای شەرابێکیشـی کـردووە کـە هیچ کەسێ نایخواتەوە. باشە ئێستە بێ لـە مرۆڤێکـی چـەپەڵی وەك ئەو چ کەسێکی دی مالاگا دەخواتەوە؟ ئەی تـف، لەعنـەتتان لـێ بـێ! باشە من بۆچی هاتوومەتە ئێرە؟ ئیدی چاوەڕێی چیم؟

خاڵە بە جەختکردنەوەوە لەسەر هەر وشەیەکی، گوتی:

– فۆمـا! ئێسـتە... دوای ئـەوەی کـەمێ حەسـایەوە و هەمـدیس گەڕایەوە نێومان... یانی، دەمویست بڵێم... فۆما، چۆن بیڵێم، دەزانم کە ئەمڕۆ بە بوختانکردن بۆ کەسێکی پاك...

---

١. شەرابی ترێی شیرین، لە جۆری لیکۆر. «و. ف»

فۆما کتوپڕ، وەك ئەوەی کە تای لێ هاتبێت و وڕێنە بکات، قسەی پێ بڕی و گوتی:

– وای، کوا، پاکیی من لە کوێیە؟ کوان ڕۆژە ئاڵتوونییەکانی من؟ ئەی ڕۆژگاری منداڵیی من، تۆ لە کوێی، ئەو کاتانەی کە من پاك و بێگوناح بە سارادا[1] شوێن پەپوولە بەهارییەکان دەکەوتم؟ کوان ئەو ڕۆژانە، ئاه ئێستە وان لە کوێ؟ بگەڕێننەوە، پاکییەکەمم بۆ بگەڕێننەوە!...

جا لەم وەختەدا، بە سەرە دەستی خۆی بەرەو ڕووی یەك بە یەکی ئێمە درێژ دەکرد، وەك ئەوەی کە پاکییەکەی لەنێو گیرفانی یەکێك لە ئێمەدا بێت.

باخچینێڤ کە هێندەی نەمابوو لە تاو تووڕەیی بتەقێتەوە، گوتی:

– تۆ تەماشای ئەو ڕاسپاردەیە! پاکییەکەی بدەنەوە بەڕێزیان! باشە ئێستە دەیەوێ چیی لێ بکا، ڕەنگە بیەوێ ئەملا و ئەولای ماچ کا، ها؟ پێدەچێ بە منداڵیش هەر کوڕیژگەیەکی نەحس بووبێ! سوێند دەخۆم کە نەحس بووە.

خاڵە دەیویست دیسان دەست پێ بکاتەوە:

– فۆما!...

جا پاشان فۆما هاواری کرد:

---

١. سارا: دەشت.

– کوان، کوان ئەو ڕۆژانە، ئەو ڕۆژانەی کە من هێشتا بڕوام بە عەشق هەبوو و مرۆڤەکانم خۆش دەویستن؟ ئەو ڕۆژانەی کە من باوەشم بە مرۆڤێکدا دەکرد و بەسەر سنگیدا دەگریام؟ وەلێ ئێستە... من لە کوێم؟ من لە کوێم؟

خاڵە گوتی:

– فۆما، خەمت نەبێ، تۆ لای ئێمەی! فۆما دەمویست پێت بڵێم...

کتوپڕ پرەی پێلیتسینا، چاوە مارئاساکانیی زەق کردنەوە و بە شاتەشات گوتی:

– دە ئێوەش لانیکەم لە ئێستەدا کەمێ بێدەنگ بن، قوربان.

فۆما لەسەری ڕۆیشت:

– من لە کوێم؟ ئەمانە کێن کە دەوریان لێ داوم؟ ئەمانە گا و بوورفالۆن[1] و دەیانەوێ بمدەنە بەر قۆچ. ئای ژیان، باشە تۆ چیی؟ هەر دەژی و دەژیی، وەلێ دواجار حەیات بۆ ناهێڵنەوە و پووڕەشت دەکەن، سووک و کەساست دەکەن، جا لەو کاتەی کە خۆڵ دەڕێژنە سەر گۆڕەکەت، تەنیا لەو کاتەدایە کە خەڵکی دێنەوە سەر خۆیان و بە دیواری مەزارگە ئێسکە داماوەکانت ورد دەکەن!

یژێڤیکین دەستەکانیی ئاوەڵا کردنەوە و ورتاندی:

– بەڕێزان، وا خەریکە باسی مەزارگە دەکا!

---

١. بوورفالۆ: گامێشی ئەمریکی.

فۆما هاواری کرد:

– ئاه خوایە، پەیکەری ڕێزلێنانم بۆ دانەتاشن! بەسەرم نەکەنەوە و ماتەمم بۆ مەگێڕن! من پەیکەرم ناوێ! لە دڵەکانتاندا مەزارگەم بۆ بنیاد بنێن[1]، لەوە زیاتر هیچم ناوێ، نامەوێ، نامەوێ!

خاڵە قسەی بە فۆما بڕی:

– فۆما! بەسە! ئارام بە! باسی ماتەم مەکە. تەنیا گوێ بگرە... دەبینی، فۆما، دەزانم ئەمڕۆ کە منت سەرکۆنە دەکرد، چۆن بیڵێم، ڕەنگە لە خەمخۆریتەوە تووڕە بووبی، وەلێ فۆما، تۆ لە بارەی بەرزەئاکارییەوە بە هەڵەدا چووی... دڵنیات دەکەمەوە کە لە هەڵەدای...

پرەی پێلیتسینا هەمدیس شاتاندی:

– ئێوە دەیبڕنەوە یان نا، قوربان؟ ئێستە کە ئەم پیاوە داماوە کەوتووەتە بەر دەستتان، یانی هەر دەسئەنقەست دەتانەوێ بیکوژن؟

ژنەی جەنەراڵیش پشتی پرەی سینای گرت و بەدوای ئەویشدا هەر هەمووان هاتنە دەنگ، هەموران ڕووەو خاڵە دەستیان ڕادەوەشاند تا بیبڕێتەوە. خاڵە جددی وەڵامی دایەوە:

---

١. بە ڕوونی تانەیەکی گاڵتەجاڕانەیە لە وەسیەتنامەی گۆگۆڵ:

مەزارگەم بۆ بنیاد نەنێن و بیری ئەم جۆرە وڕێتانە لە سەری خۆتاندا وەدەر بنێن، ئەمە بۆ کەسێکی مەسیحی شتێکی نەشیاوە. جا هەریەك لە نزیکانم کە هەر بە ڕاستی منی لەلا بەبایەخە، با بە جۆرێکی دی بەسەرم بکاتەوە، بە تێکۆشانی سەرسەختانەی خۆی لە کار و ژیاندا، هەروەها دڵخۆشکردنی کەسانی چواردەوری... . «و. ف»

– خاتو ئانا نایلۆڤنا، ئێوە بێدەنگ بن! من خۆم دەزانم پێویستە چـی بڵـێم! مەسـەلەی دادپـەروەری و حـەیا لـە ئارادایـە. فۆمـا! تـۆ پیاوێکی ژیری، دەبێ هەر ئێستە داوای لێبووردن لەم پاکیزە سەلارە بکەی کە سووکایەتیت پێی کردووە.

فۆما، لە بارێکدا کە واق و وڕ چاوی بەنێو هەموو ئامادەبوواندا دەگێـڕا، وەك ئـەوەی کـە هـەر بـە تـەواوی ئـەو ڕووداوەی لـە بـیر چووبێتەوە و نەزانێت چی بە چییە، گوتی:

– کامە پاکیزە؟ من سووکایەتیم بە پاکیزەیەك کردووە؟

– بـەڵێ، فۆمـا، جـا ئێسـتە گـەر خـۆت وەکـو پیـاو دان بـە گوناحەکانتدا بنێی، سوێند بێ خۆم باوێمە بەر پێت و...

فۆما هاواری کرد:

– مـن سـووکایەتیم بـە کـێ کـردووە؟ بـە کامـە پـاکیزە؟ ئـەو لـە کوێیە؟ ئەم پاکیزەیە لە کوێیە؟ لانیکەم کەسێ ئەوم پێ بناسێنێ!...

لەم ساتەدا ناستینکا بە شەرمەزاری و نیگەرانییەوە بەرەو لای ئیگۆر ئیلیچ چوو و سەرقۆڵەکەی ڕاکێشا و بە پاڕانەوەوە گوتی:

– نا، ئیگۆر ئیلیچ، وازی لێ بێنین، پێویست بە داوای لێبووردن ناکا! من هیچ هۆکارێ نابینم بۆ ئەمە.

فۆما کتوپڕ هاواری کرد:

– ئـەها! ئێسـتە بـیرم هاتـەوە! خوایـە گیـان! وا خەریکـە بـیرم دێتەوە!

جا بە جۆرێك وەك بڵێیت ناڕەحەتی و بێتاقەتیی لە باسدا نییە، لەسەری ڕۆیشت:

– ئاه، یارمەتیم دەن، یارمەتیم دەن بیرم بێتەوە! ئادەی بڵێن: ئەوە ڕاستە کە وەك سەگێکی بریندار منیان لێرە وەدەرناوە؟ ئەوە ڕاستە کە هەورەبرووسکە لێی داوم؟ ئەوە ڕاستە کە لێرە لەسەر هەیوانەوە فڕێیان داومەتە دەر؟ ئەوە ڕاستە یان نا؟

لە وەڵامی قسە ڕەوانەکانی فۆما فۆمیچدا، گریە و شیوەنی کۆڕی ژنان گەیشتە ئاسمان. فۆما جەختی لەسەر کردەوە:

– بەڵێ، وایە! بیرم هاتەوە... ئێستە بیرم هاتەوە کە پاش ئەوەی هەورەبرووسکە دایدا و من کەوتم، هەستامەوە و لە بارێکدا کە هەورەتریشقە بەدوامەوە بوو، بەرەو ئێرە ڕام کرد تا ئەرکی خۆم بگەیەنمە کۆتا و ئیدی بۆ تاهەتا پێوار بم! یارمەتیم دەن هەستمەوە! هەرچەندەش لاواز بم، هەر دەبێ ئەرکی خۆم بگەیەنمە کۆتا.

خێرا ئەویان لەسەر قەنەفەکە بەرز کردەوە. فۆما باری وتاربێژانی بە خۆوە گرت، جا دەستێکی ڕاوەشاند و هاواری کرد:

– سەرهەنگ! ئێستە ئیدی بە تەواوی هاتوومەتەوە سەر خۆم، خۆشبەختانە هێشتا هەورەشریخە بە تەواوی ئەقڵمی لەنێو نەبردووە، ئەوەی ڕاستی بێ تەنیا گوێی ڕاستم کەڕ بووە، کە ئەریش ڕەنگە زیاتر بە بۆنەی کەوتنم لە هەیوانەوە بێ نەك دەنگی هەورەشریخە... وەڵێ ئەوە کەی گرنگە و ئەسڵەن کێ بایەخ بە گوێی ڕاستی فۆما دەدا!

فۆما ئەم وشانەی کۆتایی بە تەشەرێکی هێندە جەرگبڕانەوە دەربڕین و وەها خەندەیەکی خەمناکی لەگەڵدا کردن کە خانمان خێرا خەم دایگرتن و ناڵەیان لێ بەرز بووەوە. ئەوان هەر هەموو بە نیگایەکی سەرکۆنەئامێز و ئەوانی دیکەش بە قینەوە لە خاڵەیان دەڕوانی و ئیدی ئەویش خەریك بوو بەرەبەرە لەبەر یەکدەنگیی ئامادەبووان ملکەچ دەبوو. میزینچیکۆڤ تفێکی ڕۆکردە سەر زەوی و بەرەو لای پەنجەرە ڕۆیشت. باخچییێڤ هەروا بەهێز و بەهێزتر ئەنیشکی تێ دەژەندم، ئەو بە دژواری خۆی بە پێوە گرتبوو. فۆما بە نیگای لووتبەرز و لێبڕاوانەی لە ئامادەبووان نز بووەوە و بە کینەوە گوتی:

- ئێستە هەمووتان پێهاتنەکانی من ببیستن! جا پاشان داوەری لەسەر چارەنووسی ئۆپیسکینی چارەڕەش بکەن. ئیگۆر ئیلیچ! دەمێ بوو چاوم لەسەر ئێوە بوو، بەڵێ، بە دڵێکی پڕ لە ئازارەوە چاوم لەسەرتان بوو و هەموو شتێکم دەبینی... هەموو شتێ... تەنانەت لەو کاتانەشدا چاوم لەسەرتان بوو کە خۆتان شتی واتان بە خەیاڵدا نەدەهات... سەرهەنگ! ڕەنگە کارەکەم هەڵە بووبێ، دەی ئاخر من ئاگاداری خۆویستی و لووتبەرزیی بێسنووری ئێوە و هەوەسبازیی نائاساییتان بووم. دەی ئێستە کێ دەیەوێ لەسەر ئەوە سەرکۆنەم بکا کە خۆنەویستانە خەمی شەرەفی پاکترین بوونەوەری نێو مرۆڤایەتیم بووە؟

خاڵە کە بە نیگەرانییەوە لەو ئازارەی دەڕوانی کە بە ڕووخساری ناستینکارە دەرکەوتبوو، قیراندی:

– فۆما، فۆما!... ئیدی لەوە زیاتر ئەم مەسەلەیە مەورووژێنە! فۆما!

– فۆما وەك ئەوەی كە هەر ئاگاداركردنەوەكەی خاڵەی نەبیستبێت، لەسەری ڕۆیشت:

– بێئەزموونیی ئەم مرۆڤە، زیاتر لە پاكی و ساویلكەییەكەی منی پەرێشان دەكرد. دەمبینی وا خەریكە عاشق دەبێ، ڕێك بە وێنەی چرۆی قۆخ لە دڵیدا دەپشكوا و، جا خۆنەویستانە ئەم قسەیەی *پترارك*[1]م هاتەوە بیر كە *پاكی بە تاڵە مووێكەوە بەندە*. داخم بوو و شینم دەكرد و گەرچی ئامادە بووم لە پای ئەم پاكیزە پاكە و مرواریئاسایەدا گیانم بخەمە گرەوەوە، وەلێ، ئیگۆر ئیلیچ، كێ دەیتوانی شەفاعەت بۆ ئێوە بكا؟ من دوای ئەوەی كە چاوم بە شەهوەتی هەوسارپچڕاوی ئێوە كەوت و بینیم كە ئامادەن هەموو شتێ بكەنە قوربانیی یەك ساتی شەهوەتتان، كتوپڕ لەبەر چارەنووسی ئەم پاكیزە نەجیبەدا كەوتمە نێو خەرەندی ترس و تۆقینەوە...

خاڵە هاواری كرد:

– فۆما چۆن دەكرێ ئاوات لێك دابێتەوە؟

---

١. فرانچیسكۆ پترارك (١٣٠٤–١٢٧٤م)، بیرمەند، مێژوونووس، نووسەر، شاعیر، مرۆڤناس و هیومانیستی ئیتاڵی، بە یەكەمین شاعیری مۆدێرن ناری بۆیشتووە. زۆربەی كات بە باوكی هیومانیزم دەیناسێنن. «و. ف»

– من بە دڵێکی پڕ لە ئازارەوە چاودێریی ئێوەم دەکرد. گەر دەتانەوێ بزانن چ ئازارێکم چەشتووە، ئەوا لە شەکسپیر بپرسن، ئەو بە ڕوونی هەلومەرجی دەروونیی من لە هاملێتدا شی دەکاتەوە. من دەسەوەسان و هەراسان بووبووم. لە تاو ڕق و نیگەرانی هەموو شتێکم لە بەرچاو ڕەش بووبوو. ئەمە هەمان ئەو ڕەنگە ڕەشە نەبوو کە لە ڕۆمانسێکی بەناوبانگدا باس دەکرێ...[1] دڵنیا بن! هەر لەبەر ئەوەش ئێوە بینیتان من پێداگر بووم لەوەی ئەو لەم ماڵە بڕوا، من دەمویست ڕزگاری بکەم. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ئێوە لەم دواییانەدا بینیتان کە چۆن بە ڕقەوە لەبەرانبەر مرۆڤایەتیدا وەستامەوە. ئاه! جا ئێستە کێ لەگەڵ مرۆڤایەتیدا پێکم دێنێتەوە؟ هەست دەکەم لەبەرانبەر میوانانی ئێوە و خوشکەزاکەتان و هەروەها بەڕێز باخچییێڤدا و ئەوەی کە چاوەڕێم دەکرد شارەزای زانستی ئەستێرەناسی بێ، کەمێ سەختگیر و بێویژدان بوومە، وێڕای ئەوەش، کێ لەبەر هەلومەرجی دەروونیی ئەو کاتەم تاوانبارم دەکا؟ هەمدیس ئاماژە بە شەکسپیر دەکەم و وەك پاساوێ دەیهێنمەوە و دەڵێم داهاتوو وەك گێجاوێکی قووڵ دەهاتە بەرچاوم کە تیمساحێك لەنێویدا خۆی مەڵاس دابێ.[2] هەستم دەکرد ئەرکی سەر شانمە بەر

---

١. ڕۆمانسی پڕهەستی *ڕەش، ڕەنگی دڵگیر*، لەنێو عەوامدا باو بوو و هەر لەژێر کاریگەریی ئەودا چەند گۆرانییەك گوترابوون. نووسەرەکەی دیار نییە، گەرچی دەگوترێت، خاوەنەکەی *مانێوی نیڤانۆڤیچ برنارد*، ئاوازدانەر و پیانۆژەنی ڕووسی (١٧٩٤-١٨٧١)یە. «و. ف»

٢. ئەم دیمەنە هی *شاتوبریان*ە نەك شەکسپیر. لە داستانی ئۆتێلا (١٨٠١: وەرگێڕران بۆ ڕووسی ١٨٠٢). پاڵەوانی هیندی -شاکتاس- دەڵێ:

بـە نەگبەتییـەك بگـرم و مـن هـەر بـەو مەبەستەشـەوە ئـافرێنراوم و ڕاسپێردراوم... جا ئەوە چیی لێ کەوتەوە؟ ئێوە دەرکتان بە پاڵنەری پاکی من نەکرد و بە درێـژایی ئـەم ماوەیـە بـە دژمنایـەتی، پێنـەزانی، گاڵتە و سووکایەتیپێکردن پاداشتتان دامەوە...

خاڵە بە هەڵچوونێکی وەسفهەڵنەگر قیڕاندی:

– فۆما! گەر وا بیر دەکەیەوە... هەڵبەتە، من ئەوەم قەبووڵە کە...

– گـەر هـەر بـە ڕاسـتی قەبووڵتانـە، سـەرهەنگ، کەواتـە پیـاوەتی بکەن و گوێم لێ بگرن و قسەم پـێ مەبڕن. درێـژەی دەدەمـێ: هـەموو گونـاحی مـن ئـەوە بـوو کـە خـەمی چـارەنووس و بەختـەوەریی ئـەم کچۆڵەیەم بوو، چونکە ئەو هەر بە ڕاسـتی وەك منـداڵی خۆتـان وایـە.

---

پاکترین دڵەکان وەك کانیکەلی دەشتی ئالاشوْڤا وان، ڕوواڵەتیان هێمن و پاك دەنوێنێ. وەلێ کە باش لێیان ورد دەبیتەوە، دەبینی لە قووڵاییاندا تیمساح خۆی مات داوە. دیمەنی ئاوبراوی شاتۆبریان لە ئەدەبیاتی ڕۆمانتیکی ڕووسیدا چەندان جار بە کار براوە. گەورەشاعیری ڕووس –*کانستانتین باتیۆشکاف* (١٧٨–١٨٥٥)– لە شیعری *پیاوی کامەران*دا (١٨١٠) دەنووسێت:

دڵی ئێمە گەنجینەیەکی جوانە
بە ڕوواڵەت کپ و هێمن
وەلێ کە دزە دەکەیتە ناوی...
ترسناکە!
لە ناخیدا تیمساحێك خۆی مەڵاس داوە!

*ئالێکساندەر فیۆدارایچ ڤاییکۆف* (١٧٧٨–١٨٣٩) لە شیعری مەجووئامێزی *یانەی شێتەکان*دا، ئەم وێنایە سوننەتییە دەداتە بەر گاڵتەجاڕی. دۆستۆیێفسکی لە سەردەمی پانسیۆندا، ئەم شیعرە مەجووەی ڤاییکۆفی، کە ئەوسا تازە بە شێوەی دەستنووس بڵاو کرابووەوە، لەبەر بوو. «و. ف»

لەم ماوەیەدا خۆشەویستیی زیاد لە ڕادەم بۆ مرۆڤایەتی، هەتا بڵێی کردوومیەتە کەسێکی تووڕە و بەدخوو. ئیگۆر ئیلیچ، ئایا دەزانن کە هەڵسوکەوتی ئێوە سات بە سات دەبووە پاکانەیەك بۆ ڕقی من و مۆری دڵنیابوونەوەی لە تەواوی بەدگومانییەکانم دەدا؟ ئایا دەزانن دوێنێ پاش ئەوەی کە ئاڵتوونەکانتان پێشکەش کردم تا لە خۆتانم بتارێنن، من بیرم کردەوە: بۆیە دەیەوێ منێك بتارێنێ کە حوکمی ویژدانی ئەوم هەیە، تا ئاسانتر بتوانێ تاوانەکانی بکاتە کردە...

خاڵە بە هەراسانییەوە هاواری کرد:

– فۆما، فۆما! یانی تۆ دوێنێ وات لێك داوەتەوە؟... خوایە بمبوورە، وەڵێ من بە هیچ شێوەیەك نیازی وام نەبوو!

فۆما لەسەری ڕۆیشت:

– کەواتە ئەم بەدگومانییە هەر وا لە ئاسمانەوە بۆم دابەزی. تو ویژدانتان، بۆ نموونە، ئەو شەوەی کە من بە هەڵکەوت بەرەو لای ئەو نیمکۆتە شوومە هاتم، دەبوو چۆنی لێك بدەمەوە؟ ئاە، خوایە! کاتێك سەیرم کرد سەرلەبەری بەدگومانییەکانم بە ڕوونترین شێوە بە ڕاست گەڕاون، کەوتمە چ دۆخێکەوە؟ لەگەڵ ئەمەشدا، هێشتا تۆزە هیوایەکم هەبوو، گەرچی بێبایەخیش، وەڵێ هەرچۆنێ بووە هیوایەك بوو... بەس ئەی چی بوو؟ ئەمڕۆ ئێوە ئەو تۆزە هیوایەشتان کردە خۆڵەمێش و لەنێوتان برد! ئێوە نامەیەکتان بۆ نووسیم، ڕاتان گەیاند کە نیازی زەماوەندکردنتان هەیە و تکاتان کرد کە ئەو مەسەلەیە پەردەپۆش کەم... لە بەرخۆوە گوتم: وەڵێ بۆچی؟ ئەو بۆچی پێشتر ئەمەی نەکرد و کاتێ ئەوەی نووسی کە من بەسەریدا

چووم؟ بۆ پێشتر بە دڵخۆشی و ڕوویەکی گەشەوە نەهاتە لای من (ئاخر عەشق ڕووخساری مرۆڤ دەگەشێنێتەوە)، بۆ ئەو کاتە نەهاتە لام تا سەر بخاتە سەر سنگم و تا لە تاو کامەرانی فرمێسکی ئامەزرۆیی بڕژێنێ و لە هەموو شتم ئاگادار بکاتەوە؟ نەکا لاتان وا بێ من تیمساحم و لەجێی سپاردەی بەسوود، دەتانخۆم؟ یان ڕەنگە قالۆنچەیەك بم و تەنیا گازتان لێ دەگرم و بەر بە کامەرانیتان دەگرم؟ ئەم بەیانییە لە خۆمم پرسی، *من هاوڕێی ئەوم یان قێزەونترین حەشەرەی سەر ڕووی زەوی؟* بیرم دەکردەوە بۆچی، *ئاخر بۆچی ئەو داوای لە خوشکەزاکەی کردووە لە پایتەختەوە بێ و جیا وەك خوازبێنیکەری ئەم پاکیزەیە ناساندوویەتی؟ ئایا نیازی ئەوە نەبووە کە هەم ئێمە و هەم خوشکەزا خۆشباوەڕەکەی بخەڵەتێنێ و لەم نێوەندەدا ژێراوژێر نیازی پیسی خۆی بەجێ بێنێ؟* نەخێر، سەرهەنگ، ئێوە ئەو بۆچوونەتان لا درووست کردم کە لەو خۆشەویستییەدا نیازێکی پیستان هەیە! وێڕای ئەوەش، ئێوە لە بەرانبەر ئەم خانمخاسەدا تاوانبارن، چونکە بە بۆنەی هەڵەشەیی و کەللەڕەقیی خۆویستانەتانەوە واتان کرد ئەم بوونەوەرە پاك و نەجیبە بکەوێتە بەر تۆمەت و بەدگومانیی ترسناکەوە!

خاڵە سەری دانەواندبوو و نقەی لێوە نەدەهات. وا دیار بوو کە ڕەوانبێژیی فۆما، سەرلەبەری پاساوەکانی ئەوی پەك خستبوون و ئیدی بە تەواوی خۆی بە تاوانبار دەزانی. ژنی جەنەراڵ و ئەوانەی دەوری، بە بێدەنگی و ڕێزەوە گوێیان بۆ قسەکانی فۆما دەگرت و

پەرەی پێلیتسینا شەڕانی و سەرکەوتووانە سەیری ناستینکای بەستەزمانی دەکرد. فۆما درێژەی پێ دا:

– من ئەمڕۆ سەرباری ماندوویێتیم، بە گەرموگوڕی و سەرمەستییەوە دەرگەم لەسەر خۆم کڵۆم دا و سەرقاڵی خواپەرستی بووم، خواش ڕاستەڕێی پیشان دام! دواجار بڕیارم دا لە بەردەم هەمووان‌دا ئێوە لە مەحەك بدەم. بۆی هەیە زۆر پێم لێ ڕاکێشابێ و زیاد لە ڕادە تووڕە بووبم، وەڵێ ئێوە لەبەر هۆکارە جوامێرانەکانم منتان فێرێ دایە دەرێ! بەدەم کەوتنمەوە بیرم دەکردەوە کە، دایمە لەم دونیایەدا ئاوا پاداشتی چاکەکاران دەدەنەوە! ئا لەوێ کەوتمە سەر زەوی و ئیدی بە دژواری بیرم دێتەوە کە دواتر چیم بەسەر هات!

لەگەڵ بیرهێنانەوەی ئەم یادگارییە خەمگینەدا، دەنگی ناڵە و شیوەن بەرز بووەوە و قسەکانی فۆما فۆمیچی بڕی. پراسکۆڤیا ئیلینیچنا تازە بە بتڵێك مالاگاوە گەڕابووەوە کە ژنی جەنەراڵ بتڵەکەی لە دەستی وەرگرت و ویستی بۆ فۆمای ببتات، وەڵێ فۆما لووتبەرزانە دەستی نا بە ڕوویەوە و هاواری کرد:

– بوەستن! من دەبێ قسەکانم تەواو کەم. نازانم دوای کەوتنم چی ڕووی داوە. تەنیا شتێ دەزانم ئەویش ئەمەیە کە ئێستە بە سەرتاپای خووساوەوە لێرە ڕاوەستاوم و وێڕای ئەوەش کە بۆی هەیە لە هەر ساتێکدا تووشی لەرز و تا ببم، دەمەوێ کامەرانیی ئەم دووانە دەستەبەر بکەم. سەرهەنگ! دواجار لەبەر ڕۆشنایی چەند بەڵگەیەك کە بۆ ئەوە ناشێن لێرەدا ئاماژەیان پێ بکەم، ئەرخەیان

بووم کە عەشقی ئێوە بێگەرد و تەنانەت بالاش بووە، گەرچی هاوکات گوماناویش دەینواند. من ئێستە دەمەوێ نیشانتانی بدەم کە فۆما ئۆپیسکینی ورد و سووککراو و تاوانبار بە شکاندنی حورمەتی پاکیزەیەك (کە ئامادەیە وەك شاسواری سەدەکانی ناوەڕاست تا دواهەمین دڵۆپی خوێن بەرگری لە شەرەف و ئاوڕووی ئەو بکا)، ئێستە چۆن لەبەرانبەر ئەو هەموو ئێش و ئازارانەدا تۆڵەی خۆی دەسێنێتەوە. سەرهەنگ دەستتانم بدەنێ!

خاڵە بە خرۆشەوە هاواری کرد:

– بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە، فۆما! ئێستە مادام تۆ بە تەواوی دانت بە ئاوڕوو و پاکیی ئەم نەجیبترین خانمی دونیایەدا نا، منیش... بێ چەندوچۆن... ها، ئەوەش دەستی من، فۆما، من شەرمەزارم و تۆش چاوپۆشیم لێ بکە...

جا خاڵە بێ ئەوەی بزانێت کە جارێ چی بە چییە، گەرموگوڕانە دەستی خستە نێو دەستی ئەو. فۆما بەنێو ئەو خانمانەدا کە دەورەیان دابوو، ڕێگەی بۆ خۆی کردەوە و بە دەنگێکی هێمن، ڕووەو ناستینکا گوتی:

– ئێوەش دەستتانم بدەنێ.

ناستینکا نارەحەت و سەرسام لە فۆمای دەڕوانی. فۆما، کە هێشتا دەستی خاڵەی لەنێو دەست بوو، بە نەرمونیانی گوتی:

– وەرە پێشتر، وەرە پێشتر، ڕۆڵەی نازدارم! من تەنیا کامەرانیی ئێوەم دەوێ.

میزینچیکۆڤ گوتی:

- تۆ بڵێی چیی لەژێر سەردا بێ؟

ناستینکا تۆقیو و لەرزۆك، هێواش بەرەو لای فۆما ڕۆیشت و دڕدۆنگانە دەستی درێژ کرد. فۆما دەستی گرت و خستییە نێو دەستی خاڵە و زۆر فەرمییانە گوتی:

- لە ئێستەوە لێکتان مارە دەبڕم و دوعای کامەرانیتان بۆ دەکەم، جا گەر هەر بە ڕاستی دوعای مرۆڤێکی دڵشکاو و مەینەتی بتوانێ یارمەتییەك بگەیەنێ، دەی دوعا دەکەم کامەران بن. ئەمەیە تۆڵەی فۆما ئۆپیسکین! دەی پیرۆزتان بێ!

هەمووان دۆش دامابوون. کۆتایی مەسەلەکە هێندە سەرسووڕهێن بوو کە هەر هەمووان وشك بووبوون. ژنی جەنەراڵ بە دەمێکی بەشکراوە و بتڵە مالاکای نێو دەستییەوە، تاسا بوو. پرەی پێلیتسینا ڕەنگی پەڕی بوو و لە ڕقان هەڵدەرزی. هاودەمەکان بە پشتەدەستی خۆیاندا کێشا و تووشی پاگیرە[1] بووبوون. خاڵە لەرزی لێ نیشتبوو و دەیویست شتێك بڵێت، وەلێ نەیدەتوانی. ناستینکا وەك تەرمێك ڕەنگی پەڕی بوو و بە ترس و لەرزەوە، لەژێر لێو گوتی *ئەمە نا چێتە ئەقڵەوە*... بەس ئیدی دێری کردبوو. دەبێ بەویژدان بین، چونکە ئەوەی ڕاستی بێت، پاش فۆما فۆمیچ، باخچییێڤ پیرۆزبایی کرد و هەلهەلەی لێدا. دوای ئەو من و بەدوای منیشدا

---

١. پاگیرە: پێگیرە. بارێکە لە ترس یان شڵەژانەوە سەرچاوە دەگرێت و کەسی تووشبوو، تا ماوەیەك توانای هەنگاونانی نییە.

ساشینکا خێرا بە فڕکەیەك باوەشی بە باوکیدا کرد و بەو دەنگە بەرز و زایەڵەدارەیەوە پیرۆزبایی کرد، پاشانیش نۆرەی ئالیۆشا و دوای ئەویش یژێڤیکین هات.

فۆما دووبارە هاواری کرد:

– هەلەلەلا! هەلەلەلا! ئێستە بکەونە سەر ئەژنۆ، خۆشەویستانم، لە بەردەم نەرمونیانترین دایکی سەر زەویدا بکەونە سەر ئەژنۆ! داوای دوعای خێری لێ بکەن، گەر پێویست بکا خۆشم لەبەرانبەریدا دەکەومە سەر ئەژنۆ...

خاڵە و ناستینکا، کە هێشتا زاتیان نەبوو لە یەکدی بڕوانن، تۆقیوانە، وەك بڵێیت کە هێشتا نەیاندەتوانی تێبگەن چی ڕووی داوە، لە بەردەم ژنی جەنەراڵدا کەوتنە سەر ئەژنۆ. هەمووان دەوریان دابوون. پیرێژن تاساوانە ڕاوەستا بوو و نەیدەزانی پێویستە چ کاردانەوەیەکی هەبێت. فۆما لێرانەشدا فریا کەوت و خۆیشی لە بەردەم نانبدەکەیدا هاتە سەر ئەژنۆ. ئەم کارە تەواوی دوودڵییەکانی ژنی جەنەراڵی ڕەواندنەوە و دواجار ئەویش بەدەم فرمێسکڕشتنەوە قاییلبوونی خۆی ڕاگەیاند. خاڵە فڕکەیەکی کرد و فۆمای گرتە باوەش و گوتی:

– فۆما، فۆما!

وەلێ ئەسلەن لە دڵخۆشییان نەیدەتوانی درێژە بە قسەکەی بدات و وسکت بوو. ستێپان ئالێکسییڤیچ باخچییێڤ بە دەنگی بەرز گوتی:

– شامپانیا بێنن! شامپانیا بێنن! هەلەلەلا!

پرەی پێلیتسینا، کە تازە هاتبووەوە سەر خۆی و لە مەسەلە و ئاقیبەتەکەی حاڵی بووبوو، پەڕییە نێو قسەکەی و گوتی:

– نەخێر، قوربان! شامپانیا نا، دەبێ لە بارەگای خوادا مۆم داگیرسێنین و لە بەردەم کۆتەڵی پیرۆزدا دوعا بکەین. هەر کارێ ڕێی خۆی هەیە، قوربان، ئاخر ئێمە خواناسین و پێویستە لای خوا داوای خێر و بەرەکەتیان بۆ بکەین...

دەمودەست هەمووان ڕایان کرد تا ئەم سپاردە ژیرانەیە جێبەجێ بکەن، هەڵپەهەڵپێکی سەیر هاتە ئارا. دەبوو مۆم داگیرسێنن. ستێپان ئالێکسییڤیچ باخچییێڤ کورسییەکی هێنایە پێش و چووە سەری تا مۆم بخاتە بەردەم کۆتەڵی پیرۆز، وەلێ کتوپڕ کورسییەکە دەرپەڕی و بە توندی کەوت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، خۆی لەسەر پێ گرتەوە و تەخت نەبوو. ئەمە هەر نەبووە مایەی قەڵسیی ئەو و خێرا چووە لاوە تا پرەی پێلیتسینا ئەم ئەرکە جێبەجێ بکات. پرەی پێلیتسینای سیسەڵە لە چاوترووسکانێکدا کارەکەی تەواو کرد و مۆمی داگیرساند. ڕاهیبە و هاودەمەکان خاچیان کێشا و کڕنۆشیان برد. کۆتەڵی فریادڕەسی پیرۆزیان هەڵگرت و بردیانە لای ژنی جەنەراڵ.

خاڵە و ناستینکا هەمدیس کەوتنەوە سەر ئەژنۆ و ڕێوڕەسمەکە بە پێی سپاردە ئایینییەکانی پرەی پێلیتسینا ئەنجام دران: «بچەمێنەوە و کۆتەڵی پیرۆز ماچ کەن، دەستی دایە گیانیش ماچ کەن!»

بەڕێز باخچییڤیش بە ئەرکی خۆی زانی کە دوای بووك و زاوا، کۆتەڵی پیرۆز ماچ بکات، لەگەڵ ئەوەش دەستی دایەگیانیشی ماچ کرد. ئەو، کە هەتا بڵێیت دڵخۆش و خرۆشاو بوو، هەمدیس هاواری کرد:

– هەلەلەلا! دەی، ئێستە ئیدی کاتی خواردنەوەیە!

بە کورتییەکەی هەمووان خەنی بوون[1]. ژنی جەنەراڵ دەگریا، وەلێ فرمێسکەکانی هەڵسی شادی بوون. ئەم هاوسەرگیرییەی کە فۆما بە پیرۆز ناوی هێنابوو، ئیدی لای ئەویش موقەدەس و ئاوڕوودارانە دەینواند. جا لەمەش گرنگتر ئەوە بوو کە هەستی دەکرد، ئێستە کە فۆما فۆمیچ خۆی سەلماندووە، بێ چەندوچۆن بۆ تاهەتا لای ئەو دەمێنێتەوە. هاودەمەکان گەر بە ڕووالەتیش بێت، وەك ئەوانی دیکە دڵخۆش بوون. خاڵە هەیتاهەتا لە بەردەم دایکیدا دەکەوتە سەر چۆك و دەستی ماچ دەکرد یان دەهاتە پێش و باوەشی بە من و باخچییڤ و میزینچیکۆڤ و یژێڤیکیندا دەکرد. ئەوەندە ئالیۆشای بە خۆوە گوشی بوو کە هێندەی نەمابوو بیخنکێنێت. ساشینکا، ناستینکای لە باخەڵ گرتبوو و ماچی دەکرد. پراسکۆڤیا ئەیلی نیچنا فرمێسکی دەڕشت. بەڕێز باخچییڤ کە چاوی بەمە کەوت، خۆی گەیاندە ئەو و دەستیی ماچ کرد. یژێڤیکینی داماو تەواو حەپەسا بوو و لە سووچێکدا دەگریا و بە هەمان دەستەسڕە چوارخانەییەکەی جارانی چاوەکانیی دەسڕین. لە سووچێکی دیکەوە گاڤریلا دەگریا و بە ڕێزەوە لە فۆما فۆمیچی دەڕوانی.

---

١. خەتیبوون: شاگەشکەبوون، دڵخۆشیی لەڕادە بەدەر.

فالالیش بە دەنگی بەرز دەیزیڕاند و دەچووە سەروەختی هەمووان و یەك یەك دەستیانی ماچ دەکرد. هەمووان ورووژابوون. هیچ کەسێك نقەی لێوە نەدەهات و ڕای دەرنەدەبڕی، تەنیا دەنگ و هەرای شادی دەبیسترا. هێشتا کەس نەیدەزانی چی قەوماوە کە لە کتوپڕێکدا ئاوا هەموو شتێك بەم ئاسانی و سادەییە بە خێر گەڕا. تەنیا یەك شتیان دەزانی کە ئەویش ئەوە بوو، ئەمە هەمووی لە سایەی فۆما فۆمیچەوەیە. ئەمە ڕاستییەکی بێچەندوچۆن و نکۆڵیلێنەکراو بوو. هێشتا پێنج خولەك بەسەر ئەم شادییە گشتییەدا ڕانەبردبوو کە کتوپڕ سەروسەکوتی تاتیانا ئیڤانۆڤنا دەرکەوت. دیار نییە ئەوێك کە لەو سەرەوە لە ژوورەکەیدا دانیشتبوو، چۆن و لە کوێڕای توانیبووی بە بەسەرهاتی عەشق و زەماوەندکردنی ئەم خوارە بزانێت؟ تاتیانا بە ڕووخسارێکی گەشاوە و چاوانێکی پڕ لە ئەسرینی شادی و ئارایشێکی جوان و هەستبزوێنەوە (ئەوجا فریای ئەوەش کەوتبوو کە جلەکانی بگۆڕێت ) پڕتاوی کرد و بە دەنگ و هەرایەکی زۆرەوە ناستینکای گرتە باوەش و هاواری کرد:

- ناستینکا، ناستینکا! تۆ خۆشت دەویست و کەچی من نەمدەزانی! خوایە گیان! عاشقی یەکدی بوون و ژێراوژێر و لە خەڵوەتدا ئەشکەنجەتان دەکێشا! جا هەموانیش چاودێرییان دەکردن! وای لەو چیرۆکە عاشقانەیە! ناستینکا، باوانم، ڕاستییەکەیم پێ بڵێ: یانی تۆ هەر بە ڕاستی ئەم شێتۆکەیەت خۆش دەوێ؟

ناستینکا لە وەڵامدا ئەوی گرتە باوەش و ماچی کرد. تاتیانا ئیڤانۆڤنا لە خۆشحاڵیان چەپڵەی لێدەدا.

- خوایە گیان، وای لەو بەسەرهاتە عاشقانە و دڵڕفێنە! گوێ گرە، ناستینکا، فریشتەکەم: ئەم جەنابانە، هەموویان دێوگەلێکی ناڕەسەنن و شیاوی عەشقی ئێمە نین، وەڵێ دەی، ڕەنگە ئەمەیان لەوانی دی باشتر بێ.

پاشان دەستی خاڵەی گرت و بە دەنگی بەرز گوتی:

- ئادەی وەرە پێش، شێتۆکە! هەر بە ڕاست تۆ عاشقی؟ یانی تۆ ئەوەت لێوەشایەوە کە کەسێکت خۆش بوێ؟ ئا سەیرم کە: دەمەوێ چاو ببڕمە چاوت و بزانم ئاخۆ درۆ دەکەن یان نا؟ نا، نا، درۆ ناکەن: بریقەی عەشقیان تێدا دەبینم. ئای کە من چەندە دڵخۆشم! ناستینکا، هاوڕێکەم، گوێ بگرە، خۆ تۆ ماڵ و موڵکێکت نییە، کەواتە لێگەڕێ با سی هەزارت بە دیاری بدەمێ. توخوا لێمی وەرگرە! من پێویستیم پێی نییە، هەر بە ڕاستی پێویستیم پێی نییە، هێشتا هەر دونیایەك پارەم بۆ دەمێنێتەوە.

جا کاتێك بینیی ناستینکا دەیەوێ ئەو دیارییە ڕەد بکاتەوە، بەدەم دەستڕاوەشاندنەوە هاواری کرد:

- نا، نا، نا، نا! ئیگۆر ئیلیچ، تکایە ئێوەش هیچ مەڵێن، ئەمە پەیوەندیی بە ئێوەوە نییە. نا، ناستینکا، من ئیدی لە بڕیاری خۆم پاشگەز نابمەوە... دەمەوێ بیکەمە دیاریت، زۆر لە مێژە بە تەمای ئەوە بووم. تەنیا چاوەڕێی یەکەمین پەیوەندیی عاشقانەی تۆ

بووم... دەمەوێ لە ئامێزی خۆشبەختیدا بتانبینم. گەر ئەم دیارییەم لێ وەرنەگری، نیگەران دەبم، ناستینکا، دەنا دەگرییێم ها... نا، نا، نا دیسان دەیڵێمەوە: نا! هەر ئەوەی کە گوتم.

لەو ساتەدا تاتیانا ئیڤانۆڤنا هێندە خرۆشا بوو کە بە هیچ شێوەیەك نەدەکرا سەرپێچیی بکەیت و تەنانەت دڵیشت پێی دەسووتا. ئەم بابەتەش درێژەی نەکێشا و کەوتە کاتێکی دی. تاتیانا ئیڤانۆڤنا هاتە پێشەوە و ژنی جەنەراڵ و پرەی پێلیتسینا و هەموو ئێمەی گرت و ماچی کردین. باخچیێڤیش چووە لای ئەو و بە رێزدارانەترین شێوە دەستی ماچ کرد.

- کچە ئازیزەکەم! نازدارەکەم! منی گەمژە ببوورە لەبەرانبەر ئەو کارەی ئەمڕۆم، نەمدەزانی دڵی تۆ هێندە ناسك و ئاڵتوونییە!

تاتیانا دەستەوانەکەی کێشا بە لووتیدا و بە مەکرونازێکی بێوێنەوە گوتی:

- شێتۆکە! من هەر لە سەرەتاوە دەمناسیی.

جا لە بارێکدا کە داوێنی کراسە ڕازاوە و پرچینەکەی بەرەو لای باخچیێڤ دەکشا، وەك سروەی دەمەو بەیان بە لایدا ڕابورد. کابرای خەپە بە ڕێزەوە خۆی لا دا و نەرمونیانانە گوتی:

- کچێکی زۆر باشە!

جا پاشان لە چاوانی منی ڕوانی و بە دزییەوە گوتی:

- ئەرێ بە ڕاست، لووتی ئەڵمانییەکەیان لکاندووەتەوە!

سەرسامانه پرسیم:

– لووتی کێ؟ ئەی کابرای ئەڵمانی کێیه؟

– بابـه یـارۆی کـه سـپاردبووم، هـەر ئـەوەی کـه دەسـتی کچـه ئەڵمانییەکـەی مـاچ دەکـرد و کچـەش بـه دەسـرِ فرمێسـکی خـۆی دەسـرِی. دوێنـێ *یـۆدا*کیم بـۆمی چـاك کـردەوه، ئـەمرِۆش کـه لـه شـوێنهەڵکردن گەرِاینـەوه، کەسـێکم بـۆ نـارد... هاکـا گەیشـت. یاریچەیەکی نایابه!

خاڵه که شێتئاسا ورووژا بوو، هاواری کرد:

– فۆمـا! تـۆ مایـەی بەختـەوەریی ئێمـەی! مـن چـۆن دەتـوانم قەرەبووی ئەم دڵسۆزییەت بکەمەوه؟

فۆما به شان و شەوکەتی موقەدەسانەوه هاته وەڵام:

– به هیچ شێوەیەك، سەرهەنگ. ئێوه درێژه به پشتگوێخستی من بدەن و ئەسڵەن له بەرچاوم مەگرن و خۆش رِابیبوێرن.

وا دیار بوو فۆما رِەنجاوه. پێدەچوو لەو شادییه گشتییەدا ئەو له بیر کرابێت. خاڵه هاواری کرد:

– فۆمـا، ئەمـه هـەموو لـه خۆشـحاڵییەوەیه! برالـه، مـن ئێسـته تەنانەت نازانم له کوێشم. گوێ بگره، فۆما: من دڵـی تـۆم شـکاند. بـه هەموو ژیان و خوێنیشم ناتوانم قەرەبووی دڵشکاویت بکەمەوه. هـەر لەبەر ئەوەشـه کـه بێدەنگم و داوای لێبووردن ناکـەم. وەڵێ گـەر رِۆژێ ژیان و سەریشـمت بوێ و گـەر پێویسـت بـێ لەبەر تۆ خـۆم هەڵدەمه

نێو خەرەندێکی قووڵەوە، جا ئەوسا تۆ فەرمان کە بزانە وا دەکەم... فۆما، لەمە زیاتر ئیدی ناتوانم هیچ بڵێم.

خاڵە وەها دەستی ڕاوەشاند وەك بڵێی گەیشتووەتە ئەو بڕوایەی کە ناکرێت لە ڕێی وشەیەکی دیکەوە بیروبۆچوونی خۆی دەربڕێت. ئەو تەنیا پێزانانە و بە چاوانێکی پڕهەڵسەوە تەماشای فۆما فۆمیچی دەکرد. جا پەرەی پێلیتسیناش بەش بە حاڵی خۆی، زیکەزیك بە شان و باڵی فۆمادا هات:

– تەماشا چ فریشتەیەکن!

ساشینکاش جەختی لەسەر کردەوە و گوتی:

– بەڵێ، بەڵێ! فۆما فۆمیچ، من نەمدەزانی ئێوە مرۆڤێکی هێندە باشن، پێشتر بێڕێزیی زۆرم پێ دەکردن. فۆما فۆمیچ، لێم ببوورن! دڵنیا بن لەمەودوا خۆشەویستی دڵمن. وای گەر بزانن ئێستە لای من چەندە بەڕێزن!

باخچییێڤ گوتی:

– بەڵێ، فۆما! لە منی دەبەنگیش خۆش بە! دەی نەمدەناسیی! فۆما فۆمیچ، تۆ نەك هەر بە تەنیا زانستمەند، بگرە پاڵەوانیشی! هەموو ئەندامانی خێزانەکەم لە خزمەتتدان. برالە، ئەسڵەن وا باشە دووسبەی بێی بۆ ماڵی من، لەگەڵ خانمی جەنەراڵ و هەروەها بووك و زاوا... باشە ئەوە چی دەڵێم! هەمووان داوەت دەکەم! پێکڕا شێوێکی باشی بۆ دەخۆین!... عەیبە پیاو باسی خۆی بکا، وەڵێ با

شتێ بڵێم: یانی بۆ میواندارییکردنتان هەموو شتێ دەخەمە سەر مێز بێجگە لە شیری چۆلەکە! بەڵێنی شەرەفتان دەدەمێ!

لەم کاتەدا ناستینکا بەرەو لای فۆما ڕۆیشت و ماچی کرد، گرتیە باوەش و گوتی:

– فۆما فۆمیچ! ئێوە خودانی ئێمەن، هێندە چاکەتان بەسەرمانەوەیە کە هەر نازانم پێزانینی خۆم دەربڕم، هەر ئەوەندە دەزانم کە لەمەدوا دەبمە باشترین خوشکی ئێوە...

نەیتوانی قسەکانی تەواو بکات و گریان زۆری بۆ هێنا. فۆما سەری ئەوی ماچ کرد، چاوی پڕ بوو لە ئەسرین و گوتی:

– ڕۆڵەکانم، ئازیزانی دڵم! پێکەوە بژین و بۆخۆتان دڵخۆش بن و لە ساتەکانی کامەرانیدا جاروبار ئەم پیرەمێرە ئاوارە و کلۆڵە بەسەر بکەنەوە! *لە بەرخۆوە دەڵێین: ڕەنگە هەر بە ڕاستی گوێرەوەری دایکی هێژایی بێ.* وا بزانم ئەمە گوتەی نووسەری بیمێشک گۆگۆڵە، کە هەڵبەتە جاروبار فکری بەپێزیشی بە مێشکدا دێن[1]. دەی، خۆ ئاوارەییش جۆرێکە لە گوێرەوەری! منی وێڵ گۆچانبەدەست بە جیهاندا دەسووڕێمەوە، جا کێ چووزانێ؟ ڕەنگە بە بۆنەی گوێرەوەرییەکانمەوە لەمە زیاتر هێژا ببم! ئەم بیرۆکەیە تاکە سووکنایییدەری منە.

---

١. گۆگۆڵ لە گوتاری *لە بارەی پارمەتیدانی لانەوازانەوە*، دەنووسێت:

... گوێرەوەری مرۆڤ ئارام نەرمونیانتر دەکاتەوە، لەو بارەدا، هەر بە سرووشت باش و خێراتر لە هەندێک بابەت تێدەگات، تەنانەت زۆر باشتر لە ئینسانێک کە لە باری ئاساییدایە... «و. ف»

خاڵە بە هەراسانییەوە هاواری کرد:

– وەڵێ... فۆما، ئاخر دەتەوێ بۆ کوێ بچی؟

هەمووان لە کتوپڕێکدا حەپەسان و سەرنجیان چووە سەر فۆما. جا فۆما بە شکۆیەکی نائاساییەوە پرسیی:

– وەڵێ سەرهەنگ، دوای ئەو هەڵسوکەوتەی کە ئەمڕۆ بەرانبەر منتان نواند، ئایا دەتوانم لە ماڵی ئێوەدا بمێنمەوە؟

دەرفەتیان نەدا قسەکانی تەواو بکات. قیژوهووڕ و ژاوەژاوی ئامادەبووان دەنگی ئەوی داپۆشی. لەسەر قەنەفە دایاننیشاند، دەستیان کردە شین و شەپۆڕە، لێی پاڕانەوە و چووزانم... هیچ نەما نەیکەن. وەڵێ ئەو هەر بە ڕاستی نیازی جێهێشتنی «ئەو ماڵە»ی نەبوو، وەك چۆن ئەو بەیانییە و دوێنێ و هەروەها لەو ڕۆژەوەی کە دەستی بە کێڵانی زەویی باخچەکە کرد، نیازی جێهێشتنی نەبوو. دەیزانی خۆیان دەهاوێنە بەر دەست و پێی و ڕێی لێ دەگرن، جا بە تایبەت لە ئێستەدا، لەبەر ئەوەی کە بووبووە مایەی بەختەوەریی هەمووان و سەرلەنوێ بڕوایان پێی هێنابووەوە و بەسەر دەستانەوە دەیانگێڕا، جا لەسەرووی هەموو شتێکەوە، ئەوەیان بە شەرەف و کامەرانیش دەزانی. لەگەڵ ئەمەشدا، چونکە ئەمڕۆ لەبەر حیزەڵی و ترس لە هەورەبرووسکە و شریخە ناچار بووبوو بگەڕێتەوە، وا دیار بوو کە ئەمە لە ناخەوە بووبووە مایەی ئەشکەنجەی و کەمێك کلکەقنگەی هەستی خۆپەرستییەکەی دەدا و دەیوروووژاند تا دیسان بە جۆرێك لە جۆرەکان ڕۆڵی پاڵەوانانە بگێڕێتەوە، هەروەها لە سەرووی ئەمەشەوە، دیسان دەست بە خۆنواندن بکاتەوە. جا

* بێگانـه *

لـەوەودوا ئیـدی دەیتـوانی پڕ بـە دڵ بـدوێ و بـە شـان و بـاڵی خۆیـدا هەڵبدا و خۆی بسەپێنێت. خۆڕاگرتن لە بەرانبەر وەسوەسەیەکی لەو جۆرە، کارێکی بەرپێنەگیراو بوو. جا هەر خۆیشی ڕانەگرت، دەکۆشا خـۆی لـە دەسـتی ئـەو کەسـانە ڕابپسـکێنێت کـە گرتبوویـان، داوای گۆچانەکەی دەکرد، تکای دەکرد بـەری بدەن تـا بچێت بـۆ هـەر کـوێ کە پێی خۆشە، هەروەها ئەوەی کە ئەو لەم ماڵەدا سووك و سەرشـۆڕ کراوە و تەنیا لەبەر ئەوەش گەڕاوەتـەوە تـا کامـەرانیی ئـەم کۆمەڵەیـە دەستەبەر بکات، جا پرسیی ئایا ئەو دوای ئەمە، دەتوانێت لـە مـاڵی ئـەم مرۆڤـە سـپلانەدا نیشـتەجێ بێـت و شـۆربای خۆشـی کەلـەرم بـە تامی شەقەوە بخوات؟

دواجـار فۆمـا وازی کردوکـۆش بـۆ خۆڕاپسـکاندن و ڕۆیشـتن هـەڵگرت. دووبـارە ئـەویان لەسـەر قەنەفـە دانیشـاندەوە، وەلێ هـەر وا درێژەی بە ڕەوانبێژیی خۆی دەدا و هاواری دەکرد:

– مەگـەر لێرەتـان نەتارانـدم؟ مەگـەر بـەر تەشـەرتان نـەدام؟ سـەرهەنگ، بـۆ ئێـوە، وەك منـاڵانی بێڕەوشـتی سـەر شـەقام، لـە هـەر ئانوسـاتێکدا شـیڕتان بـۆ هەڵنەکێشـام؟ هـا، سـەرهەنگ! بـە تایبـەت دەمـەوێ ئـەوە لێـك بدەمـەوە، چـونکە گـەر بـە کـردەییش شـیڕتان هەڵنەکێشابێ، ئەوا شیڕی ئەخلاقیتان هەڵکێشاوە، شیڕی ئەخلاقی لـە شـیڕی ڕاسـتەقینە خـراپترە. جـا وا باشـە ئـەوە هـەر باسـی شەقکاریش نەکەین...

خاڵە کتوپڕ هاواری کرد:

– فۆمـا، فۆمـا! بـه بیرهێنانـهوهی ئـهم باسـه گیـانم مهكێشـه! خـۆ گـوتم كـه تهنانـهت بـه خوێنیشـم نـاتوانم پهڵـهی ئـهم سـووكایهتییه بسڕمهوه. تـۆ لـێم ببووره! لـه بیری كـه و لـێم خـۆش بـه، بمێنـهوه و بینـهری بهختـهوهریی ئێمـه بـه! ئهمـه هـهمووی لـه سـایهی تۆوهوهیـه، فۆما!...

فۆما هاواری كرد:

– ...من دهمهوێ خۆشم بوێ، دهمهوێ ئینسـانم خـۆش بوێ، وهڵێ ئاخر ئێوه سهرهتا ئینسانیهتم نیشان دهن. به ئاشكرا خۆشهویستیم لێ قهدهغه دهكهن و ئینسانم لێ دهشارنهوه! ئادهی بێنن، ئینسانێكم بۆ بێنن تا بتوانم خۆشم بوێ! له كوێیه ئهم ئینسانه؟ ئهم ئینسانه لـه كوێ خۆی شاردووهتهوه؟ ڕێك وهكو دیـۆژن[1] تـا ئێسـتهی تهمـهنم بـه چـراوه بـۆی گـهڕاوم، وهڵێ نهمدۆزیوهتـهوه و جـا تـا وههـا ئینسـانێ

---

١. دیۆژن (نزیكهی ٣٢٣ تا ٤٠٤ پێش لهدایكبوون)، له فهیلهسووفانی یۆنان و ئهو وتاربێژانهیه كه ژیانێكی سادهیان ههبووه. دهگێڕنهوه كه سامانی ئهو تهنیا یهك دارهدهست و باڵاپۆش و گۆزهیهك بووه. دیۆژن خاوهن تهنزێكی چزوودار بووه و پێگه دونیایی و شانازییهكانی زهمانهی به لاوه گرنگ نهبوونه. ئهسكهندهری مهكهدۆنی كه دهچێته دیدهنیی ئهو، لێی دهپرسێ: *ئایا پێویستیت به هیچ نییه؟* دیۆژهن له وهڵامدا دهڵێ: *ئهرێ، تكا دهكهم له بهر خۆرهتاوی مندا لاكهوه.* لهو كاتهدا یاوهرانی ئهسكهندهر هەڵدهچن و دهیانهوێ دیۆژن تهمبێ بكهن، بهڵام ئهسكهندهر پێیان دهڵێ، گهر ئهسكهندهر نهبام، ئهوا حهزم لێبوو دیۆژهن بم. ئهو بهسهرهاته بهسهر زارانهوه بووه كه دیۆژهن بڕۆژی ڕووناك، به شاردا دهسووڕایهوه و له مرۆڤ دهگهڕا. ئهم بهیتهی مهولهویش بهسهرهاتی ئهوه:

دوێنێ شێخ بـه چراوه هـهر شاری دهپشكنی
گوایه لــــه دێوودرنج بێزارم مرۆڤم ئارهزووه «و. ف»

نەدۆزمەوە ناتوانم هیچ کەسێکم خۆش بوێ. ڕسوایی بۆ ئەوانەی کە کردمیانە بوونەوەرێکی بێزار لە توخمی ئینسان! من هاوار دەکەم: ئینسانێکم نیشان دەن تا بتوانم خۆشم بوێ، کەچی ئەوان فالالیم بە گـژدا دەکـەن! ئایـا مـن دەتـوانم فـالالیم خـۆش بـوێ؟ ئایـا هـەر لـە بنەڕەتەوە دەمەوێ فالالیم خۆش بوێ؟ یان ئایا تەنانەت گەر دڵیشم پێوە بێ دەتوانم فالالیم خۆش بوێ؟ نا. بۆ نا؟ چونکە ئەو فالالییە. بۆچی من ئینسانەکانم خۆش ناوێن؟ چونکە هەموو ئەوەی کە لە جیهاندایە، هەر فالالییە یان شتێکی هاوشێوەی فالالی![1] من فالالیم ناوێ، بێزم لە فالالییەکان دەبێتەوە، من تف دەکەمە ناوچاوانی فالالی، فالالی پاشێل دەکەم و گەر ڕۆژێ سەرپشک بکرێم، ئاسمۆدیۆس[2] هەڵدەبژێرم لە جێی فالالی!

فالالی لەسەر سنگی پێ خۆی بەرز کردبووەوە و لەپشت ئەو ئاپۆرایەوە کە بە دەوری فۆما فۆمیچدا ئەڵقەی بەستبوو، بەوپەڕی داماوییەوە لەوی دەڕوانی. فۆما کتوپڕ ڕووەو فالالی قیراندی:

– وەرە، وەرە ئێرە، ئەی بەڵای گیانی من، وەرە ئێرە! وەرە ئێرە!

---

١. هاوتایە لەگەڵ *بژاردەیەک لە نامە بۆ دۆستان*:

ڕەڵێ چۆن دەکرێ براکانت خۆش بوێن، جا چۆن دەتوانی خەڵکیت خۆش بوێ؟ ڕۆحی مرۆڤ تامەزرۆی خۆشویستنی شتێکی باڵایە، وەڵێ خەڵکی داماو عەیبوعاری زۆریان هەیە و تەنیا بڕە هێژاییەکیان تێدا بەدی دەکرێ! «و. ف»

٢. ئاسمۆدیۆس (هاوتای دێوی ڕق لە ئەفسانە ئێرانییەکاندا)، منداڵی ئادەمە و یەکەمین هاوسەری *لیلیت*ە. «و. ف»

فالالی لە حەیبەتان چوارچاو بووبوو. فۆما دەستی ئەوی گرت و بەرەو لای خۆی ڕایکێشا و هاواری کرد:

– وەرە ئێرە! سەرهەنگ، دەبێ بۆتان بسەلمێ، هەر ئێستە ڕاستێتیی قسەکانمتان لە بارەی تەشەر و شیرهەڵکێشانە هەمیشەییەکانتانەوە بۆ دەسەلمێنم! فالالی، بڵێ بزانم، بەس ڕاستییەکەی بڵێ: تۆ دوێشەو خەونت بە چییەوە بینی؟ سەرهەنگ، چاك گوێ بگرە، ئێستە بەرهەمی خۆتان دەبینن! دەی، فالالی، بڵێ بزانم!

کوڕیژگەی داماو کە لە ترساندا هەڵدەرزی، هەناسەساردانە تەماشایەکی ئاپۆڕاکەی کرد تا بەشکوم کەسێك لەو دۆخەدا بێ بەدەمییەوە، وەلێ هەمووان تەنیا دەلەرزین و تۆقیوانە چاوەڕێی وەڵامی ئەو بوون.

– دەی، فالالی، بڵێ ئیدی، من چاوەڕێم!

فالالی لە جێی وەڵام، ڕووخساریی خوارخێچ کرد و وەك گوێرەکە بۆڕاندی.

– سەرهەنگ خۆ چاوتان لەو لاسارییەیە؟ نەکا ئەمەتان بەلاوە ئاسایی بێ؟ فالالی، بۆ دواهەمین جار لێت دەپرسم: شەوی ڕابردوو چ خەونێکت بینیوە؟

– ئێ...

باخچییێڤ قسەی پێ بڕی و بە دزییەوە گوتی:

- بڵێ خەونت بە منەوە دیوە.

پژێڤیکینش بە گوێکەی دیکەیدای چپاند:

- بڵێ، خەونم بە نەجیبزادانەوە بینی!

فالالی تەنیا چاوی بە چواردەوریدا دەگێڕا، دواجار بە مینکەمینک گوتی:

- خەونم... خەونم بە نەجیب... خەونم بە گای سپییەوە بینی!

جا خوورخوور دایە پرمەی گریان. هەمووان ئاهیان هەڵکێشا، وەلێ فۆما فۆمیچ، کە لە ترۆپکی دڵئاوایی خۆیدا بوو، گوتی:

- فالالی، ویڕای هەموو ئەمەش من ڕاستگۆییت تێدا دەبینم، هەمان ئەو ڕاستگۆییەی کە لەوانی دیکەدا بەدیی ناکەم. بە دەستی خوات دەسپێرم! گەر ئەوانی دیکە دنەت دەدەن تا بە خەونەکانت سەر بخەیە سەرم، ئەوا خوا خۆی هەقم لە تۆ و ئەوانی دیکەش بکاتەوە. جا گەر واش نییە، ئەوا لەو بارەدا ڕاستگۆییت جێی ڕێزی منە، چونکە من خورم بەرەوە گرتووە کە لە بوونی چەپەڵترین بوونەوەرانی وەك تۆشدا ڕووخساری خوا ببینم و هەست بە ئامادەگیی بکەم... فالالی، من لێت دەبوورم! ئەی ڕۆڵەکانم، وەرن و بمگرنە باوەش، من لێرە دەمێنمەوە!...

هەمووان دڵخۆشانە هاواریان کرد:

- دەمێننەوە!

– بـەڵێ، دەمێنمـەوە و دەبـوورم. سـەرهەنگ، شـەکر ببەخشـنە فالالی، با لەم ڕۆژی کامەرانییە سەرتاسەرییەدا نەگریێ.

نواندنی ئەم هـەموو دڵئاواییـە لـە لایـەن فۆما فۆمیچەوە مایـەی سەرسامی بوو. تا ئەم ڕادەیە هاوخەمبوونی ئەوانی دیکە، جا لە وەها هەلومەرجیکیشـدا... ئـاخر لەگـەڵ کـێ؟ لەگـەڵ فـالالی! خاڵـە دەمودەسـت ویسـتی فەرمانەکـە بـەجێبێنێت و شـەکر بداتـە فـالالی. تـەنیا هـەر خـودا دەزانـێ کـە کـوێرا و چۆنچـۆنی ئـاوا دەمودەسـت شـەکردانە زیویەکـە لـە دەسـتی پراسـکۆڤیا ئیلینیچـنادا دەرکـەوت. خاڵە دەیویست بە دەستی لەرزۆکی، دوو کڵۆ شەکر و دواتـر سـێ کڵۆ هـەڵبگرێت کـە لـە دەسـتی کەوتـە خـوارێ و دواجـار وەختێـك تەماشای کرد هێندە خرۆشاوە کە توانای ئەنجامدانی هیچ کارێکی نییە، قیڕاندی:

– ئەی هـاوار! تـۆ تەماشـا، لە وەهـا ڕۆژێکدا چۆن پیـاو تووشـی سەرەگێجە دەبێ! ها بگرە، فالالی!

جا شەکردانەکەی هەڵگرتەوە و خاڵیی کردە نێو گیرفانی فـالالی و وەك مامۆستایانی ئاکار گوتی:

– ئەمەش لەبەر ڕاستگۆییەکەت.

لـەم سـاتەدا ڤیدۆپلیاسـۆ کتـوپڕ لـە بەرئاسـانەی ژوورەکـەدا دەرکەوت و ڕایگەیاند:

– جەنابی کاك کارۆفکین.

کتوپڕ ورتەورتێکی کورت دەستی پێکرد. ئەوەی ڕاستی بێت هاتنی کارۆفکین ناوەخت بوو. هەمووان سەرنجی پرسیارئامێزیان چووە سەر خاڵە. خاڵە بە تۆزێك شپرزەییەوە هاواری کرد:

– کارۆفکین!

جا تەماشایەکی ترسنامێزی فۆما فۆمیچی کرد و ئەمەشی گوت:

– هەڵبەتە خۆ من خۆشحاڵم... وەلێ ئەوەی ڕاستی بێ ئێستە من نازانم کە ئایا لە هەلومەرجێکی لەم جۆرەدا خوڵکی بکەم یان نا. فۆما، تۆ چی دەڵێی؟

فۆما بە ڕوویێکی خۆشەوە گوتی:

– کێشە چییە، قەیدی نییە! کارۆفکینیش داوەت کەن، لێگەڕێن با ئەویش هاوبەشی خۆشیمان بێ.

بە کوریتییەکەی، فۆما ئەو ڕۆژە فریشتەیەك بوو بۆ خۆی! ڤیدۆپلیاسۆ ئاگاداری کردنەوە:

– وەلێ پێویستە بەوپەڕی ڕێزەوە ئاگادارتان بکەمەوە کە کارۆفکین لەسەر خۆیان نین، قوربان.

خاڵە هاواری کرد:

– لەسەر خۆیان نین؟ یانی چی؟ بۆ قسەی قۆڕ دەکەی؟

– کتومت وایە. سەرخۆشن، قوربان...

وەلێ بەر لەوەی خاڵە دەم داپچڕێت، سوور هەڵگەڕێ، بترسێ و بێئیرادە تەریق بێتەوە، مەتەڵەکە خۆبەخۆ هەڵهێنرا. کارۆفکین خۆی لە

بەردەرگـەدا دەرکـەوت و بـە دەسـت ڤیدۆپلیاسـۆڤی پاڵنایـە لاوە و لەبەرانبەر ئەو کۆمەڵە سەرسامەدا ڕاوەستا. پیاوێکی چل ساڵە و تا ڕادەیەك بالآبەرز بوو، وەلێ تۆکمە و چوارشانە. قژێکی کورت و ڕەنگ تاریکی هـەبوو کـە برێك تاڵی سپیی تێکەوتبوو. ڕووخساری خڕ و سوور و چاوانی بچووك و گۆمی خوێن بوون. بۆینباخێکی درێژی بەستبوو کە لە پشترا بە بەرەزبانە[1] توووند کرابووەوە. کۆتێکی داوێن لۆچی ئێجگار کۆنـە و پڕ لـە کوڵك و ڕیشووی لـە بـەر بـوو کـە ژێـر باڵەکەشی بە تەواوی شڕ بووبوو، هەروەها پانتۆڵێکی لە پێ بوو کە بۆ باس ناشێ و کلآوێکی فرە کۆنەشی بە دەستەوە بوو. کاکم بە تەواوی سەرخۆش بوو. لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا ڕاوەستا، سەری دەسـووڕا و ڕەت دەیـبردەوە وەك ئـەوەی کـە بـە لـووتی دەنـووك بوەشێنێ، جا دواتر بە هێمنی تا بناگوێ دەمی دادڕی و گوتی:

- ببـوورن، کـاك و خانمـان! مـن... ئـەوەم... (جـا پلتـۆکێکی بـە یەخەکەیدا کێشا) وەرگرت!

ژنـی جەنـەراڵ خێـرا سـیمای مرۆڤێکـی بـە خـۆوە گـرت کـە سـووکایەتی بـە سـەنگی کرابێـت. فۆمـا، هـەر وا لەسـەر قەنەفـە دانیشتبوو، بەدەم تیزخەنەوە میوانەکەی هەڵدەسەنگاند. باخچییێڤ واقووڕ کە هەڵبەتە کەمێك هەستی هاوخەمیشی تیدا دەبینرا، لـەوی دەڕوانـی. هەسـتی شـەرمەزاریی خاڵـە لـە ئەقڵدا نـەبوو، ئـەو کـە لـە ناخەوە نیگەرانی کارۆفکین بوو، ویستی شتێك بڵێت:

---

[1] بەرەزبانە، ئاڵقەزوانە، سێر، قرتێفە، ئەڵقەی ددانەداری کانزایی کە کورەکی تێدایە و بۆ توووندکردنی تایبشی کەمەر و کەوش و بەرەزین و... بە کار دێت.

- کارۆفکین! گوێ بگرن!

کارۆفکین قسەی پێ بڕی:

- ئانانـدی[1]، قوربـان. خـۆم دەناسـێنم: ئـەوە مـنم، ڕۆڵـەی سرووشت... وەلێ ئەوە چییە لەپێش چاوم؟ من لێرە چەند خانمێ دەبینم...

جا بە بزەیەکی چڵێسانەوە تەماشای خاڵەی کرد و درێژەی پێدا:

- ئەی نارەسەن، بۆ پێت نەگوتم کە ئێرە خانمیشی لێیە؟ هیچ نییە! ترسی ناوێ! با شتی ناسکیش بناسین...

بە دژواری زمانیی دەبزواند و لە هەر وشەیەکدا دەگیرا.

- ئەی خانمانی دلڕفێن و جوان! ئێوە وا مرۆڤێکی چارەڕەشتان لە بەرچاوە کە... دەی ئیدی، شتێکی لەو جۆرە... ئەوی دیکەی بۆ گوتن ناشێ. هۆ ژەنیاران! پۆلکا بژەنن!

میزینچیکاف لە سەرخۆ لێی نزیک بوورەوە و گوتی:

- باشتر نییە ئێوە کەمێ بخەون؟

- بخەوم؟ ئەوە سووکایەتیم پێدەکەن؟

- هەرگیز! دەزانن، دوای سەفەر وا باشە...

کارۆفکین بە تووڕەیی گوتی:

---

1. بوەستن. (فەڕەنسی). «و. ف»

– هەرگیز! تۆ وا دەزانی من سەرخۆشم؟... هەرگیز... ئەرێ بە ڕاست، لە ماڵی ئێوەدا شوێنی خەوتن لە کوێیە؟

– وەرەن با بچین، من ڕێنماییتان دەکەم.

– بۆ کوێ بچین؟ عەمار؟ نا، برالە، ناتوانی فێڵم لێ بکەی! من دوێشەو لەوێ خەوتبووم... وەڵێ دەی، با بچین... جا بۆ نەکەومە گەل مرۆڤێکی هێندە باش؟... من سەرینم ناوێ، خۆ سەرباز پێویستیی بە سەرین نییە. برالە، تەنیا قەنەفەیەك، تەنیا یەك قەنەفەی بچووکم بۆ دەبر کە...

جا لەم ساتەدا ڕاوەستا و ئەمەشی بۆ زیاد کرد:

– هی، گوێ بگرە... دەبینم تۆ کوڕێکی چاکی، شتێکی دیکەشم بۆ دەبر کە... تێدەگەی؟ ڕۆمئۆ، هەر بەشی ئەوەی کە گەروێکی پێ تەڕ کەم... ئەرێ، تەنیا گەروێك تەڕ دەکەم، یانی تەنیا بنەپیاڵەیەك.

میزینچیکاف لە وەڵامدا گوتی:

– زۆر باشە، زۆر باشە!

– دەی... بوەستە، هیچ نەبێ با خواحافیزی بکەم... Adieu, mesdames H Mesdemoiselles[1]... ئێوە... چووزانم، سیحرتان لە دڵی من کرد... دەی، هیچ نییە! دواتر دەمەتەقێ دەکەین... وەڵێ هەر کە ویستتان دەست پێبکەن، تەنیا ئاگادارم

---

١. ماڵئاوا، خاتون و پاکیزەخاتونان. (فەرەنسی).

بکەنەوە... یان هەر پێنج خولەك پێشتر ئاگادارم بکەنەوە... بێ من دەست پێ نەکەن ها! خۆ گوێتان لێیە؟ بێ من دەست پێنەکەم!

جا ئەو کابرا خۆشسەیرە بەدوای میزینچیکافدا لە چاو ون بوو.

هەمووان قرِوقەپ بووبوون. سەرسامی و وڕبوون هەروا باڵی بەسەردا کێشابوون. سەرئەنجام فۆما بە کاوەخۆ و دەنگی نزم دەستی کردە پێکەنین، دەنگی پێکەنینەوەکەی بەرز و بەرزتر بووەوە و بەرەبەرە بووە قاقا. بەم ڕووداوە، ژنەی جەنەراڵیش کەمێك دڵخۆش بوو، گەرچی هێشتا ئەو بارەی بە سەروسەکوتییەوە پاراستبوو کە گوایە سووکایەتی بە سەنگی کراوە. دەنگی پێکەنینی ئامادەبووان لە هەموو لایەکەوە بەرز بووەوە. خاڵە کە سوور هەڵگەڕا بوو و هێندەی نەمابوو فرمێسك بزێتە چاوی، ڕێك هەروەك کەسێکی تاساو تا ماوەیەك نەیدەتوانی یەك وشە بڵێ. دواجار هاتە گۆ و گوتی:

– خوایە گیان! کێ شتی وای بە خەیاڵدا دەهات؟ وەلێ ئاخر... ئاخر بۆی هەیە هەر کەسێ وەها شتێکی بەسەردا بێ. فۆما، دڵنیات دەکەمەوە کە پیاوێکی ئاوڕوودار و ڕەسەن و تەنانەت حەکیمێکی بێوێنەشە. فۆما... جا خۆت دەیبینی!...

فۆما کە لەبەر پێکەنین کەوتبووە خێسەخێس، لە وەڵامدا گوتی:

– دەبینم، قوربان، دەبینم... حەکیمێکی بێهاوتایە، بەڵێ، هەر بە ڕاستی حەکیمە!

یژێڤیکین لە سەرخۆ گوتی:

- زۆر باش شارەزای ڕێگەی ئاسنە و شتانێکی سەرنجڕاکێش دەڵێ، قوربان!

- فۆما!...

خاڵە دەیوست درێژە بە قسەکەی بدات، وەلێ قاقای ئامادەبووان دەنگی ئەوی شاردەوە. فۆما بە چەشنێك کەوتبووە حیلکەحیلك کە خاڵە بە بینینی ئەو لە تریقەی پێکەنینی دا و بە جۆشوخرۆشەوە گوتی:

- دەی، ئەوە کەی گرنگە! فۆما، تۆ زۆر دڵئاوای، دڵت دەریایە. تۆ بوویتە مایەی بەختەوەریمان... کەواتە بێ گومان لە کارۆفکینیش دەبووری.

لەم نێوەندەدا تەنیا ناستینکا پێنەدەکەنی. بە چاوانێکی کەیل لە ئەورینەوە وەها لە دەزگیرانەکەیی دەڕوانی، کە وەك ئەوەی بیەوێ بڵێت، *تۆ چەندە باش و نەرمونیانی، ئای کە پیاوێکی بەشەرەفی و وای کە من چەندەم خۆش دەوێی!*

# بەشی شەشەم

## کۆتایی

سەرکەوتنی فۆما بنجبڕانە و پتەو بوو. هەر لە ڕاستیشدا هیچ کێشەیەك بەبێ ئەو چارە نەدەکرا، هەر گومان و دوودڵییەکیش کە لەم بابەتەدا هەبوو، لەگەڵ ئەم ڕووداوەدا لەنێو چوو. سووپاسگوزاری و پێزانیی جووتە دڵدارە بەختەوەرەکە و ئەوانی دیکەش لەبەرانبەر فۆمادا، کۆتایی نەبوو. هەر کات کە دەمویست بە جۆرێك لە جۆراکان و ناڕاستەوخۆ خاڵە و ناستینکا لەوە تێبگەیەنم کە بۆچی فۆما بە زەماوەندکردنی ئەوان ڕازی بووە، تەنیا بە سەرسامی دەستێکیان ڕادەوەشاند. ساشینکا هاواری دەکرد، *فۆما فۆمیچی دڵباش، من وا خەریکم بەرگەپشتێت بۆ دەچنم!* تەنانەت واشی لێهاتبوو منیان سەرکۆنە دەکرد کە گوایە لە ئاست ئەودا دڵڕەقم. گەر بمویستبا بچووکترین بێڕێزی بە فۆما فۆمیچ بکەم، لام وایە هەر هەمان ئەو ستێپان ئالێکسییڤیچ باخچییڤەی کە ئیدی بە تەواوی بۆچوونی گۆڕابوو، دەمودەست دەیخنکاندم. ئەو ئیدی وەك سەگێك دوای فۆما فۆمیچ دەکەوت و بە ڕێزەوە لێی دەڕوانی و هەر وشەیەکی لە دەم دەربچووبا، ئەو خێرا دەیگوت، *فۆما*، *تۆ*

*جوامێرترین پیاوی سەر ڕووی زەویی! تۆ زانستمەندی، فۆما*! یژێڤیکینیش بە تەواوەتی شاگەشکە بووبوو. پیرەمێردی داماو لە مێژە ئاگاداری ئەوە بوو کە ناستینکا ئەقڵی لە سەری ئیگۆر ئیلیچدا نەهێشتووە، جا هەر لەو ساتەوە، لە خەو و بێداریدا تەنیا دالغەی لای ئەوە بوو کە هەرچۆنێك بووە کچەکەی بداتە ئەو و بێرادە پابەندی ئەم بیرۆکەیەش بوو و تەنیا ئەو کاتەش دەستی لێهەڵگرت کە ئیدی لەسەررۆیشتنی بووە کارێکی دژوار. وەلێ فۆما فۆمیچ کێشەکەی چارە کرد. هەڵبەتە پیرەمێرد (سەرەڕای کامەرانیی)، لەوە ئاگادار بوو کە لە ناخی فۆما فۆمیچدا چی دەگوزەرێ. بە کورتی، ئەوە قسەی لەسەر نەبوو کە پادشایەتیی فۆما فۆمیچ لەمماڵەدا تاهەتا درێژە دەکێشێت و ملهووڕییەکەی هیچ کۆتاییەکەی بۆ نییە. ئەوە ڕوونە کە تەنانەت بەدخوو و سەرەڕۆترین مرۆڤەکانیش کاتێك کە ئارەزووەکانیان دێنە دی، بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت نەرمونیان دەبن، وەلێ ئەم پرسە بۆ فۆما فۆمیچ بە تەواوی پێچەوانە بوو. ئەو دوای هەر سەرکەوتنێك دەبەنگتر دەبوو و زیاد و زیادتر پێی لێ ڕادەکێشا. ڕێك بەر لە فراوێن و دوای ئەوەی جلەکانیی گۆڕین، لەسەر قەنەفە دانیشت و خاڵەی بانگ کرد و لەنێو تەواوی ئەندامانی بنەماڵەکەدا سەرلەنوێ دەستی بە گوتاری ڕەخنەگرانە کردەوە:

– سەرهەنگ وا ئێوە بە شێوەیەکی فەرمی هەنگاو دەنێنە ژیانی ژن و مێردایەتییەوە. خۆ نەزانن کە خەریکن دەچنە ژێر باری بەرپرسیارییەتییەکەوە کە...

جا نـازانم چـی و چـیی دیکـەش، ئێـوە بـن و خـودا دە لاپـەڕ لـە گۆڤـاری Journal des Debats[1]، بـە ورتـرین خـەت و پـڕ لـە تۆقێنـەرترین هەڵیتوپـەڵیت بێننـە بەرچـاوی خۆتـان. قسـەکانی ئـەو هـیچ ئاماژەیـەکیان لـە بـارەی ئەرکـەکانی ژن و مێردایەتییـەوە تێـدا نـەبوو، بەڵکـە تـەنیا پیاهەڵـدانێکی ڕووقامییمانـە بـوون لـە بـارەی زیرەکـی، نـەرمونیانی، دڵئـاوایی، دلێـری و بەخشـندەیی خۆیـەوە. هەمووان برسییان بوو و حەزیان دەکرد فراوێن بخۆن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، کەس زاتی نـەبوو نـاڕەزایی دەربڕێـت و هـەمووی بەوپـەڕی ڕێزەوە تا کۆتایی گوێیـان لـەم فلتەفلتـە گـرت، تەنانـەت باخچـییڤیش بـەو چلێسـییە بێرادەیەیـەوە، بەڕێزانـە و بـەبێ جووڵـە تـا کۆتـایی لەگـەڵیان دانیشـتبوو. دواجـار فۆمـا فـۆمیچ، کـە وا دیـار بـوو لـە زمانپـاراویی خـۆی ڕازییـە، کەوتـە هـەوای خـۆی و تەنانـەت بـەر لـە فـراوێن بـە ڕووێکـی گەشـاوەوە تێـری خـواردەوە و بـەدەم خواسـتنی سەیروسـەمەرەترین ئاواتـەوە پێکـی بـەرز دەکـردەوە. دەسـتی کـردە گاڵتەوگـەپ و بـە تایبـەت سـەری دەخسـتە سـەر لاوەکـان. هـەمووان قاقایـان لـێ دەدا و چـەپڵەیان دەکـوتی، وەڵێ هەنـدێك لـە گاڵتـەکان هێنـدە ناشـیرین و قێـزەون بـوون کـە تەنانـەت باخچـییڤیش تـەریق دەبـووەوە. دواجـار ناسـتینکا لەپشـت مێزەکـە هەسـتایەوە و لـە شـەرمان ڕایکـردە دەرێ. کەیفخۆشـیی فۆمـا لـەم بارەیـەوە لـە باسـدا نـەبوو، وێـڕای ئـەوەش، خێـرا هاتـەوە سـەر خـۆی و بـە ڕسـتەیەکی

---

١. ڕۆژنامەی مشتومڕی ئەدەبی و سیاسی: هەروەها بڵاوکراوەی بەهێز و بەپارێزی فەڕەنسی لە سەدەکانی نۆزدە و بیستدا کە لە ساڵی ١٧٨٩ تا ١٩٤٤ لە پاریسدا بڵاو دەکرایەوە. «و. ف»

کورت و بەپێز تاریفی ناستینکای دا و بە خۆشیی پاکیزەی پێوارەوە پێکی هەڵدا. خاڵە کە چەند خولەکێك وڕ و نارەحەت بوو، لەو ساتەدا ئیدی ئامادە بوو باوەش بە فۆما فۆمیچدا بکات. بووك و زاوا، بە گشتی دەتگوت شەرم لە یەکدی دەکەن و بەوە تەریق دەبوونەوە کە هەستیان بە کامەرانی دەکرد... من ئاگادار بووم کە لە ساتی ڕاگەیاندنی مارەبڕینەکەدا یەك وشەیان لەگەڵ یەکدی نەگوتبوو و تەنانەت خۆیان لە تەماشاکردنی یەکدی دەدزییەوە.

کاتێك هەمووان لەپشت مێز هەستاینەوە، کەس نەیزانی خاڵە کتوپڕ چۆن پێوار بوو. بەدوای خاڵەدا چووینە هەیوان. فۆما لەسەر ئەسکەملەیەك دانیشتبوو و بەدەم قاوەخواردنەوەوە، بە قینێکی فرەوە خەریکی قسەی بێسەروبەر بوو. تەنیا بەڕێز یەژێڤیکین، باخچییێڤ و میزیچیکافی لا بوون. من ڕاوەستام و گوێم گرت. فۆما بە دەنگی بەرز گوتی:

– بۆچی، هەر بە ڕاستی بۆچی من ئێستە ئامادەم لە پێناو بیروباوەڕەکانم بە نێوجەرگەی ئاگردا ڕابوورم؟ بۆچی هیچ یەك لە ئێوە ئامادەی وەها کارێ نییە؟ بۆچی؟ بۆچی؟

یەژێڤیکین بە ڕابواردنەوە گوتی:

– فۆما فۆمیچ، ئاخر چوونە ناو ئاگر کارێکی بێمانایە، قوربان! دەی، سوودی چییە؟ یەکەم بەئازارە، قوربان، دووەم، کە تۆی سووتاند، ئیدی چیت لێ دەمێنێتەوە؟

– چیم لێ دەمێنێتەوە؟ خۆڵەمێشی جوامێری! وەڵێ ئاخر تۆ کەی لەم شتانە حاڵی دەبی، تۆ کەی گرنگی بە من دەدەی! بە

بۆچوونی ئێوە بێجگە لە سیزارەکان و کەسانی وەك ئەسکەندەری مەکەدۆنی هیچ ئینسانێکی گەورە بوونی نییە! ئادەی بزانم، ئەم سیزارانەی تۆ بۆ نموونە چ ئیشێکی گرنگیان کردووە؟ کامەرانیی چ کەسێکیان دابین کردووە؟ ئەم ئەسکەندەری مەکەدۆنییەش کە هێندە بە شانوباڵیدا دێی، چ کارێکی ئەنجام داوە؟ دەستی بەسەر دونیادا گرتووە؟ دەی، گەر لەشکرێکی ئاوهاش بدەنە من، دەست بەسەر دونیادا دەگرم، تۆش دەستی بەسەردا دەگری، ئەوی دیکەش دەستی بەسەردا دەگرێ... کەچی ئەسکەندەر، لەبری ئەوە کلیتۆسی هێژای کوشت، وەڵێ گەر من لە جێی ئەو بام، ئەو لاوە داماوە — کلیتۆس—م نەدەکوشت... خوێڕیی چەپەڵ! لە جێی ئەوەی لە مێژوودا تاریفی بدەن، دەبوو بە شووڵ بەربنە گیانی... هەم ئەو و هەم سیزاریش، دەبوو هەردووکیان تەمبێ کەن!

— فۆما فۆمیچ، لانیکەم دەسپارێزی لە سیزار بکەن!

فۆما هاواری کرد:

— من دەست لە دەبەنگ و شتی وا ناپارێزم!

ستێپان ئالێکسیێڤیچ باخچییێڤ کە سەرخۆش بوو، بە تین و تاوەوە خۆی تێهەڵقورتاند و گوتی:

— نا، دەسپارێز نەکەی! هیچ هۆکارێ نییە بۆ ئەوەی دەسپارێزیان لێ بکەی، ئەوانە هەموویان پریگونن[1]، هەر ئەوە

---

١. واتای بزاوت و ناوی دەستەیەك مەسیحییە کە لە سەرەتاکانی ساڵانی ٥٠ی سەدەی نۆزدەیەم لە ئیمپراتۆریەتی ڕووسیادا بەرهۆی سەندبوو. پریگۆنەکان لەنێوان خۆیاندا گەنجێکیان، کە خۆشئاواز (بۆ دوعاخوێندن) و چالاك بوو، وەك پەیامبەرێك هەڵدەبژارد. پەیامبەرەکە پێویست بوو لار بێت، چونکە کەسانی بەتەمەن لە کاتی ڕێوڕەسمی

دەزانن لەسەر یەك پێ بخولێنەوە و هەڵبەزودابەز بکەن! فاشیستگەلی باسترمەفرۆشی نە![1] هەر دوێنێ یەکێکیان دەیویست بچێ بۆرس وەربگرێ. جا هەر خوا دەزانێ کە مانای ئەم بۆرسە چییە! گرەو دەکەم کە ئەمەش جۆرە خوێڕیگەرییەکی نوێیە کە هێناویانەتە ئارا. ئەم ماوەیە یەکێکی دیکەیان لە کۆڕێکی خانەدانانەدا گەرچی تەواو سەرخۆش بوو، کەچی هەر داوای رومی دەکرد! *باشە بۆ نەخۆینەوە؟* بەڵێ، تۆ بخۆرەوە، بخۆرەوە و ئێستێ بکە و دواتر هەمدیسان بخۆرەوە... ئەوانە نابێ دەسپارێزییان لێ بکرێ! هەموویان کڵاوچین! تەنیا تۆ زانستمەندی، فۆما!

باخچییێڤ کە ملکەچی کەسێك دەبوو، بە تەواوی و بێ هیچ مەرج و ناڕەزایەتییەك ملکەچ دەبوو.

من چووم بۆ باخ و لای ئەستێڵك، لە هەمان ئەو جێیە چۆڵەدا چاوم بە خاڵە کەوت... لەگەڵ ناستینکا بوو. ناستینکا کە منی بینی، چون مرۆڤانی تاوانبار زۆر بە خێرایی فرکەی کردە لای دەوەنەکان و دوور کەوتەوە. خاڵە بە ڕووخسارێکی گەشاوەوە بەرەو

---

حاڵکردندا، کە لە ڕێوڕەسمە ئاینییەکانی ئەوان بوو، زوو ماندوو دەبوون. پریگۆنەکان دەبوو لەم ڕێوڕەسمەدا هێندە حاڵ بکەن تا لە هۆش دەچوون و دەکەوتنە سەر زەوی. بۆی هەیە وشەی پریگۆن لێرانەدا (بە مانای بزاوت)یش بەکار هاتبێت. ڕەوتەکانی دیکە، پریگۆنەکانیان بە لەدینهەڵگەڕاوە دەزانین. «و. ف»

١. تانەیە لە ئەڵمانییەکان. ئەرستۆکراتە ڕووسییەکان، لە هەمبەر بیانییەکاندا بەدبین بوون و بڕوایان وا بوو کە پێویستە بخرێنە ژێر چاودێرییەوە، گەرنا ڕووسیا لەنێو دەبەن. «و. ف»

پـیرم هـات، لـه دڵخۆشـیان چاوانی فرمێسـکیان تـێ زابـوو. هـەردوو دەستمی گرتن و توووند گوشییینی و گوتی:

– هاوڕێکەم! هێشتا هەر ناتوانم باوەڕ بەم بەختەوەرییە بکەم... هـەروەها ناسـتینکاش. ئێمـه هێشـتا سەراسـیمەین و سوپاسـی خـوا دەکەین. ناستینکا ئێسته خەریکی گریان بوو. دەزانـی، هێشـتاکەش هەسـت و هۆشـم نەهاتوونەتـەوە سـەر خۆیـان و بـه تـەواوی تاسـاوم، هەم باوەڕ دەکەم و هەمیش باوەڕ ناکەم! چۆن ئاوا شکایەوە؟ بۆچی؟ بۆ من چیم کردووە تا شایەنی وەها پاداشتێ بم؟

به گوڕوتینەوە گوتم:

– خاڵه گیان، گەر کەسێ شایەنی پاداشـت بـێ، ئـەوە بـێ گومـان ئێوەن... من تا ئێستـەش کەسێکم نـەدیوە وەك ئێـوە ڕاسـتگۆ و بـاش و دڵنەرم بێ...

له وەڵامدا بە حەسرەتەوە گوتی:

– نا، سیریۆژا، نا، ئەمە زیادەڕۆییە. مەسـەلەکە ئەوەیـە کـە ئێمـه هـەر کـات حاڵمـان باشـه، چاك و نـەرمونیانین (هەڵبەتـه لەمـەدا تـەنیا مەبەستم خۆمه)، جا هەر کاتیش حاڵمان خراپە، هـیچ کـەس ناوێرێ لێمـان نزیـك بێتـەوە! ئێسـته مـن و ناسـتینکا خـەریك بـووین باسـی ئـەوەمان دەکـرد. مـن دایمـه بـه چـاوی خـۆم هێـژایی فۆمـام دەبینـی، باوەڕ دەکەی؟ تەنیا مەسەله ئەوە بوو کە دەتگوت تا ئـەمڕۆش بـڕوام پێـی نـەکردبوو، کەچـی هارکـات تـۆم دڵنیـا دەکـردەوە کـه مرۆڤێکـی تەواوە، تەنانەت دوێنێش کە ئەو دیارییە چاکەی ڕەد کـردەوە، هـەر

باوەڕم پێی نەکرد! وا ئێستە هەر شەرم لە خۆم دەکەم! کە بیر لە هەڵسوکەوتی ئەمڕۆم دەکەمەوە، کزەی دڵم دێ! وەلێ ئاخر، بە دەست خۆم نەبوو... ئەمڕۆ کە باسی هێنایە سەر ناستینکا، وەك ئەوە وابوو کە شتێ بە دڵمدا بچەقێنێ. ئیدی بەرچاوم ڕەش بوو و وەك گورگێکی دڕندە هەڵسوکەوتم لەگەڵ کرد...

– وا نییە خاڵە گیان، ئاسایی بوو.

خاڵە دەستەکانیی ڕاوەشاندن و گوتی:

– نا، نا، براله، شتی وا مەڵێ! هۆکارەکەی تەنیا ئەوەیە کە من هەر بە سرووشت مرۆڤێکی گەندەڵم، ڕووتاڵ و خۆویست و ئارەزووبازم و زیاد لە ڕادە گیرۆدەی هەوەسم. قسەی فۆماش هەر ئەمەیە.

دەی، چ وەڵامێك بە کەڵکی وەها پاساوێك دێت؟ جا خاڵە لە ناخی دڵەوە درێژەی پێدا:

– سیریۆژا، تۆ نازانی کە من هەندێ جار چەندە بەدخوو و بێبەزەیی و خۆپەرست بووم، جا نەك هەر بە تەنیا لە پەیوەندیم لەگەڵ فۆمادا! ئێستە کە هەموو ئەم شتانەم دێنەوە یاد، هێندە شەرمەزارم کە لام وایە من تا ئێستە شتێکی وام نەکردووە تا شایەنی ئەم کامەرانییە بم. ناستینکاش ئێستە هەر ئەوەی گوت، گەرچی، ئەوەی ڕاستی بێ، نازانم ئاخۆ دەبێ تووشی چ گوناحێ بووبێ، ئاخر خۆ مرۆڤ نییە، بگرە فریشتەیەکە بۆ خۆی! دەیگوت، ئێمە زۆر قەرزاری خواین و دەبێ لەمەودوا هەوڵ دەین زۆر دەست و

دڵکراوەتر بین و چاکە بکەین... گەر دەتبیست کە ئەو بە چ گەرموگوڕییەکەوە ئەم قسانەی دەکرد! خوایە گیان، ئای لەو کچە نازدارە!

هێندە خرۆشابوو، ئێستێکی کرد و ساتێك دواتر دیسان درێژەی پێ دایەوە:

– براله، ئێمە بڕیارمان دا لەمەودوا زۆر بەدەم فۆما و دایەگیان و تاتیاناوە بین. ئاه، تاتیانا ئیڤانۆڤنا! ئای لەو بوونەوەرە شەریفە! ئاخ من چەندە ستەمکارم بوومە لەبەرانبەر هەمووانیدا! لە ئاست تۆشدا ستەمکار بوومە... وەلێ واووەیلا بۆ کەسێ کە بیەوێ ئازار بە تاتینا ئیڤانۆڤنا بگەیەنێ! جا ئەوسا... دەی، ئیدی گرنگ نییە!... دەبێ خەمێك لە میزیچیکافیش بخۆم.

– بەڵێ، خاڵە گیان، بۆچوونی منیش لە بارەی تاتیانا ئیڤانۆڤناوە گۆڕا. ئەم ژنە شیاوی ڕێزلێنان و خۆشویستنە.

خاڵە خرۆشاوانە گوتی:

– کتومت، کتومت! شیاوی ڕێزلێنانە! هەروەها ئەو کارۆفکینەش!

جا دڕدۆنگانە لێی ڕوانیم و گوتی:

– ڕەنگە پێکەنینت پێی بێ، هەموومان ئەمڕۆ پێی پێکەنیین. لە بارێکدا کە ڕەنگە خوا لێمان خۆش نەبێ... ئاخر دەشێ ئەو لە باشترین و میهرەبانترین مرۆڤەکان بێ، بەس چارەنووس... تووشی

ئەم بەدبەختییەی کرد... باوەڕ ناکەی، ولێ ڕەنگە هەر بە ڕاستی وا بێ.

– نا، خاڵە گیان، ئاخر بۆچی باوەڕ نەکەم؟

جا بە تینوتاوەوە دەستم کردە باسی ئەوەی کە بۆی هەیە نزمترین بوونەوەرەکانیش هێشتاکە هەستگەلی بەرزی مرۆڤانەیان تێدا مابێتەوە، هەروەها قووڵایی ناخی مرۆۋ هێشتا هەر نەناسراوە و نابێ مرۆڤە نزمەکان سەرکۆنە بکرێن و بەڵکە بە پێچەوانەوە، پێویستە گوێیان بۆ شل بکرێت، دەستیان بگیرێت و هەڵبستێنرێنەوە، هەروەها پێوەرە باوەکانی چاکە و ئاکار و نازانم چی و چی بۆ ئەم مەبەستە نەشیاون، بە کورتییەکەی گەرم بووبووم و تەنانەت دونیایەك چەنەم لە بارەی قوتابخانەی ناتۆراڵەوە دا و لە کۆتاییشدا ئەم هۆنراوەیەم خوێندەوە:

*ئەوسا کە لە تاریکدا گومڕایت...*[1]

خاڵە بە تەواوی شاگەشکە بووبوو و خرۆشاوانە گوتی:

– هاوڕێکەم، ئەی براکەی خۆم! تۆ هەر بە تەواوی تێم دەگەی و تەنانەت لە خۆشم باشتر قسەکانی دڵم دەکەی. ڕێك وایە! ئای خوایە گیان! باشە وەچەی ئادەم بۆ ئاوا شەڕەنگێزە؟ بۆچی من زۆربەی

---

١. شیعری بەناوبانگی نیکۆلای نیکراسۆڤ کە یەکەمین جار لە ١٩٤٦ لە *یادداشتە نیشتمانییەکان*دا بڵاو کرایەوە. کاکڵەی ئەم شیعرە، کە هەستانەوەی بوونەوەری خراپ و بزوێنەری تایبەتمەندیی باڵای مرۆڤانەیە لەودا، لە هزری دۆستۆیڤسکییەوە نزیك بوو. دۆستۆیڤسکی بڕگەیەك لەم شیعرەی، لە پەڕەگرافێکی وەرزی دووەمی *یادداشتە ژێرزەمینییەکان*دا گواستووەتەوە. «و. ف»

کات هەڵدەچم، ئەمەش لە کاتێکدا کە نەرمونیانی شتێکی ئاوا باش و ناوازەیە؟ ناستینکاش ئێستە ڕێك وای دەگوت...

جا لە بارێکدا کە لە دەوروبەریی دەڕوانی، بۆی زیاد کرد:

– تەماشا، ئێرە شوێنێکی ئێجگار باشە، ئای لەو سرووشتە! وای لەو تابلۆیە! بەخ لەو درەختە! تەماشا کە: لە باوەشدا جێگەی دەبێتەوە! وای لەو شیلەیە، بەخ لەو گەڵایانە! وای لەو خۆرەتاوە! ئای کە چۆن دوای هەورەبرووسکە و گرمە هەموو شتێ تەڕوبڕ و خاوێن دەبێتەوە!... پیاو وای بۆ دەچێ کە درەختەکانیش بۆ خۆیان لە شتگەلێك دەگەن و هەستیان هەیە و چێژ لە ژیان دەبەن... هەر بە ڕاستی وایە... ها؟ ڕای تۆ چییە؟

– ڕێی تێدەچێ، خاڵە گیان. هەڵبەتە، بە شێوازی خۆیان...

– ئاخر، بەڵێ، بە شێوازی خۆیان... پەروەردگار سەرسووڕهێنە، سەرسووڕهێن!... سیریۆژا، بێ گومان باش کونج و کەلەبەری ئەم باخەت بیر ماوە. ئای کە بە منداڵی چ یاری و فڕکەفڕکێکت بێرانەدا دەکرد!

جا هەروا بەدەم سەیرکردنی من و بە سیمایەکەوە، کە ئەوین و هەستی بەختەوەرییەکی وەسفهەڵنەگری لێ دەباری، لەسەری ڕۆیشت:

– بیرم دێ کە منداڵ بووی، بۆت نەبوو بە تەنیا لە چواردەوری ئەستێڵەکەدا یاری بکەی. بیرت دێ کە عەسرێکیان کاتیای خوالێخۆشبوو بانگتی کرد و لاواندتیەوە... بەر لەوە بە دڵی خۆت بە

باخەکەدا ڕات کردبوو و ڕووخسارت گەشابووەوە، قژەکانت زۆر کاڵ و لوول بوون... کاتیا، کاتیا بەدەم گەمەکردن بە قژتەوە، گوتی، *باشت کرد ئەم منداڵە هەتیوەت هێنایە لای خۆمان*. بیرت دێ یان نا؟

– تەنیا هەندێ شت، خاڵە گیان.

– هەر دەڵێی دوێنێ بوو کە ئێوە دووبەدوو لەژێر ڕووناکیی هەتاو دانیشتبوون و منیش لە لایەکەوە سەبیلم دەکێشا و لێتانم دەڕوانی...

جا پاشان خاڵە بە شێوازێکی هێدی، کە خەفەتێکی لەرزۆکی گریاناویی تێدا هەست پێدەکرا، لەسەری ڕۆیشت:

– سیریۆژا، من هەر مانگێ دەچمە شار، سەرێکیش لە گۆڕەکەی ئەو دەدەم. ئێستە لەگەڵ ناستینکا باسی ئەوەم دەکرد، ئەویش گوتی، لەمەودوا پێکەوە دەچینە سەردانی...

لەم ساتەدا سەروسەکوتی ڤیدۆپلیاسۆڤ دەرکەوت. خاڵە بە هەیەجانەوە هاواری کرد:

– ڤیدۆپلیاسۆڤ! لە لای فۆما فۆمیچەوە دێی؟

– نەخێر قوربان، زیاتر بە بۆنەی ئیشی خۆمەوە هاتووم.

– ئەها، چاکت کرد! دەی ئێستە وەرە و باسی کارۆفکینم بۆ بکە. دەمویست زووتر لێت بپرسم... سیریۆژا، من فەرمانم پێ کردبوو ئاگای لە کارۆفکین بێ. دەی، ڤیدۆپلیاسۆڤ، باس کە بزانم، چی بووە؟

ڤیدۆپلیاسۆڤ گوتی:

– پێویسته بیرتان بێنمەوە کە دوێنێ بڕیار درا داواکەم جێبەجێ بکەن و بەڵێنتان دا لەو ئازارانەم نەجات بدەن کە ڕۆژانە تووشیان دێم، قوربان.

خاڵە تۆقیوانە هاواری کرد:

– نەکا دیسان مەسەلەی گۆڕینی ناسناوی بنەماڵە بێ؟

– چارەم چییە، قوربان؟ ئەم ئازارانەی کە لە هەر ئان و ساتێکدا...

خاڵە کە ئیدی تەنگی پێ هەڵچنرابوو، گوتی:

– ئاخ، ڤیدۆپلیاسۆڤ، ڤیدۆپلیاسۆڤ! چی بکەم بە دەستتەوە؟ ئاخر چ ئازارێ لە ئارادایە بۆ تۆ؟ دواجار ئەقڵت خەسار دەکەی و ڕێگەی شێتخانە دەگریە بەر!

ڤیدۆپلیاسۆڤ گەرەکی بوو لەسەری بڕوات:

– ئاخر من بەم هەموو زیرەکی و ئاوەزەمەوە...

خاڵە پەڕیە نێو قسەکانی و گوتی:

– دەی باشە ئیدی، هەر ئەمە، هەر ئەمەیە ئاخر... براله، من هەر را ئەوەم گوتم. زیزبوونی پێناوێ، جا ئەوە لە بەرژەوەندیی خۆشتدایە. ئاخر چی دەبێتە مایەی ئازاردانت؟ گرەو دەکەم ئەمە هەموو قسەی قۆڕە!

– هەراسانم بەدەستیانەوە، قوربان.

– ئاخر بەدەست کێوە؟

– بەدەست هەمووانەوە و بە تایبەت بەدەست ماتریناوە، قوربان. لەبەر ئەو هەموو ژیانم بووەتە ئازارکێشان. ئێوە خۆتان دەزانن کە هەموو ئەو کەسە ژیرانەی بە منالّی منیان بینیوە، دەلّێن من لە بیانییەکان دەچم، بە تایبەت لە ڕووی شێوەی ڕووخسارەوە، قوربان. چارمان چییە، گەورەم؟ هەر لەبەر ئەوەش ئێستە ئارامیم لیّ براوە. دەچمە هەر شوێنێ، هەمووان بەدوامدا قسەگەلی ناشیرن دەکەن، قوربان، تەنانەت منالّە وردەش قاوەم لیّ دەکەن، هەقە بە شوولّ ژێر خۆیانیان پیّ پیس بکەم... هەر ئێستەش کە بەڕێوە بووم بەرەو ئێرە، فیك و هووڕێکیان نابووەوە و قسەی ناشیرینیان دەگوت... ئیدی سەبرم نەماوە، قوربان. گەورەم، بێن بە هانای بەندەوە و بەرگریم لیّ بکەن!

– ئاخ، ڤیدۆپلیاسۆ!... باشە، بۆ نموونە چ قسەیەکی ناشیرینیان دەگوت؟ بیّ گومان قسەیەکی پووچە کە تەنانەت ئەوەش ناهێنێ گوێی پیّ بدەی.

– گوتنی بێئەدەبییە، قوربان.

– باشە، بلّیّ بزانم کتومت چییە؟

– زۆر ناشیرینە، قوربان.

– دەی، بیلّیّ ئیدی!

– دەلّێن گریشکا گالانتێس نارنجی خواردووە، قوربان.

– تف، مرۆڤێکی عەنتیکەی ها! گوتم ئاخۆ دەبێ چییان گوتبێ! دەی تۆش تفێ ڕۆ کە و عەرەبانەت ڕاکێشە.

– تفم ڕۆ کرد، قوربان، کەچی فیك و هووڕکەیان زیاتر بوو. گوتم:

– خاڵە گیان، گوێ بگرن، ئاخر ئەو سکاڵای ئەوەیە کە لەمماڵەدا ئارامیی نییە. دەی، بە کاتی بینێرنە مۆسکۆ بۆ لای یارۆی خەتخۆش. خۆتان گوتتان کە لای خەتخۆشێ ژیاوە.

– ئەی دادوبێداد، براڵە، ئەویش بە شێوەیەکی خەمناك کۆچی دوایی کرد!

– چۆن چۆن؟

ڤیدۆپلیاسۆڤ وەڵامی داوە:

– قوربان، ئەوان بۆ نەگبەتی دەستیان بەسەر ماڵ و موڵکی کەسێکی دیکەدا گرتبوو و هەر لەبەر ئەوەش –وێڕای ئەو هەموو زیرەکی و ژیرییەیان– کەوتنە زیندان و هەر لەوێش تیاچوون.

– زۆر باشە، ڤیدۆپلیاسۆڤ، تۆ خەمت نەبێ! من لێی دەپێچمەوە و کێشەکەت چارە دەکەم... بەڵێنت دەدەمێ! باشە، ئادەی ئێستە باسی کارۆفکینم بۆ بکە! هێشتا خەوتووە؟

– نەخێر، قوربان! ئەوان ئێرەیان جێهێشت. هەر بۆ ئەوەش هاتم تا ئەوەتان پێ بڵێم، قوربان.

خاڵە هاواری کرد:

– یانی چی جێیان هێشت؟ ئەوە چی دەڵێی؟ بۆ هێشتت بڕوا؟

– دڵم پێیان سووتا، قوربان، پیاو بە بینینیان دڵی دەبووە کەباب. هەر کە هەستانەوە و هەموو شتێکیان هاتەوە بیر، کێشایان بە سەری خۆیاندا نەڕاندیان...

– نەڕاندن!...

– با بەڕێزانەترە بڵێم: دەستیان کردە هاتوهاوار و ناڵاندن. دەیانقیڕاند: *باشە ئێستە شتە ناسکەکان چ تێکەیشتنێکیان لە بارەی منەوە دەبێ؟* هەروەها ئەوەشیان گوت، *من شایەنی تێکەڵیکردنی مرۆڤایەتی نیم!*... جا ئەم قسانەی هێندە خەمناك و بە وشەگەلی قووڵ دەردەبڕین کە...

– ئاخ، وای لەو پیاوە قورسوقۆڵە! سیریۆژا، ئەی من نەمگوت؟... ڤیدۆپلیاسۆ! بۆ فەرمانم پێ نەدابووی ئاگاداری بی، ئاخر بۆ هێشتت بڕوا؟ ئاخ، خوایە گیان، خوایە گیان!

– زیاتر لە خەمخۆرییەوە بوو، قوربان. داوایان کرد هیچتان پێ نەڵێم. گالیسکەوانان ئالفیان دایە ئەسپەکانیان و جلەویان کردن. دواتر داوایان کرد لەبەرانبەر ئەو برە پارەیەی کە سێ ڕۆژ لەمەوبەر پێتان دابوون، زۆر سوپاستان بکەم و بڵێم کە لە ڕێی یەکەمین پۆستخانەوە قەرزەکەتان بۆ دەنێرنەوە.

– خاڵە گیان، بڕی چی، مەسەلە چییە؟

ڤیدۆپلیاسۆ هاتە گۆ:

– ئەوان گوتیان بیستوپێنج ڕۆبلی زیوی قەرزارن.

– هیچ، براله، له وێستگه پارەی کەمی پێ بوو، منیش بە قەرز دامێ. بێ گومان هەر لە ڕێی یەکەمین پۆستخانەوە بۆم دەنێرێتەوە... ئاخ، خوایە گیان، هەزار مخابن! سیریۆژا، کەسێ بنێرینە دوای؟

– نا، خاڵه گیان، وا باشە ئەم کارە نەکەن.

– خۆشم هەر وای بۆ دەچووم. دەزانی، سیریۆژا، من فەیلەسووف نیم، وەلێ لام وایە هەر ئینسانێ زۆر لەوە باشترە کە بە ڕووالەتییەوە دیارە. وەکو کارۆفکین: ئەو نەیتوانی بەرگەی ئەو شەرمەزارییە بگرێ و ڕۆیشت... با لێی گەڕێین، ئێستە با بچین بۆ لای فۆما! لێرە زۆر ماتڵ بووین، ڕەنگە بە بۆنەی کەمتەرخەمی و سپڵەییمانەوە بێتاقەت بێ... دەی با بڕۆین! ئاخ، کارۆفکین، کارۆفکین!

دەی، وا دیارە ڕۆمانەکەی ئێمەش گەیشتە سەرئەنجام. دوو دڵدار بە یەك گەیشتن و فۆما فۆمیچیش لە پێگەی سەرمەشقی چاکەکاریدا هەر وا فەرمانڕەوایی ماڵەکەی دەکرد. لێرانەدا پێویستە ڕوونکردنەوەیەکی ئێجگار سەرنجڕاکێشی بۆ زیاد بکەین، گەرچی تەواوی ئەم ڕوونکردنەوانە بە تەواوی زیادە دێنە بەرچاو. بە هەرحاڵ، بۆچوونی من وایە. لە جێی هەر ڕوونکردنەوەیەك، تەنیا بە چەند ڕستەیەك لە بارەی داهاتووی کەسایەتییەکانی چیرۆکەکەمەوە

کۆتایی پێدێنم. هەر بەو جۆرەی کە هەموومان دەزانین، بەبێ وەها بەرچاوڕوونییەك، هیچ ڕۆمانێك ناگاتە سەرئەنجام. ئاخر ئەمە یەکێکە لە ڕێسا دیاریکراوەکانی ڕۆمان.

شەش مانگ دوای ئەو ڕووداوانەی کە باس کران، زەماوەندی دوو دەزگیرانە خۆشبەختەکە ئەنجام درا. ڕێوڕەسمی زەماوەندەکەش بێ دەنگوهەرا و خۆمانەیی و ئێجگار سادە و بەبێ میوانێکی زیادە بەڕێوە چوو. من برابووکی ناستینکا بووم، میزینچیکافیش ئەم ڕۆڵەی بۆ خاڵە دەگێڕا. هەندێك میوانیش ئامادە بوون، وەلێ بێ گومان بەرجەستە و گرنگترینی نێویان فۆما فۆمیچ بوو. هەمووان مەراییان دەکرد و دەیانخستە بان سەر. وێڕای ئەوەش، کەسێك کە سینییەك شامپانیای پێ بوو، بە هەڵکەوت بە لایدا تێپەڕی بێ ئەوەی فەرمووی لێ بکات. ئەوجا دوای ئەوە، بەزمێك نرایەوە و وەها سەرکۆنەکردن و هاتوهاوار و شینوشەپۆڕەیەکی بەدوای خۆیدا هێنا کە هەر مەپرسە. فۆما ڕایکردە نێو ژوورەکەی و دەرگەی لەسەر خۆی کلۆم دا و هاواری دەکرد کە بێڕێزیی پێ کراوە و ئێستە ئیدی کەسانی تازە بۆ ماڵەکە زیاد بوونە، جا هەر لەبەر ئەوەش ئیدی ئەو گرنگییەکی ئەوتۆی نەماوە و تەنانەت لە گوربەیەکی بەرەڵاش چەپەڵتر دێتە بەرچاو و هەر ئەوەندەی ماوە لە ماڵەکە فڕێی بدەنە دەرێ. خاڵە دامابوو، ناستینکا دەگریا، ژنی جەنەراڵیش، ئەوە وەك هەمیشە بووراببووەوە... زەماوەندەکە زیاتر وەك ڕێوڕەسمی ماتەمەنیی لێ هاتبوو. ئیدی بەم جۆرە نەسیبی خاڵەی داماوی من و ناستینکای چارەڕەش، کتومت بووە هاوژینییێکی حەوت ساڵی

لەگەڵ خودانێکی وەك فۆما فۆمیچ. فۆما فۆمیچ تا ساتی مەرگی (ئەو ساڵێك لەمەوبەر کۆچی دوایی کرد) هەر بەدخوو بوو، بەردەوام دەتۆرا، تووڕە دەبوو و جنێوی دەدا، سەرباری ئەوەش، نەك هەر بە تەنیا خۆشڕەفتاریی جووتە بەختەوەرەکە لەبەرانبەر ئەودا کەمی نەدەکرد، بگرە بە پێی بەدخووییەکەی ئەو ڕۆژ دوای ڕۆژ دەگەیشتە ترۆپك. ئیگۆر ئیلیچ و ناستینکا لەو هاوژینییەدا بە ئەندازەیەك هەستیان بە کامەرانی دەکرد، کە تەنانەت بڕێك جار لەو هەموو کامەرانییە نیگەران دەبوون و لایان وا بوو کە خودا زیاد لە ڕادە بەدەمیانەوە بووە و شایەنی ئەم هەمووی چاکەیە نین و وایان بیر دەکردەوە کە بیّ چەندوچۆن ڕۆژێك بە نەخۆشی و مەرگ باجی کامەرانییەکەیان دەدەن. ئەوەش فرە ڕوون و لە ئاست تێگەیشتندایە کە فۆما فۆمیچ لە ماڵی مرۆڤانێکی هێندە ساکار و ساویلکەدا دەتوانێت چیی پیّ خۆشە بکات. جا لەم حەوت ساڵەدا چیی نەکرد! تەنانەت ناتوانن وێنای بکەن کە خەیاڵپلاوییەکانی زەینی سەرەڕۆی ئەو، کە ئیدی لە کەیف و سەفا تێر بووبوو، چ هەرەسگەلێکی داهێنەرانە و لە ڕووی ئەخلاقییەوە لۆکۆلۆسییانەی[1] داهێنان. سیّ ساڵ دوای زەماوەندی خاڵە بوو کە داپیرە دڵی لە لێدان کەوت. فۆمای هەتیوکەوتوو بە تەواوی ماتەم دایگرتبوو. تەنانەت ئێستەش هەموران تۆقیوانە باس لە بارودۆخی ئەوسای ئەو دەکەن. کاتێك

١. لۆکۆلۆس، ناوی فەرماندەی ئیمپراتۆری ڕۆم (١٠٦–٥٦ی بەر لە لەدایکبوون)ە، کە بە سەروەت و سامان بەناوبانگ بوو. بە گشتی ئەم ناوە دەدرێتە پاڵ کەسێك کە لەنێو ناز و نیعمەتدا بێت، لە ژیان تێر و بێزار بووبێت و بەدوای چێژ و ڕابواردنی تازە و دەگمەنەوە بێت. «و. ف»

خۆڵیان ڕشتە نێو گۆڕەکەی، خۆی هاویشتە نێوی و هاواری کرد کە ئەویش لەگەڵ خودانەکەیدا بنێژن. یەك مانگی ڕەبەق چەقۆ و چەنگاڵیان نەدەدایە دەستی، جارێکیشیان چوار کەس بە زۆر دەمی ئەویان کردبووەوە و دەرزییەکیان تێدا دەرهێنابوو کە دەیویست قووتی بدات. یەکێك لە بینەرانی ئەم دیمەنە، ئاماژەی بەوە کرد کە فۆما فۆمیچ لەو ماوەیەدا، دەیتوانی لە جێی جارێك هەزار جاریش دەرزییەکە قووت بدات و کەچی نەشی دا. وەڵێ هەمووان لێبڕاوانە و بە تووڕەییەوە ئەم قسەیەیان ڕەد کردەوە و بگۆکەیان بە بێڕێز و ویژدان دایە قەڵەم. لەم نێوەندەدا تەنیا ناستینکا بەدەم بزەیەکی کاڵی سەر لێویەوە بێدەنگ بوو، هەر لەبەر ئەوەش خاڵە تا ڕادەیەك بە نیگەرانییەوە تەماشای کرد. بە گشتی پێویستە ئەوە وەبیر بهێنمەوە، گەرچی هێشتا فۆما لە ماڵی خاڵەدا وەکو ڕابردوو خودایی دەکرد و دەستی لە لاساری هەڵنەدەگرت، وەڵێ ئیدی هیچ هەواڵێك لەو دەمپیسییە ستەمکارانەیە و ڕووقاییمیەی جارانی نەبوو کە بەرانبەر بە خاڵەی ڕەوا دەبینی. گلەیی و سکاڵای دەکرد، لە پرمەی گریانی دەدا، سەرزەنشتی دەبەخشییەوە و بیانووی دەگرت و سووکایەتیی دەکرد، وەڵێ ئیدی وەك ڕابردوو جنێوی نەدەدا و بێحورمەتیی نەدەکرد... ئیدی ڕووداوی وەك «پایەبەرز» نەهاتە پێش، جا وا دیارە هۆکارەکەشی شێوازی هەڵسوکەوتی ناستینکا بوو. ناستینکا کەمتازۆر بە شێوەیەکی هەستپێنەکراو فۆمای ناچار کردبوو کەمێك لە کەڵ شەیتان بێتە خوارێ و تا ڕادەیەك ملکەچ بێت. نەیدەویست مێردەکەی بە ناڕەحەتی ببینێ و لەسەر ئەم ویستەی خۆی سوور بوو. فۆما بە ڕوونی دەیبینی ناستینکا تا

ڕادەیەك ئەوی ناسیوە. دەڵێم «تا ڕادەیەك»، چونکە ئەویش نازی فۆمای دەکێشا و تەنانەت هەر کات کە مێردەکەی بە شانوباڵی زانستمەندەکەی خۆیدا دەهات، ئەو پشتگیریی لێ دەکرد. ناستینکا دەیویست هەمووان بێنێتە ژێر باری ئەوەی کە ڕێز لە تەواوی تایبەتمەندییەکانی مێردەکەی بنێن و هەر بەم بۆنەیەشەوە هەوڵی دەدا سنوور بۆ فۆما دابنێ و وای لێ بکات ڕێز لە ویستی مێردەکەی بگرێت. دەتوانم بە دڵنیاییەوە بڵێم کە دڵی زێڕینی ناستینکا هەموو ئازارەکانی ڕابردووی سپاردنە دەستی فەرامۆشی و دوای ئەوەی کە فۆما بووە هۆی پێکگەیشتنی ئەو و خاڵە، ئیدی لە هەموو خراپەکارییەکانی خۆش بوو. سەرەڕای ئەوەش، دەتگوت ئەو بۆچوونەی مێردەکەی بە هەند وەرگرتووە و بە تەواوی بڕوای پێی هەیە کە نا بێت چاوەڕوانییەکی ئەوتۆت لە کەسێکی ژێرچەپۆك هەبێت کە پێشتر گەپجاڕ بووە، بەڵکە بە پێچەوانەوە، پێویستە مەلهەم لە برینەکانی دڵی بساون. ناستینکای داماو، کە خۆیشی سەردەمانێك لە مەینەت و ئازاردا بوو، دەرکی بەمە دەکرد. جا پاش نزیکەی مانگێك، فۆما دامرکا و تەنانەت نەرمونیان و میهرەبانیش بوو، لە جێی ئەوە، هەڵمەتگەلی دەماریی دیکە دەستیان پێ کرد و دەچووە بارگەلێکی هیپنۆ

زیبەرە و هەر هەمووانی دەتۆقاند، بۆ نموونە، ئەم ستەملێکراوەی ئێمە بەدەم پێکەنینەوە خەریکی قسەکردن بوو و لە کتوپڕێکدا دەبووە بەرد. یانی ڕێك لەو بارەی کە تێیدا بوو، وەك پەیکەرێك لە

جووڵە دەکەوت، بۆ وێنە، گەر لە ساتێکدا خەریکی پێکەنین با، هەر وا خەندەکە بەسەر لێوییەوە وشك دەبوو، گەر شتێکی وەك چەنگاڵی بە دەستەوە با، دەستی لە هەوادا بە بەرزی دەمایەوە. هەڵبەتە دواتر دەستی دەکەوتە خوارێ، وەلێ ئیدی فۆما فۆمیچ نە هەستی بە هیچ دەکرد و نە بیری بوو کە دەستی چۆن هاتووەتە خوار. هەر وا دادەنیشت و تەماشای دەکرد و تەنانەت چاویشی دەترووسکاند، وەلێ نە هیچی دەبینی و نە هیچی دەبیست و تێدەگەیشت. جاری وا هەبوو ئەم بارە نزیکەی کاتژمێرێکی دەخایاند. ئەوە ڕوونە کە لەم هەلومەرجانەدا ئەندامانی ماڵەکە لە حەیبەتان نیوەگیان دەبوون، هەناسەی خۆیان دەگرت و لەسەر سنگی پێ ڕێیان دەکرد و دەگریان. دواجار فۆما لەو بارە دەهاتە دەرێ و هەستی بە کفتی دەکرد و دەیگوت، بە درێژایی ئەم ماوەیە نە هیچی بیستووە و نە هیچیشی دیوە. تۆ بڵێیت مرۆڤ تا ئەم ڕادەیەش ناچار بێت نماییش بکات و بە ویستی خۆی چەندان کاتژمێر ئازار بچێژێ، تەنیا بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا بڵێت، *تەماشام کەن، هەستەکانی من ناسکترن یا هیکانی ئێوە؟* دواجاریش لەبەر ئەو ئازارانەی کە چەشتبوونی و ئەو بێڕێزیانەی کە پێی کرابوون، لە خاڵە دەکەوت بە قیندا و دەتۆرا و ڕێگەی ماڵی بەڕێز باخچینڤی دەگرتە بەر. ستێپان ئالێکسییڤیچ باخچینڤ، دوای زەماوەندی خاڵە، چەندان جار لەگەڵ فۆما مشتومڕیان بووبوو، وەلێ هەمیشە بەوە کۆتایی دەهات کە خۆی داوای لێبووردن بکات.

جـا بـه تایبـەت لـەم سـاتانەدا، بـه گەرموگوڕییـەکی سەیروسـەمەرەوە دەسـتی پـێ دەکـرد: بـه تامەزرۆییـەکی زۆرەوە پێشـوازیی لـه فۆما دەکـرد و بـه گۆشـتی ڕاو میوانـداریی دەکـرد و دەمودەسـتیش ئامادەکـاریی بـۆ بەگژداچـوونەوەی خاڵـه دەکـرد، تەنانەت دەیگەشتە ئەوەی کە سکاڵانامەی لە دژ بنووسێت. مەسەلە ئـەوە بـوو کـە ئـەوان لەسـەر پارچـە زەوییـەك نـاکۆکی کـەوتبووە نێوانیانـەوە. هەڵبەتـە هـیچ کـات نەگەیشـتبووە ئـەوەی بیکەنـە شـەڕ، چونکە خاڵـه، بێ هـیچ بێنەوبەرەیـەك، لـه بەرژەوەنـدیی باخچییێڤدا سازا بوو. جا بەڕێز باخچییێڤ، بێ ئەوەی یـەك قسـه بکات، فـەرمانی دەدا گالیسکە ئامادە بکەن و یەکسەر بە غار دەچوو بۆ شار و خێرا لە دادگەدا سکاڵانامەیەکی دەنووسی و لەگەڵ باسکردنی ئـەوەی کـە *قـەرەبووی خـەرجی و تێچووی پەیوەست بـەم مەسـەلەیە دەکاتـەوە*، داوای دەکـرد بـه فـەرمی زەویەکـەی بـه نـاوەوە بکـەن. وەك ئـەوەی بیەوێت مرۆڤێکی ملهووڕ و ئاژەڵسیفەت بە سزای کردەوەکانی خۆی بگەیەنێت. جا بەیانییەکەی، خاڵە بۆ داوای لێبووردن دەچووە لای فۆما و ئەویش، کە ئیدی لە ماڵی باخچییێڤدا بێزار بووبوو، لە خاڵەی دەبووری و دەگەڕایەوە بۆ ستێپانچیکۆڤۆ. بەڕێز باخچییێڤ کـه لـه شـار دەگەڕایـەوە و تەماشـای دەکـرد فۆمـا لـەوێ نـەماوە، ئیـدی بـه جۆرێـك هەڵدەچـوو کـه هـەر مەپرسـە، کەچـی لەگـەڵ ئەوەشـدا، خـۆی دوای سـێ ڕۆژ، بۆ داوای لێبووردن دەهاتـه ستێپانچیکۆڤۆ و داوای لێبـووردنی لـه خاڵـه دەکـرد و بـه دەسـتی خـۆی سـکاڵانامەکەی لـەت لەت دەکرد. هـەر ئـەو ڕۆژە خـاڵە ئەوی لەگەڵ فۆمـادا پێـك دەهێنایـەوە و باخچییێڤیش هەمدیسان وەکـو سـەگ دوای فۆمـا دەکەوتـەوە و وەك

جاران لەگەڵ هەر وشەیەکی دەیگوت، *تۆ دانای فۆما! تۆ زانیستمەندی، فۆما!*

وەڵێ ئێستە ئیدی فۆما فۆمیچ لەتەك ژنی جەنەراڵەوە لە گۆڕدا خەوتووە. لەسەر گۆڕەکەی، مەزارێکی گرانباییان لە مەرمەڕی سپی بنیاد ناوە کە پڕە لە وتەی قۆڕ و نووسراوەی هەڵکۆڵراو لە ستایشی ئەو خوالێخۆشبووەدا. ئیگۆر ئیلیچ و ناستینکا هەندێك جار لە کاتی گەڕانەوە لە پیاسەی ڕۆژانەدا، دەچن بۆ کڵێسە و سەر مەزارەکەی ئەو و ڕێزی خۆیان دەنوێنن. ئەوان تەنانەت بە ئێستەشەوە ناتوانن بێهەستانە باسی ئەو بکەن، هەموو گوتەیەکی فۆما بەسەر دەکەنەوە و هەروەها ئەوەی کە چیی دەخوارد و کەیفی بە چی دەهات. ئەوجا بە چەشنێك پارێزگاری لە کەلوپەلەکەی دەکەن کە وەك ئەوەی گەوهەر بێت. خاڵە و ناستینکا، کە بە ڕۆیشتنی فۆما بە تەواوی هەستیان بە هەتیوی دەکرد، زیادتر لە جاران هۆگری یەکدی بوون. خوا هیچ ڕۆڵەیەکی بەوان نەبەخشی و زۆر لەمە بێتاقەتن، وەڵێ زاتی گلەییکردنیان نییە. ساشنکایش دەمێك لەوەوبەر لەگەڵ گەنجێکی شایستەدا زەماوەندی کرد. ئالیۆشا لە مۆسکۆ خەریکی خوێندنە، ئیدی بەم جۆرە خاڵە و ناستینکا دووبەدوور ژیانێکی ئەویندارانە بەسەر دەبەن. ناستینکا بەردەوام سوپاسی خودا دەکات. لام وایە گەر یەکێك لەوان بمرێت، ئەوی دیکەشیان لە حەفتەیەك زیادتر بڕ ناکات. لەگەڵ ئەوەشدا، هیوادارم خودا تەمەنێکی درێژیان پێ ببەخشێت! بەوپەڕی ڕووخۆشییەوە پێشوازی لە هەر کەسێك دەکەن و ئامادەن

دارونەداری خۆیان لەگەڵ تەواوی داماوانی جیهاندا دابەش بکەن. ناستینکا حەزی لە خوێندنەوەی ژیاننامەی پیاوخاسانە و دەڵێت کرداری چاکەی هاکەزایی بێبایەخە و خۆی مرۆڤ هەرچیی هەیە، پێویستە بیداتە هەژاران و لە نەداری و بێنەواییدا بۆ بەختەوەری بگەڕێت. خاڵەش گەر خەمی ئالیۆشا و ساشینکای نەبا، زۆر لە مێژە ئەم کارەی کردبوو، چونکە لە هەموو لایەنێکەوە هاوڕای هاوسەرەکەیەتی. پراسکۆڤیا ئیلینیچنایش لەگەڵ ئەوان دەژی و بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە هاوکاریانە و هەڵسووڕاندنی کاروباری ماڵەوەی لەدەستە. بەڕێز باخچییێڤ، دەمودەست دوای زەماوەندی خاڵە، چووە داوای ئەو، وەلێ هەر زوو دەست بە ڕوویەوە نرا. دوای ئەوە، هەمووان دەیانگوت ڕوو لە پەرستگە دەنێت، بەس ئەوە ڕووی نەدا. پراسکۆڤیان ئەیلی نیچنا تایبەتمەندییەکی بەرز و سرووشتیی هەیە: دەڵێی بەختەوەریی خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە بە تەواوی لە پێناو خۆشەویستانیدا خۆی بەخت بکات، کەم دەربکەوێت، چاو نەبڕێتە چاوانیان و گوێ بە لاسارییان نەدات، دوایان بکەوێ و خزمەتیان بکات. ئێستەش دوای مەرگی دایکی (ژنی جەنەراڵ)، بە ئەرکی خۆی دەزانێ لەپاڵ براکەیدا بمێنێتەوە و لە هەموو کاروبارێکدا یارمەتیی ناستینکا بدات.

یژێڤیکینی پیریش هێشتاکە زیندووە و لەم دواییانەدا زیاد و زیادتر دێتە دیداری کچەکەی. خاڵە لەوە ناڕەحەت بوو کە سەرەتا لەگەڵ ژیکەڵەکانی (بەم جۆرە ناوی منداڵەکانی دەبات)، خۆیان بەدوور دەگرت لە ستێپانچیکۆڤۆ. داوەتەکانی خاڵەش

کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەبوو و هەستیاری و بەدگومانیی ئەو، لە چاو لووتبەرزییەکەیدا زیادتر بوو. بەدگومانییەکی نەخۆشانەی هەبوو. فکر و خەیاڵی ئەوەی کە نەکا ئەوان بۆیە لەو ماڵە ڕازاوەیەدا کچەکەی ئەویان ڕاگرتووە کە بەزەییان پێیدا هاتووەتەوە و بە سەربار و دەسپاگری دەزانن، کەلەیی دەکرد، هەندێك جار تەنانەت دەستی یارمەتیی ناستینکاشی ڕەد دەکردەوە و تەنیا لە کاتی زۆر پێویستدا قەبوڵی دەکرد. ئەو هەرگیز هیچ هاوکارییەکی لە دەستی خاڵە وەرنەدەگرت. ئەو کاتەی ناستینکا لە باخدا پێمی گوت کە باوکی لەبەر «ئەو» خۆی کردووەتە گەپجاڕ، بە تەواوی لە هەڵەدا بوو. ڕاستە کە ئەو کاتە هەتا بڵێیت ئارەزووی بوو ناستینکا بە شوو بدات، وەڵێ تەنیا لەبەر پێویستیی دەروونی خۆی دەکردە گەپجاڕ و لەم ڕێیەوە هەموو ئەو قینەی دەردەبڕی کە گیانی ئەوی تەنیبووەوە. گاڵتەجاڕی و لۆتییەتی پێویستییەك بوون کە بە خوێنی ئەودا دەگەڕان. ئەو لە وێنایەکی کاریکاتێریدا، لە شێوەی چەپەڵترین و کاسەلێسترین ماستاوچییدا خۆی دەنواند. هاوکات، بە ڕوونی دەیگوت کە تەنیا وەك نمایش ئەمە دەکات، جا هەر سات کە مەراییکارییەکەی قێزەونتر دەبوو، تەنزەکەی تەزێنەر و ڕووتتر دەردەکەوت. ئەمە شێوازی سەرەکیی ئەو بوو. توانیی هەموو منداڵەکانی لە باشترین ڕێکخراوە فێرکارییەکانی مۆسکۆ و پترسبورگدا ناونووس بکات، هەڵبەتە ئەمە تەنیا لەو کاتەدا ڕێککەوت کە ناستینکا توانیی بیهێنێتە سەر ئەو بڕوایەی کە هەموو ئەو یارمەتیانە لەسەر حێسبی داراییەکەی خۆین، یانی لەسەر حسێبی ئەو سی هەزار ڕۆبڵەی کە تاتیانا ئەیڤانۆڤنا وەك دیاری

پێی داوە. هەڵبەتە ئەم سی هەزار ڕۆبڵە هەرگیز بە کردەوە لە تاتیانا ئەیڤانۆڤنا وەرنەگیرا، جا تەنیا بۆ ئەوەی دڵی نەئێشێ و خەفەتی پێ نەخوات، بەڵێنیان پێدا کە ئەگەر بۆ دابینکردنی هەر پێویستییەکی بنەماڵەکە دامان، ئەوا داوای یارمەتیی لێ بکەن. هەر واشیان کرد و بۆ نواندن، دوو جار لە کاتی جیاوازدا بڕێکی تا ڕادەیەك زۆریان لا قەرز کرد. وەلێ تاتیانا ئەیڤانۆڤا سێ ساڵ لەمەبەر کۆچی دوایی کرد و هەر چۆنێك بووە ناستینکا سی هەزارەکەی خۆی پێ بڕا. مردنی تاتیانای داماویش زۆر کتوپڕانە بوو. هەموو ئەندامانی ماڵەکە لە ئاهەنگێکی نێو ماڵی یەکێك لە موڵکدارە دراوسێکاندا کۆ بووبوونەوە. هەر کە جلی ڕازاوەی سەمای پۆشی و تاجێکی ئێجگار زەریفی لە گوڵەڕۆزی سپی کردە سەری، لە ناکاو سەری سووڕا و کەوتە سەر قەنەفە و مرد. هەر بە هەمان ئەو تاجەگوڵەوە ئەویان ناشت. ناستینکا زۆر دڵتەنگ بوو. لە ماڵی خاڵەدا بەردەوام نازی تاتیانا ئیڤانۆڤنایان دەکێشا و وەك منداڵێك ئاگاداری بوون. تاتیانا ئیڤانۆڤنا بە وەسیەتنامەی ژیرانەی خۆی هەمووانی واق و وڕ کرد و بێجگە لەو سی هەزار ڕۆبڵەی ناستینکا، باقیی دارایییەکەی، یانی سێسەدهەزار ڕۆبڵی بۆ پەروەدەکردنی کچۆڵانی هەتیو و داماو و خەڵاتی کاش بۆ ئەوانەی کە لە دامەزراوە فێرکارییەکاندا خوێندن تەواو دەکەن، دابین کرد. هەر ئەو ساڵەی کە دونیای جێهێشت، پاکیزە پرەی پێلیتسینا، کە تا بەر لە مردنی ژنی جەراڵ، هەر بەو هیوایەوە لە ماڵی خاڵەدا مابووەوە کە تاتیانا ئیڤانۆڤنا نەرم بکات، شووی کرد. هەر لەم کاتەدا بوو هاسەرەکەی ئەو، کە کاربەدەستی دەوڵەت و خاوەنی میشینۆ (هەمان ئەو دێیە بچووکەی کە لەوێ

لەگەڵ ئابنۆسکین و دایکی لەسەر تاتیانا ئیڤانۆڤنا تووشی بەزمێك بووین) بوو، کۆچی دوایی کرد. ئەو کاربەدەستە، پیاوێکی تووڕە بوو و لە هاوسەری یەکەمی شەش منداڵی خستبووەوە. ئەو، کە لای وا بوو پرەی پێلیتسینا کچێکی دەوڵەمەندە، کەسێکی ناردە خوازبێنیی و کچەش دەمودەست قایبل بوو، ئەمەش لە دۆخێکدا کە پرەی پێلیتسینا خێری پێ دەشیا. تەنیا سێسەد ڕۆبڵی زیویی هەبوو کە ئەویش ناستینکا بە بۆنەی شووکردنییەوە بە دیاری پێی دابوو. جا ئەو ژن و مێردە ڕۆژ تا ئێوارە چەلەحانێیان بوو. پرەی پێلیتسینا قژی منداڵەکانی ئەوی دەڕووتاندەوە و بە دەسکەوان تەمبێی دەکردن، بە کورتییەکەی (وای دەگێڕنەوە) چڕنووکیشی دەگرتە ڕووخساری مێردەکەی و برینداری دەکرد و جا هەقوناهەق سەرگوردزادەیی خۆی بە ڕووی ئەودا دەدایەوە.

میزینچیکۆڤیش بۆ خۆی بووەتە پیاو و بیری کردووەتەوە. هیوای لە ئیڤانۆڤنا بڕی و سەری کردە فێربوونی هونەری کشتوکاڵی. خاڵە ئەوی بە کۆنتێکی ئێجگار دەوڵەمەند ناساند کە سێهەزار ڕەعیەتی هەبوو و لە دووریی هەشتا وێرستا لە ستێپانچیکۆڤۆوە دەژیا و بە دەگمەن سەری لە موڵکەکانی دەدا. کۆنتیش لە ڕێی ڕاسپاردەی خاڵەوە تێگەیشت کە میزینچیکۆڤ شیاوی متمانەپێکردنەوە و هەر لەبەر ئەوەش بریکارە ئەڵمانییەکەی خۆی، کە وێڕای ناوبانگی ئەڵمانییەکان بە دەستپاکی ئەوی دزشیبوو، جواب کرد و پێشنیاری پێگەی بریکاریی موڵکەکەی خۆی بۆ میزینچیکۆڤ کرد. دوای پێنج ساڵ، ئەو موڵکە

نەدەناسرایەوە. جوتیاران دۆخیان باشتر بووبوو، هەلومەرجێك بۆ کشتوکاڵ هاتە پێش کە جاران نەکردە بوو، کەمتازۆر داهات دوو هێندە زیادی کرد... بە کورتییەکەی، بریکاری تازە لەوانی دیکە جیاواز بوو و بە بۆنەی لێهاتوویییەوە لە کاروباری کشتوکاڵیدا، ناوبانگی لە شاردا دەنگی دایەوە. میزینچیکۆ ڕێك دوای پێنج ساڵ، وێڕای تکای کۆنت و پێشنیاری زیادکردنی موچەی کار، دەستی لە کار کێشایەوە! کۆنت زۆر بێتاقەت و تاسا بوو و گومانی ئەوەی هەبوو کە موڵکدارانی دراوسێ ئەویان لە خشتە بردووە یان تەنانەت فرویوی کەسانی سەر بە پاریزگە دراوسێکانی خواردووە. هەمووان دۆش دامان کە بینییان ئیڤان ئیڤانۆڤیچ میزینچیکۆ دوای تێپەڕینی دوو مانگ بەسەر دەستکێشانەوەکەیدا دەمودەست بووەتە خاوەنی موڵێکی شازی سێسەد ڕەعیەتی. ئەم موڵکە ڕێك چوارسەد وێستایەك لە موڵکەکەی کۆنتەوە دوور بوو و، ئەو، لە هاوڕێیەکی دێرینی خۆی کە ئەندامێکی دەستبلاوی سوارەی چەکدار بوو، ئەو موڵکەی کڕیبووەوە! میزینچیکۆ دەمودەست ئەم سێسەد ڕەعیەتەی خستنە ڕەهنەوە و دوای ساڵێك، هەر لەو ناوە بووە خاوەنی موڵکێکی شەشسەد ڕەعیەتیی دیکە. ئێستە ئەو، ئیدی خۆی حسێبی موڵکدارێکی بۆ دەکرێ و بێ کێشە کاروبارە کشتوکاڵییەکانی بەرەو پێش دەچن. هەمووان سەریان لەوە سووڕ ماوە کە ئەو ئاوا لە کتوپڕێکدا چۆن ئەم هەموو پارەیەی دەست کەوتووە. کەسانێکیش تەنیا سەر با دەدەن، لەگەڵ ئەوەشدا، میزینچیکۆ گوێ بەم قسانە نادات و کارەکەی خۆی بە ڕەوا دەزانێت. خوشکەکەی لە مۆسکۆوە هێنایە لای خۆی، هەمان ئەو

خوشکەی کە وەختێك ئەو بەرەو ستیپانچیکۆڤۆ کەوتە ڕێ، هەر بەو سێ ڕۆبڵەی کە هەیبوو، پووتێکی بۆ براکەی خۆی کڕی. ئەو تەڕوبڕیی جارانی تێدا نەماوە، لەگەڵ ئەوەشدا، کچێکی ئێجگار نازدار و دڵنەرم و بەسۆز و خوێندەوارە کە بێ گومان هەتا بڵێیت لە هەر شتێك تەوەساوەتەوە. ئاخر ئەو هەمیشە لەگەڵ خانمەکەیدا لە مۆسکۆ و بەنێو کۆڕی جۆراوجۆردا وێڵ بووە، وەلێ ئێستە ئیدی خەریکی ستاییشکردنی براکەیەتی و کاروباری ماڵەکەی ئەو هەڵدەسووڕێنێ و ویستی ئەوی لەلا وەك یاسا وایە و هەر بە تەواوەتی هەست بە کامەرانی دەکات. براکەی هێندە نازی هەڵناگرێ و تەنانەت تا ڕادەیەکیش سەختگرە لەگەڵیدا، بەس ئەو هەست بەمە ناکات. لە ستێپانچیکۆڤۆدا هەمووان تا بڵێیت کەیفیان پێی هاتووە و هەندێکیش دەڵێن کە بەڕێز باخچیێڤ زۆر دڵی پێیەوەیەتی. ئەویش لاریی لەوەدا نییە خوازبێنیی بکات، وەلێ ترسی ئەوەی هەیە کە دەست بە ڕوویەوە بنێن. جا هیوادارم لە کاتێکی دی و چیرۆکێکی دیکەدا تێروتەسەلتر بپەرژێینە سەر بەڕێز باخچیێڤ.

دەی، وا دیارە هیچ شتێك نەمایەوە بۆ باسکردن... ئەرێ بە ڕاستە! بیرم چوو: گاڤریلا فرە پیر بووە و بە تەواوی زمانی فەڕەنسیی بیر چووەتەوە. فالالیش بۆ خۆی بووەتە کالیسکەوانێکی چاك، وەلێ ڤیدۆپلیاسۆڤ دەمێك لەمەوبەر لە نەخۆشخانەی دەروونیدا خەوێنرا و وا بزانم هەر لەوێش مردووە... لەم ڕۆژانەدا سەرێك لە ستیپانچیکۆڤۆ دەدەم و لای خاڵە هەواڵی دەپرسم.

١٨٥٩

# پەیدۆزی[1] لە بارەی مەتەڵی «بێگانە»وە

بابەتی ئەم کتێبە، چۆنییەتیی ئەو کاریگەرییەیە کە ژیانی دۆستۆیڤسکی لەسەر بەرهەمەکانیی داناوە. ژیانی گەلێك لە هەڵبژاردەکانی جیهان، وا دەردەکەوێت کە بە جۆرێك لە جۆرەکان لەگەڵ بیروبڕوا، بۆچوون و بەرهەمەکانیاندا «لێکچوون»ی هەیە، بەو مانایەی کە ڕەنگە بکرێت بڵێین لە ڕووی پێکهاتەوە، یەکانگیرییەکی هاوئاهەنگ پێك دەهێنن. بۆ نموونە، *لویسی چواردەیەمی* پادشای فەڕەنسا: ژیانێکی دەربارییانە، بیروباوەڕێکی دەربارییانە و کردەوەیەکی دەربارییانەی هەبوو. وەڵێ لای دۆستۆیڤسکی هەموو شتێك بە جۆرێکی دیکەیە. ژیانی هیچ لێکچوونێکی لەگەڵ بیروباوەڕیدا نەبوو، هەروەها بیروباوەڕی لەگەڵ چالاکییە ئەدەبییەکانیدا یەکی نەدەگرتەوە. لە ژیانـدا هەراسانی دەستی نەخۆشی بوو، بیروباوەڕێکی کۆنەپەستانەی هەبوو، هەروەها شێوازی کارەکانیشی بانشۆڕشی بوون. هەڵبەتە باش ئاگادارم کە تەواوی ئەم وەسفانە، یانی هەراسانی دەستی نەخۆشی و

---

١. پەیدۆزی: کار و ڕەوتی کون، چاڵ، یان کەلێنخستنە شت یان بابەتێك، بۆ لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە.

کۆنەپەرست و بانشۆڕشی، کە دامنە پاڵ دۆستۆیڤسکی، بێبەزەییانە، ناشیرین، قێزەون و دواجار نادروستن. وەلێ چۆن دەکرێ وەسفێکی کورت و پوخت لە بارەی ئەم مرۆڤەوە بخەینە بەر دەست؟ لێرانەدا مەبەستم لە وردبوونەوە و وەسفکردن نییە، تەنیا دەمەوێ هەر ئەوەندە بڵێم کە پەیوەندیی نێوان ژیانی نووسەر و بەرهەمەکانی پرسێکی ئێجگار ئاڵۆزە. وێڕای ئەمەش، وەها پەیوەندییەك لە ئارادا هەیە و کلیلی مەتەڵی کتێبی بێگانە، لەودا حەشار دراوە.

هەر بەم بۆنەیەوە، هەمدیسان لە کۆمەڵەی ئەدیبانی ئەو سەردەمە نزیك دەبینەوە، هەمان ئەو کۆمەڵەیەی کە کاتێك دۆستۆیڤسکی کەوتە بەر ئاسانەی زیندان و دوورخستنەوە، تا ماوەیەك لەم کتێبەدا لێی دوور کەوتینەوە. کەواتە دەگەڕێینە لای *نیکراسۆف* و *سەردەمی* ئەو. لەوێ گۆڕاکارییەکی قووڵ ڕووی دابوو کە لە درێژەی باسەکەدا ئاماژەی پێ دەکەین. لەساڵی ١٧٦٠دا پەیوەندیی *تۆرگنێف* لەگەڵ نیکراسۆفدا تێك چوو، وەلێ بەر لەوەش تۆرگنێف لە ڕووی سەلیقەوە، لەگەڵ ڕەخنەگری ئەدەبی و سەرۆکی سەردەم، *دابرالیۆف*، پنت و بتی لاوانی ڕێی پێشڕەویدا ناکۆك بوو. چرنیشفسکی و دابرالیۆف، دوو گوتارنووسی بلاوکەرەوە، بە نووسینەکانی خۆیان گرنگییان بە تێفکرینەوە لە بەهاکان دەدا. ئەوان لەگەڵ مەکتەبێکدا کە لایان وابوو تەنیا جوانیناسییەکی پەتییە، کەوتبوونە ململانێ و لە هەڵسەنگاندن و نرخاندنی ئەدەبیاتدا دیدگەیەکی سوودگەرا-کۆمەلایەتییان هێنابووە ئارا و

لەم ڕووەوە، درێژەپێدەری برێك لە دیدگەكانی *بلینسکی* بوون. ئەم نووسەرانە، هەردووكیان پێگەیەكی ئەوتۆی بەرزی وایان بۆ تۆرگنیێف دانەدەنا. ئەمڕۆ كاتێك نووسینەكانی دابرالیۆف و چرنیشفسكی دەخوێنینەوە، بەر لە هەر شتێك لە دڵی خۆماندا دەڵێین: *باشە ئەمانە خۆ هەر نەیانزانیوە نووسین چییە!* شێوازی ڕەق و خاڵی لە جوانیی ئەم دوو ڕەخنەگرە مەزنە، جیاوازییەكی ئێجگار زۆری لەگەڵ ئاستی بەرز و شكۆداری ئەدیبانی ئەو سەردەمەی ڕووسیادا هەیە. وەلێ هاوچەرخانی ئەوان، بە شێوازێكی دی لە ئەدەبیاتیان دەڕوانی و ئەم دوو نووسەرەش، بە شێوازێكی جیاواز ئەدیبانیان هەڵدەسەنگاندن.

دابرالیۆف لە ساڵی ١٨٦١دا گوتارێكی لە بارەی دۆستۆیڤسكییەوە نووسی و بە شێوازێك، وەك ئەوەی لە گوێی گادا خەوتبێت، دۆستۆیڤسكیی خستە پێگەی نووسەرێكی پلە سێوە. لەم گوتارەدا ئاماژەیەكی كورت بە *بێگانە* كراوە، وەلێ سەرتاسەری گوتارەكە تایبەتە بە ڕۆمانی *سووك و ڕسواكراوەكان* و وا دیارە كە نووسەری گوتارەكە، ڕۆمانی سووك و ڕسواكراوەكانی زۆر لە ڕۆمانی بێگانە لەلا پەسەندترە، تەنانەت دەگاتە ئاستێك كە ئەو ئەركە ئاداتە بەر خۆی كە سەرنجێكی زیادتری پێ ڕەوا ببینێت. لەو ساتەدا مرۆڤ حەز دەكا بڵێت: «ئاخ، هەی كەللەپووت!». گومان لەوەدا نییە كە سووك و ڕسواكراوەكان لە ڕیزی بەرهەمە ئاستنزمەكانی دۆستۆیڤسكیدایە، ڕۆمانێك كە بە ڕوونی دیارە، لە سەردەمێكدا نووسیبووی كە بلیمەتی و داهێنەری بە شێوەیەكی

کاتی ئەوی جێهێشتبوو و بە سەرلەبەری گرێکانییەوە بە تەنیایی وێلی کردبوو: لەگەڵ تارمایی شێتئاسای کچۆڵەیەکدا. گرێیەك کە توانای لێهەڵهاتنیی نەبوو. ئێمە نازانین هۆکاری ئەم گرێیە تاوانێکە کە هەر بە ڕاستی لە هەرەتی گەنجیدا تووشی بووبوو یان بە پێچەوانەوە، ئەو گرێ دەروونییە هێندە بەهێز بوو کە دۆستۆیڤسکی لەژێر کاریگەری و دەسەڵاتیدا، تووشبوون بەو گوناهەی بەسەر خۆیدا سەپاندبوو. گرێیەکی دی، کە لە سووك و ڕسواکراوەکاندا بەو هەموو ناشیرینییەیەوە خۆی دەنوێنێت، هەمان ئەو خۆئازاردنە هەستیارانەییەیە کە پێشتر ئاماژەمان پێی کرد. ڕۆمانێك لەژێر کاریگەریی پەلاماری گرێکان و لە پێواریی بلیمەتیدا نووسرابێت، بێ گومان نزمئاستە. دابرالیۆیف لەو ڕووەوە سەرنجی خستە سەر و پەسنی دا، کە چیرۆکی شازادەیەکی ستەمکار و خەڵکانی دەستکورت و ستەمدیدە دەخاتە ڕوو و ئەمەش، لەگەڵ جیهانبینیی کۆمەڵایەتیی ڕەخنەگری ئەدەبیدا یەکی دەگرتەوە. کەچی دابرالیۆف لە کتێبی بێگانە تێنەگەیشتبوو و نەیدەتوانی لێکی بداتەوە. ئەو ڕێنماییکارێکی کورتبین، زەینتەسك و خاڵی لە هەر جۆرە سەلیقەیەکی ئەدەبی بوو کە دەیتوانی ڕاپبگەیەنێت کە بە پێچەوانەوە، ئەم بەرهەمە ڕەسەنایەتییەکی ڕاستەقینەی تێدایە: بەرهەمێك پێش ئەو سەردەم و کاتەی خۆی کەوتبوو کە تێیدا نووسرا. گەر ئیبسن لەنێو شوێنکەوتووان یان دژەکانیدا نووسەرێکی هەڵکەوتەی هەبووبا، ئەو نووسەرە دەیتوانی لە نزکەی ساڵی ١٩١٠دا وەها ڕۆمانێك بنووسێت و بێ گومان وەها بەرهەمێك لەو سەردەمەدا پەسەند و ستاییش دەکرا. وەلێ بێگانە، لە نۆڤێمبەر

و دیسێمبەری ساڵی ١٨٥٩دا چاپ کرا و لەو سەردەمەدا، نە خوێنەر و نــە ڕەخنــەگرانیش نەیانــدەتوانی بــە شــێوەیەکی شــیاو هــەڵی بســەنگێنن و بینــرخێنن. ئـەم ڕۆمانــە، بـە دەردی هــەمان جووجەڵــە مراویەکـەی نێـو چیرۆکی «جووجکە مراویـی ناشیرین»ی *ئاندرسن* چوو: لەگەڵ مراویەکاندا لـە هێلکە دێتـە دەرێ، لـە بەرچاوی ئەوانی دیکــەدا جووجکــە مراوییــەکی ناشــیرینە و، ئیــدی خۆیشــی بــە ناشـیرینیی خــۆی تــەرق دەبێتــەوە. دۆستۆیڤســکی ســەردەمێك کــە بڕیاری دا ئەم ڕۆمانە بە سەرە «بفرۆشێت»ـە سێ بڵاوکەرەوە، (بە پــەیڕەویکردن لــە نووســەر وشــەی «فرۆشــتن» پاتــە دەکەمــەوە) وەك بەرهەمێکی کۆمیدی ناساندی. ئێمە ئەمڕۆکە ناتوانین لـەوە تێبگـەین کە کۆمیدی یان پێکەنیناوی پەیوەنـدیی بە کام بەشی ئەم کتێبەوە هەیـە؟! ئـەم ڕۆمانـە هـەر لـە دەسـتپێکەوە تـا کۆتـا، تاریك و مـۆن و ترسێنەرە. نووسەر لە هەلومەرجی کەسێکدایە کە پارچە قوماشێکی ئێجگـار جـوان بــە هــەودای زێڕینــەوە دەچــنێت و جـا لــە گــەرماوی گشتیدا، لە جێی خـاوڵی بۆ فرۆشـی ڕادەنـێ و دڵنیـایی دەدات کـە بـە باشی لەشی تەڕ وشك دەکاتەوە، کەچی لە وەڵامدا دەبیستێت کە بە پێچەوانە، هەتا بڵێیت زبرە و لەشیش دەڕووکێنێت.

بێگانــە، دواهــەمین بەرهــەمی دۆستۆیڤســکییە کــە لــە کــاتی شەنوکەوکردنیدا ناوی گۆگۆڵ دەبەین. بە بوێرییـەوە دەتـوانین بڵـێین لەگــەڵ نووســرانی ئــەم بەرهەمــەدا، دەســەڵات و شــوێنپێی دیــاری گۆگۆڵ لە بەرهەمی دۆستۆیڤسکیدا دەسڕێتەوە و کۆتـایی پـێ دێت. وەك چۆن *فۆما فۆمیچ* لە *بێگانە*دا هێمـای زەبرە، بـە هـەمان شێوەش

*پلیۆشکین* لە *حەشاماتی مردوو*[1]دا هێمایە بۆ پیسی و چەپەڵی و ستەم. لەگەڵ ئەو جیاوازییەی کە لە بوونی پلیۆشکیندا ڕووخۆشییەکی کاریکاتێریانە دەبینین، ئەمەش لە بارێکدا کە *فۆما فۆمیچ* بوونەوەرێکی دێوئاسا، وەلێ ڕاستەقینەیە. گۆگۆڵ بەردەوام دەستەنقەست کۆمیدی و تەنزنووسە، وەلێ دۆستۆیڤسکی نمایشنامەنووسێکی ڕووتاڵ و مۆنە.

ناوەڕۆکی کتێبەکە ئازار و مەینەتییەکە، کە ستەمکاری دڵڕەق بەرانبەر بە هەر کەسێکی ڕەوا دەبینێت، هەڵسوکەوتێك کە لە ئازار و مەینەتیی دەروونی خودەوە سەرچاوە دەگرێت. بێ گومان ئەمە، دڵڕەقانەترین کتێبی دۆستۆیڤسکییە لەنێو هەموو دڵڕەقییەکانیدا، خوێندنەوەی ئەم کتێبە ئازاردەر، هەراسان و وەڕەزکەرە. تەماشاکردنی بەردەوامی هەوەسبازییەکانی مرۆڤێکی چەپەڵە لەژێر زەڕەبینێکدا، ڕێك وەکو خستنە ژێر زەڕەبینی جاڵجاڵۆکەیەك و گەورەکردنی تا ئەندازەی سەگێکی گەورە و زلکردنی وێنەکەی بە ڕادەیەك، کە سەرانسەری دیوارێك دابپۆشێت. ئەمە کتێبی هێما گەورەکانە، شتێکی هاوشێوەی *میتەرلینگ*، وەك ئیبسن، کە هاوکات بە واقیبینییە زیادەڕۆییانەکەی پەستمان دەکات. لایەنە باشەکانی ئەم کتێبە، هەمان لایەنە خراپەکانی ئەون. نیگارکێشێك بێننە بەرچاوتان بە شێوازێکی هێندە ڕاستەقینانە وێنەی ئاگر بکێشێ کە دەست و ڕووخسارمانی لەگەڵ بسووتێنێت. ئێمە بێ گومان

[1]. حەشاماتی مردوو یان ڕۆحە مردووەکان: یەکێکە لە شاکارە ڕووسییە دووبەرگییەکان کە نووسەر (نیکۆلای گۆگۆڵ) دەستنووسی بەرگی دووەمی دەسووتێنێت و بە ناتەواوی دەمێنێتەوە. «و. ك»

لەبەردەم بێگانانـدا هەسـتی نارەحـەتی و دەسەپاچـەیی سەرچـاوەگرتوو لـە هەڵسـوکەوتی ناشـیانەی خۆمانمـان ئـەزموون کـردووە، یـان ڕەنگـە زۆر چـاومان بـە دیمـەنی تەریقبوونـەوە و بێتاقەتبوونی کەسانێك کەوتبێت کە هۆکارەکەی ئەوە بووە، کەسێك لەبـەردەم خەڵکیـدا هەڵسـوکەوتێکی دزێـوی لەبەرانبـەر نوانـدوون. دۆستۆیڤسـکی ئـەم هەسـتی تەریقبوونـەوە و ئازارچەشـتنەی لـەنێو کۆڕ و لە بەرچاوی بێگاناندا بە چەشنێك لە ڕۆمانی بێگانەدا شیکار کردووە و هێندەی گـەورە و زەق کردووەتـە و بە جۆرێك گۆڕیویەتی بۆ ئـازار و ئەشکەنجەیەکی کـاری، کە هـەر بە ڕاسـتی خوێنـەر پێـی بێتاقـەت دەبێت. ئـەو کەسـایەتییەی کـە حیکایـەتی ڕۆمانەکە لەگـەڵ ئەودا دەست پێدەکات، کاتێك لـە مـوڵکی خاڵەیدا تووشی هەڵەگـەلی یـەك لـەدوای یـەك دەبێـت، وەختێـك ئامـادەبووانی نێـو هۆڵەکـە لەبەرانبـەر ئـەو هەڵانـەدا کاردانـەوە دەنـوێنن، خوێنـەر هەسـت بـە ئەشکەنجە دەکات. وەڵێ ئەمە تەنیا دەستپێکێکە بۆ ئازارەکانی دی. تەواوی ئەم ئازارانە، لە دیدگەی دۆستۆیڤسکییەوە، کۆمەڵێك ئازاری ئـەخلاقین. دۆستۆیڤسـکی بایـەخێکی وا بـە ئـازاری جەسـتەیی، یـان برینـەکانی لـەش و نەخۆشـییەکان نـادات، ئـەو تـەنیا ئەشـکەنجەی ئـەخلاقی لـە بەرچـاو دەگرێـت. لـە بەرهەمـەکانی دۆستۆیڤسـکیدا، هەمیشە ئازاری ئینسان، بەرئەنجامی کردەوەکانی خۆیەتی نەك هیچ شـتێکی دی. لێرانـەدا، بـە ڕوواڵـەت، تووشـی لێکـدژی دەبینـەوە، چـونکە بـەر لەمـە، گـوتم کـە بێگانـە، حەماسـەی زوخـاوێکی سەرچاوەگرتووە لـە کردەوەکانی ملهوڕێك. بەڵێ! وەڵێ ملهوڕ لـەم چیرۆکەدا، نە تزاری ڕووسـە و نە هیچ کەسـایەتییەکی دی کـە دەشـێ

بەسەر ستەملێکراواندا زاڵ بێت. بە پێچەوانەوە، ستەمکار کەسێکی هەژار، پرۆلیتاریا، گەپچاڕی جاران، جا ستەمی ئەو، بە شێوەیەکی ئازادانە پەسەند کراوە، ئەمەش لە لایەن کەسانێکەوە کە نەك هەر بە تەنیا بەوەوە وابەستە نین، بەڵکە بە پێچەوانەوە، ئەوە ستەمکەرە کە لە هەر ڕوویێکەوە چاولەدەستی ئەوانە. لە سەرووی هەموو شتێکیشەوە، ملهووڕ بەدوای تۆڵەی سووکایەتییەکەوەیە کە لە ڕابردوودا ئەزموونی کردووە. جا دواجار هاوکات لەگەڵ سووکایەتیکردن بەوانی دیکە، خۆیشی ئازار دەکێشێ و هەمیشە ترسی ئەوەی هەیە کە نەکا سووکایەتیی پێ بکرێت. ئەشکەنجەی سووکایەتیپێکردن لەم چیرۆکەدا، چەند بەرانبەر گەورە کراوە. فۆما ئیپسکین، گەپچاڕی جارانی جەنەراڵ، دیار نییە کە دوای مردنی جەنەراڵ، چۆنچۆنی دەبێتە بتی ژنەکەی. ژنی جەنەراڵ، مرۆڤێکی بەتەمەن و بەدخووە و کوڕێکی هەیە کە پێشتر سەرهەنگی سوپای سوارە بووە. ئەم کوڕە مرۆڤێکی نەرمونیان، جوامێر و لە هەر ڕوویێکەوە سەرڕاستە. فۆما سەرەتا بەسەر ژنی جەنەراڵ و جا دواتر لە ڕێی ئەوەوە، بەسەر کوڕەکەی و کەسانی دیکەی دەوروبەریدا زاڵ دەبێت و دەست بە ستەمکاری دەکات. تێکڕای کەسانی ئەو ناوە لە ترسی فۆما هەڵدەلەرزن، ماستاوی بۆ دەکەن، ترسی ئەو ئازای ئەندامیان دەهێنێتە لەرزە، ئەمەش لە بارێکدا کە فۆما بە درێژایی ئەو ماوەیە، بە هەموو شێوازێك سووکایەتییان پێ دەکات. کتێبەکە ڕێك شەنوکەوکردن و لێکۆڵینەوەیەکی دەروونناسانەیە لە بارەی چۆنییەتیی بەرکەوتنی ستەمکار، کە ئەم کەسە، لەخۆگری هەستی نەفرەت و حەز بۆ ئاژاوەگێڕی، هاوکات تێکەڵەیەك لە ڕێز و ترس و

تەنانەت جۆرێك لە سۆزی سەركوتكراو و نەوییە. كار دەگاتە شوێنێك كە فۆما دەبێتە بەڵایەكی ڕاستەقینە بۆ سەرهەنگ و تەنانەت وای لێ دێت كە سەرهەنگ، ئامادەیە نیوەی دارایی خۆی ببەخشێتە ئەو تەنیا بەو مەرجەی لە كۆڵی بێتەوە. وەلێ فۆما بە سەروسەكوتێكی جوامێرانەوە پێشنیاری پارەكەی ڕەد دەكاتەوە و دەیەوێ ئەو ماڵ و بنەماڵە سپڵەیە جێبهێڵێت و تەنیا لەبەرانبەر سووكایەتیپێكردنی زیادتر و ناشیرینتردا لەم نیازە پەشیمان دەبێتەوە. ئەوجا ئاقیبەت فۆما وەدەر دەنرێت، وەلێ كەشوهەوا تووشە و زریانـاوی، باران دەبارێت و لەم دۆخ و هەلومەرجەدا سەرلەبەری ئامادەبووان، تەنانەت ئەوانەش كە پێشتر سەرهەنگیان لەبەر بێهەڵوێستیی سەركۆنە دەكرد، لەو ساتەدا سۆز و بەزەییان بۆ فۆما دەبزوێت. جا سەرهەنگ بە پەلە سوار ئەسپی بێزین و هەوسار دەبێ تا خۆی بگەیەنێتە فۆما و داوای لێبووردنی لێ بكات. لە ڕێگەدا تووشی فۆما دەبێت كە وا خەریكە تەكەتەك بەرەو ماڵ دەگەڕێتەوە، چونكە ئەوێك كە بەردەوام هەڕەشەی جێهێشتنی ئەو ماڵەی لە هەمووان كردووە، دواجار تێگەیشتووە كە هەر بە ڕاستی لە دونیادا بێكەس و پەناگەیە. جا بەم پێیە، ڕیسەكە دەبێتەوە بە خووری، هەموو شتێك سەرلەنوێ دەست پێدەكاتەوە و فۆما سەركەوتووە. لەم بارەیەوە ئیبسن و ستریندبێرگ زۆر قەرزاری دۆستۆیڤسكین.

لە ناونیشانی ئەم شرۆڤەیەدا باسی مەتەڵم كرد. بە بۆچوونی من خاڵی مەتەڵئاسا ئەوەیە كە بۆچی لێكۆڵینەوەی زانستمەندانی

ڕووسی لە بارەی دۆستۆیڤسکییەوە، وەڵامی ئەم پرسیارەیان دەست نەکەوتووە کە نووسەر بە ئافراندنی کەسایەتیی فۆما ئۆپیسکین (کەسایەتییەك کە ئافراندنی هوونەریی، هەڵگری بایەخێکی جیهانیی هاوشێوەی تابلۆی *مۆنالیزای لیۆناردۆ داڤینشی*یە)، مەبەستی کێ بووە؟

بێگانە سەرەتا بڕیار بوو لە بڵاوکەرەوەی پەیکی *ڕووسیی میخائیل کاتکۆف*دا چاپ بکرێت، وەلێ دەستەی نووسەرانی ئەم بڵاوکەرەوەیە، کە سەرەتا تەنانەت بەیعانەشی دابووە دۆستۆیڤسکی، چیرۆکەکەی پەسەند نەکرد و دەستنووسەکەی پێ دایەوە. دۆستۆیڤسکی خۆی ئارەزووی بوو کتێبەکەی لە مانگنامەی دژەکانی، یانی لە *سەردەمی نیکراسۆف*دا چاپ بکات، وەلێ *نیکراسۆف*یش کەیفی بە چیرۆکەکەی نەهات. تا دواجار *کرایفسکی*، ئەو کەسەی کە بەر لە دوورخرانەوەی دۆستۆیڤسکی بەرهەمەکانی ئەوی چاپ دەکردن، کتێبەکەی لێ کڕی. هەر ئەم کرایفسکییەیە کە دوای خوێندنەوەی بێگانە، دەڵێت کەسایەتیی فۆما، گۆگۆڵی لە سەردەمی خەمۆکی و لاتەریکیدا بیر دەهێنێتەوە. جا ئێوە سەرنج لەوە بدەن کە کرایفسکی سەلیقەیەکی ئەوتۆی ئەدەبیی نەبوو، ئەو تەنیا بڵاوکەرەوە و کڕیارێکی کتێب بوو. وەلێ ئەم گوتە بێسەروبەر و ناماقووڵەی ئەو، ئەفسانەیەکی بەدوای خۆیدا هێنا و بووە هۆکاری ئەوەی کە سالأنێك دواتر، کاتێك یانەی شانۆی *ئەستۆنیسلاڤسکی* بۆ نمایشکردن بێگانەی بردە سەر سەکۆ، کەسایەتیی فۆما فۆمیچی، هەر وەکو گۆگۆڵ، بە پەرچەمێکی کاڵی سەر تەوێڵییەوە

نیشـان دا. ئـەم گریمانـە و بۆچـوونەی کرایفسـکی، بـە تـەواوی لـە حەقیقەت بەری بوو. دۆستۆیڤسکی لە نزیکەوە ئاشنای گۆگۆڵ بوو، وەك نووسەر شەیدای ئەو بوو و هیچ هۆکارێك بۆ ئەم ڕقەبەرایەتییە لە ئارادا نەبوو. با واز لەوە بهێنین کە گۆگۆڵ ڕێی تێدەچوو لە ژیانی تایبەتییدا بەدخوو بێت، وەڵێ لە ئاستی پرسی ستەمکاریی فۆمادا، بـێ گومـان نووسـەر سـەرنجی لەسـەر شـتێکی بـالاتر لـە ئـەخلاقی تایبەتی بوو. هەڵبەتە کەسایەتیی فۆما هێمایەکە و لێرانەدا نەك هەر بە تـەنیا گوشار دەخرێتـە سـەر خودی خـەڵکی، بەڵکە بیروباوەڕیـان دەخرێتە ژێر گوشار، ئەمە ئەو خاڵەیە کـە دۆستۆیڤسکی بـە ڕوونـی جـەختی لەسـەر دەکاتـەوە. خـاڵی کۆتـاییش ئەوەیـە کـە گۆگـۆڵ هەڵکەوتـە بـوو، کەچـی فۆمـا دەستوپێسـپییەکی ئەدەبییـە و ئـەم کۆڵەواری و نزمئاستییەش تایبەتمەندیی دیاری ئەوە. فۆما وێنـای کەسـێکی دیکەیـە، کەسـێك کـە پەیوەندییـەکی ڕاسـتەوخۆی لەگـەڵ ژیان و چالاکییە ئەدەبییـەکانی دۆستۆیڤسکیدا هـەبوو. جا لێرانـەدا مافی هەڵهێنانی ئەو مەتەڵە بۆ خـۆم دەپارێزم و دەڵـێم کـە، ئـەم فۆمـا فۆمیچە هیچ کەسێکی دی نییە بێجگـە لـە *ڤیسساریۆن بلینسـکی*. هـەر یـەك لـە ڕسـتەکانی ئـەم کتێبـە پشتڕاسـتکەرەوەی گریمانـە و بۆچوونەکەی منن. تەنانەت ئەو دیمەنـەی ژیـانی بلینسـکیش کـە لـەم کتێبـەدا گواسـتەمەوە، نیشـاندەری پێکچـوونی نێـوان فۆمـا و بلینسـکییە. سـەرنجی ئـەم خالانـە بـدەن: فۆمـا زڕەنووسـەرێکە، بـەردەوام وانـە بـە کەسـانی چـواردەوری دادەدا، هـەر وانـەدادان و وانەدادان، وای دەنوێنێـت کـە بایـەخێکی ئـەوتۆ بـە ئاسـناو ئـادات، گەرچی پێداگریش لەسەر ئەوە دەکات کە بە پایەبەرز بانگ بکرێت.

قرووشـێکی لـە باخەڵـدا نییـە، بـەس حـەزی لـە خـۆراکی باشـە و شەرابناسـە، جـا لـە سـەرووی هـەموو شتێکیشـەوە داب و نـەریتی ڕووسـی بـە کـەم و پـووچ دەزانێـت و بـە ناچـارکردنی جووتیـارانی ڕووسـی بـۆ فێربـوونی زمـانی ڕووسـی، سـووکایەتییان پـێ دەکـات. کاتێك گـاڤریلای پیرەخزمـەتکار، ڕوو لـە فۆمـا دێتـە گـۆ، لـە شێوازی قسـەکردنیدا هـاواری حورمـەت و ئـیرادەی شـکێنراوی نەتـەوەی ڕووسیا دێتە گوێ. فۆما پیرەجووتیاران ناچار دەکات وەك منـداڵ بـە چۆکدا بێن، بیلینسـکیش هەڵسـوکەوتێکی هاوشـێوەی هـەبوو، بـۆ نموونـە لـەو کاتـەدا کـە فـەرمانی «بێـدەنگ بـە» بەسـەر پرۆفیسـۆردا دەکات و لێی دەخوازێت لە پەنجەوەرەوە بڕوانێتە دەرێ.

جا هەر بە ڕاستی دیار نییە کە زۆربەی ڕۆشنبیر و هاوچەرخانی بلینسـکی لەبـەر چ هۆکارێـك گوێڕایـەڵی ئـەو بـوون و، بۆچـی پەیوەنـدییان لەگـەڵ ئـەودا بـە جۆرێـك لـە جۆرەکـان دەچـووەوە سـەر کۆیلایەتییەکی ئازادانە. ئەو ڕەخنەگرێکی ئـەدەبی بـوو کـە بیروڕا و دیدگەکانیی بە ئارەزووی خۆی و شێوازێکی هەوەسبازانە دەگۆڕین، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، کەسانێکی زۆر، وەکو کۆیلە پـەیڕەوییان لـێ دەکـرد. دەوڵەمەنـدانێکی زۆر کردوکۆشـیان بـوو تـا هـەموو جـۆرە پێداویستییەکی خۆشگوزەرانی بۆ ئەوم مرۆڤە لاتولووتە دابین بکەن و جا ئـەوە سەنجڕاکێشـە کـە ئـەم، هـەموو ئـەو شـتانەی وەك دیـاری وەردەگـرتن و بـە مـافێکی ڕەوای خـۆی دەزانـین. سـەرلەبەری ئـەم تایبەتمەندیانـەش لـە کەسـایەتیی فۆمـادا دەدۆزیینـەوە؛ هەڵبەتـە بـە شـێوازێکی ناشـیرین و قێـزەون و هـەجووئامێز. ئێمـە ئـەوەمان بـیر

نەچووەتەوە کە بلینسکی چۆن ئازاری دۆستۆیڤسکیی دا، پێگەی ئەوی لەقاند، سووکایەتیی بە لێهاتوویی و سەلیقەی ئەدەبیی کرد. ئەو ئازار و مەینەتییەی کە بلینسکی بۆ ئەوی هێنایە ئارا، لە تێکڕای ئەشکەنجەی سالانی دوورخستنەوە و بێگارەکاری زیادتر بوو. بێباکیی بلینسکی بەرانبەر بە ئەو، سالانێکی زۆر ئەوی کردە گاڵتەجاڕی هەر هەمووان، بایەخی کارە ئەدەبییەکانیی دابەزاند، خوێنەران و تەنانەت تا ڕادەیەك خودی ئەویشی لە لێهاتوویی و سەلیقەی ئەدەبیی خۆی خستە دوودڵییەوە. هەموو ئەمانە گورزگەلێك بوون کە کەسێکی وەك دۆستۆیڤسکی نەیدەتوانی لە بیریان بکات و جا هەر لەبەر ئەمەش، ئەو بە درێژایی تەمەنی قینلەدڵانە بلینسکیی بەسەر دەکردەوە.

ئەو سالانەی کە دۆستۆیڤسکی لە تاراوگە بوو، *پانایێف* لە گوتارێکیدا ناویی هێنایە ناو و ئەوی وەك نووسەرێك وەسف کرد کە بە هۆی بەخت و هەڵکەوتێکی گاڵتەجاڕانەوە، لە ڕێی یەکەمین ڕۆمانییەوە دەستی بە قیچە ناوبانگێك ڕاگەیشتبوو. دۆستۆیڤسکی خۆی دەیزانی کە ئەم بەکەمزانینانە، هەمووی لە سایەی بلینسکییەوەن. پانایێفیش تا ڕادەیەك سەرهەنگمان بیر دەهێنێتەوە کە لەژێر دەسەلات و ویستی فۆمادایە. کەواتە ئەوە جێی سەرسامی نەبوو دۆستۆیڤسکی دوای تارانەکەی، کە گەڕایەوە نێو ژیانی ئەدەبی، بۆ هەقکردنەوە لە کەسێك کە ئەو هەموو خراپەکارییەی بەرانبەر کردبوو، دەستی بە نووسین کردەوە. وێڕای هەموو ئەمانەش، ئەو حەزی نەدەکرد خوێنەرانی لەوە تێبگەن کە ئەوە

کەسایەتیی بلینسکییە، چونکە لەو بارەدا بێگانە، زیادتر شێوەی تۆڵەسەندنەوەیەکی تایبەتیی بە خۆوە دەگرت. بێ لەوەش، فۆما کەسایەتییەکی نەناسراوە و دۆستۆیڤسکی نیازی بوو بابەتی بلینسکی، بە بۆچوونی خۆی، یەك جار بۆ هەمیشە بەم شێوەیە چاروبڕ بکات: بلیسکی بەهرەیەکی وای نەبوو و لێهاتوویەکەشی لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە دەیتوانی بیروبۆچوونەکانی بەسەر ئەوانی دیکەدا بسەپێنێت. بێ لە تۆڵەسەندنەوەی تایبەتی، دۆستۆیڤسکی لە ڕووی بیروبۆچوونەوە چەند وردەحسێبێکی لەگەڵ بلینسکیدا هەبوو. فۆما کەسێکە وەرزێران فێری زمانی فەرەنسی دەکات، داب و نەریت و خوڕافات و پەندە ڕووسیەکان بە شێوەیەکی ڕووکەشبین و گەمژانە و کڵێشەیی دەداتە بەر سووکایەتی. ئەمە وێنایەکی زیانەخرۆیانەی بلینسکییە، کەسێك کە بێڕادە بە شانوباڵی ئەوروپادا دەهات و سووکایەتیی بە ڕووسیا دەکرد. هەمان ئەو بلینسکییەی کە نامەی بۆ گۆگۆڵ نووسیبوو و دۆستۆیڤسکیش (تۆ تەماشەی یارییەکانی ڕۆژگار!)، بە تاوانی خوێندنەوەی ئەو نامەیە، کەوتبووە زیندان.

## سەرچاوە


ستانیسلاو ماتسکەویچ

زندگی و آثار داستایفسکی از نگاهی نو

ترجمه: دکتر روشن وزیری

نشر نی

# شیکاریی پێکهاتەی-دیالەکتیکیی دۆخی کۆمەڵایەتی لە «بێگانە»دا

دەروونناسایی کۆمەڵایەتی هەوڵ بۆ تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی پەیوەندیی مرۆڤ، دۆزینەوە و دیارخستنی یاسامەندیی ڕەوتی بۆنەکانی مرۆڤ دەدات، هەروەها ئامانجەکەشی شەنوکەوکردنی هۆکاری کێشمەکێشە تاکەکەسییەکان و دۆزینەوەی ڕێچارەیانە.

ڕێدۆز«میتۆد»ی پێکهاتەیی-دیالەکیتیکی، ڕێدۆزێکە لە چوارچێوەی قوتابخانەی دیالەکتیکی دەروونناسی، بنەماکەشی تێفکرینی دیالەکتیکە کە بۆ شەنوکەوکردنی ڕووداوی کۆمەڵایەتی-دەروونناسی بە کار دەبرێت. شێوەبەخشین بە پێکهاتەی دیالەکتیکیی دۆخێکی دیاری کۆمەڵاتی، ئەو توانایەمان دەداتێ کە ئەو دیاردەیە دەربخەین، دژبەرە پێکهێنەرەکانی بدۆزینەوە و تەنانەت ئەوەش دەستنیشان بکەین کە ئەم دۆخە چۆنچۆنی پەرە دەسەنێت و لە داهاتوودا چ ئاراستەیەك دەگرێتە بەر. دۆزینەوەی ئەو دژبەرانەی کە وەك بنەمایەکی جیهانی کار دەکەن، وا دەکات لە هەر یەکەیەکی ناوەڕۆکی بنچینەییدا، میتۆدی پێکهاتەی-دیالەکتیکی شیتەڵکاریش پێك بهێنرێ. ئەم میتۆدە پێکهاتەیی-

دیالەکتیکییە، ناساندنی بابەتە ماتریالّی و ئایدیالّییەکان دەرەخسێنێت و ڕێی دەدات کۆی ئەم شێوازانە وەك یەك گوتاری تایبەتی دیالەکتیکی بخرێنە ڕوو. کۆی ئەم شێوازانە وەك لۆجیکی ئەگەرگەلێکە کە دێتە ناو پێکهاتەی دیاردەکان و بابەتە جیاوازەکان.

هەر دۆخێکی ژیان، وەك سیستمێك وایە کە بە شێوەیەکی بزۆك لە باری تەشەناکردندایە. خستنە گەڕی ئامانجداریی تێفکرینی دیالەکتیکی، بۆ شەنوکەوکردنی دۆخ و شێوەپێبەخشینی، ئەو توانایە بۆ تاکی گیرخواردوو لەو دۆخەدا دەستەبەر دەکات کە نەك هەر بە تەنیا پێشنیاری گۆڕانکاری بدات، بەڵکەن خودی خۆی بەشداریی چالاکانەی لە ڕێکخستنی ئەم گۆڕانکارییەدا هەبێت. توانای وێناکردنی داهاتوو، ئەو لێهاتوویییە دەبەخشێتە مرۆڤ کە خۆی لە کۆتی ئەوەی کە لە ئێستەدا بایەخی هەیە، ڕزگار بکات، بایەخ بۆ وێناکردنی داهاتووی ئەم دۆخە دابنێت و بەو پێیە، بەرنامەی تایبەتی چالاکیی خۆی دابڕێژێت. وێنای ئێمە بۆ داهاتوو و ئەو ڕووداوانەی کە دەشێ تێیدا ڕوو بدەن، یەکێکە لەو هۆکارە بنەڕەتیانەی کە دەتوانێت ئێمە و ئەو دۆخەی کە تێی کەوتووین، بگۆڕێت.

لە مێژە ئەو شرۆڤە دەروونناسییە قووڵانەی کە دۆستۆیڤسکی بۆ کەسایەتییەکانی دەیانخاتە ڕوو، سەرنجی زانستمەندانی بۆ خۆی ڕاکێشاوە. گەرچی بۆی هەیە ئەم قسەیە ناکۆك بێتە بەرچاو کە وەسفکردنی کەسایەتییەکان و هەڵسوکەوتیان بە شێوەیەك کە هێندە ڕاسقینە دەر بکەوێت، جیاوازیی لەگەڵ ئەوەدا نەبێت کە لە واقعدا

هەیـە، کـارێکی ئێجگـار دژوارە، سـەرەڕای ئـەوەش، دۆستۆیڤسـکی دەرەقەت هاتووە، چونکە لە وەها ڕەوشێکدا پێویستە هەموو شتێك بـە شـێوەی یـەك گشـت و یەکەیـەکی یەکپارچـە بـە هـەموو تایبەتمەندییە لێکدرژەکانییەوە ببینین. کتومت هەر لەبەر ئەوەشە کە کەساسەتییەکانی دۆستۆیڤسکی وەك مرۆڤانێکی ڕاستەقینە دێنە بەرچاو. لە هەمان کاتدا، ئەو دۆخەی کە لە ڕۆمانەکەدا خراوەتە ڕوو ئێجگار تایبەت، بەرجەستە و بە مانایـەك، بۆ دەرککردنـی برێك لـە دیاردەگەلی کۆمەڵایەتی-دەروونناسی، کلاسیکیانە دەر دەکەوێت.

تایبەتمەنـدیی هەلومـەرجی پاڵـەوانانی نێـو ڕۆمانەکـە، لـە چوارچـێوەیەکی گشـتیدا بـەم جۆرەیـە: سـەرهەنگ ئیگـۆر ئیلـیچ ڕۆسـتانێڤ، کەسـێکی دڵپـاك، جـوامێر، ڕەسـەن، خاکـەڕا، خۆشسرووست، بسار، بێبڕوانامە و هاکەزاییە. سەرهەنگ پێشوازی لـە دایکـی خـۆی، یـان ژنـی جەنـەراڵ کراخـۆتکین، کـە پیرێـژنێکی لووتبـەرز و دەبـەنگ و بەدگەوهـەرە، دەکـات و لـە ماڵی خۆیـدا جێـی دەکاتەوە. دایکی، نانەخۆرەکەی جارانی -فۆما فۆمیچ ئۆپیسکین- یشـی لەگەڵـە. ئۆپیسـکین پیـاوێکی بێکەڵکـە، مرۆڤێکـی دەستوپێسپی، چەپەڵ، بەخۆناز و بێڕادە خۆپەرستە، جا سـەرباری ئەمەش، لە هەر جۆرە هوونەر و لێهاتوویيەك بێبەشە کە تەنانەت گەر لەبەر ئـەوەش بێـت، بکرێـت تـا ڕادەیـەك ڕەوایـەتی بـەو خۆویسـتییە نەخۆشانەییە دەروونییەی بدەیت. ئەمە دیـوێکی دیکـەی هـەمان ئـەو خۆویسـتییەیە کـە وای کـرد فۆمـا لـە سـەردەمی ژیـانی جەنـەراڵ کراخۆتکینـدا، بچـێتە ژێـر بـاری سـووکایەتییەکانی ئـەوەوە. فۆمـا

فۆمیچ هەق و ناهەق و بۆ هەر کارێك دەست بە سەرکۆنەکردنی سەرهەنگ دەکات و بەردەوام شەرمەزاری دەکات، دایمە لە کاروباری ماڵ و بەڕێوەبردنی موڵکدا خۆی هەڵدەقوورتێنێت. سەرهەنگش کە بەرگەی ئاژاوە و پشێویی نێو ماڵەکە ناگرێ و لێی دەترسێت، گەرچی لە دڵدا ناڕازییە و ئازار دەچێژێت، وەلێ گوێڕایەڵانە مل کەچ دەکات تا *هەمووان ڕازی و کامەران بن*. سەرئەنجام، لە ماوەیەکی کوورت و لە موڵکی ستێپانچیکۆڤۆدا، ملکەچییەکی سەرتاسەری بۆ ئارەزوو و بیانووەکانی فۆما فۆمیچ دەرەخسێت و *ماڵ لە خاوەنماڵ حەرام دەکرێت*. پێگەی فۆما فۆمیچ بە پاڵپشتیکردنی دایکی سەرهەنگ و مشەخۆرەکانی، پتەوتر دەبێت. بەشێکی زۆری ڕۆمانەکە بۆ ئەوە تەرخان کراوە کە فۆما فۆمیچ چۆن سەرهەنگ دەخاتە نێو یارییەکەوە و، سەرهەنگیش گەرچی لە دڵدا بەرهەڵستیی پێداگرییەکانی فۆما فۆمیچ دەکات، کەچی زاتی نییە هیچ هەنگاوێك بۆ سەرکوتکردنی داخوازییەکانی ئەو بنێت. بەم پێیە، سەرهەنگ مۆڵەت دەداتە فۆما فۆمیچ کە گاڤریلای پێشخزمەتی فێری زمانی فەڕنسی بکات، ئەمەش لە بارێکدا کە پێویستیی وەها فێرکارییەك بە تەواوی ڕوون نییە و گاڤریلاش ناکۆکە. وا دەردەکەوێت کە دەسەڵاتی فۆما فۆمیچ بەسەر سەرهەنگدا بیکۆتاییە، چون تەنانەت هەوڵ دەدات دەسەڵاتی خۆی بەسەر جۆری خەونیشەوە، کە لە دەسەڵاتی ئاگایی مرۆڤدا نییە، بسەپێنێت و کەچی سەرهەنگ، لەبەرانبەردا هیچ کاردانەوەیەکی نابێت. هەر بەم بۆنەیەشەوە کوڕەی لادێیی (فالالی)، سەرەڕای لێپێچینەوە و گوشاری هەرڕۆژەی فۆما فۆمیچ، بە هیچ شێوەیەك

ناتوانێت خەون بە گاچەرمووەوە نەبینێت و، سەرهەنگ ئیگۆر ئیلیچیش لەم نێوەندەدا زۆر خۆی بە گەمژە دێتە بەرچاو. سەرهەنگ ئیدی خۆیشی خەریکە بەرەبەرە دێتە سەر ئەو بڕوایەی کە فۆما ڕاست دەکات و هۆکاری ئەم خەونە *قۆڕانە* کاریگەریی خراپی ئەوە بەسەر کوڕیژگە داماوەکەوە!

هەر بەو جۆرەی کە دەیبینیین، دیاردەی بنچینەیی، کە بناغەی ڕووداوەکانی ئەم بەشەی ڕۆمانەکە پێك دەهێنێت، کردوکۆشی فۆمایە بۆ زاڵبوون بەسەر هەموو کەس و شتێکدا لە ڕێی گوێڕایەڵکردنی سەرهەنگەوە. ئێستەش دەبێت ئەو دژبەرانە دیاری بکەین کە لەم دیاردەیەدا کۆ بوونەتەوە. یەك لەو جووتە لێکدژانەی کە وا دێتە بەرچاو لەم دیاردەیەدا بوونی هەیە، دەکرێت ئەم جووتەی ژێرەوە بن:



سەلەبەری هەوەسەکانی فۆما فۆمیچ ئۆپیسکین بە پێچەوانەی ئەو شێوازە ژیانەوەیە کە لە ماڵی ئیگۆر ئیلیچدا باوە و بە پێچەوانەی بڕوا و ویستەکانی ئەوەوەن. لە ڕاستیدا، گوێڕایەڵکردنی کەسێك، تەنیا ئەو کاتە مانا دەبەخشێت کە ویستەکانی ئەو، لەگەڵ هیکانی گوێڕایەڵکەرەکەیدا دژ بن. بەدەر لەمە، ئیدی گوێڕایەڵییەك لە ئارادا نابێت، بەڵکە، بۆ نموونە جۆرێك لە پەیوەندیی هاوکارانە لەنێوان هاوبیراندا دێتە ئارا. لەگەڵ ئەمەشدا، سەرهەنگ هەرچەندە هەوڵ دەدات گۆڕانکاری لە خۆیدا بکات، باشتر ببێت یان هەڵسوکەوتی ڕێك بە پێی ڕێنماییەکانی جەنابی فۆما فۆمیچ بن، سەرکەوتوو نابێت، چونکە فۆما فۆمیچ دەمودەست داوای شتێکی دی دەکات (گەر نا دەسەڵات لەدەست دەدات و دەبێتە هاوکارێك). مەسەلەکە بەم جۆرەیە کە بەردەوام، بۆ نموونە فۆما فۆمیچ لەبەر نەزانی سەرکۆنەی سەرهەنگ ئیگۆر ئیلیچ دەکات، بەس دوای ماوەیەك، لەسەر ئەوەی کە خەڵکانی زانستمەند و خوێندەواری داوەتی ماڵەوە کردووە، لەگەڵیدا دەیکاتە شەڕ، هەر بەو جۆرەی کە ئەمە لە کاتی گەشتی گێڕەرەوەی ڕۆمانەکەدا، کە زەویناسە و لە پترسبورگەوە هاتووە بۆ ستێپانچیکۆڤۆ، ڕوو دەدات. سەرلەبەری هەڵسوکەوتەکانی فۆما فۆمیچ دەچنە چوارچێوەی ڕێکارێکی نەخشەڕێژکراوەوە. هەڵسوکەرتی فۆما، پشتی بە ناکۆکیی دەروونیی سەرهەنگ لەگەڵ پێداگرییەکانی ئەو و ئامادەیی بۆ بەجێهێنانی داخوازییەکانی بەستووە.

لـه بەشـی دووەمـی ڕۆمانەکـەدا هەلومـەرجێك دێتـە ئارا کـە فۆمـا ناچار دەبێـت ڕێکارەکـەی بگۆڕێـت، ئـەوەش تـەنیا لەبـەر ئەوەیـە تـا پێگــەی خــۆی بپارێزێــت. دواجــار ســاتێك دێتــە پــێش کــە ڕووبەڕووبوونەوەی سەرهەنگ دەبینین. فۆما فۆمیچ بێ گومان پێشتر دەیزانی کە سەرهەنگ ئیگۆر ئیلیچ بە هیچ شێوەیەك لـە دەسەڵاتدا هاوبەشـی ئـەو نییـە، دەنـا دەمودەسـت ڕێکـاری داخوازییـەکانیی دەگـۆڕی. وەڵێ وا ئێسـتاکە فۆما فـۆمیچ لـە ڕووی فیزیکیشـەوە بـەر ئەوە کەوتووە (با بیر خۆمـانی بهێنینـەوە کە چۆن وەهـا ڕووداوێك هاتە ئارا).

هـەر بـەو جـۆرەی کـە لـە دەسـتپێکی ڕۆمانەکـەوە دەرکـی پـێ دەکـەین، خـانمی جەنـەراڵ لەگـەڵ فۆمـا فۆمیچـدا بڕیاریـان داوە سەرهەنگ ناچار بکەن زەماوەند لەگەڵ خاتونێکی دەوڵەمەند، وەڵێ نیوەشێتدا بکات کە بە هیچ شێوەیەك دڵی پێوەی نییە و، ئەمەش لە بارێکدایـە کـە هـەموو ئەنـدامانی ماڵەکـە دەزانـن سـەرهەنگ شـەیدای خاتوونی مامۆستای منداڵەکانی خۆیەتی.

کاتێك فۆما دەیەوێت ببێتـە کۆسپی سـەر ڕێـی بەختـەوەریی دوو دڵدارەکــە و تــا شــەرمەزارکردنی کچــەی بێتــاوانیش لەبــەردەم ئامادەبوواندا لێی دەچێتە پێش، سـەرهەنگێك کـە بـە هـیچ شـێوەیەك نەدەهاتــە ســەر بــڕوای دەرکردنــی فۆمــا، جــۆرە کاردانەوەیــەکی چاوەڕوانینەکراو دەنوێنێـت و دەگاتـە ئـەم ئەنجامـە: پێویسـتە ئـەو تورخمە بێگانەیە لە ماڵ وەدەر بنێت. کاتێك فۆما فۆمیچی تێهەڵدراو و خووساو و ترسـاو لـە هەورەشـریخە دەگەڕێتـەوە ماڵـێ (بگـرە ئـەو

هەر لە بنەڕەتەوە نەیویستووە ئەم *ماڵە خۆشە* جێبهێڵێت)، کتوپڕ دەبێتە مایەی کامەرانیی هەمووان. ئەو دەڵێ بۆیە ویستوویەتی ناستینکا لەو ماڵە بتارێنێ تا لە شەڕی *ئارەزووە هار و نیازە چەپەڵەکانی* ئیگۆر ئیلیچ بەدووری بگرێت. جا بینەرانی کاڵفام وای لێك دەدەنەوە دیمەنی پێشوو، کە فۆما فۆمیچ دەیویست بەو سووکایەتیپێکردنانەی پەلاماری ئەو کچە پاك و نەجیبە بدات، تەنیا مەبەستی تاقیکردنەوەی سەرهەنگ بووە. بەم پێیە، سەرهەنگ لە تاقیکردنەوەکەدا سەربەرز دەرچوو و فۆما فۆمیچ پەسەندی کرد کە ئەوینی سەرهەنگ *بێگەرد و تەنانەت پیرۆزیش* بووە. فۆما فۆمیچ، بەم جۆرە ئیدی پێگەی ڕابردووی خۆی بەدەست دەهێنێتەوە و دووبارە دەچێتەوە سەر هەمان ئامانجەکەی سەرەتای، یانی دەسەلات و لێکدژی لەگەڵ هەڵسوکەوتەکانی ڕابردووی.



جا خاڵی جێسەرنج ئەوەیە کە لەو ساتەدا ئیدی هیچ کەس کەمترین گومانی لەوەدا نییە کە فۆما فۆمیچ وەك هەر کەسێکی دی دڵخۆشە بە کامەرانیی سەرهەنگ و حەز دەکات ئەو، زەماوەند لەگەڵ کچەی لاودا بکات. کەواتە هەمدیسان جڵەوی دۆخەکە دەکەوێتەوە دەستی فۆما و ئێستە ئەوە ئەوە پێداگری دەکات کە ئەویندارەکان پێك بگەن و دوعای خێریان بۆ دەکات. ئەوسا فۆما دەبێتە نموونەیەکی دڵخواز و وا دەردەکەوێت کە بەبێ ئەو، هیچ کێشەیەك چارە ناکرێت.

پێویستە سەرنج بخرێتە سەر ئەوەی کە تا بەر لەم ڕووداوانەی کە ئێستە باس کران، گەر لە ماڵی سەرنگدا کەسانێك دەیانوێرا بە ئاشکرا بڵێن فۆما فۆمیچ ئۆپیسکین مرۆڤێکی *ستەمکار و چەپەڵ و خوێڕییە* (هەر بەو جۆرەی کە بەر لە هەمووان کچە پازدە ساڵەکەی سەرهەنگ ئەم فیداکارییەی کرد)، لەوسا بەدواوە ئیدی هیچ کەسێك نەیوێرا تەنانەت لە دڵی خۆیشیدا وەها شتێك بڵێت، چونکە ئەو لە کتوپڕێکدا بووە خۆشەویستی دڵان. هاوکات، فۆما بابەتگەلی تازە بۆ ئاراستەکردن و درێژەدان بە زۆرداریيەکەی دەدۆزێتەوە، هەر لەبەر ئەوەش، ئیدی هیچ کەسێك ناوێرێت سەرپێچی لە فەرمانەکانی بکات.

کتومت هەر لەبەر ئەوەشە کە خێرا هەڵسوکەوتی کەسایەتییەکان دەگەڕێتەوە سەر هەمان ڕەوت و ڕێچکەی جاران. بەم پێیە، وەك ئەوە وایە کە ڕێکاری باسلێکراو، لەنێوەی یەکەمییەوە بازێك بداتە سەر نیوەی دووەم، یان لە دژیەکییەکەوە بچێتەوە سەر دژیەکییەکی دی.




دەبێت سەرنج بخەینە سەر ئەوە کە فۆما فۆمیچ ئۆپیسکین تەنیا کاتێك دەتوانێت پێگەی خۆی بپارێزێت و دەسەڵاتی بەسەر ئەوانی دیکەدا بسەپێنێت، کە بەردەوام وەها پەڕینەوە و بازدانێك لە ڕێکارێکەوە بۆ ڕێکارێکی دی لە ئارادا بێت. گەر دەسەڵات تەنیا بە پێی ئەو ئەوەڵ شێوازەی کە باسمان کرد، بجووڵێتەوە و لە مرۆڤەکان بخوازێت بە پێی ئارەزووی ئەو هەڵسوکەوت بکەن، (تەنانەت گەر بەتەماش نەبن) لەو بارەدا شۆڕشێك بەرپا دەبێت و ئەو پێگەیەی خۆی لەدەست دەدات. دەسەڵات گەر بە

پێچەوانەشـەوە، لەگـەڵ ئـازادی و مافـە سرووشـتییەکانی مرۆڤانـدا بسازێت، ئیدی بە فەرماندەیی نامێنێتەوە و دەبێتە هاوبیرێك.

بـەم پێیـە، بـە دۆزینـەوەی پێکهاتـەی دیالـەکتیکیی ڕۆمانەکـەی دۆستۆیڤسـکی، شـێوازی دەسەڵاتویسـتیی فۆمـا فـۆمیچ لـە ئاسـت تێگەیشتندا دەبێت: *ناچارکردنـی ئـەوانی دی بۆ جووڵانـەوە بە پێـی ئـارەزووی ئـەو و جاروبـاریش مۆڵەتپێـدانیان و تەنانـەت لێخواخستنیشـیان بـۆ هەڵسـوکەوتکردن بـەو جـۆرەی کـە خۆیـان حـەزیان لێیـە*. ئەم سیاسـەتە وا دەکـات فۆمـا فـۆمیچ لـە داهاتووشـدا بتوانێت ئەوان ناچار بکات کارێك ئەنجام بدەن کە بە دیوێکی دیکەدا لە مەبەستی ئەوەوە نزیك بێت. جا خاڵی سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە بە پێی ئەنجامی کۆتایی فۆرموولە (بازنـەی خوارەوەی دەستە ڕاست)، ئـەوان سـەرلەبەری ئـەم کارانـە بـە ئـارەزوو و ویسـتی خۆیـان ئـەنجام دەدەن، چونکە بە ڕوواڵەت *لە بەرهەڵستییەکی ئاشکرادا، بەو جـۆرە هەڵسـوکەوت دەکـەن کـە بە بۆچوونی خۆیـان ڕاستە*، جا هـەر لەبەر ئەوە، بە تەواوی پاڵپشتی لە بەرنامە و سیاسەتی فۆما فۆمیچ دەکەن و بـە ڕەوای دەزانـن! ئـەم ویسـت و ئـارەزووە لـە لایـەن خۆیـەوە لـە خۆپەرستییەکی نهێنیی دیکەوە سەرچاوە دەگرێت. کەواتـە دیـوێکی دیکـە و دەشـێت ئـەنجامی کۆتـایی و نهێنـیتری ئـەم شـیکردنەوەیە، ئـەوە بێـت کـە ملـهوڕ، تـەنیا و تـەنیا بەسـەر ملهوڕانـدا دەتوانێـت فورمانڕەوایی بکات.

## سەرچاوە

**تحلیل ساختاری-دیالکیتیکی موقعیت اجتماعی در ناشناس**

**حمید رضا آتش برآب**

### لە بارەی زنجیرەی هاوزایی[1]

---

۱. نەخۆشیی وەهمی هاوزا «دوانە یان دوانەیی»

هاوزا لە زمانەوانیدا، بە واتای پێکەوە لەدایکبوون دێت، یانی دووکەس لە کاتێکی دیاریکراودا پێکەوە بزێنرێن و بهێنرێنە دونیا. دەکرێت وشەی هاوزا مانای دیکەیش بگەیەنێت، بۆ نموونە لە بارەی دوو یان چەند شتێکەوە کە هاوکات هاتبنە دونیا، وەك کەسانی دووانە و هاوەڵدووانە و...

هاوزا شتێکی سەربەخۆ یان جیا لە مرۆڤ نییە و لە ڕاستیدا دەبێت بڵێن هاوزا بەشێکی بوونی خوودی مرۆڤە. هاوزا لە هەلومەرجێکی تایبەتییدا دێتە ئارا و خۆی دەنوێنێ، ئەمەش پەیوەستە بە زەمانێکەوە کە تاك تووشی کێشەی ڕۆحی و پەرتەوازییەکی توندی دەروونی بووبێت. ئەو کەسانەی کە هەست بە تەنیاییەکی زۆر دەکەن، هەر بەم بۆنەیەوە نیازمەندی هاودەم و دڵنەوایەکن بۆ ئەوەی دەردەدڵی لەگەڵ بکەن، هاوزاش ئەم نیازە لە بەین دەبات. بە شێوەیەکی باو، هەمیشە ئەو کەسانە هاوزا دەبینن کە لە لێواری شێتبووندانە و لەگەڵ ئەودا دەدوێن. ئەو کەسانەی تووشی تەنیایی و خەمۆکی و پەرێشانی دەبن، سەرەتا لە گوێی خۆیاندا دەنگێکی وەکو چرپە یان ورتەورت دەبیستن کە ئەمەیش چالاکییەکە لە دەرەوەی ویستی دەمار و مێشك. بە پێی تێپەڕینی کات، ئەم چرپە و ورتەورتە بە ئەندازەیەك لە گوێی تاکی تووشبوودا زیاد دەبێت کە باری ڕوو لە خراپتربوون دەکات و دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەڵسوکەوتی نەشیاوی لێ بوەشێتەوە. لەم دۆخەدا کەسانی دەوروبەری لێی دوور دەکەونەوە و ئەویش بە ناچاری دەخزێتە کونجێکی چۆڵ و زۆربەی کات لە خاڵێك ڕادەمێنێ. لەم دۆخەدا تاك دێوانە بووە و بە کەسێکی شێت ناودەبرێ. لەم قۆناغەدا شێت بە ڕادەیەك لەگەڵ خۆیدا دەدوێت کە هەر بە ڕاستی وەك ئەوە وایە کەسێك لەبەرانبەریدا دانیشتبێ و قسەی لەگەڵدا بکات. تاك بەردەوام

## لە بەرهەمەکانی دۆستۆیڤسکیدا

ئەو پاڵەوانانەی کە دۆستۆیڤسکی ئافراندنی (*ماکار دێڤوشکینی هەژاران*، *گۆلیادکینی هاوزا*، *ئۆپیسکینی بێگانە*، *پیاوی ژێرزەمینی یادداشتە ژێرزەمینییەکان*، *ڕاسکۆلنیکۆڤی تاوان و سزا* و خودی *کارامازۆڤ*)، نوێنەرانی چینی خوارەوە، یان بەپێی ئەو دەربڕینەی کە هەمیشە بە هەڵە ئاماژە بەو چینەی ئەوسای ڕووسیا دەکرێت، نوێنەرانی چینی ناوەڕاستن، کە لەگەڵ خواستەکانیان لە ململانێدان و هەمووان مۆری مۆتەکە و سووکایەتی و هەژارییان بە تەوێڵەوەیە. ئەمانە خەیاڵپڵاوانێکی مەزاجی، ڕقلەدڵ، تووڕە، کەللەڕەق و مۆن و دوورەپەرێزن. گەر جاروباریش هەڵبکەوێت دۆستۆیڤسکی پاڵەوانەکانی لە جلوبەرگێکی خانەدان و موڵکدارانەدا بئافرێنێت (*ڤالکۆڤسکی سووک و ڕسواکراوەکان*، *میشکینی گەمژە* و *سڤیدریگایلۆڤی تاوان و سزا* و...) بێجگە لەو جلوبەرگانەی بەریان، هیچ نیشانەیەك لە

---

ئەزموونە تاڵ و یادەوەرییە ناخۆشەکانی ڕابردووی دەهێنێتەوە یاد و لە زەینی خۆیدا دووبارەیان دەکاتەوە. زۆربەی کات، تاك دوای تێپەڕاندنی سەردەمی خەمۆکی و شڵەژان و دەستپێکی قۆناغی شێتی، ماوزای خۆی دەبینێت. بەس ئەم ماوزایە تەنیا دەروونی خودی تاکە و هەر بە تەنیاییش لە لایەن خودی خۆیەوە دەبینرێ و دەبێتە هۆی ئەنجامدانی کاری شێتانە. «و. ك»

خانەدانی و موڵکدارییان تێدا نابینین. ئەوانە هەندێك جار، وەکو شازادە میشکین، هەر بە منداڵی لە کەشی خۆیان دوور کەوتوونەتەوە و بەدەوری چینگەلێکی نزمتر لەوەی خۆیاندا دەخولێنەوە و تەنانەت کەسانی وەك *سڤیدریگایلۆف* و *ستۆرۆڤگین* لە ناوجەرگەی چینی خوارەوەدا ژیاون. پێکهاتەی دەروونی، هەست و بیریان، هەر وەك هی کارەکتەرانی چینی خوارەوە وایە. ئەوان هەر ئەوەندە لە خانەدان و موڵکداران دەچن، کە *خەڵکی تەروای شەکسپیر* لە تەرواییەکانی مێژوو دەچن، یان *یۆنانییەکانی راسین* لە یۆنانییە دێرینەکان. وەك چۆن لە بەرهەمی شەکسپیر و راسیندا لەپشت ئەو ناوە یۆنانیانەوە، سەروسیمای دەرەبەگی سەدەی شازدەیەم یان ڕووخساری خانەدانێکی سەدەی حەڤدەیەم دیارە، لە ڕۆمانەکانی دۆستۆیڤسکیشدا، لەناو ئەو جلە خانەدانیانەی پاڵەوانەکاندا، سەروسەکوتێکی ڕقلەدڵ و تووڕەی پیاوانێك دێتە دەرەوە کە پووکالاوی هەژاری وا بە ناوچاوانیانەوە. گەر بمانەوێت بزانین چ دۆڵێکی قووڵ لەنێوان یۆنانییەکانی شەکسپیر و راسین لە لایەك و یۆنانییە ڕاستەقینەکانی مێژوو لە لایەکی دیکەوە بوونی هەیە، ئەوا دەتوانین بچین *هۆمێر* و *سۆفۆکل* بخوێنینەوە. هەروەها گەر ویستیشتان وێنایەکی ڕوونتان لە بارەی نەبوونی هیچ پێکچوونێك لەنێوان خانەدان و موڵکدارانی دۆستۆیڤسکی لەگەڵ ڕاستەقینەکاندا هەبێت، ئەوا بچن *تورگنێف* و *تۆلستۆی* بخوێننەوە.

ئەم پاڵەوانانەی دۆستۆیڤسکی چۆن دەژین، چ هەستێکیان هەیە و بیر لە چی دەکەنەوە؟ هەر بە ڕاست، ئەمانە کێن کە لە دۆخی

تۆقێنـەری کـەلاوەکانی شـار و کەشـی کەساسـانەی گیـانپڕووکێنی مرۆڤایەتیـدا، کـە هاوسـنووری هـەژاری و تێکشـکانی ڕەهایـە، دەر دەکەون؟ وەڵامی ئەم پرسیارانە، واتـە خستنەبەردەستی یـەك وێنـای تـەواو لـە بارەی نـاوەڕۆکی بەرهەمـەکانی کـاکی هوونەرمەنـدی ئێمـە. جا ئێمەش بەنیاز نیین کە لە بەرهەمی دۆستۆیڤسکیدا جیهـانبینی و بۆچـوونی سیاســی و ئــایینیی ئــەو شــەنوکەو بکــەین. وەهــا بەدواداچوونێك لـە بەرهـەمی هوونەرمەندێکدا، ڕێك وەکـو ئـەوە وایـە کە لە شیرینیخانەدا داوای جووتێك پووتین بکەین! هوونەرمەند ژیـان دەئافرێنێت، نەك سیستەم، ئەو نەك داوەری و بەڵگاندن، بەڵکە ژیـان دەکات و خۆی لە فلانە ژینگە و هەلومەرج، فلانە سیما و کارەکتـەردا وێنا دەکات. ئەوە دۆستۆیڤسکییە کە دەنووسێت:

خۆشــحاڵیی ڕاســتەقینەی مــن لــە ســەرەتا خولەکـەکانی ســەرکەوتنە سەرمەسـتکەرەکەمدا نـەبوو، بەڵکـە لـەو سـاتانەدا بـوو کـە هێشـتا نـە دەستنووسـەکەمم نیشـانی کـەس دابـوو و نـە بـۆ هیچ کەسێکیشـم خوێنـدبووەوە، یـانی لـە مـاوەی ئـەو شـەوانەی کـە پـڕ بـووم لـە حـەز و تاسـە بـۆ کـاری نووسـین، ئـەو شـەوە لێوڕێـژ لـە هیـوا و جۆشوخرۆشـانەی کـە تـەژی بـووم لـە خـەون و خـەیاڵ و لەوپـەڕی خۆشـحاڵیدا دەژیـام، ئـەو دەمانـەی کـە لەگـەڵ ئـەو کەسـایەتییانەدا دەژیـام کە خۆم ئافراندبوومن و هێندەم خۆش دەویستن

> کە دەتگوت کەسوکاری خۆمن و مرۆڤانێکی ڕاستەقینەن نەك خەیاڵی، بە خۆشحاڵییان دڵم دەکرایەوە و وەختێکیش کە تووشی چەرمەسەرییەك دەبوون، من بە چەشنێك خەم دای دەگرتم، کە هەندێك سات لە ناخەوە هۆن هۆن فرمێسکم بۆ دەڕشتن. ئەرێ، گەر کامەرانییەك بوونی هەبووبێت، ئەوا تەنیا لەو شەوانەدا بووە.[1]

بیرمان نەچێت کە هوونەرمەند ڕووخسارگەلی ڕاستەقینە دەئافرێنێت، نەك دەستکرد و میکانیکی. بەم پێیە، پێویستە شرۆڤەی بەرهەمی هوونەری، تاوتوێکردنی ڕووخسارگەلی زیندوو بێت نەك شەنوکەوکردنی بۆچوون و ئەندێشەکان. هەڵبەتە هیچ کارەکتەرێك دانەماڵراوە لە فلانە ویستی سیاسی-کۆمەڵایەتی یان فەلسەفی، وەلێ سەرلەبەری ئەم ویستانە لە بەرهەمی هوونەریدا، بایەخێکی سەربەخۆیان نییە. ئەم ویستانە بێ گومان یارمەتیدەرن بۆ نەخشاندنی کارەکتەر، وەلێ بەبێ ڕووخسارگەلی ڕاستەقینە، بە ڕەهایی هیچ مانایەکیان نییە. با سادەتر بیڵێم، ئەو کەسەی کە هەوڵ دەدات بە پێی گێڕانەوە و بۆچوونەکانی فلانە کارەکتەری بەرهەمی هوونەری، فەلسەفەیەك بێنێتە ئارا کە گوایە لە خودی دەقەکەوە

1. بڕگەیەکی نێو ڕۆمانی «سووك و ڕسواکراوەکان»ـە، نووسەر باس لە کەسایەتییەکانی نێو ئەرەڵین ڕۆمانی «مەزاران» دەکات. «و. ک»

هەڵقوڵاوە، بە بڕوای من سەرقاڵی کارێکی گاڵتەجاڕانە و بێسوودە، چونکە ئەو شتێك بەسەر نووسەردا دەبڕێت کە هوونەرمەند لە بنەڕەتەوە لێی بەرییە و لەبەرانبەردا، هیچ وێنایەك بەدەستەوە نادات لەچاو ئەوەی کە هەر بە ڕاستی هەیە، بۆ نموونە، کاتێك بەڕێز *ڤاسیلی ڕۆزاناف*ی فەیلەسووف لێکۆڵینەوەی بەناوبانگی «ئەفسانەی پشکنەری گەورە» دەنووسێت، بە ڕەهایی بیری دەچێتەوە کە ئەم ئەفسانەیە لە ڕاستیدا بۆچوونی ئیڤان کارامازۆفێکە کە خۆی کەسایەتییەکی زیندووە و ئەم کەسایەتییە، بۆ خۆی زنجیرەیەکی تەواوی مۆدێلگەلی ئەدەبییە کە وایان کردووە ئەو تاکە بۆ ئێمە و خۆی ڕۆشن و لە ئاست تێگەیشتندا بێت. ڕۆزاناف بە ڕەهایی بیری چووە کە ئەفسانە فەلسەفە نییە، بەڵکە تورخمێکی پێکهاتەیی کارەکتەرە. کاتێك *دیمیتری میریشکۆفسکی*ی فەیلەسووف، وەك بیرمەندێکی ئایینی، کار لەسەر ئەندێشەی دۆستۆیڤسکی دەکات، خاڵێکی سادە و هاوکات جێبایەخ لە بەرچاو ناگرێت، ئەویش ئەوەیە کە دۆستۆیڤسکی هەرگیز بیرمەند نەبوو. دەربڕینی بۆچوونی ئایینیی هەندێك لە کەسایەتییەکانی دۆستۆیڤسکی، تەنیا سوودی ئەوەیە کە باری دەروونییان ڕوون دەبێتەوە و لە ئاست تێگەیشتندا دەبێت، بە هیچ شێوەیەك بایەخێکی فەلسەفیی نییە. ئەوەی لە بەرهەمی دۆستۆیڤسکیدا بایەخی هەیە، ژیانە لەگەڵ ئارەزوو، ململانێ، هەست و بیر، نەك لەگەڵ فەلسەفە. لەوانەیە توێژەر بتوانێت فەلسەفەی ئەم جۆرە ژیانە ڕێك بخات، وەلێ نەك ئەوەی کە شتێك وەك فەلسەفە تاوتوێ بکات کە هەرگیز بوونی نەبووە.

مـــادام دۆستۆیڤســـکیی ئێمـــە وەك نووســـەرێکی سیاســـی-کۆمەڵایـــەتی چـــالاکی نوانـــدووە، ئاســـاییە کـــە لـــەو بارەیـــەوە بۆچـــوونەکانیی دەربڕیـــون و پـــەرەی بـــە جیهـــانبینیی داوە. جـــا لێرانەدایە کە ئێمە بە ڕاستی سەروکاریمان لەگەڵ دیدگە ئایینی، سیاســی و کۆمەڵایەتییــەکانی ئــەودا هەیــە، لێرانەدایــە کــە ئێمــە دەتوانیین لـە ڕووی هەلومـەرجی مەنتیقییانـەوە شەنوکەویان بکـەین، ناتــەواوی و خەوشــیان لــە فلانــە شــوێندا نیشــان بــدەین، هــەروەها زیادەییشـیان وەلا بنـێین. وەڵێ ئـەم بەرهەمـە هوونەرییـەی بەرچـاوی ئێمە، ژیان و کارەکتەر و ڕۆحی زندوو تێدایە کە بەهایەکی بابـەتی و هاوبەشیان هەیە.

ململانێــی بێســوود لەگــەڵ هــەژاری و دەردیســەری، جــەنگی نابەرانبــەر لــەپێناو شــەرەفدا، تامــەزرۆیی بــۆ بەرەنگاربوونــەوە لــە هەلومـەرجی بێهێزیـی ڕاستەقینەدا، هـەروەها حـەزی زیادلـەڕادە بـۆ گەیشــتنە دەســەڵات لــە دۆخــی ملکەچــی و زمانشــکاویدا، ئەمانــە تایبەتمەنـدیی کارەکتـەری هـاوزا و هاوزایـانی دیکـەی بەرهەمـەکانی دۆستۆیڤســکین. ئــەوان دەیانــەوێ ببنــە ئەوشــتە نــاتوانن بــبن، جــا تراژیـدیای بوونیشـیان هـەر ئەمەیـە. سەرچـاوەی دووجەمســەری و دوانــەیی کەسایەتی هــەر ئەمەیــە. ئــەوان هەســت بــەوە دەکــەن ئــەو شتەی کە دەیانـەوێت، بـە تـەواوی دوورەدەستە، وەڵێ نـاتوانن واز لـە خواسـت و داواکارییەکـەیان بێـنن. جـا بـەم جـۆرە، ئیـدی بەرەبـەرە هەســت دەکــەن تورشــی نەخۆشــییەکی بێــدەرمان بوونــە. ئــەوان پاڵەوانگــەلێکن گەرچــی دەزانــن ئیــدی توانــای هەســتانەوەیان لــە جێگەدا نییـە، کەچـی تاسـەی هەستانەوەی دووبارەیـان لـە پێخـەفی

مەرگدا هەر دانامرکێتەوە. لە ئاگایی ڕووناکیاندا، زیاد و زیادتر لەو کۆتاییە نزیک دەبنەوە کە هەیانە، کەچی هەوڵ دەدەن گەر بۆ دەمێکیش بێت، ئەوە فەرامۆش بکەن و هیوای شادییەکانی ژیان لە خۆیاندا بگەشێننەوە. جا لەم فەرامۆشییەدا خۆیان بە قووتدا دەکەن و لەم هیوا و خەیاڵاتانەدا نغرۆ دەبن و وایان دێتە بەرچاو کە وا جارێکی دی هەست بە ژیانێکی بێکۆتا و پڕاوپڕ دەکەن، ئەمەش تا ئەو کاتەیە کە هێشتا هەڵمەتی کتوپڕانەی ئازار، حەقیقەتی وەبیر نەهێناونەتەوە. لەواندا دوو ڕۆح ململانێیانە: تاوێك، ڕۆحێکی شاد و چوستوچالاك و تاوێکیش، ڕۆحێکی کزۆڵە و بەئازار کە زیاد لە کاتی دیاریکراوی خۆی هەست بە کۆتایی دەکات.

لێرانەدا حەقیقەقەتی تاڵ لەگەڵ ئاواتە بەدینەهاتووەکاندا کەوتووەتە ململانێ. ڕۆحی هاوزا لەنێو ئەم حەقیقەتە تاڵ و ئاواتە بەدەینەهاتووانەدا، بێهوودە کردوکۆششییەتی. ئەو خۆویست، لووتبەرز، تەنانەت بەسەر ئاواتەکانیدا فەرمانڕەوا و کامەرانە، ڕێك هەروەك خەیاڵپلاوێك، وەك بوونێکی ڕاستەقینەی کزۆڵە و شەرمۆکە، جا لە ڕووبەڕووبوونەوەی حەقیقەتدا، بە تەواوی لاواز و لەپێکەوتووە. هاوزا-عەرام، لە بارێکدا کە بە شێوەیەکی گورچکبڕ نەخۆشە و لە کۆتایی نزیك بووەتەوە، بە گوڕوتینێکی زیاترەوە هەڵپەی ژیانیەتی و بە پێداگرییەکی فرەترەوە خۆی دەسپێرێتە دەستی ئاواتەکانی و بە ئازارێکی قووڵەوە واقعیەت وەبیر خۆی دەهێنێتەوە، جا تا بوونە ڕاستەقینەکەی نائومێدانەتر بێت، بە مکووڕییەکی زیاترەوە تا دەمی مەرگ خۆی دەداتە دەست ئاوات و

ئـارەزوو، تـا لـە بەرکـەوتنی واقعیەتـدا زویـر و نـامورادتر بێـت، خۆپەسـەندانەتر لـە ئارەزووەکانی خۆیدا نغرۆ دەبێت. بـە گشتی، حـەز دەکات بوونی ڕاستەقینە لە بیر بکات و ئێجگار ئارەزوویـەتی ئەوەی کە لە خەیاڵیدا سازی داوە، ڕاستەقینە بێت. ئێرە سەرچاوەی ئـەو خـەیاڵ و ئارەزووانەیـە کـە تـا ئاسـتێکی نەخۆشـانە گەشـەیان کـردووە و ئێمـەش لـە کەسـایەتییە هاوزاییـەکانی دۆستۆیڤسـکیدا سـۆراغی دەکـەین. ئـەم هاوزاگەلـە، هەڵپەکارانـە و تـا ئاسـتی خۆلەبیرکردن تەنیا و تەنیا ئاوات دەخوازن، تا وای لێ دێت کە ئیدی وەهم و خەیالات، بەرەبەرە لە زەینیاندا شوێنی واقعیەت دەگرێتەوە. دۆستۆیڤسـکی بـۆ یەکـەمین جـار وێنـای ئـەم کارەکتـەری هـاوزا-خەیاڵپلاوەی لە یەکێك لـە کارە سـەرەتاییەکانی (خـانمی خانـەخوێ) و لـە سەروسـیمای *ئـۆردینێڤ*دا بەرجەسـتە کـرد، وەلێ ئـەوە کـەمێك درەنگـتر و تـەنیا لـە ڕووخسـاری پاڵـەوانی کورتـەڕۆمانی *شـەوە ڕۆشـنەکان*دایـە کـە دەتوانێـت شـێوەیەکی تـەواوی پـێ ببەخشـێت. هـاوزا-خـەیاڵپلاو، کتومـت بەدەسـت ئـەوەوە ئـازار دەچـێژێت کـە ئارەزووەکانی ڕاستەقینە نین و واقعیەت لەگەڵ ئاواتەکانی ئەودا یەك ناگرێتەوە.

وەلێ گەر لە کەسایەتیی پاڵەوانی شەوە ڕۆشنەکاندا، خەیاڵی نەخۆشانە لە چاو *دێڤوشکین* و تەنانەت *گۆلیادکین*دا بە شێوەیەکی خێرا و توندتر تەشەنای سەند، ئەوا لە سەروسیمای *فۆما فۆمیچی* *بێگانـەی* ئێمـەدا، بەخۆنازین و خۆپەرستیش بەش بە حاڵی خۆی هـەنگاوێك دەچێتە پێشـەوە. ئەمـەش مـەنتقی هـەر لێکدژییەکـە کـە

بەردەوام لە تەشەناسەندندایە، ئەگەر دەرفەتی تەشەناسەندیشی نەبوو، تووش و قووڵتر دەبێتەوە. ململانێ مرۆڤ بێبەزەییتر دەکات. بیرمانە کە هۆرمەزد (ئافرێنەری چاکە و پاکی)، لە جیهانێکی رووناکدا دەژیا و ئەهریمەنیش، بە پێچەوانەوە، کەمزانست و مایەپووچ و بەدکردار بوو و لەناوجەرگەی جیهانی تاریکیدا دەژیا. بیرمانە کە ئەهریمەنی نەزان لە جیهانی رووناکی بێئاگا بوو، سەروەختێکیش کە لەناوجەرگەی جیهانی تاریکییەوە هاتە دەرێ، بە بینینی جوانییەکانی جیهانی هۆرمەزد واقی وڕ ما. جا لەبەر ئەوەی شەڕانی و بەدگەوهەر بوو، بڕیاری کاولکردنی جیهانی هۆرمەزدی دا، بۆ ئەم مەبەستەش، دێو و پەری و شەیتانی زۆری هێنانە دی. کاتێک سەرانسەری زەوی لە ئافاتی ئەهریمەن گەوزا، فریشەکانی ئاسمان و هەسارە و ئافرێنراوانی هۆرمەزد، هەمووان لەگەڵ دێوەکانی ئەهریمەندا دەستەویەخە بوون. بیرمان نەچێت هۆرمەزد و ئەهریمەن تا زیادتر کەوتنە ململانێ، گورزی زیاد و کوشندەتریان وەشاند. تا ئاگر زیادتر کڵپە بسێنێت، بە چڕییەکی فرەترەوە شەو لە دەوری ڕەشاییەکەی کۆ دەکاتەوە و خودی گڕی ئاگریش، لە تاریکایی ئەو شەوەدا، زیادتر دەدرەوشێتەوە. کەواتە لە دەروونی هاوزاشدا حورمەت و سووکایەتی ململانێیانە، هەم خۆپەسەرستی بە سووکایەتی زیادتر بڵێسەدار دەبێت و هەم سووکایەتیش لە بەردەم خۆپەرستیدا بە گوڕێکی زیادترەوە هەستی پێ دەکرێت. دەشێت ئەم لێکدژییە تەشەنا بکات و قووڵتر ببێتەوە، وەلێ هەرگیزاوهەرگیز ناگاتە ئاشتی و لە کزی نادات و تەنیا و تەنیا بە سەرکەوتنی یەکێک لەم تووخمانە چارەبڕ دەبێت. وەلێ بیرمان

نەچێت کە لە بوونی هاوزادا هیچ کام لەم تووخامانە سەرناکەون و هەستی حورمەت یان خۆپەسەندی لەتەك سووکایەتییەوە درێژە بە ژیانی خۆی دەدات و ئەم دووانە هەمیشە لە ململانێکەیاندا بەگوڕ و تووشتر دەبن.

لە بوونی گۆلیادکینی *هاوزادا*، دەکرێت ئاماژە بە بوولێلێکی تایبەتیی ئەم جۆرە هەستانە بکەین کە تاکە نیشانەی خۆئازاردان و ئارەزووبازی لەگەڵ *کولاندنەوەی برینەکانی خۆیی*یەتی. هەر بەو جۆرەی کە لەژێر خۆکوتیی دێڤوشکینی *هەژاران*دا، خۆپەرستیی بێسنوور شاردراوەتەوە، لەپشت خۆئازاردانی گۆلیادکینیشەوە، ویستی پەرێشانی کۆنترۆڵکردنی کەسێك خۆی مەڵاس داوە کە هێشتا وەك پێویست ئەم ئازار و ئەشکەنجەیە هەستی پێ ناکرێت. وەلێ ئەوە لە کەسایەتیی فۆما فۆمیچ ئۆپیسکینی *بێگانە*دایە کە شێوەگرتووتر دەبێت و سیمایەکی دیاریکراو و سادەتر بۆ شیکردنەوە بەخۆوە دەگرێت.

ئەم جەنابی فۆما فۆمیچ، یان ئەگەر ڕێکتر بڵێین *ئەدەبیاتچی‌یە نامورادە*، کە دەستکورتی ئەوی کردە خزمەتکاری جەنەراڵی زۆردار و هۆڤی، تا دواهەمین دڵۆپ جامی سووکایەتیی فڕ کرد. دۆستۆیڤسکی وا دەڵێت *خۆپەرستیی مرۆڤ نەك هەر تەنیا بە سووکایەتیپێکردن لەنێو ناچێت*، *بگرە بەم سووکایەتی و گاڵتەجاڕی و پێڕابواردنە. لەچاو ملکەچی و کاسەلێسی و بێهەڵوێستی و بێشوورناسیدا زیادتر تەشەنا دەکات*. فۆما فۆمیچی ئێمەش هەر تووشی وەها دژخێك دێت. تا زیادتر هەست بە تێکشان و

پێشووناسبوونی خۆ دەکات، لەودا پاڵنەری نیشاندانی کەسایەتی و سەربەستیی بەهێزتر دەبێت. هەروەها نووسەر بەم جۆرە وەسفی ئەو دەکات: *فۆما فۆمیچ نموونەی ئەوپەڕی لووتبەرزییە*. فۆما فۆمیچ بەم خۆپەرستییە ترسناکە گەشەسەندووەی کە خۆراکەکەی کاسەلێسی و سووکایەتییە، لە ماڵی کوڕی خاتونی جەنەراڵدا (دوای مردنی هاوسەرەکەی) خۆی دەبینێتەوە، شوێنێك کە بە ڕێز و حورمەتەوە، وەك چرای درەوشەداری ژێری پێشوازیی لێ دەکرێت. سەرەتا وا دەردەکەوێت کە ئەم دۆخە، فۆما هێور دەکاتەوە و ئیدی حورمەت و خۆپەرستیی لە بەندی ئازادا نەجاتی دەبێت. وەلێ بەسەرهاتەکە هەرگیز ئەمەی لێ ناکەوێتەوە. فۆما فۆمیچ ئیدی نە متمانەی بە خۆی هەیە و نە بەوانی دی. گومان و دوودڵی بە شێوەیەکی تۆقێنەر لەودا گەشەیان کردووە و گۆڕیویانە بۆ جۆرە هاوزایەکی نموونەیی کە لەنێوان بەخۆنازین و خۆکوتیندا ئازار دەچێژێت. تاوێك وای دێتە بەرچاو کە وا ڕێزی لێ دەگرن، لەبەر ئەوە هەست بە کامەرانی دەکات و چێژ لە بوونی خۆی وەردەگرێت. کەچی دوای تاوێکی دی، وا هەست دەکات کە کردوویانەتە گاڵتەجاڕ و هەمدیسان ئازار و ئەشکەنجەکانی دەست پێ دەکەنەوە و خۆیشی خۆی نابینێت. تینوێتیی بۆ ئەوەی بزانێت کە ئایا ئەوانی دی ڕێزی دەگرن و دان بە دەسەڵاتیدا دەنێن یان نا، ئەو دنە دەدات تا بەردەوام کەسانی دەوروبەری تاقی بکاتەوە.

فۆما فۆمیچ وەك مرۆڤێکی لاواز، کە هەژاری و کوێرەوەری بەسەریدا زاڵ بووبوون، نموونەی ستەمکاری و خۆنوێنییە و جا بۆ

ئەوەی هەست بە بەهێزیی خۆی بکات، پێویستە بیٚ ئەوەی لێپێچینەوەی لەگەڵ بکرێت، ستەم بکات و ئەوانی دی بسڕێتەوە. *ڕۆحی مایەپووچ هەرکە لە یەخسیری نەجاتی بوو، ئیدی خۆی دەست بە ستەمکاری دەکات. ستەمیان لە فۆما کردبوو و ئیدی ئەویش دەمودەست، هەستی بەوە کردبوو کە پێویستە ستەم بکات، وردوخاشیان کردبوو و ئەویش کەوتە وردوخاشکردنی ئەوانی دی.* یان پیک یان سندان[1]، لە دۆخی کۆمەڵایەتیی فۆما فۆمیچدا هیچ چارەیەکی دیکە نییە و هەر ئەوەیە کە ئەو، بەردەوام خەریکی تاقیکردنەوەیە تا بزانێت کە ئایا هەر بە ڕاستی ئەو پیکە یان نا؟ بەم جۆرە، ئیدی ئەو لە ماڵی ڕۆستانێڤدا دەبێتە ستەمکارێکی ڕاستەقینە و هەمووان —هەر لە سەرهەنگ ئیگۆر ئیلیچی دڵسافەوە تا فالالیی گێلۆکە— تێك دەشکێنێت. ئەو بۆیە هێندە ناهەقی دەکات و ئاوها ملهووڕە، چون بڕوای بە خۆی نییە و باوەڕ بەوەش ناکات کە ئەوانی دی هەر بە ڕاستی بە کەسێکی ڕێزداری بزانن. ئەو مادام بڕوای بە حورمەتی خۆی نییە، لە ئازار و ئەشکەنجەدایە و جا لەبەر ئەوەی بەدوای ئەو بڕوایەدا دەگەڕێت، کەسانی دەوروبەریشی ئەشکەنجە دەدات. لێکدڕیی نێوان بەخۆنازیین و خۆکوتین لە کەسایەتیی فۆما فۆمیچدا، دواجار بە لێکدڕییەکی قووڵتر لەنێوان ستەمکردن و ئازارچەشتندا کۆتایی دێت. بوونەوەرێکی هاوکات ستەمکار و ستەملێکراو، ئەڵقەیەکی نوێی نێو زنجیرەی هاوزاییە کە دۆستۆیڤسکی بە ئێمەی دەناسێنێت. تا ئەم لێکدڕییە زیادتر

---

۱. سندان: سەگان، سنچینە: لەتە پۆڵایەکی پتەو و تەخت و قوورس، کە کانزای لەسەر دەکوتن.

هەستی پێ بکرێت، پێویستە بە هەمان شێوە بە شێوازی ترسناك و ناجۆر و گەمژانەتر باوەش بۆ ستەمکاری و ستەملێراوی بکرێتەوە. ئێمە دەتوانین لەو کارەکتەرە قوولّ و ئالۆزانەدا کە دۆستۆیڤسکی لە ڕۆمانەکانی داهاتوویدا ئافراندنی، بە ڕوونی ئەم بابەتە بەدی بکەین، بەس مادام بڕیار وایە باسەکەمان بە دەوری *بێگانە*دا بخولێتەوە، لێگەڕێن با بە شێوەیەکی سادە و بەسوود ئەو بەرئەنجامە کورت بکەینەوە کە پێی گەیشتووین.

هەموو ئەو کەسایەتییانەی کە بەسەرمان کردنەوە، کەسایەتیی چینی عەوام و تازەپیاکەوتوون کە لەژێر باری قوورسی خواستەکانیاندا هانەهانیانە. ململانێ لەگەڵ بێدەرامەتی و بێپەناییدا، دەڵێیت شێوەی ململانێ لەسەر شەرەف و کەساتیی مرۆڤێك بە خۆوە دەگرێت کە هەموو ڕەگەکانی لە هەژاری و کوێرەوەریدایە. جا ئەم تینوێتییە بۆ شەرەف و حورمەت، دەبێتە سەرچاوەی خۆپەرستی، بەخۆنازی، ئەشکەنجە و فرمێسکی پیرۆز. شکستخواردن لە ململانێی شەرەفدا، هەستی لاوازییەکی بێپرادە دەبزوێنێت، کە لە خۆیدا، کزی، ملکەچی، خۆکوتی، ئەشکەنجە و ئاگاییپەیداکردن لە بارەی تاریکیی واقعیەتی لێوە هەڵدەقووڵێت. پەیوەندیی هاوئاستی نێوان دوو دۆخی پێکهاتەی دەروونی بە جۆرێکە کە وێڕای مەودای نێوان ئەم دوو دونیایە، بەهێز و زیاتر یەکدی دەڕووژێنن: خۆپەرستی لە سووکایەتیپێکردنەوە سەر هەڵدەدات و بە پێچەوانەشەوە، ستەمکاری لەگەڵ تەملێکراوی گەشە دەکات و پێچەوانەکەشی هەروا، تا دونیای ئاوات و وەهمەکان

ڕووناكتر بێتەوە، دونیای حەقیقەت تاریكتر دەبێت و هەر وا بە پێچەوانەوە.

یەك بە یەكی ئەو كارەكتەرە ناوبرانەوانە خاوەنی وەها تایبەتمەندییەكی دەروونین. ئاوێتەبوونی تووخمگەلێكی تەواو لێكدژ لە دەروونیاندا، هاوزاگەلێكیان لێ بەرهەم دەهێنێت و بە پێی فلانە تایبەتمەندییان، كە لە نەخشەی سەرەتایی هەر یەكێكیاندا دانراوە، ئێمە چوار سیمای نموونەیی هاوزامان هەیە: كەسایەتیی دیڤوشكینی ڕۆمانی هەژاران لەنێوان خاكەڕایی و خۆپەرەستیدا، گۆلیادكینی ڕۆمانی هاوزا لەنێوان دەسەلاتویستی و ملكەچی، پالەوانی ڕۆمانی شەوە ڕۆشنەكان لەنێوان خەیاڵ و حەقیقەت، دواجار فۆمای بێگانە لەنێوان ستەمكاری و ستەملێكراوی لە ململانێدان. جا ئەم دواهەمین ئەڵقەیەی هاوزا، بە هەڵكەوت بێگانەترین شێواز و ئەڵقەی هاوزایەك بوو كە دۆستۆیڤسكی كاتی خۆی ئافراندی.

### سەرچاوە

در باره پیوستی همزادی در آثار داستایفسکی

حمید رضا آتش برآب

# «ساتەوەختی حەماسی»:
# دۆستۆیڤسکی، بە گێڕانەوەی شتێفان سوایگ

بێ گومان دەتوانین دۆستۆیڤسکی بە یەکێك لە کەسە بەرجەستەکانی ئەدەب و هزری جیهان دابنێین. لە بەرهەمەکانی ئەودا، کاریگەریی فیکر و فەرهەنگی ئەڵمانی گەلێك دیارە. ڕەنگە بە یەکەمین سەرنج، وا دیار بێت کە دۆستۆیڤسکی دیدێکی پڕ لە قێز و قینلەدڵانەی لە هەمبەر ئەڵمانییەکان هەیە، وەلێ بە لێوردبوونەوەیەکی زیادتر لە ژیان و هزری ئەو، دەتوانرێت دەرك بە لێکنزیکیی زەینی و دەروونیی نێوان ئەو و ئەدیب و بیرمەندانی ئەڵمانی بکرێت. ئەم شرۆڤە کورتە، هەوڵ دەدات بپەرژێتە سەر پەیوەندیی نێوان دۆستۆیڤسکی و فیکری ئەڵمانی و کاریگەریی ئەو لەسەر یەکێك لە نووسەرە بەرجەستە هاوچەرخەکان، یانی *شتێفان سوایگ*. سوایگ لای وایە تەنیا لە ڕێی خوێندنەوەیەکی هاودڵانەوە دەتوانین پێ بنێینە نێو جیهانی فیکریی دۆستۆیڤسکی. گێڕانەوەی سوایگیش لە مەڕ دۆستۆیڤسکییەوە، ڕەنگدانەوەی هەمان ئەم شێوازەیە.

قسەکردن لە بارەی یەکێك لە گەورەترین نووسەر و شاعیرانی مێژووی مرۆڤایەتی، فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی، کارێکی ئاسان و دژوارە. ئاسانییەکەی لەبەر بەرفراوانیی ئەو توێژینەوە و نووسینە جۆراوجۆرانەیە کە لەسەر ژیان و بەرهەمەکانی ئەو نووسراون. دژوارییەکەشی هەر بە بۆنەی ئەم بەرفراوانییەی مەیدانەکەوەیە کە وای کردووە خستنەڕوو و نووسینی بابەتێکی تازە و دیدگەیەکی نوێ سەخت بێت. *ڕنە ڤێلك*ی توێژەر، نووسەری کتێبی *مێژووی ڕەخنەی نوێ* و بنیادنەری بەشی دەبیاتی بەراوردکاری لە زانکۆی یال، لە کتێبی *دەروازەیەك بۆ مێژووی ڕەخنەی دۆستۆیڤسکی*، ئاماژە بۆ ئەو خاڵە دەکات کە لە هیچ شوێنێکی سەر زەویدا (بێجگە لە ڕووسیا)، هێندەی ئەڵمانیا (هەروەها ناوچە ئەڵمانیزمانەکان) لە دۆستۆیڤسکی نەکۆڵراوەتەوە و شرۆڤە بۆ بەرهەمەکانی نەکراوە (welleck,١٩٦٢, ٨).

وێڕای ئەوەش، لەمڕۆی وڵاتی ژاپۆندا، زۆرترین وەرگێڕان بۆ کارەکانی دۆستۆیڤسکی دەکرێت. هۆکاری گرنگیی ئەم پرسەش ئەوەیە کە زۆربەی لێکۆڵەران، دۆستۆیڤسکی بە نووسەرێکی مەسیحی و گرێدراو بە تانوپۆی مەسیحییەت دادەنێن. بە لەبەرچاوگرتنی ئەو خاڵە، ئەم پرسیارە دێتە پێش کە تا چ ڕادەیەك دەتوانین دۆستۆیڤسکی بە شاعیر و نووسەرێکی تەواو مەسیحی دابنێین؟ جا بە تایبەت گەر تامەزرۆیی نیچە بۆ ئەو بهێنینەوە بیر خۆمان: *دۆستۆیڤسکی تاکە دەروونشیکارە کە دەتوانم شتێکی لێوە فێر بم.* هەروەها نیچە ئاشنابوون بە بەرهەمەکانی ئەو، دەخاتە ڕیزی

ڕووداوگەلی وەك *مەیموون* و *سەعدی*یەوە کە لە ژیانیدا ڕوویان داوە (Nietzsche, ١٩٨٠, ١٤٧). تاریفی نیچە بۆ دۆستۆیڤسکی، گومانی ئێمە دەڕەوێنێتەوە، چونکە لای ئەو زۆر بە دەگمەن وەها پیاهەڵدان و گوتەیەك بەدی دەکرێت. بەس ناوزەدکردنی دۆستۆیڤسکی بە دەروونشیکار، لەگەڵ گوتەی خودی دۆستۆیڤسکی یەك ناگرێتەوە، چونکە ئەو خۆی جەخت دەکاتەوە: *من بە دەروونشیکار ناو دەبەن و ئەمەش ڕاست نییە. من تەنیا ڕیالیستێکم، ڕیالیست بە تەواوی مانا، یانی گێڕەوەرەوە و توێکاری قووڵایی دەروونی ئادەمزاد.* (وەرگیراوە لە Hhawser, ١٩٩٠, ٩١٥).

لێرانەدا دیدگەی دۆستۆیڤسکی، زیاتر ئاوێتەکردن و ڕێکخستنی دەروونشیکاری و ڕیالیزمە. ڕەنگە بکرێت ئەو بە دەروونشیکارێکی ڕیالیزم ناو ببەین، چونکە مرۆڤی بیرکەرەوە( der intigible mensch) و مرۆڤی ئازاد (der freie mensch)، چەقی هەموو بەرهەمەکانی ئەون، هەر بەو جۆرەی کە *کانت* یان *شیلەر* پەنجەی دەخەنە سەر و شیی دەکەنەوە. ڕێك بە پێچەوانەی مرۆڤی ناتۆرالیستییەوە، هەر بەو جۆرەی کە *ئەمیل زۆلا* لە بەرهەمەکانیدا دەیخاتە ڕوو. ڕەنگە بتوانین شێوازی دۆستۆیڤسکی بە کاردانەوەیەك لە دژی ڕەوتی ناتۆرالیستیی باو ئەژمار بکەین. تاسە و حەزی ئەو بۆ توێکاریی کەسایەتییەکان و دۆخە قەیرانا وییەکان و دەرخستنی لایەنە قووڵەکانی دەروونی مرۆڤ، هەر خۆی بەڵگەی ئەم بانگەشەیە.

لەتەك نیچە، زۆرێك لە بیرمەندان و شاعیرانی ئەڵمانیزمان (ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ) لەژێر کاریگەریی ئەودا بوونە، وەك *مارتین هایدگەر*، *هانس گیۆرگ گادامێر*، *تۆماس مان* و بێگومان *شتێفان سوایگ*.

گادارمێر سەردەمی زانکۆی خۆی، بە هاوەڵی تاسەمەندیی خۆی بۆ خوێندنەوەی دۆستۆیڤسکی ناو دەبات، *ئەو شوێنانەی کە کتێبە ڕەنگ سوورەکانی پەخشانگەی پیپەر لەسەر مێزی هەر خوێنکارێك بەرچاو دەکەوت و کوڕ و تینی* تێدەگەڕا(Gadamer, ١٩٧٢, ٤).

هایدگەر لە زانکۆی *ماربۆرگ*دا، تەنیا دوو وێنەی لەسەر مێزی کارەکەی دانابوون: *پاسکاڵ* و دۆستۆیڤسکی. ئەو لە وانەگوتارەکانی خۆیدا لە بارەی نیچەوە، بە تێروتەسەلی گوتارەکەی دۆستۆیڤسکیی لە بارەی پوشکینەوە شی کردووەتەوە (Heidegger, ١٩٨٩, ١٢٩). ئەو لە نامەیەکدا بۆ هاوسەرەکەی، باس لە خاڵێکی گرنگ دەکات و دەڵێت: *ئەوە دۆستۆیڤسکی بوو نیشانی دام چۆن هەندێك مرۆڤ لە ساتی لەدەستدانی نیشتمان و مێرگ و سەوزاییدا، تەنیا و تەنیا لە پەیوەندیدا دەژین*. (Heidgger, ٢٠٠٥, ١٠٦).

تۆماس مان وتارێکی تێروتەسەلی لەسەر دۆستۆیڤسکی نووسیوە، دەکرێت بە ڕوونی کاریگەریی دۆستۆیڤسکی لەسەر ئەو، لە گوتوبێژی نێوان *دکتۆ فاستۆس* و *شەیتان*دا ببینین کە دەمودەست دیمەنی گفتوگۆی *ئیڤان کارامازۆف* لەگەڵ *شەیتان* دێنێتەوە یاد. ئەم کاریگەرییە دەگاتە ئاستێك کە تۆماس مان لە

بارەی دۆستۆیڤسکییەوە دەنووسێت: *برێک لە ویستی سامناکی ئەو دزە دەکاتە نێو (گیانی ئێمە)وە. هەمان ویستی پەیوەست بە ڕزگاریی شیاوی ستاییشی ئینسان لە دەستی خۆی* ( Mann, ١٩٩٧, ١٤).

دیدگەی جیاواز و شرۆڤەی تایبەتیی شتێفان سوایگ بۆ دۆستۆیڤسکی، جیاوازییەکی بنەڕەتیی لەگەڵ شرۆڤە ئەڵمانییەکانی دیکەدا هەیە. بەر لە چوونە نێو ئەم باسە گرنگەوە، وا باشە بە بۆچوون و دیدگەی دۆستۆیڤسکی لەمەڕ ئەڵمانیا و ئەڵمانییەکانەوە ئاشنا بین. ڕەنگە ئەوەی کە بە ڕواڵەت و لە یەکەمین سەرنجدا بێتە بەرچاوی ئێمە، نیشاندەری قینی قووڵ و بەدبینییەکی فرەی دۆستۆیڤسکی بێت لە ئەڵمانییەکان. ڕەنگە دەربڕینی نیچەیی Ressentiment، یان هەمان ڕقئەستووری، بۆ وەسفکردنی ئەم هەلومەرجە شیاو بێت. سەردەمی نیشتەجێبوونی دۆستۆیڤسکی لە ئەڵمانیا، هاوکاتە لەگەڵ سەردەمی هەژاری و بێپارەیی و لێپیسکردنی نەخۆشی و ئالوودەبوونی زیاد لە ڕادەی ئەو بە قوومار. لە ساڵی ١٨٦٢دا، دۆستۆیڤسکیی تەمەن چلویەك ساڵ، پێ دەنێتە خاکی ئەڵمانیاوە: *بەرلین*، *درێسدن*، *ویسبادن*، *فرانکفۆرت*، *هامبۆرگ*، *کلن*، *ماینز* و دوای ئەوەش بۆ *سویسرا* و *ئیتاڵیا* (ئەوەش سەرنجڕاکێشە کە یەکەمین کاری وەرگێڕانی دۆستۆیڤسکی بۆ سەر زمانی ڕووسی، *دۆن کارلۆس*ی *شیلەر*ە لە زمانی ئەڵمانییەوە).

لەم سەروبەندەدا سەرێك لە *پاریس* و *لەندەن*یش دەدات. دۆستۆیڤسکی لە ماوای خۆی دابڕابوو و نەیدەتوانی لە هیچ

شوێنێکدا، بێجگە لە نیشتمانەکەی خۆی ئۆقرە بگرێت. دەکرێت بە باشی بێزاریی قووڵ و ڕقلەدڵیی ئەو لەم بارەیەوە، لە کەسایەتیی بارۆنی ئەڵمانیی نێو ڕۆمانی *قومارچی*دا ببینین. سەروشکڵی بارۆنی ئەڵمانی بە ڕووخساری پڕ لە چرچ و لۆچ و درێژ و باریکەلە و بەژنبەرز، بەسەر باڵای ئەڵمانییەکاندا دەگشتێنرێت. با بەشی شەشەمی قومارچی بەسەر بکەینەوە: *پێیەکانی، دەتگوت لەژێر سنگییەوە درێژ بوونەتەوە*، ئەمە نیشانەیەکە لە ڕەگەزی ئەڵمانی. *وەک تاوسێک بەخۆناز و لەخۆبایی بوو*. وێڕای ئەوەش، ئەوە بۆچوونی بنجبڕانەی دۆستۆیڤسکی نەبوو لە بارەی ئەڵمانییەکانەوە. دڵی ئەو، بە هیچ شوێنێك بێجگە لە ڕووسیا نەدەکرایەوە. دۆستۆیڤسکی لە ئەڵمانیادا غەریب بوو، وەلێ ئەڵمانیا، واتە فەرهەنگ و فەلسەفە و فیکری ئەڵمانی، ئەمەش بە شێوەیەکی فرە توند بە تانوپۆی ئەوەوە گرێ درابوو. ئەڵمانیا لە ناخی دۆستۆیڤسکیدا، نزیکترین دراوسێی ماڵی بوونی بوو. دۆستۆیڤسکی، ڕەنگە زیاتر کاریگەریی شیلەر و *هۆفمان*ی بەسەرەوە بووبێت. *هۆرست گۆرکن گریك* لە لێکۆڵینەوەیەکی خۆیدا بە ناوی *دۆستۆیڤسکی و ئەڵمانیا*، بە تێروتەسەلی پەرژاوەتە سەر ئەم بابەتە. دۆستۆیڤسکی دیدگەی مرۆڤناسیی ئایدیالیستیی لە شیلەرەوە وەرگرت و بیرۆکەی دوانەیی (یان بە دەربڕینێکی دی، چەندانەیی–«فرەجەمسەری»)ی کەسایەتیی لە بۆچوون و نووسینەکانی هۆفمانەوە هێناوە. ئەم فرەجەمسەرییەی بوون لە یەك سوورژە و چەندانەیی کەسایەتییە لە ڕێی شوناسێکی *دیکە* و *نامۆوە* کە هەڕەشەیەکە بۆ سەر کەسایەتی، بابەتێکە خۆی لە ناونیشانی

کەسایەتیی سەرەکیی *تاوان و سزادا* دەنوێنێت: ناوی بنەماڵەیی ڕاسکۆلنیکۆف-ڕاسکۆل (raskol)، واتای فرە، پارچەپارچە و کەرتبوون دەگەیەنێت. شابەیتی بۆچوونەکانی شیلەر و هۆفۆمان جەختکردنەوەیە لەسەر ئەو پرسەی کە پێویستە لەنێو یەکپارچەیی و تاقانەبوون و پارچەپارچەبوونی کەسایەتیی دژەنۆرماڵ و ڕێسا باوەکاندا بۆ چییەتیی تایبەت و ڕاستەقینەی مرۆڤ بگەڕێین، نەك لە مرۆڤە ئاسایی (normal) یان نموونەییەکاندا (vorbildlich). شیلەر لەنێو کەسایەتییە لاڕێ و تاوانبارەکاندا بۆی دەگەڕێ و هۆفمان، لەنێو شێت و دێوانەکاندا بەدوای دۆزینەوەی چییەتیی مرۆڤدا وێڵە. شیلەر لەم بارەیەوە دەڵێ: *لە تاوانێکی ئەنجامدراوی گەورە و تۆقێنەردا، هێز و دەسەڵاتێکی تا ڕادەیەك گەورە لە ئارادا هەبووە* (Vgl. Griegk: ١٩٩٦, ٤). بێ زێدەڕۆیی، دەتوانین بڵێین کە تاوان و سزا، کاریگەریی کتێبی *هەوڵێك بۆ ڕوونکردنەوەی پەیوەندیی نێوان سرووشتی ئاژەڵی و مرۆیی لە لایەنی ڕۆحی و دەروونیی* ئەوی بەسەرەوەیەوە.

وەڵ ڕەنگە هیچ شاعیر و نووسەرێکی ئەڵمانیزمان هێندەی شتێفان سوایگ دراوسێ و هاوماڵی سەرزەوییە ئافرێنراوەکەی دۆستۆیڤسکی نەبێت. هەر دەڵێی چارەنووس بۆ هەر یەکێك لەوانە بەسەرهاتێکی هاوشێوەی دیاری کردووە. بەرهەمی هەر نووسەرێك، دۆزینەوەی جیهانێکی بێسنوورە. جیهانێك کە ئاسمان و زەوی و ئەستێرە و سەرلەبەری بەشەکانی ئافرێنراوی دەستی ئەو شاعیر و نووسەرەن. گەر ڕۆحی بەرگوێ لەم جیهانەدا وەك نیشتمانی ئاشنای

خود سەر هەڵبێنێ و هەوای ئەو هەڵمژێت، ئەوسا بە قووڵترین مانای وشە، لە ئاست تێگەیشتنیدا دەبێت. سوایگ (هەر بەو جۆرەی کە خۆی دەیڵێت) لە ڕێی دەستڕاگەیشتن بە هەستی هاودەردی و ئازاری هاوبەشی دەروونیی خۆیەوە توانیویەتی لە دۆستۆیڤسکی تێبگات. *دۆستۆیڤسکی هیچ نییە، گەر ئەو لە ناخی خۆماندا ئەزموون نەکەین. دەبێت تا قووڵترین ئاست بوونی خۆمان هەڵبکۆڵین تا (تا لە ئەوەڵ هەنگاودا)، پەیوەندیی نێوان خەیاڵ و خەیالات (پاشان) مرۆڤبوونی ڕاستەقینە و بەرز و باڵا (هەر بەو جۆرەی کە دۆستۆیڤسکی بەیانی دەکات) کەشف بکەین. دەشێت لەو قووڵاییەدا، لە بێسنووری و تاقانەیی بوونی خۆماندا، بتوانین هیوامان بەوە هەبێت کە لە ڕەگەوە بە دۆستۆیڤسکییەوە گرێ دراوین* (Zweig, ۱۹۲۲). ئەم خاڵەی کە سوایگ ئاماژەی پێ دەکات، دیدگەی گادامێر دەهێنێتەوە یاد لە بارەی یارییەوە وەك بابەتێکی جوانیناسی. گادامێر جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکاتەوە کە هەر بەرهەمێکی هونەری، پەلکێشی نێو یاریی خۆیمان دەکات. ئەم بابەتە زیادتر لە بارەی بەرهەمی ئەدەبییەوە درووستە. بە چوونەناوەوەی بەرگوێ و خوێنەر، چەماوەی یارییەکە تەواو دەبێت. شیعر یان ڕۆمانێك کە ئێمە دەکاتە بەرگوێ و لەگەڵمان دەدوێت، ئەوە داوامان لێ دەکات چالاکانە بچینە نێو یارییەکەوە. هەر دەقێك لە خوێندنەوەی چالاك و هاودڵانەدا (بەو جۆرەی کە *ولفگانگ ئەیز* لە کتێبی *کردەی خوێندنەوە* (Der Akt des Lesens)دا ئاماژەی پێدەکات) دەبێتە کردەیی و دەگۆڕێت بۆ ڕووداوێکی ڕاستەقینە. خاڵی سەرنجڕاکێش ئەوەیە کە گادامێر بۆ ڕوونکردنەوەی

بۆچوونەکەی خۆی، یارمەتی لە *برایانی کارامازۆف* وەردەگرێت. لەوێدا پلیکانەیەك بوونی هەیە کە وا دیارە *سمیردیکۆف* لەوێوە دەکەوێت. ئەم پلیکانەیە لە لایەن دۆستۆیڤسکییەوە بە شێوەیەکی تایبەت وەسف دەکرێت. *من* (گادامێر لەم وەسفەدا) *باش دەزانم کە ئەم پلیکانەیە چۆنچۆنییە. دەزانم لە کوێوە دەست پێ دەکات، پاشان، (دەچێتە نێو کەشێکی) تاریکەوە و دواتر بەلای چەپدا با دەداتەوە. ئەم پلیکانەیە وەك هەمیشە بۆ من ڕوون و لە بەرچاوە، لەگەڵ ئەوەشدا، دەزانم کە بێ لە من، هیچ کەسێکی دی ئەم پلیکانەیە نابینێت. وەلێ گەر هەر کەسێك ڕێ بدات ئەم بڕگە هوونەرییە بلیمەتانەیەی گێڕانەوە کاریگەریی بخاتە سەر، بە هەمان شێوە پلیکانەکە «دەبینێت» و لەوە دڵنیایە بە جۆرێك دەیبینێت، وەك ئەوەی کە هەر بە ڕاستی بوونی هەبێت.* ئەمە هەمان ئەو کەشە ئازادەیە کە گوتەی شاعیرانە دەخاتە (بەردەستی خوێنەر) و ئێمە (کەشی بەدیهاتوو) بە پەیڕەویکردن لە ئامارژە (هەرەوەها دیمەن)ی وشەیی گێڕانەوە، پڕی دەکەینەوە (Gadamer: ١٩٩٣, ١١٨).

سوایگیش هەر بە خوێندنەوەیەکی هاودڵانەیە کە دەبێتە هاومانی دۆستۆیڤسکی و لەگەڵیدا دەکەوێتە وتووێژێکی شاعیرانە و داهێنەرانە و کاریگەریی دۆستۆیڤسکی بەسەر سوایکەوە ئێجگار دیارە و سوایگیش هیچ هەوڵێك بۆ شاردنەوەی ئەم کاریگەرییە نادات. کتێبی *چیرۆکی شەترەنج* (Schachmovelle) بە ڕوونی ڕۆمانی قومارچیی دۆستۆیڤسکی بیر دەهێنێتەوە. سوایگ لە دوو کتێبی گرنگی خۆیدا، بە تێروتەسەلی دەپەرژێتە سەر

دۆستۆیڤسکی: یەکەمیان، *کتێبی سێ مامۆستا*: *بەلزاک*، *دیکنز* و دۆستۆیڤسکی (Drei Meister) کە لە ساڵی ١٩٢٠ لە پەخشانگەی *ئەینزاڵ لایپزیک*ی ئەڵمانیادا بڵاو بووەوە، ئەو بڵاوکەرەوەیەی کە سوایگ لە ڕێگەی ناسیاویی لەگەڵ *ئانتۆن کیپنبێرگ* ڕۆڵێکی بەرچاوی لە ڕێکخستنیدا هەبوو. هەروەها لە کتێبێکی ناسراوی دیکەیدا *ساتە درەوشاوەکانی مرۆڤایەتی* (Sternstunde der Menscheit)، کە ساڵی ١٩٢٧ لە پەخشانگەی ئەنێزلدا بڵاو کرایەوە، دێتەوە سەر باسی دۆستۆیڤسکی.

سوایگ هەوڵ دەدات دوازدە بڕگەی مێژوویی، کە بە گومانی ئەو ساتەوەختەکانی وەرچەرخانی مێژووی مرۆڤایەتین، دیاری بکات. لەتەك دۆزینەوەی ئۆقیانووسی ئارامەوە (*پاسفیك* لە ٢٥ی سێپتێمبەری ١٥١٣دا، فەتحی *بیزانس* (٢٣ مەی ١٤٥٣) هەڵکشانی *گیورگ فردریش هندل* (٢١ی ئابی ١٧٤١) و ساتەوەختی مێژوویی *واتەرلۆ* (١٨حوزەیرانی ١٨١٥) و شەمەندەفەری *لینین* (١٩ی ئاپریلی ١٩١٧)، ساتەوەختی حەماسیی دۆستۆیڤسکی بوونی هەیە. ساتەوەختێك کە لە ٢٢ی دیسێمبەری ١٨٤٩دا لە پترسبورگ و گۆڕەپانی *سیمیۆنافسك*دا ڕوو دەدات. ئەو شوێنەی کە تێیدا چاوانی فیۆدۆر بە پارچە پەڕۆیەکی ڕەش بەستراونەتەوە و بۆ گوللەبارانکردن هێنراوەتە گۆڕەپان. ئەفسەرێك سزاکە دەخوێنێتەوە: *لەبەر ناپاکیکردن لە نیشتمان، سزا بە مەرگ بە قورقوشم و کۆکرد...* (Zweig, ١٤٧).

بۆ لەم پارچە هۆنراوەیە، کە لە شێوەی شیعری حەماسیدا نووسراوە، باقیی دیکەی گێڕانەوەکە لەسەر شێوازی پەخشان نووسراوە و هەریەکەی باس لە چیرۆکێك دەکا. پێدەچێت سوایگ لە ڕێی ئەم شێوازەوە، نزیکی و خۆشەویستیی دڵی خۆی بۆ دۆستۆیڤسکی زیادتر نیشان دابێت، وەك چۆن لە کتێبی *سێ مامۆستا*دا بەشی گەورەی کتێبەکە تایبەتە بە دۆستۆیڤسکی (زیاد لە دوو لەسەر سێی کتێبەکە). *هەریەك لەم ڕۆماننووسانە، کەش و جیهانی تایبەت بە خۆی هەیە. بەلزاك (سەر) بە جیهانی کۆمەڵگەیە، دیکنز جیهانی خێزان، وەڵ دۆستۆیڤسکی سەر بە جیهانی تاك و گشتە.*

جیهانی دۆستۆیڤسکی، لە دیدگەی سوایگەوە، *جیهانێکە لەسەر سنووری نێوان مەرگ و ژیان، لەنێوان خەیاڵ و واقعیەت، لێڵە و ڕوون. لە دۆستۆیڤسکیدا تاریکییەکی شیرین بوونی هەیە و شەفەقێکی عارفانە. لەجێی ڕووناکیی درەوشاوە و تینبەخشی خۆرەتاو، ڕووناکیی سارد و خوێنینی خۆری باکوور وەدەر دەکەوێت. جیا دەشێ، گەر ئەم ئاسمانە بەرین و سافەی سۆز و خۆشەویستیمان بەسەرەوە نەبا، ڕۆح لە تاو هێرشی ئەم تاریکییە چڕە و لەسەر ئەم زەوییە پڕ لە کارەساتە بێکۆتاییەدا، سەری خۆی هەڵبکرتبا* (Ibid, ٩٢).

ژیانی دۆستۆیڤسکی وەك هی مرۆڤە گەورەکانی دیکە، بەردەوام لەنێو بووڵێڵی حەقیقەت و گوماندا ئاموشۆی بووە و هەر لەبەر ئەوەشە کە لە ڕێی بەڵگەی ڕووتی مێژووییەوە ناتوانین دیدێکی تازە

لەسەر ژیانی پەیدا بکەین و بیگوازینەوە. تەنیا لە ڕێگەی هاودڵی (Empathie) و هاومالییەوە دەتوانین چارەنووس و ژیانی ئەو وێنا بکەین. ئەم هاودڵییە، لە سەرلەبەری نووسینەکانی سوایگدا ئامادەیە. سوایگ لە بوونی دۆستۆیڤسکیدا سێگۆشەیەکی ئێجگار تەلیسماوی دەبینێت. سێگۆشەیەك کە پەیوەندییەکی پتەوی بە جەستە و ڕۆحی ئەوەوە هەیە: ڕووخساری دۆستۆیڤسکی (Antitz)و چارەنووسی، هەڵبەتە لەگەڵ بەرهەمەکانی، سێ سووچی ئەم سێگۆشەیە پێك دەهێنن. ڕووخساری ئەو، سەروسەکوتی جووتیارێك بیر دەهێنێتەوە بە چرچ و لۆچێکی زۆرەوە کە ئاماژەیە بە سالانێك لە کوێرەوەری و تەقەللا. لە ڕووخساری دۆستۆیڤسکیدا هیچ شتێکی سەرنجڕاکێش بەدی ناکرێ و هیچ نیشانەیەك لە جوانی، بە ڕووخساری بێزار و تاریکیەوە نییە. ئەوە تەنیا تەوێڵە بەرز و درێژ و ڕووناکەکەیەتی کە سەرنجی ڕادەکێشێ. هەمان ئەو تەوێڵەی کە سوایگ بە *پادشایانە* ناوی دەبات و وەك ئاسمانی بەرز و پتەو بە سەرووی لەشی لاواز و نەخۆشی ئەوەوە گیرساوەتەوە (Ibid, ۹۲). چارەنووسی ئەو، ڕێك هەروەك ڕووالەتی، لە ئەوەڵین سەرنجدا تووڕە و بێباك دێتە بەرچاو. لەگەڵ ئەوەشدا، چارەنووسی دۆستۆیڤسکی لە هی کەسایەتییەکانی نێو پەیمانی کۆن دەچێت، چون حەماسییە و لە چارەنووسی کەسایەتییەکانی نێو پەیمانی نوێ ناچێت. پێویستە ئەو لەگەڵ ئەیوب و یەعقووبدا بەراورد بکەین.

دۆستۆیڤسکی هەمیشە هەست بە ئامادەگیی خودایەکی بەزەبر و ئەشکەنجە و تاقیکردنەوەکانی دەکات، جا لەبەر ئەوەی نزیك و عاشقترە، توورِ دەدرێتە نێو درکەجاڕی پڕ لە بڵێسەی ئاگرەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، هیچ کات لە دژی چارەنووسی خۆی ناوەستێتەوە. ئەو هەرگیز دەسەوەسان نابێت. هەر دەڵێیت ئەو بەردەوام دەستێکی قودسی لەپشت سەرلەبەری ڕووداوەکانەوە دەبینێت، هەست دەکات و مانای چارەنووسی کارەساتباری خۆی دەدۆزێتەوە. لە مەینەتەکانییەوە، فێری هوونەری خۆشەویستنی ئەم مەینەتانە دەبێت و دەیانکاتە بەرهەمی هوونەریی بەپێز. بەرهەمە هوونەرییەکانی دۆستۆیڤسکی ڕەنگ و بۆی چارەنووسەکەی دەگرن. باوکی وەك باوکی شیلەر، سەر بە بنەماڵەیەکی خانەدان و پزیشکی سوپا بوو، وەڵێ دایکی، ژنێکی ئاسایی سەر بە بنەماڵەیەکی جووتیار. خانەدانی و ڕەعیەتی دەرەبەگ لە دیدگەی سوایکەوە، هەمان ئەو سەرچاوە فەرهەنگی و میلییە ڕووسییەن کە بوونی دۆستۆیڤسکییان تەنیوەتەوە. دۆستۆیڤسکی هیچ لە بارەی بنەماڵەکەیەوە ناڵێ. ڕەنگە بکرێت لە منداڵانی نێو کتێبەکانیدا لەدوی سەردەمی زارۆکیی ئەو بگەڕێین (وەك *کۆلیای برایانی کارامازۆف*، منداڵێکی پڕ لە خەیاڵ و خرۆش).

دۆستۆیڤسکی هەر لە منداڵییەوە هانای بۆ نێو دونیای تەلیماسماوی و جەنجاڵی کتێب دەبات. بە گەنجی لەپێناو دابینکردنی بژێویدا، چەند بەرهەمێکی گرنگی وەك ئۆژین

*گراندێتی بەلزاك* و *دۆن کارلۆس*ی *شیلەر* وەردەگێڕێت و دەچێتە نێو سوپاوە.

وەڵێ ژیانی کەمتازۆر میلۆدرامی ئەو بە خێرایی گۆڕانکاریی بەسەردا دێت و دەبێتە تراژدیا. ساتەوەختەکانی ژیانی ئەو، پڕ لە جۆشوخرۆش و حەماسین، ساتگەلێکن کە سنووری نێوان مەرگ و ژیانی بۆ ڕوونـاك دەکەنەوە. *شەوە ڕۆژنەکان*، کە لە کارە سەرەتاییەکانی ئەوە، دواهەمین کتێبە کە وەك مرۆڤێکی سەربەست دەینووسێت، چونکە دوای ئەوە، هەرچی کە دەینووسێت، پێشوەختە فرۆشراوە و وەك سوایگ دەڵێت *منداڵی لەدایکنەبوو، بووبوە کۆیلەی بازرگانی*. ئەو، بە تۆمەتی پووچی بەشداریکردن لە کۆبوونەوە و پێکهێنانی گرووپی پیلانگێڕ و ئاژاوەچیی *پێتراشفسکی* لە دژی *تزار*، بە بڕیاری دادگە سزای گوللەبارانکردنی بەسەردا دەسەپێنرێت. بە نیازی گوللەبارانکردنەوە، دۆستۆیڤسکی دەبەنە گۆڕەپانی سیمیۆنۆفسك. *ساتی ئەبەدی*، ئەو شوێنەی کە مەرگ و ژیا، بۆ ماچێکی ئاگرین، لێو بە لێوی یەکدییەوە دەنێن. ساتێك کە *کارڵ یاسپەرز*، فەیلەسووفی بەناوبانگی ئەڵمانی، بە هەلومەرجی سنووری ناوی دەبات. وەڵێ چارەنووس یارییەکی دیکەی لەژێر سەردایە. سزای گوللەبارانرکردن، بە چوار ساڵ دوورخستنەوە بەرەو سیبریا و بێگارەکار سووك دەکرێت. لەو سەردەمەدا کتێبی *یادەوەرییەکانی* دۆستۆیڤسکی دەکەوێتە دەستی تزار و گویا کاریگەرییەکی توندی لەسەر دادەنێت. دوای تەواوبوونی ماوەی دوورخستنەوە و گەڕانەوەی، لەگەڵ براکەیدا

بڵاوکراوەیەك دادەمەزرێنن، بەس دوای ماوەیەك ئەویش ڕادەگیرێت. لە ترسی خاوەنقەرزەکانی، دەمەو شەوان لە ڕووسیا هەڵدێت. شەڕی نێوان دۆستۆیڤسکی چارەنووسی، دەگۆڕێت بۆ جۆرە نەفرەتێکی عاشقانە، وەلێ ئەو لەم شەڕەدا، بە هۆگربوون بە چارەنووسییەوە، بەسەریدا زاڵ دەبێت. ئەم عەشقە لە گوتەکانی نیچەدا پێگەی ڕاستەقینەی خۆی دەدۆزێتەوە: «Amor fati»، هەمان ئەو شتەی کە نیچە بە بەیارترین ڕێسای ژیان ناوی دەبات: *خۆسپێری و دڵدانە چارەنووسە*. ڕەنگە بتوانین هۆگریی دۆستۆیڤسکی بۆ نەخۆشییەکەی «ق»، هەر ببەینەوە سەر بابەتی خۆسپاردنە دەستی چارەنووس. ئاخر ئەو خۆی لە بارەی نەخۆشییەکەیەوە دەڵێت: *هۆ مرۆڤە تەندرووستەکان، ئێوە ناتوانن ئەو چێژ و جۆشوخرۆشە وێنا بکەن کە لە ساتەوەختی بەر لە هەڵمەتی قێدا، کەسی قێدار دەتەنێتەوە... بڕوا بکەن من ئەو ساتە بە سەرلەبەری خۆشییەکانی ژیان ناگۆڕمەوە*. (Ibid, ١٩٩).

ساتەوەختی ق، کە دۆستۆیڤسکی بە جۆرێك لە هەستی خۆشی و هۆگرییەوە باسی دەکات، ساتێکە لەسەر سنووری نێوان مەرگ و شێتی، یان مەرگ و ژیان. ئالوودەبوونی زیادلەڕادە و بێسنووری ئەویش بە قومار، هەر لە ئەزموونی ئەم هەستەوە سەرچاوە دەگرێت. ساتەوەختێك کە ڕەش و سوور، ژمارەی تاك و جووت، خۆشی و خەم، سەرکەوتن و شکست و تیاچوون (بۆ کەسی قومارچی) لە یەك ساتدا ئامادەیە. وەك چۆن چارەنووس یاری بەو دەکات، ئەویش بە هەمان شێوە لەگەڵی دەکەوێتە گەمە... (ئەوەی کە ئەو دەیخاتە سەر

مێن) پارە یان دواهەمین سکەی گیرفانی نییە، بەڵکە تەواوی بوونی ئەوە(Ibid, ١٢٤) . هەر بەو جۆرەی کە خۆی دەڵێ: *بەردەوام و لە هەموو جێیەك، بە درێژایی تەمەنم لە سنوورەکاندا ڕێم کردووە*. هەر ئەم ڕابردن بەنێو هەلومەرجە سنوورییەکاندایە کە دۆستۆیڤسکی دەکاتە شاعیر و گێڕەرەوەی مەرگ. ڕەنگە بکرێت ئەزموونی مەرگ بەسەر سێ بەشدا پۆلێن بکەین: یەکەم ئەزموونی گشتیی مەرگ. مەرگ لەگەڵ فەنا (بەو جۆرەی کە هایدگەر دەڵێ)، ئێجگار جیاوازە. هایدگەر ئینسان بە مرۆك ناو دەبات کە لەگەڵ جەستە و بوونەوەرانی دیکەدا جیاوازیی هەیە. وەلێ ئەزموونی گشتیی مەرگ، نە دەگوازرێتەوە و نە دەردەبڕێت، چونکە بەر لە مەرگ وەها ئەزموونێك لە ئارادا نییە، دوای مەرگیش هەر وا. بەس جۆرەکەی دی، ئەزموونکردنی مەرگە لەنێو ئەم هەلومەرجە سنوورییانەدا، بە هەمان ئەو جۆرەی کە یاسپەرز لێی دەدوێت. ساتی گیرسانەوەیە لەنێوان مەرگ و ژیاندا، هەمان ئەو ئەزموونەی کە دۆستۆیڤسکی بە نەخۆشییەکەی گەلێك جار ئەزموونی کردبوو. سێیەمین جۆری ئەزموونی مەرگ، کە لەگەڵ جۆری دووەمدا پەیوەندیی هەیە، بوونە بە گێڕەرەوەیەکی هەمیشەیی ئەزموونی مەرگ. دۆستۆیڤسکی لە بەرهەمەکانیدا جۆری سێیەمی ئەم ئەزموونە دەردەبڕێت. ڕۆڵی پەیامبەرئاسا و پێشبینیکەرانەی ئەویش هەر لەم مەسەلەیەوە سەرچاوە دەگرێت. بوونە شاعیری هەمیشەیی ئەزموونی مەرگ، هەوڵدانێکە بۆ چەشتنی تامی مەرگ، تا لە ڕێیەوە ئەم چێژە پەرەوەدە بکات و پێی بگەیەنێت. ڕەنگە بکرێ هەر لەم ئەزموونەشدا مانای ژیانی مەرگاریی هایدگەر لێك بدەینەوە. ئەم هێنانەئارای

چێژە بۆ مەرگ، لە ئایەت و گێڕانەوە ئایینیەکانیشدا ئامادەییەکی زۆری هەیە. وەلێ خاڵی جێسەرنج ئەوەیە کە لە فەلسەفەی ئیسلامیدا، مەرگ وەك بابەتێکی سەربەخۆ جێ و پێگەیەکی نەدراوەتێ. گەرچی مەرگ یەکێکە لە چەمکە کلیلییە قورئانییەکان، کەچی دەبێت پێوەریی مەرگ لە فەلسەفەی ئیسلامیدا، بە پێوەرییەکی چەندبەرانبەر دابنێیت. یەکەمین پێوەریی مەرگ وێڕای ئامادەگیی قوورسایی ئەو و پێوەرییەکانی دیکەی ئەم پێوەرییە، یانی بێئاگایی و سەرنجنەدانە بوونی ئەم پێوەرییە (*سەرنجدن لە نائامادەیی، سەرنجدان نییە لە بابەتێکی دیاریکراو، بەڵکو وەك چاوەڕوانییکردنی ئامادەییەکە کە نەهێنراوەتە دی و هەوڵێکە بۆ پەیبردن بەم نائامادەییە لە شیعر و عیرفاندا و چەشتن و کەشەپێدانی هەستی مەرگ، کە ئەمەش* زۆر بەرچاو دەکەوێت).

دۆستۆیڤسکیش کەشەپێدەری ئەو چێژەیە و گێڕەرەوەی ئەم ئەزموونە. مرۆڤە ئافرێنراوەکانی دەستی دۆستۆیڤسکی، بەردەوام لەنێو ئازار و ئەشکەنجەدا دەژین. مرۆڤەکانی دۆستۆیڤسکی، بە پێچەوانەی مرۆڤە دیکارتییەکانەوە بیر *ناکانەوە، کەواتە هەن*، بەڵکە *لەبەر ئەوەی ئازار دەچێژن، کەواتە هەن*. هەر بەو جۆرەی کە سوایگ دەڵێ: *ئەم بوونە گەورەترین سەرکەوتنە لە ژیاندا*.

بێ گومان ژیان ڕوویێکی دیکەی سەر دراوی مەرگە. مەرگ و ژیان پەیوەندییەکی نەپچڕاویان لەگەڵ یەکدیدا هەیە. ڕێك وەکو کەسایەتییەکانی دۆستۆیڤسکی: *ئالیۆشا*، خواپەرست و زاهید،

پاکسرووشت، هاوخوێن و کوڕی *کارامازۆف*ی بەدسرووشتە. شەو و ڕۆژ و خـودا و ئەهریمـەن لـەنێو کەسـایەتییەکانی دۆستۆیڤسـکیدا شان بەشانی یەك هەنگاو دەنێن. کەسایەتییەکانی دۆستۆیڤسکی بە گڕتێبەربوون دەردەکەون. کەرەستەی گڕتێبەردانی ئەوانیش وشەیە. گەر هەر بەو جۆرەی کە *ڤاگنەر* گوتوویەتی، *گۆتە* بە مرۆڤێکی بیینەر و دیـدەوان دابنـێین، ئـەوا پێویسـتە (لـە دیدگـەی سـوایگەوە) دۆستۆیڤسکی بە مرۆڤێکی بیسەر و گوێگر ناو ببەین. لە گوتن و بیسـتن و بیسـتراندایە کـە کەسـایەتییەکانی دۆستۆیڤسـکی دەردەکەون. سوایگ بڕوای وایە لای تۆلستۆی، *ئێمە سەرەتا دەبینین و پاشـان دەبیسـتین، وەڵ لای دۆستۆیڤسـکی سـەرەتا دەبیسـتین و دوای ئەوە دەبینین* (Idib: ١٥٨).

لە دیدگەی سوایگەوە، دۆستۆیڤسکی کەسایەتییەکانیی بە ڕۆح تەنانـدوون. ئەمـە بە واتـای ڕاستەقینەنەبوونیان نایێـت، بەڵکە بەو واتایەیـە کـە ئـەوان زیـاد لـە ڕادە ڕاسـتەقینە و واقعـین. شەکسـپیر سـەروکاریی لەگـەڵ دونیـای ڕۆحـدا نییـە، وەڵ دۆستۆیڤسـکی لـە ڕۆحدا جیهان دەبینێت:

*ئـەی نیگـار لـە ڕۆح جەسـتەتیان ئافرانـد لـە کـوفری زوڵفـت ئیمانیان ئافراند*[1]

ئەو گێڕەوەی مەرگـە، وەڵ خۆی پیاهەڵدەری ژینـە. هـەروەك لـە کۆتایی *برایانی کارامازۆف*دا سەرمەستانە هاوار دەکا: هـەر بمێنـێ

---

١. دەستپێکی غەزەلێکی *عێراقی*یە. «و. ك»

*ژیان.* گادامێر گەورەترین سەرکەوتنی ژیان لەمەدا دەبینێ دەستڕانەگەیشتنی مانا بە مەرگ، گەورەترین سەرکەوتنە لە ژیان (Gadamer, ١٩٩٣).

سوایگیش لە گوتەکانی خۆیدا دەکەوێتە ستاییشکردنی ژیان:

> *ئاه، ئەی ژیان، ئەی بالاترین و سەرسووڕهێنترین! بە ویستی ئاگایانەی خۆت بینەرانێك دەهێنێتە ئارا تا ببنە ستاییشکاری تۆ. ئەی دڵڕەقی حەکیم! بە مەینەتییەکی بەردەوام گەورەکان دەکەیتە فەرمانبەری خۆت تا لە هەموو جیهاندا هاوار بۆ (فەتحکردنی تۆ) بکەن. دەتەوێ دووبارە دەنگی ئەیوب زایەڵە بداتەوە، کە لە ناخی هەزاران ساڵەوە، هەڵدەستێت و لە ئازار و نەهامەتیدا خودا دەبینێت. دەتەوێ دووبارە چریکی شادی هاوەڵانی دانیال[1]، لەو ساتەی کە چاوانیان لەنێو کورەی بڵێسەدار++! گریان تێبەر دەبێت، ببیستیتەوە! تاهەتا ئەم پشکۆیە بەسەر زمانی شاعیرانەوە دەگەشێنیتەوە: ئەو شاعیرانەی کە*

١. دانیال، یەکێکە لە پەیامبەران کە مێژووی کتێبەکەی دەگەڕێتەوە بۆ شەش سەدە بەر لە مەسیح، خەونزان و پێشبینیکەر بووە. هەر بە منداڵی بەرەو بابل ڕاپێچ دەکرێت و لە لایەن دەسەلاتدارانی ئەو سەردەمەوە، دەخرێتە نێو چاڵێکی پڕ لە شێری برسییەوە؛ هەروەها سێ هاوەڵیشی، دەخرێنە نێو کورەی ئاگرەوە، وەلێ بە پشتیوانیی خودای دلۆڤان پارێزراو دەبن. «و. ك»

خۆیان دەدەنە بەر مەینەت تا ملکەچی تۆ بن و ناوی تۆ «تەنیا» بە عەشقەوە «گۆ» بکەن!

تۆ بە ناوی مۆسیقاوە، وا لە بتهۆڤن دەکەیت کە جوانترین ئاوازی خودا ببیستێت و بە لاواندنەوەی مەرگ شیعرێکی نەمری شاد بچرێت. رامبراند پەلکێشی نێو تاریکیی هەژاری دەکەیت تا لە ڕەنگدا بەدوای ڕووناکی، ئەو ڕووناکییە تاهەتاییەتدا بگەڕێ. دانتی لە سەرزەویی باوانی دەتارێنی تا لە خەون و خەیاڵدا دۆزەخ و بەهەشت ببینێ. هەمووانت لەگەڵ دیلەکانی خۆتدا بەرەو ئەبەدیەتی خۆت پەلکێش کردن و ئەویشت (دۆستۆیڤسکی) کە هیچ کەسێکی دیکەت ئاوا دەستبەسەر نەکرد، کردە کۆیلە خۆت. تەماشا کە لێوانی کەفاوی و لەشی گەرم و بەئازاری چۆن بەدەم ناڵەوە خودا بەسەر دەکەنەوە و داوای یارمەتی لە ڕەبی خۆیان دەکەن و «بزانە چۆن بەنێوگڕی نێوان گومان و دوودڵیدا تێپەڕیوە». ئاە کە چۆن چرپینێک دەخەیتە ناخی ئەو مرۆڤانەوە کە خستووتنە نێو ئازارەکانی خۆتەوە. لە ڕۆژ، شەو دادەهێنی، لە ئازاریشەوە، عەشق. لە ناخی دۆزەخەوە، ئاوازی ستاییشکارانە دەهێنیتە دەر،

*چونکە کلۆڵترینی ئەوان، بەئاگاترینەکەیانە، جا هەرکامێکیان کە تۆی ناسی، دەبێ بەرزت ڕابگرێ: ئینجا ئەو، کە قووڵتر لە هەمووان تۆی ناسی، بڕوانە چۆن زیاتر لە هەر کەسێکی دی شایەتیت بۆ دەدا و زیاد لە هەر کەس مۆگرتە.*

یاریی جەرگبڕی چارەنووس وا بوو کە ئەم ستاییشکارەی ژیان (شتێفان سوایگ)، لە مەنفادا دەستی چووە خوێنی خۆی و لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ماڵئاوایی لە ژیان کرد.

نۆی شوباتی ١٨٨١ دۆستۆیڤسکی ماڵئاوایی لە جیهانی فانی کرد. سێ حەفتە دوای ئەم ڕووداوە، تزاری ڕووس کوژرا و پشێوی و ئاژاوە سەرانسەری ڕووسیای تەنییەوە.

**سەرچاوە:**

«لحظه حماسی»:

داستایفسکی به روایت سوایگ

رائد فریدزاده

ئەم ڕۆمانە لە ڕیزی باشترین بەرهەمەکانی مندایە. هیوایەکی زۆرم پێی هەیە و بۆ پتەوکردنی پێگە ئەدەبیەکەشم هەر پشتم بەو بەستووە. دوو ساڵ کاتم بۆ نووسینی ئەم بەرهەمە تەرخان کردووە.
نامەوێ بڵێم هەموو قسەکانی خۆمم تێدا کردووە، وەها شتێک قسەی پڕوپووچە! هێشتا قسەی زۆرم هەیە بۆ گوتن.
لەنێو ئەم ڕۆمانەدا دوو کەسایەتیی نایاب و باش هەن کە ئافراندنیان پێنج ساڵ کاتی خایاندووە، ئەم کەسایەتیانە ناوازە و بێخەوشن و تا ئێستە لەنێو ئەدەبیاتی ئێمەدا نموونەیان نەبووە.

فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی

بێ گومان ئەمە دلڕەقانەترین کتێبی دۆستۆیڤسکییە لەنێو هەموو دلڕەقییەکانیدا، ئەمە کتێبی هێما گەورەکانە کە هاوکات بە واقعبینییە زیادەڕۆییانەکەی پەستمان دەکات، نیگارکێشێک بێننە بەرچاوتان بە شێوازێکی هێندە ڕاستەقینە وێنەی ئاگر بکێشێت، کە دەست و ڕووخسارمانی پێوە بسووتێنێت.
ئەم ڕۆمانە هەر لە دەستپێکەوە تا کۆتا، تاریک و مۆن و ترسێنەرە، ڕەسەنایەتییەکی ڕاستەقینەی تێدایە و پێش ئەو کات و سەردەمە کەوتبوو کە تێیدا نووسرا، لەبەر ئەوە، نە خوێنەر و نە ڕەخنەگرانیش نەیانتوانی بە شێوەیەکی شیاو هەڵی بسەنگێنن و بینرخێنن.

ستانیسلاڤ ماکسکیڤیچ

نرخ: ۱۰۰۰۰ دینار
1000000489
AWER 489
بەرگ: ئاکار جەلیل